ئاوەندی ئاشتی
بیرەوەری



# شوێنپێیەکانم لە جەماهیرییەی لمدا ١٩٩٤-٢٠٠٥



فازیل شەورۆ





# شـــوێنپێیەکانم
# لە جەماهیرییەی لمدا
# ١٩٩٤_ ٢٠٠٥

نووسەر:فازیل شـــەورۆ
بەرگ و ناوەڕۆک: ئیبراهیم ساڵح
بڵاوکار: ناوەندی ئاشتی
نرخ : ١٠٠٠٠
نۆبەی چاپ: دووەم
تیراژ: ٥٠٠
ساڵی چاپ: ٢٠٢٣

ژمارەی سپاردن ١٧ ی ساڵی ٢٠٢٣
بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان
وەزارەتی رۆشنبیری و لاوان





# پێرســـــت

**بابەت** **لاپەڕە**

# ئەم کتێبەم بۆ نووسی؟

موعەمەر قەزافی سەرکردەیەکی قارەمان بوو، یان دیکتاتۆرێکی دەمامکدار؟ چۆن توانی (٤٢) ساڵ و (٢٠) ڕۆژ، بەبێ پسانەوە حوکمڕانی گەلێکی بەدەوو بکات، کە ئیمپڕاتۆریەتیی ئیتاڵی دەرەقەتیان نەهات، گەرچی نزیکەی (٨٠٠) هەزار کووژراو و زامدار و یەخسیر وئاوارەی لەدوای خۆیدا بەجێهێشت؟ بۆچی سەرەڕای ئەوەی هەموو گرتەیەکی ژیانی ئەو زاتە بە دەنگ و ڕەنگ تۆمارکراوە، هەمیشە مەتەڵێکی ئاڵۆزە، لە نێو تەم و تاریکی و نهێنیدا؟ بۆچی بەو ئاکامە تراژیدیاییە گەیشت؟ و دەیان پرسیاری دیکەش.

ئاشنایەتیی کورد، بە خێڵ و ئێڵەکانی لیبیا و سرووشتی ئەو وڵاتە، نەختێ کاڵ و لاوازە. نە پەیوەندیی مێژوویی و نە وابەستەی جۆگرافیی لە نێوانماندا هەبووە، ئەوەندە زانیارییەی وەدەستیش کەوتبێ، لەسایەیی خودی قەزافی بووە، نەک ئاشنابوونمان بە مێژوو و کەلتوور و کەلەپووری ئەو وڵاتە.

ڕەنگبێ، بۆ قەڵەمبەدەستێکی وەک من، تۆمارکردنی بیرەوەرییەکانم لە ساڵانی (١٩٩٤ تا ٢٠٠٥)، لە نێو لم و تەپۆتۆز و خۆڵبارینی گەورەترین سارای جیهان، مایەیی ئەوەبێ، پەردە لەسەر هێندێ نهێنی و مەتەڵ و شانۆگەریی نەبینراوی ئەو وڵاتە و ئەو زاتە هەڵدەمەوە. بەسەربردنی ئەو ساڵانەی تەمەنم، نەک لە شاری (سرت)ی زێدی قەزافی، بەڵکوو لەو ئاواییەیی کە ئەو تێیدا گەورە بووە و گلگۆی (ئایشە نیران)ی دایکی لێی بوو، دەرگا بە دەرگای کەسوکاری ئەو بووم، زۆر دەرگای بۆ خستوومەتە سەر پشت، کە ڕەنگبێ بۆ کەم کەسی دیکە ئەو هەلە هەڵکەوتبێ!

هەوڵمداوە، گێڕانەوەی بیرەوەرییەکانم، بە زانیاریی مێژوویی و کەلتووریی و کۆمەڵایەتیی و ڕۆشنبیریی ئەو وڵاتە ئاوێتە بکەم، تا بتوانم دەستی خوێنەر بگرم و بیبەمە نێو ئەو کەش و هەوا و هەوار و ڕەشماڵ و بیابانەی ئەوان تێیدا دەژیان، تا هەست بە ئازار و خۆشی و ناخۆشییەکانیان بکەین.

ئەوەندەی بۆمکرابێ، بە زمانێکی سادە و ساکار و ڕەووان، بابەتەکان دەگێڕمە، تا خوێنەر، هەر ئاستێکی ڕۆشنبیری هەبێ پێیبوێرێ و لێیحاڵی بێ. خۆم دوورەپەرێز گرتووە، لە ڕەخنەگرتن و حکوومدان لەسەر کارەکتەر و ڕووداوەکان، چونکە من تەنها حیکایەتبێژی ئەو کارەکتەر و ڕووداوانەم، کە خۆم بینیوومن یان لێمبیستوون. با خوێنەر بۆخۆی ببێتە قازی و حەکەم.

ڕاستگۆیی و وەلاوەنانی سۆز و هەست و خۆشەویستی و ڕق و بوغزی کەسیی، بەردی قەپانی، هاوکێشە واقیعییەکانی ئەو بیرەوەرییەن.

**هیوادارم، کتێبەکەم، جێگەی ڕەزامەندیی خوێنەران بێ.**

**نووسەر**

**دوبلن**

**٢٠٢٢/٥/١٠**

## (۱)
## طُلَيْطِلَة

چ نەهەنگێکی زەبەلاحە، بەو زەردەپەڕە درەنگە خۆی لە کەناری ئیجە دەرهێناوە و زاری ڕوو لە ئەزمیر بەشکردووەتەوە! طوڵەیطەڵە!

تۆبڵێی، بۆ خاتری ئاە و نووزەی دایکم، خودای میهرەبان و دڵنەرم، بەم ئێوارەوەختە، ئەوە نەهەنگەی بۆ نازل نەکردبم، تا لە نغرۆبوون نەجاتم بدا؟

بەڵام! خۆ من یونس پێغەمبەر نیم! تا خودا ئەمر بەو نەهەنگە بفەرمووێ، جەستەم دانەڕۆشێنێت و نە گۆشتم بخوا و نە ئێسقانم بهاڕێ! لێ، خۆمنیش وەک نەبی یونس لەدەست زوڵم و جەوری زاڵم و مرۆڤکوژەکان هەڵاتووم. ئەوانەی، بەقەد پاڕانەوەی ئەو پێغەمبەرە، لێیان پاڕامەوە، کە یەکتری نەکوژن و چیتر بێوەژن و هەتیوو و دایکی جەرگسووتاو، بە شەقامە بێڕەحمەکانی ئەو نیشتیمانە نەسپێرن و ڕووبەری گۆڕستانە فراوانەکان، فراوانتر نەکەن و برین و زامە قوولەکان، قوولتر نەکەن.

کێوێکەوە، بەلای ڕۆژاوای کەناری ئیجەدا، خۆی لارکردووەتەوە، تۆ بڵێی کەشتییەکەی نوح نەبێ، بە هاوارمانەوە هاتبێ، طوڵەیطەڵە؟!

ئەگەر وابێ، ئەوا نیشانەی هاتنی ڕۆژی پەسڵانە. نیشانەی هەڵسانی لافاوەکەیە، کە بڵندترین لوتکەی چیا و تۆقەڵەی کوێستانەکانی داپۆشی وهیچیان نەیانتوانی کەنعانیش لە نغرۆبوون ڕزگار بکەن. هەموو دەنگ و ڕەنگ و هات و بات و جرپۆجۆپ و تەدارەکی هەر چوار ئیقلیمی مەفتەنەکەم، بە ئاشکرا دەیانگوت، دێ... دێ ... دێ... لافاوکەی نوح دێت و هەموومان نغرۆدەبین. تۆپە (۱۲۰) میلیمەکانیان بردبووە سەر تۆقەڵەی قەڵای هەولێر و ڕوو لەشار، دامەزرێندرابوون... جبەخانە و چەکۆچۆڵە فەرهودکراوەکانی بەعسیان، وەکو شەکرۆکە و نوقڵ بەسەر هەرزەکار و پیرەمێردەکانیشدا دابەش دەکرد، وای کە دڵخۆش بوون، کە بەوە چەکۆچۆڵانە دەچنە غەزای براکانی خۆیان... کۆیە پەلاماری پیرمام دەدات و سۆران چاوی ڕانیە دەردەهێنێ و شەقلاوە دەبێتە هەواری بووکە خوێناوییەکانی ئەو دەڤەرە... وابوو، هەموو نیشانەکانی هەڵسانی ئەو لافاوە، دیار بوو. ئای

که گومڕا و نابینا و گەوجێنراوبوون، چەند بە حەماسەتەوە لاوک و حەیران و مەقامیان بەو (ئاشووبەیە)دا هەڵدەگوت و ئالآی گەورە گەورەی زەرد و سەوزییان بۆ هەڵدەتەکاند.

لە دڵی خۆمدا دەمگوت، جا ئەگەر ئەوە کەشتیی نوح بێ، هەڵاتنی من و خۆ دەربازکردنم، خیانەت و ترسنۆکی و خۆپەرستی نییە؟ ئەدی دایکم؟ ئەدی کۆنە یارم؟ ئەدی خوێندکارەکانم؟ ئەدی شیعر و کارە هونەرییەکانم؟ ئەدی و ئەدی و ئەدی...؟

منداڵانە، دڵی خۆم دەدایەوە، دەمگوت: تۆ، خۆت هەمیشە هانی خوێندکارەکانت دەدا کە هەرگیز نائومێد و بێزار و ڕەشبین نەبن لە ژیاندا. ئێ، بۆ ناڵێی، ئەو کەشتییە زەبەلاحەی کە زۆر شێوەی لە کۆسار دەکا، ئەو سندووقە تەقەت و تۆکمەدارە نییە کە مریەم، موسای کۆرپەڵەی لەناودانا و بە ڕووباری نیلی دادا. خۆ ئەو ڕووبارە نەختۆکەک لە خوارەوەی ئەم دەریا چاو شینەیە. خۆ مەفتەنەکەی منیش، بووەتە مەفتەنی فیرعەونەکان، کێ دەڵێ، خودا ڕۆژێ لەو ئاودا دەرمناهێنێ و نامکاتە فریادڕەسی هەموو مرۆڤە جوانەکان.

قەدەر... لە هەموو ئان و زەمانێکدا هەر قەدەرە، تاکو ئەو لەحزەیەش، من پەڕەمووچێکی سووکەڵەم بەدەست ئەو قەدەرەوە.

دیارە قەدەرە... !

ئەی قەدەری شاراوەی ناو زارای نەهەنگی طوڵەیطەڵە... وا هاتم.

تەواو بێزار بووم لە ئەزمیر، ئێمە بۆ یەک شەو هاتبووین، وا نزیکەی دوو حەفتەیە، بەدەر لە ویستی خۆمان، گۆشەگیری ئەو شارە بووین. جوانە، دڵگیر و دڵڕفێنە، هەر دیمەنێکی دێتە بەرچاو، لە ئەوی دیکەی جوانترە، ئەوەی کە هەموو ڕۆژ دەیبینی، وەک ئەوە وایە یەکەمجارت بێ چاوت پێیکەوێ. بەڵام چونکە ڕێی دووری سەفەری ئێمە، بەرەو باکووری ئەفریقیایە، حەزدەکەین دەقیقەیەک زووتر بەڕێکەوین.

سلۆپیی سەر سنوورەوە، بە یەک قۆناغ بە پاسێکی گەورە و مۆدرن و تیژڕەو، دوای (٢٤) دەمژمێر گەیشتینە ئەو شارە. یەکەم سەفەرمە بۆ تورکیا، ئەوەی لە ڕێگادا دەمدیت، هەر لە سەیرکردنی دیمەنەکانی سینەما دەچوو، چونکە ڕۆحیان تێدا نەبوو، هەر دوور بە دووری بوو. بەڵام لە ئەزمیر، هەستم کرد، لە شارێکی یەکجار نازدار و ڕەنگینم. دوو حەفتەش، دەرفەتێکی باش بووـ گەرچی مانەوەکەمان بە ناچاری بوو، باش ئاشنای شارەکە و دەڤەرەکەی بم. لە پاڵ قەد گردێکی بەرز، خانووبەرە بەرز و کۆن و مۆدرنەکانی ئەو شارە،

پێ بە پێ بۆ دامێنی دەشتایەکی سەوز و پڕ چیمەن و باغ و باغات شۆڕدەبێتە و ڕووبەرێکی یەکجار فراوان دادەپۆشی. لای سەری، دەڕوانێتە دەریای ئیجە، واتا ڕۆژاوای شارەکە. جا کە نیگات بەو کیژۆڵە باڵابەرز و پێست پەمەیی و چاوشین و پرچ زەردانە مەست و خومار دەبێ، یەکسەر ئەوەت بە خەیاڵ دادێ، کە ئاخۆ دەبێ ئەزمیر، نەچێتەوە سەر جنسی حۆری دەریا! ئاخر هەردووکیان گەڵێک لێکدەچن. شارەکە بە دەست و بازووی یۆنانییە دێرینەکان، لە چاخە زووەکاندا بونیاتنراوە و هەر خۆشیان لەگەڵ تورکەکان تێیدا ژیاون. جا ئەفسانەی حۆری دەریاش، هەزار ساڵ پێش زایین، هەر لە میتۆلۆژیای یۆنانییەکاندا لەدایک بووە: گۆیا خوداوەندی ئەتارگاتیس، دایکی سەمیر ئەمیس، حەز لە پیاوێک دەکات، بەڵام غیرە دەیگرێ و مێردەکەی خۆی دەکوژێ، جا کاتێک دەزانی تاوانی کردووە و پەژیمان دەبێتەوە، لە داخان خۆی بە دەریا دادەدات و سەروسینگ و مەمکە سپییەکانی وەک خۆی دەمێننەوە و نیوەکەی دیکەی دەبێتە ماسی. ئەزمیریش وەک ئەو حۆریەیە، سەر و سینگ و مەمکی لە دەریای ئیجە دەرهێناوە و پاڵی بە گابەردێکی زل داوە و بەشەکەی تری لە ناو ئاوە شین و ساردەکەیدا، ڕووچووە. جوانەکانی ئەو شارە حەقی خۆیانە شانازی بە جوانیی خۆیانەوە بکەن، جگە لەوەی ئەزمیر سێیەمین شاری تورکیایە، نەزارگە و بنە و هەواری جوانترین سەیرانگا و هەوارگە و میوانخانەیە. کافتریا و چێشتخانە و هۆتێل و مۆزەخانە و شەقام و پارک و باغ و دارستانە زۆرەکانی تابڵێی جوانن. چیای بوزداغ و قابوسیش، بە بەفر و سەوزایی و دیمەنی خۆیانەوە، هێندەی دی شارەکەیان بە ناز کردوە. زۆربەی ئاسارەکانی، پاشماوەکانی بەرهەمی دەست وپەنجە ڕەنگینی دانیشتوانی چەند هەزار ساڵەی ئەو شارەن. تاوەری دەمژمێرە (٢٥) مەتر ـ بەرزەکەی ناوەندی شارەکە، دیاریی فەڕەنسییەکانە بە بۆنەی دانیشتنی سوڵتان مەحمود لەسەر تەخت. بۆ خۆشیان تورکەکان تەقسیرییان نەکردوە لە ڕازاندنەوەیدا، ڕاکێشانی گەشتیار و میوان، ئیمڕۆ هونەر و زانستیی دەوێ. حەشیمەتی شارەکە پتر لە (٤) ملیۆن کەسە.

چونکی، ئێمەمانان، لەوەتەی چاومان کردووەتەوە، کوشتەی ژێردەستەیی و زوڵم و ستەمی داگیرکەرانین و هەست بە موعانات و ژان و فرمێسک و هەنسک و خەونی

نەتەوەکەمان دەکەین، کە دەشچینە شوێنێک، هەر چاودەگێرین و عەودالّی بینینی هاوزمانێکی خۆمانین. خۆ حاجی قادری کۆیی ناهەقی نەبووە کە خۆی لاواندووەتەوە:

**لە ڕۆما کەوتە بەر چاوم کەسێکی هائیم و حەیران**
**بە هەیئەت تیی گەییم کوردە بە شێوەی ئەهلی کوردستان**
**کە چوومە خدمەتی پرسیم: برادەر خەڵکی کام جێگای؟**
**لە کام لا هاتوویی؟ گریا، گوتی: بابان! گوتم: بابان؟**

ئەگەرچی ئەو شارە زۆر دوورە لە کوردستانی باکوور، بەڵام چونکی ئەتاتورکەکان هەردوای جینۆسایدکردنی ئەرمەنەکان دەستیان کرد بە کووشتن و ڕاگوێزانەوەی کوردەکانی باکوور بۆ باشوور و باشووری ڕۆژاوای تورکیا، بە هەزاران کورد بە ناچاری لەو شارە و گوند و دێیەکانی نیشتەجێ کران. جا هەر حەماڵ و بۆیاغچی و کارکەرێکت لە هوتێل و گەراج و چێشتخانەکان لەو شارە دی، ئەوە بزانە کوردە. حەماڵەکان کە زۆربەیان گەنجی نەخوێندەوارن، قەرتاڵەیەکی درێژکۆڵەیان لە پشتی خۆیان بەستووە، شتومەکی خەڵکی پێدەگوازنەوە، لەو شەقام و بازاڕ و شوێنە قەڵەباڵغانە دێن و دەچن، هەر شتێکت بەدەستەوە بێ، دێن لێت دەپاڕێنەوە تا پێیان بگوازیتەوە و دوو لیرەیان بدەیتێ. ئەوانیش کە کوردێک دەبینن شاگەکە دەبن لە خۆشیان، وەک دەڵێن خوێن دەبزووێ. لەپێش دوکانی میوەفرۆشێک، کابرایەکی بنیسی گەڵەگەت، دیار بوو گوێ لێ بووە لە گەڵ خوشکەکەم بە کوردی دەدویم، بە ئەسپایی سەری خستە بن گوێم و گوتی؛ "کورمانجی؟"

ئەوجا بانگی کردینە سەر دوکانەکەی خۆی و بەدەم بەڕێکردنی مووشتەرییەکانییەوە، کاو کاوە ئاوڕێکی لێدەداینەوە و هەر دەیگوت:"بان چاڤی من هاتن.." بە تەقییەوە نەکۆ کەس گوێ لێبێ، زۆر قسەی بۆکردین و ئامۆژگاری کردین، کە بە ڕوواڵەتی ئەو بازاڕە خۆش و قەڵەباڵغە هەڵنەخەڵەتێین، باخەڵبڕ و قۆڵبڕ و دز یەکجار زۆرن، بێشەرم جانتا و جیزدان لە دەستی پیاو دەفڕێنن. پێیگوتین، دوای سەر لە ئێوارە، نەکەن بچە شوێنی چۆل و دوورە ئاوەدانی!

ناوبازاڕ و قەیسەرییەکانی ئەزمیر، کە ژمارەیان زۆرە، یەکجار خۆشن، پێدەچێ سێ-چوار سەدە کۆن بن. بە درێژایی ڕۆژ مۆنجەیان دێ، هەموو زمان و ڕەگەزێک لەوێ دەبینی، زۆربەیان گەشتیار و گەریدەن.

بەیانییەک، تازە دوکان کرابۆوە، بە تەنیا بووم، بۆ کڕینی کراسێک چوومە سەر دوکانێک، کیژۆڵەیەکی ناسک سەرپەرشتی دەکرد. هیچم بە دڵ نەبوو، کە ویستم بڕۆمەدەر، کیژۆڵەکە ڕێی لێگرتم و بە تورکی هێندێ قسە کرد. من هیچی لێ حاڵی نەبووم. کە دیسان ویستم بڕۆم، قۆڵی گرتم، بە ئاماژە، پێگوتم کە نابێ بڕۆم، هەر بە تورکی قسەی دەکرد. هەرچەند پێم دەگوت کە من تورکی نازانم، بە کوردی، عەرەبی، ئینگلیزی پێم بڵێ چیت لێم دەوێ، بێسوود بوو! کیژە، دوکاندارێکی دیکەی بانگ کرد، دیار بوو پێگوت ئەوە عەرەبی و ئینگلیزی دەزانێ. کابرا دەستی گرتم و لەگەڵ خۆی بردمی بۆ کۆلانەیەکی دیکە، بۆلای دوکاندارێکی خەڵکی سووریا. ئەوجا، ئەو حاڵی کردم، کە دەبێ، بچمەوە سەر دوکانی ئەو کیژە، یان شتێک بکڕم، یان بڕێک پارە، هەرچەندێک بێ، فڕێ بدەمە سەر زەوییەکە، وەک سفتاح. ئەگەر ئەوە نەکەم، ئەو ڕۆژە بۆ دوکاندارەکە ڕۆژێکی بێ خێر و بەرەکەت دەبێ. ئەوا کەلتووری ئەو شارەیە. جا کە چووینەوە لای کیژەکە، بێبەختی، هیچ خووردەم پێنەبوو بۆی فڕێدەمە سەر دوکانەکە، ناچار پشتێندێکی قایشم لێکڕی و خۆم دەرباز کرد.

ئێمە ڕۆژی(١٨)ی ئاب، گەیشتینە ئەزمیر، بڕیار بوو دوای دوو ڕۆژی دیکە، کەشتییەکەمان لە بەندەری ئەوێوە بەرێکەوێ بەرە و تەرابلس. کە لە کوردستان بووین، چەندان جار تەلەفۆنمان بۆ نووسینگەی هێڵی دەریایی لیبیا دەکرد لە ئەزمیر، تا دڵنیابین لە وادەی سەفەرەکە، چونکە مانگێ یەکجار کەشتی لە لیبیاوە سەفەرێک بۆ ئەزمیر دەکات و هەر چەند کاتژمێرێکیش لە بەندەرەکە دەمێنێتەوە، پێرانەگەی، دەبێ تا مانگێکی دیکە چاوەڕێ بکەی.

هەموو جارێ، بۆ تەلەفۆن کردن، لە کۆیەوە دەهاتمە هەولێرێ. لەگەڵ ڕاپەڕین هێڵی تەلەفۆن لە کوردستان نەما، هەر زوو هەرچی وایەر و ستوونی تەلەفۆن هەبوو لە نێوان شارەکان، فەرهودکران، یان توێندرانەوە یان ئاوای ئەودیوی سنوور کران. کەلوپەل و کەرەستەکانی پۆستەخانەکانیش لە ئامێر و دەزگا و شتومەکەکان، بە دەرگا و پەنجەرشەوە،

وەکو هی هەمووە فەرمانگەکان، هەر ڕۆژی یەکەم هێزی (ئاڕ ئاڕ: هێزی ڕاوڕووت) پێچایەوە و فەرهودی کردن.

گەرچی سێ ساڵ بەسەر ڕاپەڕین تێپەڕی بوو، بەڵام حکوومەتی هەرێم هیچ کارێکی بۆ بونیاتنانەوەی ئەو فەرمانگە خزمەتگوزارییانە نەکردبوو. لە هەموو هەولێر، هەر لە ساختمانە زەبەلاحەکەی جەلیل خەیات، بن قەڵاتێ، چەندان کشکی پۆستی ئەهلی کرابوونەوە، بە سەدان خەڵک نۆرەیان دەگرت تا دەستت بە تەلەفۆنێک ڕادەگەیشت. خەڵکەکە، بە گشتی، زۆر دەستکورت و بێدەرتان بوون، چاویان لەو کۆمەک و یارمەتییە بوو کە کوڕ و کچەکانیان لە هەندەران بۆیان دەناردنەوە. ئەمن پێش سەفەرەکە، پەیوەندیم لەگەڵ ئەو نووسینگەی هێڵی دەریایی لیبیا کرد، لە ئەزمیر، تێمگەیاندن کە من لە عێراقەوە تەلی بۆ دەکەم . بۆیە دەبێ مەوعیدەکەم بە سەعات و بە ڕۆژ بدەنێ.

لە ئەزمیر، بۆ سبەینێ، بەرەو نووسینگەی هێڵی دەریایی لیبیا بەڕێکەوتین. حەزمان کرد، هەر بەدەم پیاسەکردنەوە بچینە ئەوێ گەرچی شوێنکە نزیکیش نەبوو. خوشکەکەم، ئەوێی پێدەزانی و پێشتر پلیتی سەفەری لەوێ کڕیبوو. دەم کۆرنیش و کۆڕنیش ڕۆیشتین، شەقام و باغ و کەناری دەریا، هەمووی یەک لە یەکێ جوانتر و خاوێنتر و دڵگیرتر بوون. نووسینگەکە، کە یەک چاوە دوکانی شووشەبەند بوو، لە خۆشترین و گرانترین شەقامی دەم کۆڕنشینەکە بوو. ئەوەی سەرنجی ڕاکێشام، هیچ تابلۆ و نوسینێکی بەسەرە نەبوو، ئەگەر دوو وێنەکەی پاپۆڕی سەر شووشەبەندەکە نەبووایا، کەس نەیدەزانێ ئەوە نووسینگەی هێڵی دەرییایە. خۆ ئەگەر وێنەکەی قەزافی لە ژوورەوە بە دیوارەکەوە نەبووایا، کەس نەیدەزانێ ئەوە هی لیبیایە.

کە چووینە ژوورە، سەلامان کرد و لە سەر قەنەفەیەکی کەشخە بەرانبەر کابرای نووسینگەکە دانیشتین کە خەریکی گۆڤارێکی بەردەستی بوو. دووسێ قوومە جگەرەکێش بوو دانیشتبووین، ئەو کابرایە قەت سەیرێکی ئێمەی نەکرد. بۆیە خوشکەکەم، پێیگوت، ئێمە هاتووین، دوو پلیتی تەرابلسمان دەوێ. سبەینێ گەنگینیش کەشتییەکە بەڕێ دەکەوێ؟

کابرا، کە زەلامێکی کورتە بنەی تێکچەقیووی سەروڕیشی ماش و برنج بوو، چاویشی نەختێ خێل بوو، سەری هەڵبڕی و بە نەرمی گوتی:

ــ پلیتمان نییە!

یەکسەر خوشکم ڕەنگی گۆڕاو، خێرا گوتی:

ــ بۆ؟ یانی پلیت نەماوە؟ هەمووی فرۆشراوە؟

ــ نا، جارێ سەفەرمان بۆ تەرابلس نییە!

خوشکم، بە شلەژاوی و بە دەنگێکی پچڕ پچڕ گوتی:

ــ ئەدی براکەم، تەلی بۆ نەکردی و نەتگوت، (١٨) ی مانگ سەفەرەتان هەیە بۆ تەرابلس؟

بەبێ ئەوەی، تەماشای کەسمان بکات و زۆر بێباکانە گوتی:

ــ الله غالب...، کەشتیەکەمان سەفەرێکی بۆ ئیتاڵیا کەوتووەتە بەرێ، دوای ئەو سەفەرە بەرەو ئێرە بەڕێ دەکەوێ.

ــ یانی کەی ئێمە سەفەر دەکەین؟ چەند ڕۆژی دی؟ ئێمە دەوامان هەیە لە زانکۆ، دەبێ لە کاتی خۆی لەوێ ئامادە بین!

ــ الله غالب... منیش نازانم، کەی سەفەر دەکەن!

منیش، بە کابرام گوت، ئەدی تۆ خۆت بەمنت گوت. (١٨)ی مانگ، دەنگی تۆ بو کە قسەی لەگەڵ کردم.

دیسان کابرا گوتی:

ــ الله غالب!

خوشکم نوقورچەیەکی لێدام، بۆ ئەوەی هیچی دی قسان نەکەم. هەدووکمان بە عێدزی هاتینە دەرێ.

لەبەر دەرگای نووسینگەکە، لە خوشکم پرسی:"الله غالب" یانی چی؟ خەبەرێکی خۆشی پێیە؟ ئەو کابرایە هەر دەیگوت: 'الله غالب"!

ئەمە یەکەمجارم بوو لە ژیانم، لەگەڵ کەسێکی لیبی دانیشم و قسە بکەم.

خوشکم، قورگی گیرابوو، لە مەراقان قسەی بۆ نەدەکرا. عادز و مەلوول بەرەو هوتێل گەڕاینەوە، ئەو ئێوارەیە، لە خەمان نانمان بۆ نەخورا.

خوشکم کە (٣)ساڵ بوو لە بەشی فیزیک لە کۆلێژی زانستەکانی زانکۆی فاتیحی تەرابلس مامۆستا بوو، شارەزای ڕەفتار و هەڵسوکەوت و داب و نەریتی لیبییەکان ببوو، دەیزانی کە ئەوان بە زەحمەت پابەندی وەعد و بەڵێن دەبن، هەر خودی ڕەوەشتی

دەشتەکی و کۆچەری وایە، چونکە لەو دەشت و دەر و سارایە، پێویستی بە پابەندبوون نەبووە بە ڕۆژ و بە سەعات و بە دەقیقە. بۆیە خوشکم ترسی هەبوو ئەو سەفەرە هەر نەکرێ، یان دەبێ تاکو مانگێکی دیکە چاوەڕێ بکەین!

لیبییەکان، لە ئاخاوتندا، هەموویان ڕستەی" الله غالب" زوو زوو بە کار دەهێنن. بە کوردییەکەی واتا "کاری خودایەوە، هیچ دەسەلاتێکمان نییە". ئەوان ئەو گوتەیە دەڵێنەوە کە کارێک یان شتێک ڕوودەدا: نشووستییە، کەوتنە، ناخۆشییە، زەرەوزیانە، بەدبەختییە، نەهامەتییە، سەرنەکەوتنە، یان بۆ خەون و هیوایەک نە هاتۆتەدی. ئەمەش لە قورئاندا هاتووە: "وَاللَّهُ غَالِبٌ عَلَىٰ أَمْرِهِ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ"

دەستێکمان کەوتە پێش، دەستێکمان کەوتە پاش. دەمێنینەوە، نازانین هەتا کەی! دەگەڕێنەوە، دوور نییە چوار پێنج ڕۆژی دی کەشتییەکە بگات. دوابریارمان ئەوەبوو، با چاوەڕێ کەین، بزانین قەدەر چۆن دەبێ.

ئەوەی ڕاستی بێ، ئەمن بە خەونی شەوانیش نە لیبیام لە خەیاڵ بووە، نە قەت بەرنامەی بەجێهێشتنی کوردستانم لە بیر بووە.

- ئەدی ئەوەنییە، سەفەر دەکەی؟!

ئەوەی زۆڵە کوردی بەعسی، لە کۆیە بە منی کرد، مەگەر هەر با بە دەواری شڕی کردبێ! جا سەیرەکە لەوەدابوو، کە ئەوەی دەرگای دۆزەخی دەخستە سەر پشت بۆم، پیاوانی بەعس، خۆیان نەبوون، مامۆستا بەعسییە کوردە هاوشار و ڕەفیقەکانی خۆم بوون.

ئەوەی من دیتم، بەعس بە هەموو هێز و چەک و چۆڵ و جەبەرووتی خۆیەوە، ئەو گوند و لادێ و شاخ و داخەی دەسووتاند و خەڵکی کووشت و بڕ دەکرد، بەڵام لە شاردا، ئەگەر بۆ خۆت بزێوی و چالاکی و دوژمنایەتیی وانت نەکردبایە، یان کوڕی باش، ڕاپۆرتی لێنەدابایت و بۆی تێنەکوشیبای، ئەوان دەخلیان بەسەرتەوە نەبوو.

لە ئەزموونی ژیان فێربووم، کە قەت هیچ شتێک بە قەد حەسوودی و ئیرەیی، مرۆڤ ناکاتە دڕەندە و چاوی کوێرناکات و نزیکترین و بە ئەمەکترین دۆست و هاوڕێی خۆت، لێناکاتە دوژمن. دوژمنێک لە جامی کەلـلەی سەرتدا ئاو بخواتەوە، نەڵێ ئۆخەی!

جا خۆ منی کەڵاش خواری شانداتەپیوو، هیچ شکتیکم شک نەدەبرد، وابکات ئەو کوڕە باشانە حەسوودیم پێببەن و لیم ببن بە بەکرە شۆڤار. جگە لەو خۆشەویستییە نەبێ کە لە نێوان من و خوێندکار و باوانەکەنیان، وەک بارانی پەڵە بەسەر دڵ و دەروونی ئەو شارەدا باریبوو. ئەوان چاویان بەو خۆشەویستییە و بەو پەیوەندییە پاکە خوداوەندییە هەڵنەدەهات. جا کە بینیان شیکایەت و شکاندنەوە و درۆ هەڵبەستن لە لای بەڕێوەبەر و سەرپەرشتیاران سوودی نییە، کەوتنە هارکردنی پیاوانی ڕژێم لە دژم و چەندان چاڵی پڕ مینیان بۆ هەڵکەندم.

بەڵام من بووم بە کێوی باواجی و نەڕووخام و نەبووم بە بەعسی. لە قوتابخانەکەم، دواناوەندی کۆڕانی کۆیە، شاربەدەریان کردم و وەدەرەویان نام، هەر بۆ ناوزڕاندنم، وەک یاریدەدەر، گوازترامەوە بۆ قوتابخانەی ناوەندی سەرباغ، بۆ ئەوەی نیشانی خەڵکەکە بدەن کە بووم بە بەعسی، چونکە ئەوەی بەعسی نەبووایا، ئەو پۆسەتان پێنەدەدا. بەڵام، من دەقەی یەکەم، بە دەستەی مامۆستایانم گوت، من یاریدەریی بەعسی نیم. ئەم پۆستەیان، پێرەوا بینیووم.

هەر بۆ دەربازبوون لەدەست ئەو مامۆستا سەگ وسوارە بەعسییانە، فۆڕمیساڵانەی گواستنەوەم بۆ هەولێر پڕ کردەوە. سەرەتای ساڵی خوێندنی نوێ، ناوم لە پەیمانگای ناوەندی مامۆستایانی هەولێر دەرچوو. کە چووم دەستبەکاربوونم بنووسم، بەڕێوەبەرەکەی لێی پرسیم:

ــ دەرەجەی حیزبیت چییە؟

ــ دەرەجەی چی و حیزبی چی؟

ــ ئەدی تۆ لە هاوڕێیانی حیزبی بەعسی ئیشتراکی نی؟

ــ نەخێر، من مامۆستایەکی بێلایەنم!

ــ ئەها...! کەواتە دیارە تۆ بە هەڵە بۆ ئێرە گوازتراویتەوە. ئێرە قبوڵ خاصە. بەعسی نەبیت، ناتوانی لێرە دەرس بڵێیتەوە. باشە، کە ئێرەت پێ خۆشە، بۆ فۆڕمێک پڕ ناکەیتەوە و نابیت بە حیزبی، تا دەستبەکاربوونەکەت بۆ ئیمزاکەم؟

ــ ببورە، من ئەوە دەزانم. من لە فۆڕمی گواستنەوە، داوای ئێرەم نەکردبوو، ئەوا بەڕێوەبەرایەتیی پەروەردە بۆ ئێرەی ناردووم!

زوو سەری زمانی خۆم گەست، لە دڵی خۆمدا گوتم، ئەو ماستە سەرە پەتێکی تێدایە. توومەز، وایان دانابوو، مەقام و مووچە و ناوبانگی (پەیمانگە) هی ئەوە نییە پیاو لەقیس خۆی بدا، زۆریش واستەی گەورە گەورە دەکەن و ناگەنە ئەو شوێنە. زووتێگەیشتم کە ئەوە چەشتەی سەر قولابەکەیە بۆ ڕاوکردنم.

دوو ڕۆژی پێنەچوو، ناوم بۆ قوتابخانەی ناوەندی (عێراق المنتصر) لە گەڕەکی عەسکەری ـــ نەورۆزی ئێستا، دەرچوو. ساڵ سوواراپەوە، دیار بوو، مامۆستا نازم ئەدهەم، بەڕێوەبەری ئامادەیی کوردستان لە هەولێر، ناوی بیستبووم، ئەو ئامادەیە، ئەو کات، بە ناوبانگترین ئامادەیی بوو، لەسەر ئاستی کوردستان. لەسەر داخوازیی ئەو، ڕاژەم گواستەوە ئەوێ. پاش دووساڵان، کە ڕاپەڕین کراو و کوردستان ئازاد بوو، هەر ساڵی یەکەم فرمانی گواستنەوەم بۆ پەیمانگای ناوەندی مامۆستایان هەولێر دەرچوو، ئەوکات مامۆستا حاجی محێدین ئەسعەد غەفووری، بەڕێوەری ئەوێ بوو.

جا من سەفەری لیبیام لە خەیاڵ نەبوو، چونکە لەو زیقەتی و گرانی و ڕۆژگارە سەختەدا، جگە لە پەیمانگە لە زانکۆی سەلاحەددینیش وانەبێژ بووم، ئاواتی هاوژینم، لە بەڕێوەبەرایەتیی کارەبای هەولێر فەرمانبەر بوو، لە ساڵی (١٩٩٠)یشەوە دوکانێکم لە تەیراوە کردەوە بە ناوی (کلیلسازیی ڕەسەن)، کە بازاڕێکی باشی هەبوو، ئەو پیشەیە لە باوکمە فێربووم. ئۆتۆمبیلی خۆشم هەبوو، هەر ئەوەندە بوو کرێچی بووم. بەرنامەی سەفەرەکەش هی من نەبوو، پێش مانگێک، کە ئەو خوشکەم بۆ پشوو گەڕایەوە کوردستان، پێگوتم:

ـــ فازیل، من پۆستێکی باشم لە کۆمپانیای نەوتی لیبیا بۆت پەیدا کردووی و گرێبەستییەکەم هەیە. دەڵێی چیی؟ بۆ نایەیت، گەر بە دڵت نەبوو بگەڕێوە؟

گوتم، من هیچ زانیارییم نییە، گرێبەستی چی؟ چۆنە؟ چیدەکەم لەوێ؟

گوتی:

ـــ کوڕی وەزیری ناوخۆی لیبیا، لە لای من خوێندکارە لە زانکۆ، باوکی دەناسم، لە شوێنێک، بە هەڵکەوت، لە ڕێگەی ئەو وەزیرە، تەعارفم لەگەڵ بەڕێوەبەری کۆمپانیای نەوتی زاوییە کرد. پێمگوت، برایەکم هەیە، مامۆستای ئینگلیزییە، بیهێنمە ئێرە، کاری دەست ناکەوێ؟ ئەویش گوتی، ئێمە بۆ خۆمان بەدوای موتەرجیمی ئینگلیزی دا

دەگەڕێین. با بێ، لای خۆم دادیدەمەزرێنم و خانووی ئامادەکراوی بە ناوماڵ و کەلوپەلەوە دەدەینێ، جگە لە مووچەیەکی باش.
خوشکم گوتی: خانووەکانیان کەوچکی چاشی تێدایە، پێویستییتان بە هیچ شتێکت نابێ.
منیش گوتم، وەڵامت دەدەمەوە، دیار بوو خێزانم و خزمانی نزیک، بیرۆکەی سەفەرەکەیان پێ خراپ نەبوو.
چەند حەفتەیەک پێش ئەوەی ئەزموونەکانی کۆتایی ساڵ، لە پەیمانگە، تەواو بێ، ڕۆژ بە ڕۆژ بارودۆخی شاری هەولێر گرژتر و ناخۆشتر دەبوو، خەڵک هەمووی دەستی لەسەر دڵێ بوو، ئەو ڕۆژگارەیان ناوی لێنابوو، سەردەمی شەڕە پەڕۆ، ناخۆشیی نێوان پارتیی دیموکراتی و یەکێتیی نیشتیمانی لە چاوسوورکردنە و پلارتێکگرتن دەرچوو بوو. هاوار هاواری ڕادیۆ و تەلەڤزیۆنەکانیان، لە خوێندنەوەی بەیاننامەی جەنگ دەچوو. پاشنیوەڕۆیان تا درەنگانی شەو، بە سەدان ئۆتۆمبیلی پڕ چەکدار، بەشەقامە سەرەکییەکانی شاردا دەسووڕانە و هوتافیان لێدەدا و ئاڵای زەرد و کەسکی خۆیان ڕادەوەشاند. جا کە دوو کاروانی ئەو ئۆتۆمبیلە نەیارانە، بەلای یەکدی تێدەپەڕین، دەتگوت ئێستا نا ئێستا دەبێتە داستانی شەڕگەی واترلۆ... .
بەیانییەکی زوو کە بۆ دەوامکردن گەیشتینە پەیمانگە، بینیمان، دار و دیوار و تەیمان و دەرگای پەیمانگەکەمان، شەوەکەی، هەمووی بە ڕەنگی زەرد، بۆیەکراون. ئەو ڕۆژە بارودۆخی نێو پەیمانگە شلەقاو و شلەژاو بوو، کەس نەیدەزانێ چ دەقەومێ. بۆ سبەینێ کە هاتینەوە، بینیمان ئەوە جارەی دار و دیوار و شوورەکەی، شەوەکەی، هەمووی بە ڕەنگی کەسک، بۆیە کراوە. ئەوجارەی، بە نوێژی نیوەڕۆیە بۆیاغچیان هێنا و دارو دیوەرکەیان، بە ڕەنگی قەدیمی خۆی بۆیە کردەوە. نازانم، ئەو ڕۆژی بۆنەیەک هەبوو، لە گۆڕەپانی پەیمانگە بووە شایی و هەڵپەڕکێیەکی گەورە. نزیکەی (١٥٠٠) خوێندکارمان هەبوو جگە لە مامۆستاکانی ئەو هەموو بەشانەی پەیمانگەکە. هێندەی پێنەچوو، لەسەر سەرچۆپیگرتن، بووە ناخۆشی، دیار بوو خوێندکارێک بە تەزبیحی کەسکەوە سەرچوپی گرتبوو. بووە شەڕ و دەمانچە دەرهێنان و پشێوی، بۆیە خوێندکارەکانیان وەدەرەوە نا و دەوام تێکچوو و دەرگای پەیمانگەیان قوفڵدا. کە سبەینێ هاتینەوە دەوام، گوتیان بابچینە سەردانی مامۆستا عەلی جوکڵ، کە مامۆستای بەشی ئینگلیزی بوو لەگەڵ ئێمە. چونکە

شەو، چەند چەکدارێک ئەویان فڕاندبوو و لەو دەشت و دەرە حەسیرمەیدانیان کردبوو و نیوە ڕۆح بەجێیان هێشتبوو! ئەو هەواداری پارتی بوو. بۆ ڕۆژی دواتر، گوتیان بابچینە سەردانی مامۆستا کاکەخان نەسرەدین، کە هەواداری یەکێتیی بوو، شەو، چەند چەکدارێک، ئەویشیان فڕاندبوو و لە سەر ڕێی کەسنەزان، دوای دارکاریکردنی، نیوەڕۆح، لەو چۆلەوانییە فڕێیان دابوو.

ڕۆژانە، باسوخواسی ئەو ڕووداوانە، بە درێژی و بە زمانی زبر، لە ڕۆژنامەکان بڵاودەکرانەوە و لە ڕادیۆ و تیڤییەکان، یەکتریان پێ تاوانبار دەکرد. ئەوەبوو بە هەوڵ و هیمەتی چەند مامۆستایەکی دڵسۆز، خۆپیشاندانێکی گەورەمان ڕێکخست و چووینە بەر دەرگای پەرلەمان، داواکاریمان ئەوبوو، کە ئەو شەڕە پەڕۆیە ڕاگرن و بە گفتوگۆ و ئاشتییانە کێشەکان چارەسەر بکەن و پەیمانگەکەمان نەکەنە شەرگەی ئەو دووبەرەکی و ناخۆشییە. بۆ ماوەیەکی زۆر لە بەردەرگای پەرلەمان ڕاوەستاین، کەسێک نەهات داواکارییەکانمان لێ وەربگرێ. ناچار مامۆستا حاجی محیدین، سەرۆکی پەیمانگە، بۆ خۆی داواکارییەکانی بردە ژوورە و بەڵام هەر بێ سوود بوو.

تا دەهات ڕۆژەکان و ڕووداوەکان ناخۆشتر و ترسناکتر دەبوون، لە کۆیە و قەڵادزێ، لە نێو گەنجاندا، لەسەر شەر پەڕۆ، بووبووە شەڕەچەقۆ... . سەر لە ئێوارەوە دەبووە تەقە.... کەس نەیدەزانی چییە و چ ڕوودەدا ...!

جا چونکێ ڕێگای تورکیا و قامیشلۆ کرابۆوە، بە ئاشکرا، قاچاغچییەکان بە ئۆتۆمبیلی خۆیان لەسەر سنوور ڤیزەیان بۆ وەردەگرتی و دەیانپەڕاندییەوە، ئەو خەڵکەی کە دەیەوێست دەرچێ، ڕۆژ بە ڕۆژ ژمارەیان لە هەڵکشان بوون دابوو.

بەرنامەی ئەو سەفەرەم لە لای دۆستێکی زۆر ئازیز و وەفادار باس کرد، کە لە یەکێک لەو دوو حیزبە، پێگەیەکی باڵای هەبوو. ئەو بڕیاردانی سەفەرەکەی دایەوە دەست خۆم، بەڵام گوتی، من لە جێگەی تۆ بم، سەفەرەکە دەکەم، دەست لە دوکان و ماڵەکەم نادەم و مۆڵەتی وەزیفەکەم وەردەگرم، بە تەنیا دەچم، بە دڵم نەبوو دەگەڕێمەوە. ئەوەش بزانە، هەڵگیرسانی شەڕ، حەتمییە و پیلانێکی ئیستراتیژیی ئەو دوو حیزبەیە، هەر دەبێ ڕووبدا.

هەرچەندە لە پەیمانگە و لە زانکۆی سەلاحەددین ــ کە وانەبێژ بووم، نووسراوی فەرمییان بۆ کردم کە ئەوە پیشە و وەزیفەی منە، بەڵام نەمتوانی مۆڵەتی سەفەری ساڵێک،

لە پەیمانگەی مامۆستایان، وەدەست بێنم. قسە لە زارەکی دەکەوێتە شارەکی. هەموو مامۆستا و خوێندکارانی پەیمانگە بە بریاری سەفەرکردنی منیان زانی.

پاش عەسرێکی، لەسەر دوکانەکەم بووم، لە تەیراوە، هێندەم زانی کیژۆڵەیەکی ناسک و نازداری تورکمانی سەر بە لەچک، کە خوێندکاری خۆم بوو لە پەیمانگە، هاتە ژوورە و دوای سڵاو و هەواڵپرسینێکی گەرم، گوتی:

ــ مامۆستا، ئەو دیارییەم بۆ هێناوی، بەڵام دەبێ بەڵێنم پێبدەی، کە تا هەمیشە لە لای خۆت دەیپارێزی ــ لە نێو جانتایەکەی شانی، شووشەیەکی بچووکی دەرهێنا گوڵێکی سووری لەناو دانابوو، منیش لێم وەرگرت و سوپاسم کرد. ئەوجا گوتی:

ــ بیستوومە سەفەری دەرەوە دەکەی، ڕاستە؟

ــ بەلی، ئەو نیازەم هەیە.

بە ئاوازی دەنگێک و سیمای ڕوخسارێکی زۆر جیاواز و سەرنجڕاکێش، وەک ئەمر کردن، گوتی:

ــ سەفەر ناکەی!

یەکسەر هەستم کرد، کە ئەو کیژۆڵەیە، شتێکی لە دڵی خۆیدا گرتووە، هەرچەندە، لەو دوو ساڵەی کە دەرسم پێداوە، نە بە گوفتار نە بە ڕەفتار هیچ ئاماژەیەکم لێ نەبینیبوو، جێگەی سەرنج بێ. ئەوجا گوتی:

ــ دەزانی ئەو دوو ساڵە، تۆ چەندە ئازاری منت داوە؟

ــ من؟ ئازاری تۆم داوە؟ تۆ وەک هەموو خوێندکارەکانم، ڕێزت لێگیراوە، چۆن ئەو تۆمەتە دەخەیتە گەردنی من؟

ــ مەبەستم ئەوەیە ئازاری دڵت داوم. ئێستا جوابم دەوە، بریارت داوە هەر بڕۆی؟

ــ ئیحتیمالی سەفەکردنم زۆرە. قەدەریش لەدەستە مندا نییە!

ڕەنگی بە شێوەیەک گۆڕا، ئاگر لە چاوانی هەڵدەستا، پێش ئەوەی ڕووی وەرگێڕێ و بچێتە دەرەوە، بە دەنگێکی غەریب گوتی:

ــ دەی، لۆ خاتری قورئانی کەریم، سەفەری خێرێت نەبێ!

که گەڕامەوە ماڵەوە، ئەوەم بۆ ئاواتی گێڕایەوە، وەک شێتانم لێهاتبوو، شەو دوو سێ جار لە خەو ڕاچەنیم، هەرچەندە ئاوات دڵی دەدامەوە، بەڵام لە ناخدا، ترسێک دەیهەژاندم. دەبێ خودا دوعای ئەو کیژۆڵەیە قبوڵکا؟ باشە، ئەو کچە، بۆ وای کرد؟!

ڕۆژی دواتر، دیسان دەمەوە عەسرەکەی، لەسەر دوکانەکەم خەریکی ئیشکردن بووم و قسەکانی ئەو کیژۆڵەیەش هەر لە گوێم دەزینگایەوە، هێندەم زانی، لەپێش دوکانەکەم و لە کۆڵانەکان، بووە تەقە و قرمژنی کلاشنکۆف و دەمانچە. قلیشایەوە و بووە هاڵاتن و خۆشاردنەوە، ئەمن لە گۆشەیەکی دوکانەکە لەسەر چینچکان دانیشتم. کە دونیا هێوربۆوە و خەڵکەکە کردیانە قۆمرغانە و پشێووی، دیتم لەسەر عارەبانەیەکی درێژی دووتاییەی ئۆتۆمبیل، حەمباڵێکی لاوازی تەمەن سەرووی پەنجا ساڵان، کە لەبەر سیبەر، لەسەر عارەبانەکەی خەوتبوو، هەردوو دەستی لە ژێر سەری خۆی دانا بوو، گوللەیەکی بەسەر دڵی کەوتبوو، وەک نووستبێ وابوو، ئەگەر خوێنە سوورەکەی لە عارەبانەکە نەچۆڕابایەوە، کەس نەیدەزانێ، ئەو زەلامە کوژراوە. ئەو عەسرە، باندێکی چەکدار، گەف لە دکتۆر ئیبراهیم تایەراغا دەکەن و داوای پارەی لێدەکەن. ئەو عیادەکەی هەر دە مەترێک لە منەوە دووربوو، لە کۆڵانەکی تەنگەبەر بوو. ئەو تەیراوەیە بە ناوی باپیرە گەورەی ئەو دکتۆرە ناونراوە. جا پاسەوانەکانی دکتۆر، لە باندەکە دێنە دەست و دەبێتە تەقە و چەکدارەکانیش بۆی دەردەچن ـــ ئۆتۆمبیلەکەشم دوو گوللەی پێکەوتبوو.

دیمەنی جەستەی ئەو حەماڵە بێگوناحە کوژراوە، بە جۆرێک لە مێشکمدا جێگیربوو، ئێستاش بە جۆرە خۆفێکەوە بەو جادەیەدا تێدەپەڕم و ئاواتەخوازم، کتوکت، عارەبانەکە و حەماڵە شەهیدەکە لە شوێنی ڕووداوەکە، وەک خۆیان بکەمە پەیکەرێک لەسەر شۆستەکەدا. خۆزگە!

هێندێ ڕێککەوت هەڵدەکەون، پتر لە خەیاڵ و فانتازیا دەچن، هەر لەو حەفتەیەدا، بەیانییەک، کە هاتمە بازاڕ، بینیم قوفڵی دوکانەکەم شکاوە، کە دەڕابەکەم هەڵداوە، سەیرم کرد مەکینەی کلیل کۆپیکردن، لەگەڵ هەرچی ئامێر و کەرەستەی بەکەلک و گرانبەها هەیە، دزراون. بۆ من ئەوە گورزێکی کوشندە بوو، نرخی مەکینەکە نزیکی (١٧٠٠) دۆلار بوو، ئەو بڕە پارەیە ئەوکات، لە گەڕەکی خۆمان خانوویەکی (٢٠٠) مەتر دووجای پێدەکرا. کڕینەوەی مەکینەیەکی دیکە بۆ من مەحاڵ بوو، بەبێ ئەو مەکینەش، دوکانەکەم،

وەک نانەواخانەی بێ تەندوور بووا کە چوومە پۆلیسخانە، بۆ ئەوەی خەبەری شکاندنی دوکانەکەیان بدەمێ، پاشکاتبەکە گوتی: تۆ ژمارە (١٤٦)ی. تا ئێستا (١٤٥) کەسی دیکە پێش تۆ هاتوون، کە ئەمشەو دوکانیان یان ماڵیان براوە، جارێ سەعات نە بووەتە (١١)، رەنگبێ تا ئێوارە، ژمارەکە زۆرتر بەرز بێتەوە. ئەو رووداوە دوای ئەو رۆژە بوو، کە بۆ یەکەمجار مام جەلال تاڵەبانی لە پێش پارێزگای هەولێر وتاری خوێندەوە و گوتی: دەستی دز و تالانچی و چەتە و رێگران دەبڕین و پارێزەری سەر و سامانی هاوولاتیان دەبین.

چونکە وەک گوێدرێژ، شەوانە ئۆتۆمبیلەکەم لە گەراجی ماڵەوە بە زنجیر و بە قوفڵ لە دینگەیەک دەبەستەوە، دووجار هەوڵیاندا بە نوێژینیوەڕۆ، ئۆتۆمبیلەکەشم لێ بستێنن، خودا دایەوە. ئەمە شتێکی ئاسایی بوو، رۆژ نەبوو نەڵێن، لە فلان شەقام، ئۆتۆمبیلێکیان لە خاوەنەکەی ساندووە و فیشەکێکیشیان بەسەریەوە ناوە. جارێکیان، کە شۆفیرەکە دەکوژن و ئۆتۆمبیلەکەی دەرفێنن، پیادەیەک بە تیچاوێک تەماشای باندە چەکدارەکە دەکا. یەکسەر گولـلەیەکیش بەو بەستەزمانەوە و دەنێن و لە جێی خۆی ساردی دەکەنەوە.

بارودۆخە شێواوەکە، سەری لەمنیش شێواند و سەفەرەکەم لە نیازە و بووە بریار، دەستم کرد بە راپێکردنی پسوولەی فەرمی سەفەرکردن بۆ دەرەوەی هەرێم. وابزانم هەشت نو فەرمانگا و دامودەزگای میرییان پێکردم، بۆ وەرگرتنی ئەستۆپاکی، هیچ فەرمانگەیەکیش نەبوو، شتێکت لێ هەڵنەکرێنێ، مووچە، کەم بوو، بووجە نەبوو، بەو شێوەیە پارە و باج و گۆمرگیان بۆ خۆیان کۆدەکردەوە. سەیرترین شت ئەوەبوو، لە بەڕێوەبەرایەتیی هاتووچۆ، باجێکی گەورەیان خسبووە سەرم وەک شۆفیری تاکسی. هەرچەند سوێند و قورئانم بۆ خواردن، کە هەرگیز لە ژیانمدا من ئۆتۆمبیلی تاکسیم نەبوو و قەتیش ئیشی تەکسیشم نەکردوە، بێهودە بوو. باجەکەم نەدابایە، ئەستۆپاکییەکەیان بۆ مۆر نەدەکردم و لە سنوور دەیان گەڕاندمەوە... گەندەڵی زۆر زوو چەکەرەی کرد لەو هەرێمەدا. دەیانگوت زۆر بە ئاسانی کلاوی عەلۆی لەسەر جەلۆی دەنێن. باجی کەسێکی دۆستی خۆیان، دەخەنە ئەستۆی کەسێکی دیکەی نەناسراوی بەستەزمان... !

لە زاخۆ لە رێی دکتۆرێکی خانەنشینی دانیشتووی ئەو شارە، کە پێشتر لە زانکۆ هاوپیشەی خوشکەکەم بوو، بە قالە قاچاغچیان ناساندین، تا ئاسانکاریی پەڕینەوەی سنوورمان بۆ بکات، چونکە پەساپۆرتەکەی من ڤیزەی تورکیای لەسەر نەبوو.

دەوری سەعات یەکی پاشنیوەڕۆ، لە زاخۆوە بە ئۆتۆمبیلی قالە قاچاغچی بەرێ کەوتین، کە گەیشتنە بازگەی ئیبراهیم خەلیل، پێنج مەترێک لە دووری بازگەکە ڕاوەستا و گوتی تۆ سەری خۆت لە نێو سەیارەکە نەویکە با کەس نەتبینێ. هەردوو پەساپۆرتەکەی لەگەڵ خۆی برد و هەر دە دەقیقەیەکی پێچوو، هاتەوە و گوتی "تەواو"، ئەوجا بەرەو سلۆپی بەڕێ کەتین، ئەلهەقی لەوێ ئێمەی گەیاندە تێرمیناڵ تا بەرەو ئەزمیر بەڕێبکەوین. کە پارەکەمان بۆ ژمارد و گوتمان فەرموو ئەوە (هەزار) دۆلار، بەڵام (٦٠٠)ی دۆلارەوە (٤٠٠)تەکەی پاوەندی ئەسترلینییە. یەکسەر قالە وەک فیشەکەشێتە بە ئاسماندا تەقیەوە و کردیە هاوار هاوار و گوتی، ئیلاو بیلا، حەقی خۆم هەموو بە دۆلار دەوێ. گوتمان کێشە نییە، چووینە لای هەموو صەڕافەکانی ئەو شارە، کەسیان پاوەندیان وەرنەگرت. قالە هێندەی دی شێت بوو. هیچ چارەمان نەما، گوتیان هەر لە بانک، پاوەند دەگۆڕدرێتەوە. ئەو ڕۆژە هەینی بوو. قالە ئێمەی بردە هۆتێلێک تا بەیانی سەعات (١٠) دەرگای بانکی سلۆپی کرایەوە، پارەکەمان کردە دۆلار و ڕادەستی قالەمان کرد و دەفنمان کرد.



وا بووە دە ڕۆژ لە ئەزمیر هەرچاوەڕوانی گەیشتنی کەشتیی لیبیاین و هیچ خەبەرێک نییە، دوو سێ جاران چووینەوە نووسینگەی هێڵی دەریایی لیبیا، کابرای چاو خێل هەر (الله غالب، الله غالب)ی بوو. دکتۆر کازمیش، هاوسەری خوشکم، لە تەرابلس، هەر هاتووچۆی بەندەری بوو لەوێ، سەییادی هەواڵێکی سەفەری ئەو کەشتییە بوو بۆ ئەزمیر.

ئەگەر لە دووسێ ڕۆژی یەکەمی مانەوەمان لەو شارە، خوشکم پەرێشان و بێئۆقرە و نیگەران دیاربوو، ئەوا من دوای ئەو دە ڕۆژە، داڕووخام و بەردەوام جۆرە مشتومڕێک لە نێوانمان ڕوویدەدا هەر لە شەڕ دەچوو. ئەمن پێداگریم دەکرد کە حەزدەکەم بگەڕێمەوە هەولێرێ و ئەو سەفەرم بەدڵ نییە، خوشکیشم دیگوت برۆوە، بەڵام هەر نەبێ، وەرە پارەی سەفەر و قالە قاچاغچی دەربێنەوە لە لیبیا. ئەوی تا ئێستا خەرجت کردووە و شتوکەکی دیکەت بخستبا سەرێ، خانووێکی ژێکەڵەی پێدەهات.

نەمدەویست، باعیزی ئەو داڕووخانەی خۆم بۆ خوشکم باس بکەم، ئەو خۆی بە چەپ و هەڵگری بیروباوەڕی پێشکەوتووخوازی کۆمەنیزم دەزانی و دژی کەلتوور و نەریتە کۆنەکانی ڕۆژهەڵات بوو. من لە هەرزەییەوە، باوەڕم بە قەدەر و چاو و نەفەس و دوعا و

تووككردن هەیە و شتیشم بە چاوی خۆم دیوە. بۆ یەک لەحزە، دوعایەکەی ئەو کیژۆڵە خوێندکارەی خۆم لەبیر نەدەچۆوە و هەرشتێ ڕووی دەدا، لە دڵی خۆم دەمگوت ئەو ئاهوهەناسەی ئەوە: باجی چوار ساڵ شۆفێریی تەکسییان بە ناهەق لێ بەردامەوە... قالە قاچاغچی بەو پەندی بردین... شەو کە لە سلۆپی ماینەوە تا بەیانی کارەبا کوژاوە و بە تاریکی شەومان بەسەر برد... لێرەش، کابرای لیبی هەر دەڵێ (الله غالب)، خودا دەزانێ چ بەدبەختییەکی دیکەش چاوەڕێمانە ... .

هەرچۆنێک بوو، ناچاربووم خۆم ڕادەستی قەدەر بکەم، خۆشکم پەساپۆڕتەکەمی لەلای خۆی گلدابۆوە، نەیدەدامەوە.

لە ئێوارەی چواردەمین ڕۆژ، کەشتییەکەی لیبیا گەیشت و ڕۆژی دواتر بارو بارگەمان تێکنا و دوای نیوەڕۆ لە بەندەری ئەزمیر چاوەڕوانی سواربوونی پاپۆڕەکە بووین.

کە موعەمەر قەزافی لە ساڵی (١٩٦٩) کودەتای کرد، لیبیا هیچ کەشتیی دەریایی نەبوو، ئەوان وەک دەشتەکی و کۆچەر، پتر حەزیان لە سارا و دەشت و دەرەکەی خۆیان دەکرد، جا هەر کەشتیی بازرگانی و گواستنەوەی وڵاتانی دیکە بوو هاتووچۆیان بۆ بەندەرەکانی تەرابلس و بەنغازی و مووسراتە و خومس و طووبرق.. تاد.، دەکرد. دوای شەش ساڵ لە کودەتاکە لە (١٩٧٥)، قەزافی دوو کەشتیی گەورەی سەردەمییانەی لە ئیسپانیا کڕی و بوونە خاوەن هێڵی دەریایی خۆیان، هەردوو کەشتییەکە لە ساڵی (١٩٧٣) درووستکرابوون و ناوەکانیان گۆڕین بۆ طوڵەیطەڵە و غەرناطە.

طوڵەیطەڵە کە لە بەندەر لەنگەری گرتووە و چاوەڕوانی ئێمەیە، گەورەترین کەشتیی لیبیایە، نزیکەی (٨٤٨) موسافیر و (٣٠٠) ئۆتۆمبیل و (٢٢٠٠) تۆن بار هەڵدەگرێ. سەرەتا گەمیەوانەکانی ئیسپانی بوون، دوای دوو سێ ساڵ، لیبییەکان بۆخۆیان بوونە گەمیەوان و سەپەرشتیار، دوای ئەوەی خوول و ڕاهێنانی زانستیی گەمیەوانی و دەریاوانییان لە ئیسپانیا بینی.

قەزافی هەمیشە نەک هەر حەنین و نۆستالیژایای بۆ مێژووی دێرینی نەتەوەکەی خۆی هەبووە، بەڵکوو خەونی ڕابوون و زیندووکردنەوەی ئەو مێژوەش لە کەلـلەدا بوو. ناوی ئەو پاپۆڕەی لە (تۆلیدۆ)ی ئیسپانییەوە گۆڕی بۆ طوڵەیطەڵە، بەو خەیاڵە کە تاریقی کوڕی زیاد لە ساڵی (٧١٢ ز.) ئەو شارەی فەتح کردوە و ئیسلامییەکان تا ساڵی (١٠٨٤) حاکم و

قەڵەمڕەوی ئەو ناوچەیە بوون. شارەکە (٧٥) کم لە باشووری مەدریدی پایتەختی ئیسپانیایە.

بەندەر مۆنجەی دەهات، بەسەدان موسافیر و ئۆتۆمبیل ڕیچکەیان بەستبوو وەردە وردە لە دەرگای پاشکۆی کەشتییەکە نزیک دەبوونەوە بەسەر پردێکی ئاسنین دەچوونە ژووری.

بە بڵندگۆ، لەسەر کەشتییەکەوە، جاڕییان دا کە موسافیرە لیبییەکان بەرەو کەشتییەکە بێنە پێشەو و سوار بن.

قەزافی، هەمیشە کە گوتاری بۆ لیبییەکان دەخوێندەوە و قسەی بۆ دەکردن، پێیدەگوتن:

ــ ئێوە سەیید و گەورەیی هەمووانن، قبوڵمان نییە کەس بە چاوی نزم تەماشاتان بکات.

ئەم درووشمە، بەچەندان شێوە لە لیبیا بە جددیی بەرجەستە دەکرا، واتا، ژمارەی یەک و یەکەمین کەس لە هەموو شتێک دەبێ (لیبی بێ)!

جا دەستە دەستە لیبییەکان، چوونە پێشەوە و بە خەندە و ڕووخۆشییەوە سواری پاپۆڕەکە بوون. کە دڵنیا بوون، هیچ موسافیرێکی لیبی نەماوە سوار نەبووبێ، ئەوجا بانگی موسافیرەکانی دیکەیان دەکرد، کە دەگەیشتیە سەر پاپۆڕەکە، هەڵگری ناسنامەی هەر وڵاتێک دەچووە، لای ئەو مێزەی بۆی تەرخانکرا بوو، ئێمە، چووینە بەردەم ئەو مێزەی بۆ عێراقییەکان دیاری کرابوو، پەساپۆرتەکانیان مۆرکردین و لەلای خۆیان خستانە نێو سندووقێکەوە و گلیانداوە.

(٢)

## لەســەر پشتی دەریا

یەکەمجارمە سواری پاپۆڕ بم. هەرکە پەساپۆرتەکانیان لێوەرگرتین، لە شوێنێکی دیاریکراودا باولەکانی خۆمان هەڵپەسارد. بەشی هەرە زۆری ئەم نهۆمە تایبەت بوو بە بار و ئۆتۆمبیل، ئۆتۆمبیلەکان هێندێکیان بارهەڵگربوون، هێندێکیشیان هی لیبییەکان بوون، پێی هاتبوونە گەشت و گەڕان. چونکی هەموو تۆرپین و مەکینە و ماتۆڕەکانی ئەو کەرتە شاخە لە ژێر ئەو نهۆمە بوو، ئەگەر بە هەموو هێزی خۆت هاوارت بکردبایە کەسی گوێی لە دەنگت نەدەبوو، گرم و هۆڕ و ڤرەڤر و هاشووهۆشی وەک ئەو وابوو سەت فڕۆکە بە نزمی بەسەر سەرتەوە بسۆڕێنەوە. تا بڵێی بۆنی گازۆیل و نەوت و دوکەڵەکەشی، لەو داڵانە گەورە نەفەس بڕە، قورس و ناخۆش بوو، خواخوات بوو، زوو بگەیتە پێپلیکە تەسکەکانی و پێهەڵگەڕێت، نەکۆ هێڵنجت بێتێ و تێکچی... . ئەو خەڵکە وەک ڕستەی میرووڵە سەریان لە دوو یەک نابوو، سەردەکەوتن. دوای چەندان لۆفە و پێچ و سوڕانەوە، گەیشتینە بەردەم پرسگە قەڵەباڵغەکە. دوای نەختێ چاوەڕوانی، ژمارەی کابینەیەکیان پێداین و ڕێنمایین کردین چۆن بچین بیدۆزینەوە، وا بزانم لە نهۆمی چوارەم بوو.

کابینەکە، چوار تەختی نووستن بوو، دوو دوو لەسەر یەکتری بە پەیژە بەسەر دەکەوتی، داڵانێکی تەسکیان لە نێوان بوو. چەند ئیغدانێکیشی تێدا بوو بۆ جلک و بەرگ وشتومەک. پێخەف و چەرچەف و بەتانییەکان پاک و خاوێن بوون، لە تەنیشتەوەش، پەنجەرەیەکی بازنەیی هەبوو دەیڕوانییە دەریا. دەرگاکەش، هەر لە ژوورەوە کڵۆم دەدرا.

لە منداڵییەوە حەزێکی بێسنووری پرسنانەم هەیە، بۆ کەشفکردن و گەڕان و بینینی هەر شتێک کە بۆ من نوێ بێ، جا هەر شتێک بێ: شوێن و جێگا، شتومەک و ئامێر و کەرەستە، کەرەستەی یاریی منداڵان، کتێب و فەرهەنگ... تاد.

خوشکم، لە سەینوبەینی باول ڕاکێشان و بگرەوبەردەی سواربوونی پاپۆڕەکە، کێژوویژ ببوو، یەکسەر لەسەر لا تەختەکەی خۆی ڕاکشا و منیش وەک سمبۆرە بۆی دەرچووم.

که هاتمە دالانەکەی کۆلانەی کابینەکانی خۆمان، بینیم، هەرچی هەیە بۆ پاشکۆی پاپۆڕەکە دەچێ، منیش بە گەڵیان کەوتم، تا گەیشتمە سەر بانە کراوەکەی. لەوێ و لەسەر بانی هەموو نهۆمەکان موسافیرێکی زۆر خڕ ببوونە، دیار بوو دەیانەویست دەرچوونی پاپۆڕەکە ببینن. منیش وەک وان ڕاوەستام، تەماشای کەنار و سەردەریا و دەوروبەر و پاپۆڕەکەم دەکرد. لە پێشدا، دەرگا گەورەکەی پاشکۆی پاپۆڕەکە، کە ببووە پرد، بەرزیان کردە و کلۆمیان دا، ئەوجا ئەو کرێکارانەی لە سەر کەنارەکە بوون، پەتە ئەستوورەکانی لە مێخە کۆنکریتییەکان پێچرابوونە و پاپۆڕەکەیان بەستبۆوە، قوڵفە قوڵفە کردەوە و لەسەر پاپۆڕەکەش چەندان کرێکاری دیکە، کە یەک جۆرە پۆشاکیان پۆشی بوو، بە هەندلان ئەو گوریسانەیان وەک خوولخوولە هەڵدەکردەوە. کە ئەوە تەواو بوو، دیار بوو بە دەنگێکی گەورە، پاپۆڕەکە چەند تەکانێکی دایە خۆی بۆ دەرچوونی، بەڵام لە بەردەمیشیدا، کەشتییەکی تایبەت، بە گوریس وردە وردە بەرەو ناو دەریاکە ڕایدەکێشا، نزیکەی یەک کیلۆمەتر بەو شێوەیە ڕۆیی، ئەوجا پاپۆڕییان بەڕەلاکرد و شەپۆلی دوو تۆڕبینەکەی پشتی، ئەو ئاوەیان شەق دەکرد و بەدوای خۆیاندا جۆگەڵەیەکی جوانیان بەجێدەهێشت کە تا دوورتر دەکەوتەوە، کەناری جۆگەڵەکە فراوانتر دەبوو. ئەوکات، وەک ئێستا نەبوو، مۆبایل نەبوو، بەڵام هەبوو بە کامیرای خۆی وێنەی دیمەنەکانی دەگرت.

ئەوجا، بەخێرایی، چەند گەڕێک بە ناو دالان و نهۆمەکانی پاپۆڕەکەدا گەڕام، دەمزانی سەفەرەکەمان (١٧) دەمژمێر دەخایەنێ و کاتی ئەوم دەبێ هەموو کون و قوژبنێکی کەشتییەکە کەشف بکەم و ببینم. لەو تابلۆ نووسراوانەی بە دار و دیواری دالانەکاندا هەڵواسرا بوون کە زانیاریی و ڕێنمایان بە موسافیرەکان دەدا، زانیم دوای سەعاتێکی دیکە کاتی نانخواردنی ئێوارەیە. گەڕامەوەی کابینەکەی خۆمان، منیش هەستم کرد دێ ماندوو بم.

لەسەر پاپۆڕەکە، هەستم بە دوو شت کرد، یەک، من ئێستا خەڵکی وڵاتی دەریام و جیهانی من پشتی ئەو دەریایەیە، پەیوەندیم بە وشکانییەوە نەماوە. دوو، من ئێستا لەژێر دەسەلات و یاسا و دەستوری جەماهیرییەی لیبیا دام، کە سەرکردەکەی زەعیم موعەمەر قەزافییە. لە ڕێنمای و ئامۆژگارییەکانی لە دالان بەسەر دەرگای ژوورەکاندا هەڵواسرابوون، هێندێ زانیاریی نوێم دەربارەی گەمییەوانی و سەفەری دەریا خوێندەوە،

پێویستیشە موسافیر بیانزانێ، بۆ نموونە، زمانی پاپووڕی دەریا ئەو هۆڕنە بە هێزەیە، کە لەناکاو دەنگدەداتەوە و دڵت دادەخورپێنێ، ڕەنگبێ بۆ ئەوانەی نەخۆشی دڵیان هەبێ، زۆر بە ئازار بێ.

ئەگەرچی، تەکنەکۆژیای پەیوەندییەکان، ئێستا زۆر پێشکەوتووە و ئامێری بێسیم و بڕۆسکە زۆر جۆری هەیە، بەڵام دەنگی هۆڕنە بەهێزەکەی پاپۆڕ، پێگەی خۆی لەدەست نەداوە. جا پاپۆڕ، دوو جۆر شووتی هۆڕن لێدانێ هەیە: لە کەناردەریا و لە سەر دەریا.

لە کەناردەریا:

کوورتە هۆڕنێک: بۆ لای دەستە ڕاست دەچێ.

دوو کوورتە هۆڕن: بۆ لای دەستە چەپ دەچێ.

سێ کوورتە هۆڕن: گەڕانەوە بۆ دواوە.

پێنج کوورتە هۆڕن: هێمای بوونی مەترسییە.

دوو هۆڕنی فیتە درێژ: سواربوون یان دابەزین.

بەڵام لەسەر دەریا، ئاماژەکان جیاوازن:

یەک هۆڕن و یەک کوورتە هۆڕن: تێپەڕبوون بە لای دەستە ڕاستی پاپۆڕێکی دی.

یەک هۆڕن و دوو کوورتە هۆڕن: تێپەڕبوون بەلای دەستە چەپی پاپۆڕێکی دی.

سێ کوورتە هۆڕن: گەڕانەوە بۆ دواوە.

پێنج کورتە هۆڕن: ئاماژەیە بۆ بوونی مەترسی.

جا ئەگەر دەریا تەمومژاوی بێ و مەودای بینین زۆر کورت بێ، ئەو لە ترسی ئەوەی خۆی نەکێشی بە پاپۆڕێکی دیکەدا، ناوە ناوە کورتە هۆڕنێک، وەک ئاگاداری بۆ ئەوانەی لەو ناوەن، لێدەدات. گەر هەبوو ئەوانیش وەڵام دەدەنەوە.

پاپۆڕ، ناوە ناوە، هەوای داینەمۆ و تۆڕبینەکانی، لە ژێر ئاوەکە دەکا و دەنگێکی تایبەتی دروست دەبێ، پێیدەڵێن (ترو فسی پاپۆڕان). لەسەر کەشتیش پێش خوێندنەوەی هەر ڕێنمای و ئاگادارییەک، بۆ دوو سێ چرکە، ئاوازی مۆزیکێک، لە شێوەی زەنگ، دەبیسترێ بۆ سەرنج ڕاکێشان.

دەنگی زەنگەکە هات و گوتی:"کاتی نانخواردنی شێوە، فەرموونە چێشتخانە."

لەبەردەم دەرگای چێشتخانەکە، موسافیرێکی زۆر نۆرەیان گرتبوو، کەنیشکەکانی کارەکەر، بۆ سەرمێزێکیان دەناردی. بێگومان ئەو خەڵکە زۆرە لەم شوێنە جێگەیان نابێتەوە، بۆیە بە چەندان وەجبە خەڵکەکە دەچنە ژوورەوە. کە وەجبەیەک دێنە دەرەوە، هەموو سەرمێزەکان خاوێن دەکرێنەوە و ئەوجا وەجبەیەکی دێ، دەست دەکات بە نانخواردن. خواردن و ئاشەکەیان، چونکە فرە دەفرە، دەتوانی دەست بۆ ئەوە خواردنە بەری کە بە دڵتە و بە برسییەتی نایەیتە دەرەوە.

ئێستا، بابزانین کلاس و دابەشکردنی موسافیرەکانیان بەسەر نهۆم و ژوورەکانی ئەو پاپۆڕە چۆنە.

طوڵەیطەڵە (٧) نهۆم بوو، نهۆمی یەکەمی، تایبەت بوو بە تۆڕبین و ئامێرەکانی، هی دووەمیش گەراجی ئۆتۆمبیل و کۆگای بار و کەلوپەلی موسافیرەکان بوو. باقی (٥) نهۆمەکەی شوێنی خەوتن و حەوانەوەی موسافیرەکان بوو، ئەوانیش بەسەر (٣) جۆردا دابەش کرابوون:

یەکەم، موسافیرە لیبییەکان و کەسانی خۆیان: وەک چۆن لە سواربوونی کەشتییەکەدا، ئەوان یەکەم وەجبە بوون بەسەرکەوتن، لە ناو پاپۆڕەکەش، نهۆمی تایبەت بۆ وان تەرخان کراوە. کە ژوورەکانیان دوو جۆرە. هێندێکیان هەر وەک ژوورەکەی ئێمەیە، هێندێکیشیان کە خێزانین، بەرهەیوان و شوێنی دانیشتینی خۆیان هەیە کە بەسەر دەریادا دەڕوانێ و گەورە و خۆشن. جۆری دووەم، تایبەتە بەو کەسانەی کە غەیرە لیبیین و پلیتی کلاسی یەکیان بڕیوە، ئەوانیش نهۆمی تایبەت بە خۆیان هەیە. بەڵام جۆری سێیەم عەوامەکەی وەکو ئێمەیە، کە پتر لە نەتەوەکان و وڵاتەکانی دیکەوە هاتوون. جا ئێمەی جۆری سێیەم، بە هیچ جۆرێک ناتوانین بچینە نهۆم و بەشەکانی دیکە، بەڵام ئەوان دەتوانن بێنە نهۆمەکانی ئێمە و بەسەر هەموو پاپۆڕەکەدا بگەڕێن. جا بۆ چێشتخانە. جۆری یەکەم و دووەم، چێشتخانە و خواردنی خۆیان هەیە، لە نهۆمەکانی خۆیان. بەڵام لە چێشتخانەکەی ئێمە، هێندێ خەڵکی لیبیای عەوام، ناندەخۆن، ئەوانیش دەبێ یەکەم وەجبە خزمەت بکرێن، ئەوجا ئێمە دوای ئەوان دێین.

دوای ئەوەی هێندێ لە داڵانەکان خۆم خافڵاند، چونکی هەموو لایەکی دەریا تاریک بوو، چرا و ڕووناکی  بە دەرەوە نەمابوو ببینرێ، گەڕامەوە سەر جێگەکەی خۆم بۆ نووستن.

لە تەمەنی (٤٣)ساڵیدا، بۆ جارێکی دیکە چوومەوە ناو بێشکە، بێشکەیەک، لە جیاتی دەستە موتفەڕکەکانی دایکم، شەپۆلی دەریایی سپیی ناوەند ڕایدەژاند. بەدەم لایلایەیی شەپۆڵەکانەوە خەوم لێ کەوت.

بەیانی، پێش ئەوەی ببێتە کاتژمێر حەوت و نیو و زەنگی کاتی نانخوارن لێبدا، من لە خەوهەڵسام. بە کوێرەی نەخشەکەبێ، دوای دەمژمێر دە، دەبێ بگەینە تەرابلس، واتا ئێستاش چەند سەعاتێکم ماوە، بە کەیفی خۆم لەسەر پاپۆڕەکە بگەڕێم و سەرنج لە شتەکان بدەم. حەزم دەکرد بچمە سەربانی هەرە سەرەوە، بەڵام هەواکەی سارد و تەماوی بوو و بایەکی بەهێزی دەهات، هێ ئەوەی نەبوو خۆم سەرما بردوو بکەم.

لەسەر دیواری لا  داڵانێکی نهۆمەکەماندا، هێڵکارییەکی گەورەی پاپۆڕەکە کێشرابوو، خاڵ بە خاڵی نیشاندرا بوو، بەڵام هەر حەزم دەکرد، شتەکان بە چاوی خۆم ببینم، هەرچەندە خوشکم، حەزی لەو گەڕان و سۆڕانەی من نەبوو. لە ڕاستیدا، ئەو پاپۆڕە، بۆ خۆی شارێک بوو، چیت دەویست، هەبوو. هۆلێکی  خۆشیی سینەمای تێدا بوو، بەڵام هیچ نمایشکردنێکم نەدی. کافتریا و بازاڕی دیاری و شتومەکی نرخ هەرزان هەبوون. ساڵۆنی سەرتاشین بۆ پیاوان و ئارایشتکردن بۆ ژنان، ژووری مەساژ و وەرزش، تەنانەت لە گۆشەکەیدا، ژوورێکی بچکۆڵەم دی لەسەری نووسرا بوو (سجن).

پاپۆڕ بەرەو خۆراوا، تەکانان دەدا و گورج بەسەر پشتی ئاوەکەدا دەخشێ، قەت هیچ ئاوەدانی و دار و بەرێک دیار نییە. دوای پتر لە دەمژمێرێک، هێندێ دوورگەی بچووک لە دووررا دەبینران، هەر دوورگەیەک شێوەیەکی هەبوو، لە کیسەڵ و سەرە مانگا و مەمک و دیواری کەڵەکەبەرد دەچوون. خوشکم ئەو دیمەنانەی پێ سەیر بوو، دەیگوت، لە سەفەرەکانی دیکەیدا، قەت ئەو شاخ و گردۆڵکە و دوورگانەی نەهاتۆتە پێش چاو. منیش وام بۆ ڕاڤە دەکرد، کە ڕەنگبێ، لەو خاڵەدا، وەک ئێستا تۆ لێرە نەبوویت و لە ژوووورە و یان لە کافتریا و هۆڵەکان بوویت. ئەو هەر پێداگری دەکرد کە یەکەمجارە بێرە دابێ!

بە گوێرەی سەفەری (١٧) سەعاتی بێ، دەبێ دوای دەمژمێرێکی دیکە لە تەرابلس نزیک ببینەوە، خوشکم هەر پێداگری دەکرد، کە ئەو شوێن و دیمەنانە، لە ئەوانەی پێشتر دیتبووی ناچن.

کە لە چێشتخانەکە دانیشتین، بۆ هەر موسافیرێک بەشە خواردنێکی کەمیان دانا، لە چاو نانی ئێوارە هەر هیچ نەبوو. موسافیرەکان، بە سەرسوڕمانەوە تەماشای یەکتریان دەکرد. گوێمان لێ بوو کە ژنە کەنیشکەکانی چێشتخانەکە داوای لێبوردنیان دەکرد، دەیانگوت، ڕێیەکی دوورمان هاتووەتە پێش و دەبێ دەست بە خواردن و خواردنەوەکانمان بگرین. کە پرسیان، مەسەلەکە چییە و چۆنە؟ گوتیان:

ــ ئاگادار کراوینەتەوە، کە دەبێ بچینە ئۆدیسیا ئەوجا لە وێوە، دەگەڕێنەوە تەرابلس. ئەو ڕێیەش دوور و درێژە، ئێستا ئێمە لە زارکی دەریای ڕەشداین.

یەکسەر خوشکم گوتی، ناڵێم ئەوە یەکجارمە بەو ڕێیە دابێم، دڵم خەبەری دابوو، ئەوە ڕێی تەرابلس نییە.

ماتەمییەک دایگرتم و کچە خوێندکارەکەی پەیمانگە و دوعایەکەیم بەبیرهاتەوە!

یەکێک، لە دیاردە تەمومژاوییەکانی قەڵەمڕوانی لیبیا ئەوەیە، کە هەموو شتێک نهێنییە، کەس نازانێ چ دەگوزەرێ و چ بەڕێوەیە و کەسیش مافی پرسینی نییە یان ناوێرێ بپرسێ. بۆ ئۆدیسیا، لەو پەڕی باکووری دەریای ڕەش؟

مەودای نێوان ئەزمیر و تەرابلس، نزیکەی (٢٢٠٠) کم بوو، ئێستا ڕێگایەکە زۆر دوور کەوتەوە، لە ئەزمیر بۆ ئۆدیسیا نزیکەی (٩٤٥) کیلۆمەترە، بەڵام خێرای پاپۆڕەکە زۆر کەمە، لەبەر تەنگەبەری ڕێڕەوە ئاوییەکان و شەپۆلی گەورە و ترسناکی دەریایی ڕەشیی شێت و شوور! ئەوجا لە ئۆدیسیاوە بۆ ئەزمیر، نزیکەی (٣٠٠٠) کیلۆمەتر دەبێ، واتە ئەگەر بە چوار ڕۆژ بگەینە تەرابلس شوکرانەی خوای دەوێ.

شەو، کە ئێمە لە خەوی خۆش دابووین، تۆڵەیتەڵە تەنگەبەری دەردەنیلی بڕیبوو، کە درێژییەکەی نزیکەی (٦٠) کیلۆمەتر و بە یەکێک لە تەنگترین و تەسکترین ڕێڕەوی دەریایی دادەنرێت کە زۆر پڕ هەڕمێنە. لە هێندێ جێگە پانی ئەو گەرووە، هەر (٧٥٠) مەتر دەبێ، بە زەحمەت، ئەو خاڵە، دوو پاپۆڕی گەورەی پێدا ڕەت دەبێ. ئەوجا دوای ئەوە دەریای مەڕمەڕە دێ تا دەگاتە گەرووی پسفۆر کە ئەویش (٣٠) کیلۆمەترێک درێژ دەبێ.

ئەو گەرووە، کە شاری ئەستەنبۆل دەکاتە دوو کەرت، کیشوەری ئاسیا و ئەورووپا لێک جیادەکاتەوە.

هەتا کەشتییەکەمان پتر بەرەو قوڵایی دەریا دەچوو، کەش و هەواکە ناخۆشتر دەبوو و شەپۆڵەکانی دەریا بەرزتر دەبۆنەوە و پاپۆڕەکە وەک شەنگە بێ، دەهاتودەچوو. لە دێر زەمانەوە کە بەو دەریایەیان گوتوە دەریایی ڕەش، لەبەر ڕەنگی ئاوەکە نەبووە، بەڵکوو لەبەر تەمومژاویی و شەپۆلی گەورە و گۆڕانی کەشوهەوای لەنکاویدا و ڕەشەبای بەهێزی، ئەو ناوەی لێندراوە.

کاتێک چوومە سەربانی دوایین نهۆم، وەک ئەوە وابوو بچێتە جیهانێکی دیکە، کە تەماشایەکی هەرچواردەوری خۆم کرد، یەکسەر هەستم کرد، کە لێرە دەتوانی بە چاوی خۆت ببینی کە زەوی خڕە. دیمەنەکە وەک ئەوە وابوو، لە ناوەندی سینیەکی خڕی گەورە ڕاوەستابیت، جا تەماشای هەر لایەک بکەی، مەدوایی کۆتاییان وەک یەکە، بینینت دەگاتە ئاستێک. هیچ ئاسۆیەک دیار نییە، هەست دەکەوی ئاوەکە پشتی کوڕ بووەتەوە، لە کۆتا خاڵدا ئاو و ئاسمان دەگەنەوە یەک.

لەسەر پاپۆڕەکە، شتێک سەرنجی ڕاکێشم، هەستت دەکرد کە مەسافیرەکان، زۆر بە تەقیە و ئاگادارییەوە هەڵسوکەوت دەکەن، وەک بڵێی، بزانن، لەسەر پشتی کەشتییەکی وڵاتێکن، کە ناوبانگییەکی تایبەتی هەیە. ناوی زەعیم موعەمەر قەزافی، زۆر شتی دەهێنایە بەرچاو. پێم سەیر بوو، کە هەموو کرێکار و گەمیەوانەکان غەیرە لیبی بوون، میسری، بەنگلادشی، خەڵکانی دیکەی ئەفریقیا، کەیبانو و کەنیشکەکانی چێشتخانە و کافتریاکان، زۆربەیان، کە ژن بوون، هی لای خوارووی ڕۆژاوای ئاسیا و بەرازیل بوون... تەنها لە دوو شوێن بەرپرسی لیبیم بینی: لە نێو دەرگای سواربوون و وەرگرتن و مۆرکردنی پەساپۆرتەکان، هەروەها لە پرسگە، کە دابەشیان کردین بەسەر ژوورەکاندا. سەفەری ئێمەش بۆ ئەو وڵاتە بێ ڤیزەبوو. لە هەموو جیهان، ئەوکات تەنها وڵاتی یەمەن و لیبیا دەرگایان بۆ هاووڵاتیانی عێراقی والاکردبوو و لە ڤیزەوەرگرتن بەخشرابوون. باشە چۆن ئەم حکوومەتە ڕێدەدا، خەڵک ئاوا بەبێ چاودێری و لێکۆڵینەوە، ڕوو لە وڵاتەکەیان بکات؟ سەیرە!

کە تۆ لەسەر ئەو پاپۆڕەی، لە کافتریا و چێشتخانە و هۆڵ و داڵانەکاندا دانیشتبیت، یان لە پیاسەکردن بی، ناوە ناوە، موسافیری لیبی، کە زۆربەیان تەمەنیان لە سەرووی سی ساڵییە، دێنە لات و بەدەم گفتوگۆ و چاخواردنە و پیاسەکردن، هەوڵدەدەن زۆرترین زانیاریی لەسەر تۆ بزانن، بە بێ ئەوەی تۆ هەست بکەی کە ئەوانە پیاوی ئاسایشیی دەوڵەتن، پێش ئەوەی تۆ پێ بخەیتە سەر ئەرزی لیبیا، دەبێ ئەوان شوناسنامەی تۆ بزانن. بۆ نموونە، کە دەڵێیت، مامۆستام دەچم لەوێ دابمەزرێم، داوای بڕوانامە و بەڵگە و دۆسیەت لێدەکەن، وانیشان نادەن بۆ لێپێچینەوەیە، بەڵکوو پێت دەڵێن، دەمانەوێ یارمەتیتان بدەین. جا ڕوویداوە، هەر لەسەر پاپۆڕەکە نامەیان بۆ نووسیوی تا لە فلان شار بچێتە لای فلان کەس تا لە لای خۆی دابتمەزرێنێ. پەساپۆڕتەکانیش، لە پرسگەدا، تەماشا دەکرین، بۆ ئەو کەسانەی ناویان لە لیستی ڕەشەدایە. بەو شێوەیە، ئاسایشیی لیبی ئاگاداری هەموو هەڵسوکەوتی موسافیرەکانن و دەزانن بۆچی دەچنە ئەو وڵاتە.

ئێستا. لەسەر ئەو دەریایە فروانەدا، تۆ لە کوێت؟ نازانێ! کەنگێن دەگەیتە قۆناغی دیاری کراو؟ نازانێ! بەڵام ئەوەندە دەزانێ، کە دەبێ، بێدەنگ دانیشت و چاوت لە دەستی قەدەر و گەمیەوانەکەبێ بۆ کوێت دەبەن.

ڕێک دوای (٢٤) کاتژمێر، ڕووناکی و چراکانی شاری ئۆدیسیا بەدیار کەوتن و خەڵکەکە ئاهێکیان هاتەوە بەر، بەو هیوایەی، زوو موسافیرەکانی ئەوێش سوارکەن و بەرەو تەرابلس بەڕێکەون.

هێندەمان زانی، پاپۆڕ لە دووری نزیکەی (٤٠) کیلۆمەتر، لە بەندەرەکە، لەنگەرە قولابدارە قورس و گەورەکانی داگرت و لە جێی خۆی یبخ بوو و ڕاوەستا. لە زاری کرێکارەکانەوە، زانرا کە دەبێ ئەمشەو لەسەر پشتی دەریا، لە جێی خۆمان بمێنینەوە، چونکە ئەو پاپۆڕە تەمەنی (٢١) ساڵە و ڕێپێدراو نییە، بچێتە ناو بەندەرەکە. پاپۆڕ تەمەنی لە (٢٠) سال پتر بێ، گومرگی بەندەر و گەراجانەی چەندان بار، قورسترە، بۆیە هەر لە سنووری ئاوی دەریایدا لەنگەر دەگرن و ناتوانن بچنە نێو سنووری خۆجێیی دەوڵەتەکان.

ناچار، ئێمەش وەک باقی موسافیرەکان، خۆمان دایە دەستی قەدەر و دوای نانخوارنی شێوان بە دڵساردییەوە چووین لێی بخەوین.

که ڕۆژ بۆوە، دوای تێشت خواردن، هەستمان کرد، زرتە کەشتی دەستی کردەوە بە گرم و هۆڕ و هۆڕن لێدان، ئەوجا وردە وردە لە بەندەرەکە نزیک بووە.

تا چاو بڕەکا، هەموو لایەکی ئەو بەندرە کەشتی و پاپۆر و بەلەمە. بۆت لە ژمار نایە. هەیانە بە قەد چیایەک بەرز و گەورەن و ڕەنگبێ سی چل نهۆم بن، هەشیانە بارهەڵگری هەزارن تۆن بار و شتومەکن. وەک دارستانی دارخورما، ئەوا سلینگی بەرز بەرز بە ئاسمانەوەن و زۆربەیان کار دەکەن، پاپۆڕ دادەگیرێ و پاپۆر بار دەکرێ. بەندەری ئەزمیر لە چاوی ئەوەی ئۆدیسیا، بەندەرۆکەیە. لەو دیمەنە تێدەگەی کە لەکاتی خۆی ئەو شارە، چ پێگەیەکی بازرگانی و ئابووری و سەربازیی هەبووە لە یەکێتیی سۆڤیەتی هەڵوەشاوەدا، ئەوکات، ئۆدیسیا چوارەمین شاریان بووە و ئێستاش سییەمی شاری گەورەی ئۆکراینە.

لە دەوری کاتژمێر (١٠) بەیانی، موسافیرەکانی ئەو شارە سواری پاپۆرەکە بوون. لە ڕاستیدا، ئەوان ژمارەکەیان هەر (٥٠) کەس دەبوو، تێکەڵ ئێمە نەبوون، ئەوانیش بەسەر ژوور و کابینەی تایبەتدا دابەشکران. دیار بوو، بەشێک بوون لەو سەربازە لیبییانەی لە وڵاتی ئۆکراین خولی مەشق و ڕاهێنانی سەربازییان بینیبوو. چونکە چەک وچۆڵی لیبیا هەموو کارخانەی یەکێتی سۆڤیەتی پێشوو بوو، دەبووایا مەشق و دەرس و دەورەکانیان هەر لەو وڵاتانەبێ کە چەکەکانی لێ دروستکراوە و خۆشیان بەکاریان دێنن.

لە گەڕانەوەمان بەرەو تەرابلس، هێشتا لەسەر دەریای ڕەش بووین، خەڵکەکە تەواو شەپرزە ببوون، لەبەر ڕەشەبا و شەپۆلەکان، نەک هێ ئەوەی نەبوو بچێتە سەر بان و لە پشت تەیمانەکانەوە تەماشای دەریاکە بکەی، بەڵکوو لە ژوورەکەی خۆشت عەجمێنت نەبوو، دەتگوت ئێستانا ئێستا، پاپۆرەکە وەردەگەڕێ و نغرۆ دەبێ! کەس نەبوو، کیسەی ڕشانەوەی بە دەستەوە نەبێ، لە هەموو شوێنێک کیسەی خاڵی داندرابوو، بۆ ئەوانەی تێکدەچن. خوشکم نیوە ڕۆح بوو، لەسەر تەختەکەی خۆی لێی کەوتبوو، کاتی نانخواردنی نیوەڕ و ئێوارە، چێشتخانە نیوە چۆل بوو!

دەوری سەعات حەوتی ئێوارە، کەشتی گەیشتە تەنگەی بسفۆڕ و شەپۆل و ڕەشەبای دەریای ڕەش نەما، خەڵکەکە وردە وردە، لە ژوورەکانیان دەردەهاتن و تەماشای ئەو هەموو چراخان و ڕۆناکی و خانووبەر و شەقام و پردی شاری ئەستەمبۆڵیان دەکرد. ئەو کات بە ژێر دوو پردە بەناوبانگەکەی ئەو شارە داچووین، پردی پسفۆڕ و پردی سوڵتان

محەمەدی فاتیح. لە ڕاستیدا، ئەگەر ئێمە وا شەکەت و هیلاک نەبووباینایە، ئەو جۆرە گەشتە دەریاییە، بە ناو شاری ئەستەمبۆڵ و دەریای مەرمەڕە و گەرووی دەردەنیل، بۆ هەموو کەسێک ڕێکنەدەکەوت. گەشتیاران سەدان دۆلاری بۆ خەرج دەکەن.

چونکە وات هەست دەکرد، هەرچی ئەعزای بەدەنت هەیە کووتراوە، حەزت دەکرد، زوو بچی سەر بنێیتە سەر سەرینەکەت و بخەوی، بەڵکوو خوا کارێک بکا زوو بگەنە تەرابلس، بە سەلامەتی.

نزاکەی، ئەو کچە خوێندکارە، هەمیشە لە گوێمدا دەزرینگایەوە، بێئاگایانە، کە بەبیرم دەهاتەوە، بە زۆر شتم دەبەستەوە. تا لە گەرووی بسفۆر ڕەتبووین، هەر خەیاڵم لە لای ئەو ئەفسانەیە گریکییە کۆنە بوو کە دەڵێ: خوداوەندی (زیۆس)، نازادارە خۆشەویستەکەی خۆی کە ناوی (ئیبوو) بوو، کردە گامێش، نەکۆ مێردەکەی غیرەی لێبکات. جا کە مێردەکەی بەوەی زانی بە هەزاران مێشی بەدوای ئەو گامێشە دا، (ئیبوو) بۆ ئەوبەری گەرووەکە بازی دا. ناوی گەروەکەش هەر لە وەوە هاتووە (بووس واتا گامێش) وە (هوروس واتا گەروو) بە لێکدانی ئەو دوو وشەیە، زاراوەی بسفۆڕ لە دایک بووە.

لە دڵی خۆمدا دەمگوت، دەبێ غیرەی ئەو کچە خوێندکارەش من نەکاتە دەعبایەکی وەکو ئەو گامێشە چارەنووس نادیارە؟!

لە دەوروبەری دەمژمێری دووی بەیانیدا، لە تاریکستانێکی ئەنگوستەچاودا، ئەو کاتەی کە هەرچی موسافیر بوو لە خەوێکی قوولدا بوو، ئەوەی کە بە تەنیا بەخەبەر بوو هەر تۆڵەیتەڵە بوو، کە بە هێمنی  وەکو ماری ئاویی، دەریای سپیی ناوەندی دەبڕێ، هەر ئەوەندەمان زانی، گەرمەیەک، لە ژێر پاپۆڕەکەوە، وەک گرمەی تەقینەوەی مینێکی بەهێز، یان پێکدادانی دۆ پاپۆڕی گەورە، یان گڕکانێک لە ژێر دەریا...! هەر موسافیر بوو، خۆی بەدەرگای ژوورەکەی خۆی دادەدا و بە سەری قۆت و بە پێ خواستی بەرەو دالانەکە ڕایان دەکرد. ڕۆح شیرینە! ئەوەی کە پتر زراوی خەڵکەکەی برد، ئەو کرێکارانە بوون، کە بە ڕاکردن بەوەر ئەو بەلەمانەی سەر پشتی پاپۆڕەکە دەچوون، کە لە کاتی تەنگانەدا، دایان دەبەزێنە سەر ئاوی دەریاکە.

دواتر، بە بڵندگۆ، خەڵکەکەیان هێورکردەوە، نەترسێن و بگەڕێنەوە ژوورەکانیان، پاپۆڕەکە، بنی لە شاخێکی ژێر دەریا خشاوە و سەلامەتە و هیچ زیانێکی پێنەگەیووە و لەو زنجیرە شاخە ڕەتبوون!

بەدەم دەیان پرسیار و خەیاڵاتەوە، بەترسەوە، دیسان سەرم نایەوە سەر سەرینەکە و دەمپرسی، ئەگەر ئێستا پاپۆڕەکە نغرۆبووایە، دایکم چی دەکرد؟ تایەن و ڕەسەن و ڕەندی چیان بەسەر دەهات؟ ئەو خەڵکە نەیان دەگوت، چ گەردەلوولێک، ئەو بەدبەختەی گەیاندە ناوەندی دەریایی سپی؟ دەبێ ئەو کەشتییە بمگەیێنێتە کوێ و چارەنووسم چ بێ؟

پێش ئەوەی زەنگی کاتی نانخواردنی نیوەڕۆ لێبدا، ئاگاداریان کردینەوە، کە دەبێ دەست بە ئاوەوە بگرین، چونکە بای خوارنەوەمان پێماوە و پێنەماوە. تووشی هەستێکی غەریب ببووم لەسەر ئەو پاپۆڕە، بە بیستنی ئەو هەواڵە یەکسەر گەڕامەوە نێو هۆڵی دانیشتگا و دکتۆر عەبدول واحید لوئلەئەم وەبیر هاتەوە کە دێڕە شیعرەکانی سومیول تیلۆر کۆلیریجی بۆ ڕاڤەدەکردین لە قەسیدەی (دەریاوانی دێرین):

"هەموولایەک ئاوە، ئاو (کەچی)بەرمیلەکانی ئاویش وشکبوونەتەوە
هەموو لایەک ئاوە، ئاو (کەچی)دڵۆپێکیش نییە بۆ خواردنەوە."

ئەوە، ئێستا لەمە قەوما بوو. لەسەر پشتی دەریا بووین و ئاویشمان لە بڕان بوو. کە نانی نیوەڕمان خوارد، ئەگەرچی موسافیرەکان تەواو شەکەت و شپرزە دیاربوون، بەڵام چونکە ترووسکە هیوایەک هەبوو کە دەمەو عەسر دەگەینە تەرابلس، جۆرە گەشبینییەک لە ڕوخسارياندا دەبینرا. لەژێر خۆرەتاوێکی خۆش و هەوایەکی سازگاری شێدار، کە بە بۆنی ماسی سەرمەستی دەکردی، وردە وردە لە پایتەختی موعەمەر قەزافی نزیک دەبووینەوە. دەریا وەک باخ و گێڵگە وایە، هەر دەریایەی بۆنی خۆی هەیە. بۆنی دەریای سپی ناوەڕاست زۆر تایبەتمەندە، لە کەناری دەریای هەر وڵاتێکی دیکەدابیت، یەکسەر حەنین و نۆستالیژیات بۆی هەڵدەستێ و دەیناسیتەوە.

خۆر یەک دوو ڕمبی مابوو ئاوابێ، توڵەیتەڵە گەیشتەوە زێدی خۆی و بەرەو بەندەری تەرابلس، هێدی هێدی چووەپێش، تا بەرامبەر شارێکی دێرینی پڕ دار و دارستان لەنگەری گرت.

دوای بەستنەوەی پاپۆڕەکە و دانانی پردی پەڕینەوە، کە منیش لەگەڵ خەڵکێکی زۆر، لەسەر تەیمانی نهۆمەکانەوە تەماشام دەکرد، دیسان موسافیرە لیبییەکان ئاگادارکرانەوە، کە ئامادە بن بۆ دابەزین. ئەوجا دوای ئەوان موسافیرەکانی کلاسی یەک هات. ئیمەی عەوام، لەگەڵ تێکرِای خەڵکەکانی دی، دوایین کەس بووین، پەساپۆرتەکانیان رادەست کردینەوە و چووینە خوارە و باول و کەلوپەلەکانمان وەرگرەوە و مالاوایمان لە تۆڵەیتەڵە کرد.

بەندەرەکە تا بلێی قەڵەبالغ بوو، هەر کەسەی چاوەڕوانی خزم و دۆست و ئەحبابی خۆی دەکرد پیشوازی لێبکات و بیانبەنەوە ماڵ. دکتۆر کازم، شووی خوشکەکەشم، هاتبوو، تەکسییەکیان گرتوو بەرەو ماڵ بەڕێ کەوتین.

من تەواو گێژ و وێژبووم، حەزم دەکرد، دیقەت لە دیمەن و شەقام و خانووبەرەکانی پایتەخت بدەم، بەلام چاوم باش هەڵنەدەهات. دوای بیست دەقیقەیەک لە ڕێکردن، دکتۆری لێپۆرسیم:

ـــ ها، مامۆستا فازیل، تەرابلس خۆشە؟

بە هێمنی، وەک ئەوەی خۆم بدوێنم گوتم:

ـــ جا من دەزانم، لە کوێم؟ دەزانم، بۆ کوێ دەچم؟ قسەی خۆمان بی! نازانم، بۆ دەبێ من لێرە بم!

# (٣)

# لـە (زاویـە)وە بـۆ (سـرت)

شەقامە سەرەکییەکانی پایتەخت، بەتایبەتی بە درێژایی کۆرنیشە جوان و دڵڕفینەکەی، بە وێنەی ڕەنگاوڕەنگ و گەورەی قەزافی لەگەڵ سەدان لافیتە و درووشم و ئاڵای کەسکی لیبیا ڕازێندابوونەوە. هێشتا بۆن و بەرامەی (٢٥)ەمینساڵیادی (١ی فاتیح) لە هەموو گۆشەیەکی ئەوە شارە سەرمەست و کاسی دەکردی. ساڵانە دەسەڵاتدارانی لیبیا، بە سەدان ملیۆن دۆلار لە ساڵیادی کودەتا سەربازییەکەی (١ی سێپتەمبەری ١٩٦٩) خەرج دەکەن و فیستڤاڵی گەورە و ئاهەنگ و کۆبوونەوە و نواندنی چالاکیی هەمەڕەنگ لە هەموو مەڵبەند و ناوەند و قوتابخانە و زانکۆ و فەرمانگەیەکی ئەو وڵاتەدا بەڕێوەدەچێ، بەشێوەیەک کە بۆ چەندان حەفتە کاروباری وڵات تەواو هەڵ دەپەساردێت و هەموو شتێک دوادەخرێ بۆ دوای ئەو ساڵیادە. منیش دەستم لەسەر دڵم بوو، چونکە هەر (٧) ڕۆژ بەسەر ئەو یادە تێپەڕی بوو و هێشتا لە قۆناغی سەرەتایی دابوو و دەترسام کارەکانم زوو بۆ مەیسەر نەبێ.

بۆ ماوەی شەو و ڕۆژێک لە لای خوشکم، لە ماڵەوە دەرنەچووم. ئەو ئەپارتمانتێکی پێدرابوو، لە ساختومانێکی گەورە، کە نزیکەی (٥٠) ئەپارتمان دەبوو، لە ناو زانکۆی فاتیح، بە ناوی خانووەکانی ئیتاڵی ــ دیاربوو کۆمپانیایەکی ئەو وڵاتە درووستی کردبوو. بۆ دووەمین ڕۆژ، دکتۆر کازم، هەر بۆ پیاسە و بازارپکردن، منی بردە بازاڕی سەوزەفرۆشان لە گەڕەکێکی نزیک خۆیان بەناوی گەڕەکی (بن غەشیر). بازاڕ و دوکانەکانی وەک ئەوانەی لای خۆمان بوون، بەڵام لە گۆڕەپانێکدا، چەندان سەوزەفرۆش و میوەفرۆش، بەرهەمەکانی خۆیان لەسەر ئەرزی نمایش کردبوو.

ئەو شوێنە تەواو سەرنجی منی ڕاکێشا. فرۆشیارەکان دەتوانم بڵێم نیوەیان لیبیی بوون و تەمەنیان لەسەرووی چل ساڵیدا بوو، هەر هەموویان پۆشاکی کەلتووریی خۆیان پۆشی بوو. باقییەکەی دی زۆری هاووڵاتی میسری و سودانی و مەغریبی و هی هێندێ وڵاتانی دیکەی ئەفریقیا بوون. کڕیارەکانیش لیبی و غەیرە لیبی بوون و ژنی چوارشێوبەسەریشیان

تیدا بوو، شوێنەکە مۆنجەی دەهات. هەر ناوە ناوە، دکتۆر ئاگاداری دەکردمەوە، کە ئاگام لە باخەڵ و گیزدانی خۆم بێ. هەر ئەو کاتە لە خۆم پرسی: ئەدی بۆچی مامۆستاکانمان، کە باسی جوگرافیایی لیبیایان بۆ دەکرین، دەیان گوت، سارایەکی کاکی بە کاکییە و جگە لە حووشترالووک هیچی دیکەیان نییە؟ ئەدی، ئەو هەموو بەرهەمە جوانەی سەوزە و میوە چییە؟ خۆ دیارە هەمووشی بەرهەمی خۆماڵین.

لەوبازارەدا، کە هەموو جۆرە میوە و سەوزەیەکی لێبوو، هیچ فرۆشیارێک تەروازووی نەبوو، بەرهەمەکانیان بە سێ شێوە، دیاری کردبوو، تەماتە و سێو و پرتەقاڵ و خۆخ و قەیسی و هەرمێ و ترێ و گێزەر.... بە (گابییە) دەفرۆشان. گابییە، سندووقێکی بچووکە لە تەختە درووستکراوە، جا گابییەی گەورە هەیە و گابییەی بچووک، هەرچی پەتاتە و شەوەندەر و .... پیواز هەبوو لە (شکارە) بوو، واتا لە خورجێکی نایلۆنی داوداو، وەک تۆڕی ماسییان. بۆ سەوزەش بە (شەددە) بوو. شەددە چییە؟ ئەگەر چەترێکی کراوە سەرەو خوار بە دەستەوە بگرێ، چ دەبینی؟ ئەو شەددە، بە قەد ئەو چەترە بوو، لە ناوەڕاست بە پەتێک بەرزت دەکردەوە، ئەوجا دەسکە تەرەتیزە و کەوەر و شبێت و کەرەوز و مەعدەنۆس و چەند گیایەکی دیکەی خۆیان، بەیەکەوە بەسترابوونەوە. ئەو شەددەیە دوو سێ کیلۆ دەبوو، چونکە دەسکە کەرەوزەکەی، بۆ نموونە، شەش حەوت دەسکە کەرەوزی خۆمان دەبوو. ئەوجا شبێت و کەوەر و ... . کە گابییە میوەیەکت دەکڕی، بۆت دەکەنە کیسەیەک و سندووقەکە بۆ خۆیان پڕدەکەنەوە. بەڵام ئەوانی دیکە، هی تۆیە. شووتی و گوندۆرە، بە گۆترەیە، پتر، کۆمەڵ کۆمەڵ دەفرۆشن. ئەوەی سرنجمدا، لیبییەکان مامەڵە ناکەن، بەڵام کڕیارە میسری و عێراقییەکان یەکجاری بێتام، مامەڵە دەکەن. لیبییەکان ئەوەیان پێخۆش نییە، بۆیە ئەو کڕیارانە پتر دەچنە کن فرۆشیارە غەیرە لیبییەکان.

زۆربەی لیبییەکان، ئۆتۆمبیلی خۆیان دەینن بۆ ئەو بازارە، ئێمەمانانیش دەبێ بە تەکسی شتەکان ببەینەوە ماڵ. لە لای من، نرخی ئەو سەوزە و میوەیە، یەکجار هەرزان بوون، ئەو شەددە سەوزەیە کە شەش حەوت جۆر سەوزە بوو، نرخەکەی یەک دیناری لیبی بوو(دەیکردە ٦٠ سنت، ئەو کات). کرێی تەکسیش هەر دوو دینار دەبوو.

بریارماندا، سبەینێ، بچمە کۆمپانیای نەوتی نیشتیمانیی لیبیی، لە شارۆچکەی زاویە بۆ مەسەلەی ئەو گرێبەستەی خوشکەکەم بۆی باسی کردبووم. زانیاریی گەراج و شوێنی ئۆتۆمبیلەم وەرگرتبوو.

ئێستا سێیەمین ڕۆژمە لە لیبیا، بە ئۆتۆمبیلی (نەفەرات) چوومە گەراجی سەرەکیی شار و لەوێوڕا، بە نەفەرات، بەرەو زاویە بەرێکەتم. هەواکەی خۆش و فێنک بوو، گەرچی پۆشاکی، وەک دەڵێن، ڕەسمیم پۆشی بوو، چاکەت و پانتۆڵ و بۆینباغ... . ڕێگەکە هەر (٤٥) دەقیقە بوو، بەڵام چونکە تەریب لەگەڵ کۆرنیش و کەنار دەریاکە دەڕۆیشت و دەتروانییە هەر لایەک دارستان و دارخورما و سەوزایی و چیمەن و فولکە و گۆڕەپانی جوان جوان بوو، هەستت بە مەوادایەکە نەدەکرد. لە دڵەوەش، نەختۆکەک زگم بەخۆت دەسووتا، کە زێد و نیشتیمانم وەبیر دەهاتەوە و دەمپرسی، خۆ خێروبێری خۆمان زۆر لە هی ئەوانە پترە و خۆشمان بە ڕۆشنبیرتر دادەنێین، بۆچی وا خزمەتی وڵاتی خۆمان ناکەین!

کە گەیشتمە، دواقۆناغ، داوام لە شۆفێری تەکسییەکە کرد، کە تا نزیک کۆمپانیای نەوتەکەم ببات، چونکە لەو شارە تەکسی نییەوە شوێنەکەش نەختێ لادەستە.

لەبەر دەرگای سەرەکیی کۆمپانیاکە هاتمەخوار، لە پرسگە زۆریان ڕاگرتم، چونکە هیچ نووسراوێکی فەرمیم پێنەبوو، هەرچۆنێک بوو، قەناعەتیان پێ هات، کە زانیان غەریبەم و (گۆیا) گرێبەستم هەیە.

بەهلوول، یەکەمین فەرمانبەری ئەو کۆمپانیایە بوو، کە تەعاروفم لەگەڵ کرد. ئەو بەرپرسی پرسگەی بەڕێوەبەرایەتیی ئەم دەزگایە بوو. گەنجێکی ئەسمەری تەمەن (٣٧) ساڵان دەبوو، بە جەستە نەختێ ورد بوو، بەڵام تا بڵێی جست و چالاک و زرینگ دیار بوو. نزیکەی دەمژمێرێک لە لای خۆی منی هێشتوە، بڵێم سەت پرسیاری لێ کردبم، هێشتا کەمە، ئەو وای نیشاندەدا، کە هەر حەزی لە گفتوگۆیە و دەیەوێ بار و دۆخی عێراق بزانێ، بەڵام لە ژێر پەردەش، نیازی دیکەی هەبوو، کە کەسێتیی من بخوێنێتەوە. دوای ئەوی دڵی ئاوی خوارەدوە، کە من کێم، بەڕێوەبەرەکەی ئاگادارکردەوە، تا دەرگای ژوورەکەی لەگەڵم هات.

سەید ئەسوەد، بۆ خۆی ئەسوەد بوو، زەلامێکی کەڵەگەتی تێکچەقیوی بە هەیبەت و شەوکەت، زۆر پۆشتەوپەرداغ و ڕەزاسووک، لەبەرم هەڵستاو، بەخێر هاتنی گەرمی کردم

و ئاو و قاوەمان بۆ هات. سەرگوزشتەیی ئەو دیدارەم بۆ گێڕایەوە، کە پێش دوو مانگ لەگەڵ خوشکمدا هەیبووە، ئێستاش من لەسەر بەڵێن و قەولی ئەو لە عێراقە وە هاتووم. ئەلهەقی پێشوازییەکی گەرمی لێکردم و گوتی بەڵێ، لەبیرمە و بەڵێنەکەش دەهێنمە دێ، بەڵام بە هەوڵ و هیمەتی هەردوو لامان، هەرچەندە ئێستا سەرقاڵی ئاهەنگەکانی (١)ی فاتیحین. بە وردی تەماشای بڕوانامە و بەڵگە فەرمییەکانی کرد، کە لەگەڵ خۆم هێنابووم. ئەوجا منی ڕادەستی کارگێڕێکی دیکە کرد، کە سوودانی بوو، بۆ ئەوەی کارەکانم ڕایی بکات. ئەویش هەموو نووسراوەکانی منی کۆپی کرد، دوای دانیشتنێکی نیو سەعاتی، گوتی دەبێ لە دوو ئەزموون، سەرکەوتن بەدەست بێنی، ئەزموونی زارەکی و ئەزموونی نووسراوەیی، دەربارەی توانستیی زمانی ئینگلیزییم.

ــ بڕۆ، حەفتەیەکی دیکە وەکو ئیمڕۆ وەرەوە، خودا کەریمە!

ئەوەی لە گفتوگۆیەکانی بەهلوول و سەید ئەسوەدم هەڵێنجا، ئەوەبوو، ئەوان جۆرە سۆزێکیان بۆ سەددام و ڕژێمەکەی هەیە، بە پێچەوانەی ئەوەی لە میدیاکاندا دژی سیاسەتیی سەددام نیشانی دەدەن. ئەوان ڕووداو و قەیرانەکانی عێراقیان دەخستە ئەستۆی ئیستیعمار و زایۆنیزم و دەوڵەتانی سەرمایەدار و وڵاتانی کەنداو... .

هەرچەندە، چاوەڕوانکردنی ئەو حەفت ڕۆژەم لە دڵگران بوو، بەڵام چونکە، دەستپێکی دیدارەکەم، لەگەڵ هەر سێ کەسدا، لە دیدی خۆمدا، ئومێدبەخش بوو، زۆر لە دڵی خۆمدا بە هەندم وەرنەگرت. بڕیاریشمدا، تا دەستبەکار نەبم، پەیوەندیی بە ئاواتەوە نەکەم لە هەولێرێ. بەڵکوو خەبەرێکی خۆشم چەنگ کەوێ!

ئەو حەفتەیەم بە هەل زانی و چەندان جار، بە تەنیا یان لەگەل دکتۆر کازم دەچوومە بازاڕ و شوێنە گشتییەکانی شار. شارەزاییەکم پەیدا کرد. بێگومان هەر شارێک نەخشە و ڕوخسار و دیمەن و خەسڵەتی تایبەت بەخۆێ هەیە. هەرچەندە، پێش ئێستا ئەو شارەم نەدیتیبوو بەڵام، سێ جۆرە ساختومان و خانووبەرە و شەقام و گۆڕەپانم لێک جوودا دەکردەوە. شوێن و گەڕەکە دێرینەکانی شارەکە، کە مێژوویان بۆ سەدان ساڵ دەگەڕێتەوە. ئەو شارە کە بەدەستی فینیقییەکان درووست کراوە، چەندان سەردەم و ڕۆژگار و پاشا و مەلیکی بە چاوی خۆی بینیوە. بە ئاشکرا پاشماوەکانیان دیارە. جۆری دووەم، لە دیمەنەکان کە لە ناوەندی شار کۆبوونەتەوە، ئاسەواری ئیمپڕاتۆریەتی ڕۆمانی و دواتر

داگیرکەرانی ئیتاڵییە. هەرچی خانوبەرەی جوان و گەورە و سەرنجڕاکیش هەیە، هی ئەو سەردەمانەنە. کتومت هەمان دیزاین و کەرەستە و شێوازی باڵەخانە و ساختومانەکانی خۆیانە لە ئیتاڵیا. ئەوە دوو واتا دەگەیێنێ، لە لایەک، بەڕاستی خزمەتی ئەو شارە و ئەو وڵاتەیان کردووە، لە لایەکی دیکە، بەڵگەنە، کە ئەوان، هاتوونەتە ئەو وڵاتە بە نیازی مانەوەی یەکجارییان. وەک بڵێی خاکەکە، خاکی خۆیانە. ئێمە لە عێراق، هیچ پاشماوەیەکی ساختومان و شەقام و پرد و ئەوشتانەی میراتی ئینگلیزیمان بۆ بەجێنەماوە، کە جێپەنجە و مۆری ئەوانی پێوەبێ، وەکو ئەوەی ڕۆمانی و ئیتاڵییەکانی ئێرە... . بەڵام جۆری سێیەم، لە نەخشە و گۆڕانکارییەکان، دیارە هی دوای هاتنی قەزافین، بۆ نموونە (٥) ساختومانی چەندان نهۆمی بە ناوی (ذات العماد)، تاوەری تەرابلس، هۆتێل و شەقام و گۆڕەپانی گەورە گەورەی سەردەمییانە. هەر لە ناوەندی شار، گەڕەکێکی هەژارنشین هەبووە، بە ناوی گەڕەکی خانووە تەنەکەکان، قەزافی هەموو کردووەتە ئەپارماتی بەرز بەرز و بە خۆڕایی بەسەر دانیشتووانەکانی ئەوە گەڕەکەی دابەش کردووە. بەڵام پرسیارێک دەکرێ، ئایا ئەوەندە گۆڕانکارییە لە ماوەی (٢٥) ساڵدا، و بە بووجە و داهاتە، کەم نییە؟ ئەوا دەبێ بگەڕێینەوە بۆ سەردەمی پێش (١ی فاتیح)، تا جیاوازییەکان بزانین.

دوای حەفتەیەک، لەسەر بەڵێن و وادەکە، چوومەوە کۆمپانیای نەوتی نیشتیمانیی زاویە، ئومێدم هەبوو، ئەوجارە لالۆ بەهلوول هێندە بە پرسیاران سەغڵەتم نەکات و شتێک بچنیینەوە جێ بگرێ. دیسان، نزیکەی یەک دەمژمێر، بهلوول منی لە لای خۆی هێشتەوە و هیچ پرسیار نەما لێم نەکات. دواتر بە پەیوەندیی کردنی بە خاڵۆی سوودانی، ئاگاداری کردمەوە، کە دەبێ حەفتەیەکی دیکە سەردانیان بکەمەوە. هەرچەندە پێداگریم کرد، کە بارودۆخی من جیاوازە، چونکە گەر بزانم، کارەکەم مەیسەر نابێ، دەگەڕێمەوە سەر وەزیفەی خۆم لە هەولێر، سوودی نەبوو... .
بە دڵشکاوی گەڕامەوە ماڵ.

ئەو ماوە کورتەی کە لەوێ بووم و بە بینینی و تێکەڵ بوون لەگەڵ مامۆستا و دکتۆرەکانی زانکۆ، لە خانووەکانی ئیتاڵی، بەرچاوڕوونییەکم لە لا درووست بوو، کە هیچ بەڵێن و وادە و گرێبەست و پەیماننامەیەک لەگەڵ بەرپرسانی لیبیی، جێگەی متمانە نییە، ئەوان چونکە دەشتەکین، زۆر مەزاجین، زوو بیروبۆچونیان دەگۆڕن و پابەندی بەڵێن و گفتیش نیین. پتر

لەسەر بنەمای ئاشنایەتی و ناسین و حەزی خۆیان کاردەکەن. دکتۆری زانکۆ هەبوو، گرێبەستیشی لەگەڵ کراوە و دواتر وەرنەگیراوە.

ئابلوقەیی قورسی ئابووری لە لایەن ئەمریکا و ڕۆژاواوە، ڕۆژ بە ڕۆژ توندتر گەرووی هاووڵاتیانی عیراقی شەکەت دەدا و لە خنکان نزیکی دەکردنەوە. دینار بەهای نەمابوو، وڵات کاول بوو، دامەزراندن نەبوو، بێئیشی خێزانەکانی شەپرزەکردبوو، جا چونکی هەر لیبیا و یەمەن، بەبێ ڤیزە هاووڵاتی عیراقیان وەردەگرت، ڕۆژانە دوو تا سێ پاسی گەورە( پاسی مونشەئە)، لە ڕێی کەندوای عەقەبە و میسردا دەهاتنە لیبیا. سەرەتا هەر مامۆستای زانکۆ و پزیشک بوون، دواتر ئەندازیار و مامۆستای ئامادەیی و دەرمانساز و ... بە لێشاو ڕوویان تێکرد. وای لێهات، هەر یەکێک، کەس و دۆستی خۆی ڕادەکێشا. ئەوەی کە جێگەی سەرنج بوو، سەرڕای ئەوەی کە ئەو عیراقیانە، ڕوویان لە وڵاتی غەریبی کردبوو و بۆ پەیداکردنی پارووەنانێک هاتبوون، بەڵام زۆر بە تۆغی بەربەرەکانی و ململانێی سیاسیی لە نێویاندا چەکەرەی کردبوو. هەر گرووپ و باڵێک بۆ لای خۆی ڕادەکێشای. کوردەکان، پارتی و یەکێتی و چەپ بوون. سوونەکان و شیعەکان، سەربە دەیان گرووپی دژبەیەک بوون. بەعسییەکانیش، ئەوانەی پیاوی سەفارەت و حیزب بوون، ڕۆڵی خراپییان دەدیت. کەم ڕۆژ هەبوو شەڕەدەمێ و شەڕەچەقە لە نێوانیان ئەو عیراقیانە ڕوو نەدات.

من خۆم لەو بەزمە دوورەپەرێز گرتبوو، لەگەڵ چەند دکتۆرێکی قورس و گرانی زانکۆ، پەیوەندیی خۆشم دروستکردبوو. زۆرجار بەیەکەوە کاتمان بەسەر دەبرد.

ئەو حەفتەیەم تا بڵێی بە قورسی لێ ڕۆیشت و جۆرە ڕەشبینییەک بەسەرمدا زاڵ بوو، زۆر بیری منداڵ و خوێندکار و هاوڕێی و دوکانەکەشم دەکرد... .

کە وادەی سەردانەکەم هات و چوومەوە لای لالۆ بهلوول لە زاویە، بینینم لە پرسگەکەدا، دوو کەسی سمێڵ بەعسیانی دانیشتبوون، یەکسەر دڵم خەبەری دا کە ئەوانە عیراقینە و ئەوانیش بۆ چاوپێکەوتن و دامەزراندن هاتوون. من هیچ خۆم تێنەگەیاندن، بەهلوول داوای کرد، لە سەر تەختێکی نزیک ئەو دانیشم. ئەو دوو زەلامە ڕەزاقورسە، بە چاوێکی پڕ لە حەسوودی و جۆرە بێزارییەک تەماشایان دەکرین، لە گفتوگۆ گەرم و گوڕەکەی نێوانمان مورتاح نەبوون. پێدەچوو لە دڵی خۆشیان وایان دانابێ، کە وەرگرتنی من لەو کۆمپانیایە مسۆگەرە!

دەوری نیوەڕۆ، لە ژوورێکدا لەگەڵ ئەو بەرپرسە سوودانییە، بەیەکەوە دانیشتین بۆ ئەنجامدانی چاوپێککەوتنەکە. من وام دانابوو، ئەزموون و پرسیار و توێژینەوەکان، قورس و زەحمەت بن، بەڵام بینیم، هەر دوو تاقیکردنەوەی زارەکی و نووسراو، زۆر ئاسایی و هاکەزایی بوون بۆ من. بۆ خۆشی، ئەو سوودانییە، هەستی کرد، کە بەو پەڕی متمانە و باوەڕبەخۆبوون، وەڵامی پرسیارییەکانی دەدەمە و بەسەریاندا زاڵم. دیسان، وەکو جارەکانی پێشوو گوتی، بڕۆ حەفتەیەکی دیکە وەرەوە، هەرچەندە، ویستم، ئەرزوحاڵی خۆمی بۆ بەیانکەم، دیار بوو، سوودی نەبوو، بەوەی کە هیچ شتێک لە دەست ئەودا نییە. هەموو بڕیارێک لە لای سەید ئەسوەدی بەڕێوەبەرە.

هەرچەندە دڵنیابووم لە دەرچوونم لە چاوپێکەتنەکەدا، بەڵام چونکە هێندە دەنگوباسی سەیر و سەمەرەم دەربارەی دامەزراندن و کارکردن لە لیبیا بۆ باس کرابوو، گومانم لە هەموو شتێک دەکرد. کە شەش ڕۆژم تەواو کرد و سەری حەوتەمین ڕۆژ چوومەوە بەردەم لالۆ بهلوول، هەستم کرد، کە زۆر بەساردییەوە لە چاو جاران، پێشوازی لێکردم، دوای خواردنەوەی پیاڵە چایەک، بە دەنگێکی نزم گوتی:

ـــ مامۆستا، ببورە کە پێت بڵێم، سەید ئەسودە باوکی ئەتۆ خۆش و جارێ پرسەی هەیە، دەبێ چاوەڕوان بکەی. داواشت لێ دەکەم، کە پێویست ناکا سەردانی ئێرە بکەیتەوە، دەتوانی تەلەفۆنم بۆ بکەی.

ئەمە خەبەرێکی یەکجار ناخۆش بوو، چونکە لە لیبیا، پرسە بەلانی کەم مانگێک دەخایەنێ و پرسەدار، لەو مانگەدا لە ماڵەوە پێشوازی لەو میوان و ئەو کەسانە دەکات کە دەچن فاتیحە بخوێنن. کە بە خوشکیشم گوتی، من تەواو نیگەرانم لەو قسەیەیی بهلوول کە گوتی، چیتر مەیەوە ئێرە! ئەو ماستە موویەکی تێدایە.

لەماڵەوە، بووە مشتومڕ، ئەوان دەیانگوت، دەبێ بچیت بۆ پرسە و سەرەخۆشی لە سەید ئەسوەد بکەی، منیش ئەوەم بە کارێکی شیاو نەدەزانی و دەمگوت خۆ نان و پیوازم لەگەڵ ئەو زەلامە نەخواردووە، ئەو لە کوێ دەزانێ من کێم؟! بە هەرحاڵ، لەگەڵ دکتۆر کازم، دوای ئەوەی ناونیشانمان لە بهلوول وەرگرت، چووینە سەر تازییەکە. هەرچەند ئەوەیش پێداگری دەکرد، ئەگەر نەشچم زەرور نییە. کە چووینە پرسەکە، بن دەوارەکەیان مۆنجەی دەهات، پێنەدەچوو دە ڕۆژبێ باوکی مردبێ!

سەرتان نەهێشینم، نزیکەی دوای (٢٠) ڕۆژ، بەهلوول پێیڕاگەیاندم کە دەتوانم بچم بۆ کۆمپانیا، بۆ بینینی سەید ئەسوەد، کە دەستی بە کار کردووەتەوە ـ دیارە لەبەر ئەوە زوو گەڕاوەتەوە، چونکە پێگە و مەقامەکەی لەو کۆمپانیا بایەخدار و هەستیارە.

کە چوومەوە لای سەید ئەسود و لە سەر هەمان کورسیی جاری پێشوو دانیشتم، هەرچەندە بە پرسە و پرسەنامە دەستم بە گفتوگۆکرد، لێ، بینیم، کە ئەو زاتە، زۆر بەهەند گوێ لە قسەکانم ناگرێ. دوای کەمێک، بەبێ ئەوەی تەماشای من بکات و خەریکی قەڵەمەکەی نێو دەستی بوو، بە دەنگێکی نزم و لە سەرەخۆ گوتی:

ـــ مامۆستا فازیل، دەبێ قسەکانم، بە سینگێکی فراوان و واقیعبینانە لێ وەرگری. دەربارەی توانست و شارەزایی و کارامەیت لە زمانی ئینگلیزی و ئیشەکتدا، قەت تۆزقاڵە زەڕڕەیەک، گەردی لەسەر نییە و، ئاستە زانستییەکەت موممتازە. بەڵام، ئەم دەزگایە و کۆمپانیایەی ئێمە، بەشێکە لە ئاسایشیی نەتەوەیی لیبیا، ناتوانین هەموو کەسێک لێرە قبوڵ بکەین. دوای لێکۆڵینەوە، دەرکەوتووە، کە کوردەکانی بەرەزانی و تاڵەبانی سەر بە ئیسرائیل و زایۆنیزمن، بۆیە، قبوڵمان نییە، کەسێکی وەک تۆ لێرە ئیش بکات و بە نهێنییەکانی ئێشمان بزانێ!

هیچ وشەیەک شک نابەم، بتوانم وەسفی ئەو دوو دەقیقەیەی پێبکەم کە گوێم لەو قسانە بوو. چاوم تاریک بوو، پشیم سوار بوو، وەک کەسێک قورگی گیرابێت و بیەوێ بە هەموو هێز و توانای خۆی هاوار بکات و بڵێ:".... وا نییە! ڕاست نییە! درۆیە! بوختانە!"

وەک برووسکە، دیمەنی دوو هەتیوە عێراقییەکەی لە لای بەهلوول دانیشتبوون، لە مێشکی دام و زانیم، ئەو فیتیی ئەوانە، لەبن گوێی بەهلوولیان خوێندوە، کە (ئەو کوردانە، جاسووس و پیاوی بەکرێگیراوی ئیسرائیل و وایان کردووە و وا دەکەن لە شیمالی عێراق).

بە دەنگێکی پچڕ پچڕ گوتم:

ـــ سەیەد ئەسود، من ڕۆژی یەکەم پێمگوتی، کە تەنها بۆ وەرگرتنی ڤیزە، من (١٠٠٠) دۆلارم چووە، جگە لە خەرجی ئەو سەفەرە کەوا دێ ببێتە دوو مانگ، کە دەتزانی ئێمە جاسووسین، بۆ زوو پێت نەگوتم. ئەدی بۆچی موعەمەر قەزافی هەموو ڕۆژێ پشگیریی خۆی بۆ دامەزراندنی دەوڵەتی کوردی دەردەبڕێ؟ ئێستا من چی بکەم؟

هەر ئەوەندەی گوت:

ــ الله غالب! خۆت بگەڕێ لە کۆمپانیایەکی دێ، غەیرەی کۆمپانیاکانی نەوت و گاز، ئیشێک پەیدا بکە، لە لیبیا ئیش زۆرزۆرە.

پێش ئەوەی، بە دڵشکاوی ژوورەکە بەجێبهێڵم، هێندی قسەم کرد، بەڵام، ئەو زەلامە، بە هیچ جۆرێک، بەسەر زاری دانەهات بڵێ، ببورە، یان بمانبەخشە! یان عەفومان کە. "الله غالب" تاکە دەستەواژە بوو سەر لێوی بەرنەدەدا.

کە گەڕامەوە ماڵ، گوتم، من دەبێ بگەڕێمەوە و ئەم وڵاتە بۆ من نابێ. لێمان بوەوە ناخۆشی. ئەوان دەیانگوت، بگەڕێوە، بەڵام هەر نەبێ پارەی سەفەرەکە و ڤیزەکەت بێتەوە دەست، ئەوجا بگەڕێوە.

ئێستا، ڕێگەی ئەزمیر و دەریایی سپی لەمن قەدەغەکرا. چونکە کونسوڵگەریی تورکیا لە لیبیا، تەنها ڤیزە دەداتە ئەو کەسانەی کە بە فەرمی لێرە ئیش دەکەن و نووسراوی مۆرکراوی دەوڵەتیان پێیە. بۆیە دەبێ، ڕێی وشکانی، میسر و کەندوای عەقەبە و ئوردن بگرمە بەر. بەیانییەک، دەستم دا جانتاو چوومە تێرمناڵی ئۆتۆمبێلەکانی سەفەر بۆ میسر دەکەن. بەڵام، دکتۆر کازمم لێ پەیدا بوو، کردیە ڕاکێشان ڕاکێشان و جانتاکەی لێساندم و ئیقناعی کردم کە بگەڕێمەوە ماڵ، گۆیا لەوێ ئەوان بەرنامەی دیکەیان هەیە بۆ من!

بەرنامەکەی وان ئەوە بوو، کە بچم لە کەرتی پەروەردە، هەر نەبێ ساڵێک وەک مامۆستا دامەزرێم، لە ڕێی چەند کەسێکەوە، منیان نارده پەیمانگەیەکی تەکنیکی هەر لە تەرابلس. کە چوومە ئەوێ، ئیدارەی پەیمانگەکە پێشوازی لێکردم و زۆریشی پێخۆش بوو، بەڵام کە پیاسەیەکم بە ناو پەیمانگەکەدا کرد، ڕای خۆم گوڕی و داواکارییەکەم کێشایەوە. بینیم، هەرچی شیشە ئاسنی ئەستووری دەرگاکانی ئەو پەیمانگەیە هەیە، لە مێخڕا هەڵکێشراون، وەک کەممەی گۆچان چەمێنراونەتەوە. هەرچی شووشەی پەنجەرەیە شکاوە، ڕەحلە تاق و لۆقی هی ئەوەیە لەسەر دانیشی، تەختە ڕەش شانی داخزاوە... هەروام دەهاتە بەرچاوم کە پێشتر لەشکری هۆلاکۆ بیرەدا ڕەت بووبێ و ئەو شوێنەی ئاوا کاول و وێران کردبێ. جا ڕووخسار و شێوەی ئەو خوێندکارانەم هاتە بەرچاو، کە چۆن ئێمەمانان دەتوانین، ماڵیان بکەین و دەرسیان پێبلێین، پێناچێ، ئەسەڵەن ئەوانە، خوێندکار بن و دەفتەر و قەڵەمیشیان پێبێ!

خوشکم لەگەڵ شووەکەی، هەر جرپ و جۆپیان بوو، بۆ لای ئەو دکتۆرانەی کە ئاشنایەتم لەگەڵ پەیدا کردبوون، بەڵکوو ئیقناعم بکەن، جاریّ ددان بەخۆمدا بگرم و نەگەڕێمەوە کوردستان. لە ڕاستیدا، دڵدانەوەی ئەوانیش نەختێ ساردی کردمەوە، بە تایبەتی کە هەواڵە ناخۆشەکانی هەڵگیرسانی شەڕی ناخۆمان ڕۆژانە دەبیست! ئەوجا، ئەوان دەیانگوت، باشترە بمینیتەوە و زوو هەوڵ بدەی ماڵ و منداڵت لەو دۆزەخە ڕزگار بکەی. هەموو کوردێک تەممەنا دەکا ڕۆژێک زووتر کوردستان بەجێبهێڵێ. دیانگوت... کوردستان چۆل بووە!

ڕۆژێک، کەسێکی عێراقی کە خەڵکی شاری بەسرا بوو، هاتە ماڵمان، تەعارفمان کرد، زانیم کە سەرپەرشتیاریی زمانی ئینگلیزییە لە شاری سرت و لە هەشتاکانەوە لە لیبیایە. ئەو کەسێکی چەپ یان هەواداری کۆمەنیستەکان بوو، ئەگەرچی شیعە ئاییزا بوو. زۆر مەدح و ستایشی سیستمی پەروەردەی شاری سرتی کرد. هەرچەندە ئەو دیمەنەی پەیمانگەی تەکنیکی تەرابلس لە بەرچاوم ون نەدەبوو و هەستم دەکرد، ئەوە نموونەی قوتابخانەی هەر هەموو لیبیایە.

دایکم، هەمیشە دەیگوت، شتێک کە خوا قەڵەمی لێدا، خۆشت نازانی چۆن مەیسەر دەبێ و سەردەگرێ و دێتەجێ. من ئەسڵەن، لە ژیانمدا، ناوی سرتم نەبیستبوو، بەڵام، نازانم چۆن، ڕازی بووم کە بچمە ئەو شارە و لەوێ مامۆستا سەعد، لە قوتابخانەیەک دامبمەزرێنێ.

نازانم، چۆن بوو ڕازی بووم!؟

## (٤)

# ســرت، شاری قەدەر و چارەنووس

بەیانی زوو زوو لە ماڵ دەرچووم بەرەو گەراجی سەرەکیی شار، تا لەوێوە بەرێکەوم بەرە شاری سرت. دەبووایە پێش کۆتایی دەوام بگەمە بەڕێوەبەراتیی پەروەردەی ئەو شارە، لەوێ مامۆستا سەعد، چاوەڕێی دەکردم. ژیان و ئاوەدانی لە لیبیا تەنها لە کەنار دەریایەکەدا هەیە، هەتا پتر بۆ باشوور و قوڵایی سارا شۆڕبیتەوە، ژیان و ئاوەدانی کاڵتر دەبێتەوە، تا دەگەیتە ناوجەرگەی گەورەترین سارای جیهان کە بە سارای گەورە یان سارای ئەفریقیا ناسراوە و هیچ ژیان و بوونێکی تێدا نییە جگە لە مار و دووپشک، کە پێویستیان بە ئاو نییە.

بە درێژایی ڕێگا، کە هەمیشە دەم کەنار و کەنار لەگەڵ دەریایەکە دەڕوا، هەموو دار و درەخت و سەوزاییە، نزیکەی (٦٠) کیلۆمەتریش لە پایتەخت، بەرەو ڕۆژهەڵات، دوور دەکەویتەوە، هێشتا وادەزانی هەر لە شار دەرنەچوویت، دواتر وردە وردە ئاوەدانی و خانووەکان کەمدەبنەوە، کە بەشارێک تێدەپەڕی، ئەگەر شارەزا نەبی یان پێت نەڵێن، نازانی ئەو شارە ناوی چییە، چونکە، هیچ تابلۆی شارەوانی دانەندراوە، یان هێمای هاتووچۆ، ناوی شارەکانی نیشان نەداوە، لە شاری خومس تێپەڕبووین، بەرەو شاری موسراتە، کە نزیکەی (٢١٢) کم دوور بوو، هەردوو لای ڕێیە سەرەکییەکە هەموو دارخورما و دەوەن و ڕەز و باخ بوو. هەر چەند کیلۆمەترێک لە ئاقاری ئەو شارە ڕەتدەبی، سەرەتای سارایەکی پان و بەرینی وشک و برینگ دەست پێدەکا، تا دەگاتە سرت، کە ئەویش (٢٧٤) کم دەبێ. لەو ناوەدا، هیچ ئاوەدانییەک نابینی، تەنها لە ناوەندی ڕێگایەکە یەک تاقە دارخورما هەیە. چونکە ئەو دارخورمایە بۆتە هێمای ڕێگایەکە، لە هەموو لیبیا ناوناوبانگی دەرکردوە و بووەتە خاڵێکی جوگرافیی بایەخدار، بە سایە ئەو دارخورمایە دەزانی چەندە ڕێت لەبەر مایە. یان کە ڕووداوێک ڕوودەدات، دەڵێن ئەوەندە کیلۆمەترە لە پێش یان لە دوای دارخورمایەکە. لە دوای ئەو دارخورمایە، گوندێکی چەند ماڵی هەیە پێیدەڵێن، وشکە. من هەر زگم بە مامۆستای ئەو گوندە دەسووتا، کە چۆن باسی دار و درەخت بۆ منداڵەکان دەکات، چونکە ئەوەی شینای بێ و دارودرەخت بێ لەو گوندە

بوونی نەبوو. لە نێوان وشکە و سرت، سارای دووەم دەست پێدەکا، کە ئەوەیش هەر دەشتێکی کاکی بەکاکییە تا چاوبڕدەکا هەر حووشترالوکە.

ئۆتۆمبیلە (٧) نەفەرییەکەمان، کە وەک هەموو ئۆتۆمبیلەکانی کرێی ئەو وڵاتە، لە جۆری دۆج بوو، تەنها دوو جار ڕاوەستا، ئەوەیش بۆ نوێژکردن، چونکە سەرەتای مانگی ڕەمەزان بوو، چێشتخانە و چایخانە نەبوو. لەو ڕێگا (٤٧٧) کیلۆمەتریەشدا، تەنها یەک بازگەی پۆلیس ڕایان گرتین و تەماشایەکی ناوی موسافیرەکانیان کرد. لە لیبیا، کە سەفەر دەکەی، ناوی هەموو موسافیرەکان تۆماردەکەن و کۆپییەکی ناوەکان دەدەنە شۆفێرەکە، موسافیری غەیرە لیبیش دەبێ پەساپۆرتەکەی ڕادەستی شۆفێرەکە بکات، تا نەگاتە جێ ناتوانێ وەریگریتەوە.

کە گەیشتینە گەراجی سرت، هێندەی نەما بوو لە تینان بخنکێم، هەرچۆنێک بوو، شووشە ئاوێک و نەختێ پسکیتم کڕی، چووم لە شوێنێکی نادیار، بە دزییەوە، خواردم، چونکە لە ڕەمەزاندا لەوێ خواردن و خواردنەوە کوفرە.

نازانم، ئەو ڕۆژە چۆن سرتم هاتە بەرچاو، ئەو شوێنەی کە بارەگای پەروەردە بوو، زۆر نزیک بوو، کە چووم مامۆستا سەعد چاوەڕوانی دەکردم. فەرمانگەکە هەر دوو سێ ژووری هاکەزایی بوو، دوو یان سێ کەسی لێ بوو. مامۆستا سەعد گوتی:

ـــ ئێستا وا کاتژمێر یەکە، لە دوای سەعات یانزدە، لێرە فەرمانگە نامێنێ، بە تایبەتی لە ڕەمەزانان، با بچینە ماڵەوە، سبەینێ دێینەوە.

منیش سوپاس کرد و داوام لێکرد کە بمگەیێنێتە ماڵی دکتۆر حیکمەت، کە پێشتر لە ماڵی خوشکم تەعاروفم لەگەڵ کردبوو.

دکتۆر حیکمەت، کە مامۆستای بابەتی دەستوور بوو لە کۆلێژی یاسا لە زانکۆی (ئەلتەحەدی) لە سرت، کوڕێکی دڵسۆز و ڕۆشنبیر و چالاک بوو، ئەو لە مەسیحییەکانی بەغدا بوو و کەسێکی مارکسی بوو، چەند ساڵێک بوو لەگەڵ هاوژین و (بەغدادیە)ی کچی هاتبوونە لیبیا. ئەلهەقی، ئەو شەوە زۆر خزمەتیان کردم و بەیانییەکەی، لەسەر ڕێی چوونی بۆ زانکۆ، منیشی لە پێش فەرمانگەی پەروەردە دابەزاند. دەوری سەعات دە، مامۆستا سەعد پەیدا بوو، منی لەگەڵ خۆی بردە لای لیبییەک کە پۆشاکی لیبیی لەبەر بوو، عەبایەکی مەیلەو زەردی لەسەر شان بوو، تازە دەهات ڕیشی ماش و برنج بێ، لە

هەڵسوکەوتی دیار بوو، بەڕێوەبەر بوو. مامۆستا سەعد، پێیگوت، کە ئەوە مامۆستایەکی زۆر باش و خاوەن ئەزموونی بابەتی زمانی ئینگلیزییە، ئەویش یەکسەر گوتی، باشە با بچێ لە قوتابخانەی (ئەلوەحدە) دەستبەکار بێ. یەکسەر مامۆستا سەعد، دەستی گرتم و چووینە دەرەوە، لە ناو ئۆتۆمبیلەکەی خۆی، هێندێ زانیاری لێوەرگرتم، ناوی سیانی و ساڵی دەرچوون و ژمارە ساڵەکانی ڕاژەم و ئەو کتێبانەی لە عێراق دەمان خوێند. بە زۆر منی بردەماڵەوە، ئەوجا تەکسییەکی بۆ گرتم و بە شۆفێرەکەی گوت، بمبات بۆ قوتابخانەی (ئەلوەحدە) لە (غەربیات)، گوتیشی هەر شتێکت ویست من لە خزمەت دام.

ــ باشە، مامۆستا سەعد، ئەدی هیچ نووسراوێکی فەرمیم نادەیتێ؟ بچم، چیان پێبڵێم، نابێ، نووسراوێکی پەروەردەم پێ بێ؟

ئەوەیش، بە زەردە خەنەیەکەوە گوتی:

ــ نا نا، هیچی ناوێ، خۆیان دەزانن! دوای بۆخۆت تێدەگەی!

دیتم، تەکسی ڕوو لە تەرابلس، بەرەو ڕۆژاوا دەڕوا، لە شار دەرچووین، بیری خراپم بە مێشکدا هات، بە شۆفێرەکەم گوت:

ــ برا، ئەتۆ، ئەمن دەبەیتە کوێ؟ بۆ لەشار دەرچووی؟

ــ دڵت هیچ نەکا، دەزانم غەریبەی، دەتبەمە ئەو شوێنەی تۆ دەتەوێ، ئەوێ (٥) کیلۆمەتر لە دەرەوەی شارە!

کە گەیشتنە قوتابخانەکە و جانتاکەی دەستم داگرت، چوومە ژوورەوە، بینیم کەس دیار نییە. ژووری بەڕێوەبەر و ژووری مامۆستاکان قوفڵدراون. قوتابخانەکە جوان و سەردەمیانە بوو، دیار بوو دە دوانزدە پۆل بوو. نەمزانی چی بکەم، ئاوەدانیش سەت مەترێک دوور بوو، دواتر گوێم لە دەنگەدەنگێک بوو، کە چوومە گۆشەی دالانێک، بینیم دوو کەس، وا یاری تێنس دەکەن. چوومە لایان و باسی خۆم بۆکردن کە وەک مامۆستا بۆ ئێرە ناردراوم. ئەوان هەر خەریکی یاری خۆیان بوون. گوتیان، بڕۆ سبەینێ وەرەوە، مودیر و مامۆستا ئێستا هەموویان لەسەر ئیشن لە مەزرا و گێلگەکانی خۆیانن. کە پرسیارم کرد، چۆن ژوورێک بدۆزمەوە تا بەکرێی بگرم، بە پێکەنینەوە گوتیان، شتی وا لە مێشکی خۆت دەرکە. لە لیبیا، بە تایبەتی لە لادێ، کەس خانوو ناداتە زوگورتی. کە پرسیم، ئەدی لە قوتابخانە ژووری تایبەت نییە؟

یەکێک لە گەنجەکان، کە لێوی خوارەوەی نەختێ شەقی پێوە دیار بوو، تەمەنی هەر ٢٧ ساڵ دەبوو، گوتی:
ـــ با، شوێنی نووستن هەیە، لە قوتابخانە، وەرە لەگەڵم، دەبێ بە ئۆتۆمبیل بچین.
زۆر زگم بەخۆم دەسووتا، نەمدەزانی، چیدەڵێم و چی دەکەم، ئەو سەڵتەنەتەی هەولێر و ئەو غەریبییەی ئێرە، تەواو سەری لێشێواند بووم! بە دەستم بووایا، هەر ئەو ساتە دەگەڕامەوە تەرابلس و لەوێڕا یەکسەر بۆ کوردستان. ئێستا من لە شوێنێکم تەکسیشی لێ نییە و کەس ژوورێکیشت پێ ڕەوا نابینێ.
کوڕە گەنجەکە گوتی:
ـــ من ناوم صدیقە، مامۆستای وەرزشم، ئێستا دەچین بۆ قوتابخانەیەکی دیکە، خاڵم بەڕێوەبەرە و بەرپرسی هەموو دەڤەرەکەیە. ئەکید زۆر دڵخۆش دەبێ، بە بینینت.
بە پیکابێکی ژاپۆنی، بەڕێکەوتین. ڕێگەکە قیرتاو بوو بەڵام پێچ و لۆفەی زۆر بوو، بەرەو قوڵای سارا دەرۆیشتین، لای دەستە ڕاستی ڕێگاکە، هەموو مەزرا و ڕەز و دارزەیتوون بوو، لای چەپیش خانووی ماڵەکان بوو، خانووەکان کۆمەڵ کۆمەڵ بوون، شەش حەوتێک بە یەکەوە، دوای یەک کیلۆمەتر شەش حەوتێکی دیکە، هەر بەم شێوەیە، دوای شەش حەوت دەقیقەیەک گەیشتینە ئاواییەک لەسەر گردێک مزگەوتێکی جوان دیار بوو، بۆ لای دەستە چەپ، بە ناو خانووەکان بایداوە و چوو لەبەردەم دەرگای قوتابخانەیەک ڕاوەستا و چووینە ژوورە و چوار پێنج مامۆستا لە هەیوانەکە دیار بوون. مامۆستا صدیق، یەکسەر منی بردە ژوورێک، کە دوو قەرەوێڵە و چەند دولابێکی پلێت و ئاشبەزێکی هاکەزایی لێ بوو. گوتی، دانیشە، ئێستا دێمەوە، دەچم، خاڵم دەینم!
هەر بیست دەقیقەیەکی پێچوو، دەرگای ژوورەکەم کرایەوە، کەسێک، نەختۆکەک باڵای لە کورتی دەدا، بەڵام چوارشانە و تۆکمە بوو، ڕەنگی پێستی سپی و ددانێکی زێڕی هەبوو، پرچی بۆ لای ڕاست کردبووە گودلە، پۆشاکی لیبییانی پۆشی بوو عەبایەکی مەیلەوە زەردیشی لەسەر شان بوو، دیار بوو عەبایەکە لە گران بەهایەکان بوو.
بەدەم زەردەخەوە هاتە ژوورێ، بە هەردوو دەستان تۆقەی لەگەڵ کردم و بەخێر هاتنی کردن، گوتی:

ــ من عەبدولناصرم، بەڕێوەبەری ئەو قوتابخانەم. یاخوا بە خێر بێت بان چاوانم. نازانم بۆچی تۆیان بۆ قوتابخانەی ئەلوەحدە ناردووە، من (٨) پۆلم هەیە و مامۆستای ئینگلیزیم نییە و چەندان جار ئاگادارم کردوونەتەوە! تۆ لە لای من دەمێنیتەوە.

ویستم، حاڵی بکەم، کە من بۆ قوتابخانەیەکی دیکە ناردراوم، چۆن دەبێ لە شوێنێکی دیکە دەست بەکار بم؟

ــ هیچ خەمت نەبێ، هەموو شتێک بە دڵی تۆ دەبێ، سبەینێ بەیەکەوە، دەچینە بەڕێوەبەرایەتیی پەروەردەی سرت و ناوەکەت دەخەمە سەری قوتابخانەکەی خۆم. دەزانم تۆ جارێ زۆر ماندووی، بڕۆ دەست و چاوت بشۆ، لەو گەرماوەی تەنیشت ژوورەکەت، منیش پێش فتار دێمەوە، بە یەکەوە لە ماڵ فتار دەکەینەوە.

ئۆتۆمبیلەکەی عەبدولناصر، سالۆنێکی ژاپۆنی خاوێن بوو، دوای نزیکەی پێنج دەقیقە گەیشتینە ماڵەکەی، کە لەسەر بەرزاییەکی لای دەستە چەپی ڕێگایەکە بوو، شەش حەوت خانووی دیکەی لە دەور بوو. چووینە ژووری میوانان کە ئەوان پێیدەڵێن مەربووعە. پێدەچوو خانووەکە نوێ بێت و ئێستاش کاری تێدا دەکرا، چەندان ژوور و هۆڵ و داڵان بوو، بیر و چیمەنی گەورەی تێدا بوو، لە دووڵاوە شوورەی هەبوو، بە شەش حەوت پێپلیکانی کۆنکریت بۆی بەسەر دەکەوتی، هەر چواردەوری چرا و گلۆپی بە شەوق بوو.

مەلا بانگی دا و فتار کرایەوە، لە پێشدا لەسەر دەستە باشییەک چەند پەرداغێک ئاو و فنجانە قاوە و ئیستکانە شیرییان هێنا، نەختێ کێکی دەستکردی ماڵی لەگەڵ بوو لە شێوەی بازنە و ئەلقە بوون. دوای نوێژکردن، کوریژگەیەکی دە دوانزدە ساڵان مەسینە و دەستشۆری دانا، بۆ دەست شووشتن، هەرچەندە دەستشۆری شووشەی بە بەلوعە لە داڵانەکە هەبوو. ئەوجا قزعەیەکیان هێنا کە لە ناو پارچە نایلۆنێک گرێدرا دابوو، کە لچکەکانی نایلۆنەکەیان کردەوە، یەک لەگەن مەعکەڕوونی بوو، پلە گۆشتی گەورە گەورەی تێدا بوو، لەگەڵ هێندێ سەوزەی وەک بیبەر و خەیار و پیاز و تەرەوتوولە، قزعەکە بۆ چوار کەسان بوو، چوار کەوچکی لەگەڵ بوو، مامۆستا صدیقیشمان لەگەڵ بوو. لە داڵان و هەیوانەکە چەند کوڕە گەنجێک لە هاتووچۆ دابوون. دوای نانخواردن، دیسان مەسینە و دەستشۆر هاتەوە بۆ دەست شووشتن. کەلتووری فتاکردنەوەی لیبییەکانی جیاوازە لەگەڵ کەلتووری خۆمان، ئەوان بە شیر و قاوە و ئاو ڕۆژوو دەشکێنن، ئەوجا

خواردنێکی سووک دەخۆن، کە لە نوێژی تەراویح گەڕانەوە، ژەمە سەرەکییەکە دادەنرێت. ئەوەش لەبەر ئەوەیە، کە ڕەنگە ئەگەر دوای خواردنێکی تێر و تەسەڵ بچنە نوێژ، لەو هەموو ڕکات و سووژدە بردنە، تێکبچن و بۆ تەندرووستی باش نەبێ. لیبییەکان، زۆربەی هەر زۆریان تا کاتی پارشێو ناخەون، شەوی ڕەمەزانانیان زۆر پڕ هات و باتە.

هەر مامۆستا عەبدولناصر منی هێنایەوە قوتابخانە و خواردنی ژەمی بەیانیشی بۆ دانابووم. بۆ بەیانییەکەی منی بردە بەڕێوەبەرایەتیی پەروەردە، پێیگوتن، ئەو مامۆستایە لە لای خۆم دەبێ. لە پێشوازیکردن و گفتوگۆیان لەگەڵ بەڕێوەبەر نوێیەکەم، هەستم کرد کە ئەو زاتە پێگەیەکی باڵای هەیە، وەک بڵێی وەزیری پەروەردەی ئەو دەڤەرەبێ هێندە ڕێز و حورمەتی لێدەگرن.

هەر ئەو ڕۆژە، داوام لە مامۆستا عەبدولناصر کرد، مۆڵەتی سێ ڕۆژم بداتێ، بگەڕێمەوە تەرابلس جانتا و شتومەکی پێویست لەگەڵ خۆم بێنم و پەیوەندیش لەگەڵ ئاواتی هاوژین بکەم لە هەولێر، لەوەتەی بەجێمهێشتوون، هیچ ئاگام لێیان نییە.

ئەلهەقی، مامۆستا بە ئۆتۆمبیلی خۆی منی گەیاندە گەراج و بە شۆفێرەکەشی گوت، "ئاگاداری ئەو مامۆستایە بە، ئەوە برای منە!" سەیرم کرد، هەموو ئەو بەڕێوەبەرم دەناسن و دەست لەسەر سینگ بۆی ڕادەوەستن.

عەبدولناصر، گوتی، تا تۆش دەگەڕێتەوە، تەلەڤزیۆن و سەلاجە و تەباغت بۆ دادەنێین و ژوورەکەت بۆ ئامادە دەکەین!

## (٥)

# یەکەم وانە و یەکەم هەواڵی خوێن لە کوردستانەوە

لە تەرابلس، سەینوبەینی چۆنیەتیی دامەزراندم، بۆ خوشکم و شووەکەی باس کرد و نیگەرانیی خۆشم نەشاردەوە، دامەزراندنەکەم ناچێتە ئەقڵ، ئاخر نە ئەوان پسوولە کاغەزێکیان لە من داوا کرد، نە ئەوانیش پسوولە کاغەزێکیان دا بەمن، تا بزانم، مووچەم چەندە، تەنانەت ناوی قوتابخانەکەشیان پێنەگوتم. هەر ئەو دوو پرسیارەی مامۆستا سەعدی سەرپەرشتیار نەبێ، کە لە لای خۆی تۆماری کرد. ئەوان گوتیان، ئارام بە، دواتر، وردە وردە، هەموو دۆسیەکەت لەگەڵ کۆپی پەساپۆرتەکەت لێوەردەگرن.

هێشتا مۆبایل لەوێ دانەکەوت بوو، لە هێندێ فەرمانگەی دەوڵەت ئامێری فاکس هەبوو، بۆ پەیوەندیکردن بە ئاواتی هاوژینم، دەبووایا، بە دوو هەنگاو بێ، جاری یەکەم، تەل بۆ ماڵە خزمێک بکەم تا ڕۆژی دواتر، ئاوات بچێتە ئەوێ چاوەڕوانی پەیوەندیی دووەمی من بکات لەوێ.

ڕەمەزان، لە لیبیا، واتا ڕاوەستانی ژیان و ئیشوکار، جا لە فەرمانگە و دامودەزگای دەوڵەت بێ یان، لە مەڵبەندەکانی خوێندن و بازاڕ و کاروکاسبی.

تەلەفۆن بۆ دەرەوەی لیبیا، کە لە دیدی لیبییەکان، لە ڕوانگەی ئاسایشیی نەتەوییەوە زۆر جێگەی بایەخە و چاویان لەسەرە، تەنها لە بەڕێوەبەرایەتیی پۆستی ناوەندی تەرابلس دەکرێ. جا چونکە ڕەمەزانە و کارمەندەکان بەڕۆژوون، شەو دوای نوێژی تەراویح دوو سێ سەعات کار دەکەن. ئەوەی غەیرە لیبی بێ و بیەوێ بۆ دەرەوەی لیبیا، تەلەفۆن بکا، دەبێ لەو شوێنە ئامادەبێ. هەر دوای نانخواردنی ئێوارە، بە ئۆتۆمبیلی نەفەرات، چوومە ناوەندی شار و وردە وردە بە پێیان چوومە پۆستەخانە، وەک بۆیان وەسف کردبووم. ئەگەر ئەو هەموو ئانتێنە بەرز و سەتەلایتانە لەسەر باڵەخانەکە دیار نەبووبان، نەتدەزانی، ئێرە پۆستەخانەیە، چونکە هیچ تابلۆیەک بەسەر دەرگا و دارو دیوارەکەوە نەبوو.

خوا خوام بوو، زوو تەلەفۆنەکە بکەم، لە سرەگرتن، یەکەم یان دووەم کەس بم. دەرگای سەرەکیی پۆستەخانە کرابۆوە، کە چوومە ژوورەوە، کەسم نەدیت، شوێنەکە زۆر کش و

مات بوو، پێنەدەچوو کەس کەسێ لێ بێ، لە دالانەکان گەڕام و سەرم بە ژوورەکان دادەگرت، بینیم، هەر خۆم و خۆم لەو شوێنەم. باڵەخانەکە پێنج شەش نهۆم بوو، تا بڵێی فەرمانگەیەکی گەورە بوو، خۆفێکم کرد، گوتم، ئێستا پیاوانی ئاسایش، بمبینن و لێپێچینەوەم لەگەڵ بکەن کە بۆچێ لەو ناوە دێم و دەچم، چی بڵێم؟ کێ باوڕم پێ دەکا؟ خێرا، بە بێدەنگی هاتمە دەرەوە و دوور بە دووری بە دیار دەرگاکەوە ڕاوەستام، وەبێ هەر کەسێک بچێتە ژوورە و من دووەم کەس بم. کە لەبەر دەرگاکە چاوەڕوانم دەکرد، بە خۆم دەگوت، باشە ئەگەر دوژمن، یان بڵێین ئیسرائیل، ئێستا بچێتە ئەو باڵەخانەوە، هەمووی تالانکات و بیتەقێنێتەوە و بیسووتێنێ، کێ دەزانێ؟ چۆن دەبێ، دەوڵەتێکی وا گەورە، بەڕێوەبەرایەتییەکی وا گرنگ، بە بێ پاسەوان و دەرگەوان و چاودێر بەجێبهێڵێ و دەرگاش بخاتە سەر گازەری پشت. دەبێ جوولەکە، ئەوە نەزانن، باشترین کات، بۆ هێرشکردنە سەر لیبیا ڕەمەزانانە، لە ڕەمەزانیش، کاتی فتار کردنەوە، چما لەو پایتەختە گەورەیەدا، یەک زەلام لە ڕێوبانان دەبینی؟

خودا کردی، وردە وردە خەڵک دەهاتن، منیش چوومە ئەو بەشەی تایبەت بوو بە بەدالەوە، لەسەر کورسییەک، لە شوێنی چاڕوانکردن دانیشتم. دوو یان سێ، کابینە دەرگایان کردەوە، هەموو فەرمانبەرەکان پیاو بوون و پۆشاکی میللیان پۆشی بوو. کە دەچێتە پێشەوەی مێزەکەی، پەساپۆرتەکەتی دەدەیتێ، لەسەر پارچە کاغەزێکیش ژمارەی تەلەفۆن و ناوی شار و ولات و ناوی خۆت دەنووسێ و چاوەڕێ دەکەی تا ناوت دەخوێننەوە. کە سرەی تۆ هات، ئەو لە بەدالەکە، تەلەفۆن دەکا تا خەتەکە (ژمارەکە) وەرگرێ، دەبێ خۆشی گوێی لە وەڵامی تەلەفۆنەکە بێ، تا دڵنیابێ کە ئەو کەسە کێیە. ئەگەر خەتەکە وەریگرت، دەپرسێ، تۆ فلان کەسی؟ ئەوجا پێی دەڵێ، ئەوا لیبیات لەگەڵە. جا ئەگەر ژمارەکەی بۆ وەرنەگیرا، ناوت دەخوێنێتەوە و دەڵێ، ژمارەکە وەرناگیرێ، دوایی وەرەوە. دەبێ ماوەیەک خۆت بخافڵێنی بەڵکوو دەرفەتێکت بۆ دەرەخسێ. خۆ ئەگەر جاری دووەمیش هەر ژمارەکە وەرنەگیرا، ئەوا، دەبێ شەوێکی دیکە بێیتەوە، دەڵێن، خەڵک زۆر سرەی گرتووە، کاتمان لێ مەگرن.

خۆشبەختانە، هەر لە تەلەفۆنی یەکەم، توانیم لەگەڵ ئاوات قسە بکەم، بە هەڵکەوت بۆ خۆی لەو ماڵە بوو. بێگومان گلەیی و گازەندەیان زۆر بوو، کە بۆچی هیچ پەیوەندییەکم

پێوە نەکردوون و ئەوانم لە بیرنەماوە. سەرتان نەهێشینم، هەموو شتەکانم بۆ باس کرد، ئەوجا پێمگوت، چۆنتان پێباشە وادەکەم، دەتانەوێ بێمەوە، دێمەوە، یان چاوەڕوان بکەین بزانین، ئەو ساڵ چۆن دەبێ، وادەکەم.... بەڕاستی ئەوانیش لە بارودۆخێکی زۆر قورس و ناخۆش دابوون. بڕیاردانەکە بۆ وانیش زەحمەت بوو، بڵێن، وەرەوە، بیر لەو مەسەرفە زۆرە و دوارۆژە تاریکەی کوردساتان دەکەنەوە، کە کاروانی کۆچبەران بۆ هەندەران بەردەوامە، ڕۆژ بە ڕۆژیش ئاگری شەڕی ناوخۆ خۆشتر دەبێ، هیچ زانیاریشیان لەسەر ژیانی لیبیا نییە.

بە کورتی و کرمانجی، ئەوانیش گوتیان، خۆت بڕیاربدە و ئەگەر دەزانی، ئومێدێک هەیە، با ئەو ساڵ لەوێ بێت.

کە سێیەمین ڕۆژ گەڕامەوە سرت و غەربیات، شتومەکی پێویستم لەگەڵ خۆم هێنا، وەک شتومەکی پێخەف و جلک و بەرگ و خاولی... لە هەمووانیش گرنگتر، ڕادیۆیەکی گەورەم لەگەڵ خۆم هێنا کە پاتری و کارەبایی بوو.

دەوری سەعات حەوت و نیوی بەیانی، دەرگای هەیوانی قوتابخانەکە دەکرایەوە، دوو دەرگا سەرەکییەکەی حەوشە، دەرگایان پێوە نەبوو. جا یان مامۆستا عەبدولناصر بۆ خۆی دەهات یان مامۆستا حەلیمە جابر، کە یاریدەدەر بوو، زۆربەی جارانیش، بەیەکەوە دەهاتن، چونکە دروانیی یەکتر بوون. قوتابخانە نە پاسەوانی هەبوو نە بەردەست و کارگوزار. پێش هاتنی ئەوان، ئەمن نانی خۆم خواردبوو و پۆشتە و پەرداغ، بە پۆشاکی فەرمی، چاکەت و پانتۆڵ و بۆینباغ، ئامادە دەبووم.

مامۆستا عەبدولناصر، هاتە ژوورە و (ئەبلە) حەلیمەشی لەگەڵ بوو، تەوقەی لەگەڵ کردم و بەخێر هاتنێکی گەرمی کردم و خۆشحاڵی خۆی نیشاندا. ئەو مامۆستایە کچە، تەمەنی لە سییەکان بوو، بێ لەچک بوو، پرچ کورت، باڵاڕێک و ئەسمەرێکی خوێنشیرین و ڕوخسار جوان و گورج و گۆڵ دیار بوو. داوایان کرد کە بچمە ژووری بەڕێوەبەر. مێزێکی نووسینگە ڕووی لە دەرگا بوو، تەلەفۆنێکی لەسەر بوو، دوو سێ تەختە قەنەفە و سێ چوار دۆلابی پلێت، هێندێ وێنە بەدیوارەوە هەڵواسرا بوون.

دەستە دەستە، مامۆستا کچەکان دەهاتنە ژوورە و یەک یەک تۆقەیان لەگەڵ دەکردم و بەخێر هاتنیان دەکردم، تا بووە سەعات هەشت و زەنگ لێدرا. بینیم لەگەڵ لێدانی زەنگەکە

هەموو قوتابییەکان چوونە گۆڕەپانی قوتابخانەکە و پۆل پۆل بەریز وەستان لە شێوەی پیتی (L)ی لاتینی. ئەوجا مامۆستاکان هێندێکیان کە ڕابەری پۆل بوو، لەگەڵ خوێندکارەکانیان ڕاوەستان و هێندێکیش، بە کۆمەڵ بەیەکەوە ڕاوەستان، من و عەبدولناصریش بەیەکەوە لە لایەکی بەرچاوی گۆڕەپانەکە ڕاوەستاین. دیار بوو، خوێندکارەکان چاویان لەسەر من بووم چونکە مامۆستاکان پێیان گوتبوون، مامۆستای بابەتی ئینگلیزیمان بۆ هاتووە.

ژمارە مامۆستاکان (٢٥) مامۆستا بوون، بە بەڕێوەبەر و یاریدەدەر، هەشت پۆل خوێندکاری پۆلی شەش و حەوت و هەشت و نۆ بوون. پاشنیوەڕۆ لە پۆلی یەک تا پۆلی پێنج دەوامیان دەکرد، ئەوانیش (١٢) مامۆستا بوون، دوو یاریدەدەریان هەبووم مامۆستا عەبدوڵلا ڕەمەزان و (ئەبلە) عەنەد.

دەتوانم بڵێم ژمارەی خوێندکارە کوڕ و کچەکان وەک یەک بوون، ژمارەیەکی کەم لە کچەکان لەچکەیان لەسەر بوو، مامۆستاکانیش نیوە بە نیوە. خوێندکارە کچەکان یەکپۆش بوون، بەڵام کورەکان نا. بەگشتی پۆشاکیان جوان و پاک و خاوێن و پۆشتە و پەرداغ بوون. مامۆستا کچەکانیان، زۆر بە کەمی تەنکە میکیاژێکیان پێوە دیار بوو، بەڵام مامۆستا ژنەکان میکیاژ و ئارایشتیان تۆخ و دیار بوو.

مامۆستا عەبدولناصر پێیگوتم کە لە سیستمی پەروەردەی لیبیا، دەستپێکی خوێندن، بەیانی بێ یان پاشنیوەڕۆ، (١٥) دەقیقە تەرخان دەکرێ بۆ چالاکیی ڕۆشنبیری و مەعریفی و وەرزش. ڕابەری هەر پۆلێک، بە گوێرەی خشتە، بەرنامەکان ئامادە دەکات.

لە پێشدا، مامۆستای وەرزش، کە کچێکی تەمەن (٢٥) بەهاری خەپەی گورج و گۆڵ بوو، هێندێ ڕێنمای پێدان تا ڕیزەکانیان ڕێکخەن و جوان ڕاوەستن و چەند جارێک وریابە و پشووبدەی پێکردن، ئەوجا لە دوو بڵندگۆ، کە لەسەر بانی قوتابخانەکە ڕوو لە گۆڕەپانەکە داندرابوون، بەرنامەکان دەستی پێکرد. ئەوە پێیدەگوترێ (ئیستگەی قوتابخانە)، ئامێر و مایک و نەوارەکانی لە ژوورێکی بچکۆڵە دایە، مامۆستایەک و چەند خوێندکارێک، کە بابەتی ئامادە کراویان هەیە، لەوێ بەرنامەکان پێشکێش دەکەن.

سەرەتا، سلاوی دەستەی کارگێران و ناوی پۆلەکە خوێندرایەوە، ئەوجا چەند ئایەتێک لە قورئانی پیرۆز، بە تۆمارکراوی. وتاری پۆل، پێشکێش کرا. پاشان، چەند بابەتێکی

زانستی و مەعریفی. لەگەڵ شیعر و سروود خوێندەوە. لە کۆتا بڕگەش، هەموو جارێ، نوکتەیەکی خۆش و کورت دەگێرنەوە.

ئەوجا بە ڕابەرایەتیی مامۆستای وەرزش، خوێندکارێک ئاڵا بەرز دەکاتەوە لە گەڵ سروودی نیشتیمانی لە ئیستگەی قوتابخانە و سێ خوێندکار، ڕۆژانە ئەو دروشمانە دەڵێنەوە لە شێوەی پرسیارو وەڵام:

| خوێندکار | خوێندکارەکان بە یەک دەنگ |
|---|---|
| العرب | امتی |
| المسلمون | اخوتی |
| القران الكريم | شريعتي |
| الفاتح العظيم | ثورتي |
| الدفاع عن الوطن | مسووليتي |
| اهدافنا | وحدة، حرية، اشتراكية |
| اعدائنا | الامبريالية و الصهيونية و الرجعية |

پاشان پۆل پۆل، خوێندکارەکان دەگەڕێنەوە پۆلەکانیان بەدەم بیستنی سروودی نیشتیمانی لە ئیستگەکەوە، ئەوجا وانە دەست پێدەکا. ئەو خوێندکارانەی دواکەوتوون یان ڕۆژانی پێشتر، بە بێ مۆڵەت نەهاتوونەتە قوتابخانە، سزا دەدرێن، مامۆستای وەرزش دوو یان چوار داریان لە دەستی دەدا.

کە چووم کتێبی خۆم هێنا و ویستم بچم بۆ پۆل، بینیم هەر مامۆستایەک، لەسەر مێزێکی نزیک دەرگای داڵانەکە بڕێک تەباشیر و داردەستێک هەڵدەگرێ و بەرەو پۆلەکەی خۆی دەچێ. من هەر تەباشیرم هەڵگرت، دوو سێ هەنگاو نەڕۆیشتبووم، بەڕێوەبەر کە لەگەڵ دوو سێ مامۆستا ڕاوەستا بوون، پێیگوتم:

ـــ مامۆستا فازیل، دارێک لەگەڵ خۆت ببە!

ـــ ببورە مامۆستا، من پێویستم بە دار نییە!

مامۆستاکان، بە تێچاوێکی پڕ لە حەپەسانەوە، تەماشای من و بەڕێوەبەریان کرد. وەک بڵێی سەرپێچییەکم لە ڕووی ئەودا کردبێ! ئەوجارەی بەڕێوەبەر گوتی:

ـــ کوڕی باش! دارێک هەڵگرە، لێرە باشترین مامۆستا بەبێ دار، پۆلی بۆ دابین ناکرێ!

به هێمنی گوتم:
ــ ئەرکی من ئەوەیە، قوتابییەکان فێرە زمانی ئینگلیزی بکەم. خۆ من بۆ لێدانی ئەوان نەهاتووم. ئەگەر مەسەلەکە لێدانە، خۆ خۆتان دەتوانن ئەنجامی بدەن.

چوومە پۆلەکەی خۆم. من هەمیشە یەکەمین دەرس، تەرخان دەکەم، بۆ ئاشناکردنی قوتابییەکان بە پرۆگرام و ئەزموون و ئەرک و کتێب و دەفتەری پێویست و بۆیان ڕوون دەکەمەوە من چیم لەوان دەوێ و ئەوانیش دەبێ چاوەڕێی چی لەمن بکەن.

سێیەمین ڕۆژ، دەچوومە پۆل، مامۆستا عەبدولناصر گوتی:
ــ هەرچەندە من هەرگیز ناچمە دیدەنی مامۆستا لە پۆلدا، بەڵام حەز دەکەم یەک چارێک لەگەڵ تۆ بێمە پۆل.

لە ناوەڕاستی دەرسەکەدا بووم، مامۆستا گوتی، دەکرێ تا زەنگ لێدەدا لەگەڵت بمێنیمەوە؟

کە زەنگی لێدا و بەیەکەوە بەرەو نووسینگە دەگەڕاینەوە، ئەو گوتی:
ــ ڕۆژانە کە جەمال و ئەحمەدی کوڕم دێنەوە، هەر باسی دەرسی تۆ دەکەن و زۆر حەزی لێدەکەن و لێت ڕازین.

جەمال پۆلی حەوت و ئەحمەد پۆلی هەشت بوو.

ئەوەبوو لەیەکەم کۆبوونەوەی مامۆستایان، مامۆستا عەبدولناصر لە دڵڕا مەدح و ستایشیی شێوازی دەرسگوتنەوەی من کرد و پێیگوتن، خۆزیا، ئەو کاتانەی دەرستان نییە، دەچوونە دیدەنی ئەو لە پۆلدا، دڵنیام زۆر شتی لێ فێر دەبن. دیارە ڕێگەی دەرسگوتنەوەی وان لەگەڵ هی ئێمە جیاوازی هەیە.

لە ماوەی ئەو دوو سێ حەفتەدا، کە قوتابخانە چۆل دەبوو و قوتابیانی پاشنیوەڕۆش دەوامیان تەواو دەبوو، هەر خەریکی جوانکاریی دارودیواری دالان و هۆڵ و هەیوانەکە دەبووم. لە ژووری نیگارکێشان، تابلۆی جوان جوانم هێنا و هەڵمواسین، زەنگێکی جوانم بۆ دروستکردن و لە جێگەیەکی گونجاو هەڵمواسی و وردە وردە بە چاککردنەوەی دەرگا و پەنجەری شکاوەکانی پۆلەکان خۆم دەخافڵاند. بە کورتی، تەنانەت دیکۆر و دیزاینی ژووری بەڕێوەبەریشم گۆڕی بە شێوەیەک جوانتر و شیاوتربێ.

دیزاینی قوتابخانەکە، سێ بەش بوو، هۆڵ و داڵان و چوار ژوور، بۆ بەڕێوەبەر و مامۆستایان ــ بە ژووری نووستنی منیشەوە. لە دەرەوەش ڕیزێک پۆل کە شەش پۆل بوون، لە بەشێکی تازە دروستکراویش کە دە مەتریک دوور بوو، چوار پۆلی دیکە هەبوو. ژوورۆکەکیش کرابووە حانووت. بەشی ئاودەستیش لە پشتەوە هەڵکەوتبوو. یەک لای قوتابخانەکە شوورەی هەبوو، بەڵام دەرگای پێوە نەبوو. وەک هەموو قوتابخانەکانی لیبیا، هیچ تابلۆیەکیشی بەسەرەوە نەبوو. بۆیەش ناوی لێنرابوو قوتابخانەی صاڵح بویصیر، چونکە ئەو زاتە کە وەزیری پەروەردە بوو، لە سەرەتای حەفتاکاندا، لەگەڵ دروستکردنی ئەو قوتابخانەیە، لە کەوتنەخوارەوەی فرۆکە گیانی سپارد بوو. قوتابخانەکە ڕوو لە چۆلی بوو، لە دووری نزیکەی (٣٠٠) مەتر، فەرمانگەی ئەلەفی ئاژەڵان و بەیتەرخانە هەبوو کە پاڵی بە گردۆڵکەیەکەوە دابوو. ئەو ناوە هەموو دەشتایی لم بوو، نەختۆکەک پۆش و پۆڵاشی هەبوو، قەت هیچ ڕووەک و دارودرەختێکی پێوە نەبوو.

لە ناو حەوشەکەدا سێ دارتووی گەورە هەبوو، لە دامێنی خوارەوەشی شەش حەوت دار کالیپتۆس هەبوو. گۆڕەپانەکە لم بوو. لە سەر چەند ڕووبەرێکی دیوارەکان بە خەتاتی بە بۆیە نووسرابوو:

وحدة، حرية، اشتراكية

المعرفة حق طبيعي لكل انسان

الجماهيرية سلطة شعبية

ئەوەشم لەبیرچوو بڵێم، کە دوای دوو سێ حەفتە نۆبەی من هات، بەرنامەی ئیستگەی قوتابخانە بەڕێوەببەم، بەڕێوەبەر و ئەبلە حەلیمە دەستخۆشییی گەرمیان لێکردم و گوتیان:"ئەوەشت جیاواز بوو!" من سڵاوی بەرنامەکەم بە گۆرانییەکی کازم ساهیر دەستپێکرد:

سلامي على اللي حاضر معانا

سلامي على اللي خالي مكانه

سلامي إن شاء الله يوصل سلامي

أسامي ما أريد أذكر أسامي سلامي

پاش خوێندەوەی چەند ئایەتێک لە قورئانی پیرۆز لە لایەن قوتابییەکەوە نەک لە نەوار، قەسیدەیەکی حەماسی جوانی مەحموود دەرویش، لە لایەن کچێکی بە توانا خوێندرایەوە و بڕگەی زانیاریی گشتیشم، کردە گفتوگۆی نێوان دوو قوتابی لە شێوەی پرسیار و وەلام و لە کۆتایشدا نوکتەیەکی خۆش.

چونکە بەرنامەکانی تەلەڤزیۆنی لیبیی هەر هەموو دەنگوباس و وتار و سروود بوون ـــ هێشتا سەتەلایت نەببووە شتێکی باو، دەمەو عەسران و شەوان، هەر لە ڕادیۆ گەورەکەی خۆمەوە بەدوای هەواڵەکاندا دەگەڕام، بەتایبەتی هەواڵەکانی (BBC)، ئێوارەیەک، بەهەڵکەوت دەنگی ئێستگەیەکی کوردی خۆمانم هاتەبەر گوێ، پەخشەکە باش نەبوو، بەڵام کاتێک، وایەری ئەنتێنەی تەلەڤزیۆنەکەم لە گەڵ ئەنتێنەی ڕادیوەکە جەلە کرد و بەست، پەخشەکە باشتر بوو. باشم لەبیر نەماوە، ئێستگەکە هی یەکێتیی نیشتیمانی بوو یان هی پارتی. بەڵام ڕۆژانە دەنگوباسەکانم دەزانی... . بەڕاستی ئەو ڕادیۆیەم هێنا تا مەراق و تەنیایم بڕەوێنێتەوە، کەچی پتر بووە مایەیی خەم و نیگەرانیم، کە هەواڵەکان هەر کوشتن و هێرش بردنە سەریەکتری و خۆپیشاندانی خەڵک دژی ئەو شەڕە و لەبارچوونی پەرلەمان و گرانی و برسیەتی و ئەبلوقەی ئابووری بوون... .

وابزانم، سێیەمین شەو بوو دوای گەڕانەوەم، مامۆستا صەدیق لەگەڵ سێ کەسی دیکە بە میوانی هاتنە لام و منیش خزمەتێکی جوانم کردن. ئەوە سەرەتای یەکەم تێکەڵاویم بوو لەگەڵ خەڵکی ئەو دەڤەرە ـــ تاوەکو ئێستاش ئەو پەیوەندی و دۆستایەتییەمان هەر بەردەوامە سەرڕای ئەو ڕۆژگارە دوورو درێژە.

مامۆستا موفتاح ئەبو زەید، کە سەرپەرشتیاریی بیرکاری بوو، هاوتەمەنی خۆم دەبوو، کەسێکی زۆر هێمن و بە نەزاگەت و ڕەوشتبەرز و نەجیبزادە و ڕووخۆش بوو. ماڵەکەی نزیکترین خانوو بوو لە قوتابخانەکە، ئەو لەگەڵ باوکی لە خانووێکدا دەژیا و هادی و مەحموودی براشی لە دوو خانووی دیکە، دوکانێکی بچووکیشیان لە ناو ماڵەکە، ڕوو لە شەقام کردبۆوە. عەبدوڕەحمان زەرگە، کە چاکەت و پانتۆڵی کەشخە و گران بەهای دەپۆشی بوو، مامۆستا بوو، بەڵام وەک بزنسمان، ئیشی سەرپێی دەکرد، بە تایبەتی لەگەڵ دەرەوەی لیبیا. کوڕێکی باڵابەرزی بەخۆوە بوو، دەتگوت کەرتە شاخە و خاڵێکی لەسەر کۆڵمە بوو و ددانێکی زێر بوو. ئەوەیش زۆر قسەخۆش و دەمبەپێکەنین بوو. ئەوەی

سنیەمیان، ناوی مستەفا بوو، کوڕێکی ڕەشتاڵە بوو، لە ڕوخساریڕا دیار بوو، کە لە کەرتی پۆلیس و ئاسایش کاردەکات و فەرماندەی ئەوانە. ئەوەیش زۆر قورس و بەڕێز بوو، بەڵام لە هەمووان کەمدووتر بوو. دوای دوو سێ سەعات کاتبەسەر بردن، داوایان لێکردم کە دەبێ سبەینێ لە ماڵی یەکێکیان فتاربکەمەوە. نەمزانی بریار بدەم بچمە ماڵی کامیان. دواتر عەبدورەحمان زەرگە، لەسەر کاغەزێک، ناوی هەر چواریانی نووسی و بەرامبەر هەر ناوێکیش ڕۆژێکی حەفتەی نووسی، واتا (٤) ڕۆژ لە دوو یەک زەحفەتکرام.

تاوەکو، دوایین شەوی ڕەمەزان، ئەمن هەر ئێوارەی لە ماڵێک فتارم کردەوە. ئەوانەی بۆ نانخواردن بانگهشتیان دەکردم، مامۆستاکان بوون، کە هەموویان ژن بوون، برا یان باوکیان دەنارد، هێندێکیان باوکی قوتابییەکان بوون، دیار بوو کە ئەوان لە لای باوک و خانەوادەیان باسی منیان کردبوو. جاریش هەبوو، هەر لەکاتی فتارکردنەوە، کەسێک کە ئەوەیش بانگهشتکراو بوو، داوای دەکرد دەبێ سەردانی ماڵی ئەوانیش بکەم.

پێشتر باسی فتارکردنەوەی لیبییەکانم کرد، لەبیرم چوو بڵێم، کە بە میوانی دەچیتە ماڵی لیبییەک، هەموویان لە مەربووعەی پیاوان دێن بەخێر هاتنت دەکەن، دەبێ تۆقەشت لەگەڵ بکەن. تەنانەت ژنەکانیش دێن و تۆقەت لەگەڵ دەکەن، بەڵام بۆ کچی عازەب، هەیە بەخێرهاتن دەکات و هەشە ناکات.

مامۆستا عەبدولناصر و ئەوانی دیکەش، ئەزموونێکی دوورو درێژیان لەگەڵ مامۆستای غەیرە لیبی هەیە. ئەسڵەن بۆخۆیان پەروەردەی بەردەستی مامۆستای غەیرە لیبین. کە قەزافی کودەتای کرد و هاتە سەر حوکم، تاق و لۆقە مامۆستا لە دەرەوەی شارەکان هەبوون، بۆیە هەمیشە پشتیان بە مامۆستای هاوردەی میسری و فەلەستینی بەستووە. کەوایە ئەوان بە دەیان و بەسەدان مامۆستاین دیوە و مامەڵەیان لەگەڵدا کردوون و بۆ ئەوان هاسان بوو، بتوانن کەسیتی و پێگەی ئێمە هەڵسەنگێنن و تێمان بگەن.

لەگەڵ ڕۆژگاردا، پەیوەندیی من و مامۆستا عەبدولناصر خۆشتر دەبوو، زۆر عەسران بەدوام دادهات و بە ئۆتۆمبیل دەچوینە ئەو مێرگ و باخچە و سارایانەی دەڤەرەکە. جاروبار لەگەڵی دەچووم بۆ سەر تازییان. ڕۆژێک چووینە پرسەی کەسێک کە کوژرابوو، پرسەکەی یەکجار قەڵەباڵغ بوو دواتر زانیم کە ئەفسەرێکی پلە باڵایە، بەڵام نەمپرسی کێیە و چۆن کوژراوە. مامۆستا هادی، کە لە ڕشتەی زمانی عەرەبی بڕوانامەی لیسانسی هەبوو

ــ برای مامۆستا موفتاح بوو، ئەویش وەک بزنسمان ئیشی دەکرد، کوڕێکی وردیلەی بنیسی کۆسە بوو، هۆشیار و ڕۆشنبیر دیار بوو، ئاگاداری هەواڵ و دەنگوباسەکان بوو و هەمیشە کتێبی دەخوێندەوە، زوو ڕێنماییکردم، کە بە چاک و بە خراپ، خۆم لە کاروبار و سیاسەتی ئەم وڵاتە هەڵنەقوتێنم چونکە کەسانێک هەنە خواخوایانە، بۆ خۆ ڕەپێشکردن، کەسانی بیگوناح و نەفام تووش بکەن، گوتی،" تۆ هەر باسی سەددام و تاوانەکانی ڕژێمی بەعس دەکەی، بەڵام خەڵکی دیکەش هەنە حاڵییان لە ئێوە پەرێشانترە، بەڵام ناتوانن دەری ببڕن. لێرە، هەر بڵێیت لەل، زمانت لە گوێچکە دەردێنن!." جارێکی دیکەش، هەر تەنیا هەردووکمان بووین، بە تەنزەوە گوتی؛" ئێمەش، لە شێوەی سەرکردە باشەکەی ئێوەمان هەیە."

هێندەی پێنەچوو، دیسان مامۆستا عبدولناصر، منی لەگەڵ خۆی بردە پرسەیەک، لە ئاواییەکی ئەو دەڤەرە، ئەویش هەر پرسەی ئەفسەرێکی پلەدار بوو کە کوژرابوو. لە گەڕانەوەمان مامۆستا بە پەرۆشەوە گوتی؛" ترسم هەیە دیسان وەکو سەردەمی شەڕی (ئۆزۆ و تشاد)مان لێ بێ." من دەربارەی مێژووی ئەو شەڕەی نێوان لیبیا و تشاد هێندێ زانیاریم هەبوو. سەرتان نەهێشینم، دواتر، هەر لە زاری بەڕێوەبەرەکەم زانیم کە لە ناوچەی (جبل الاخضر) چەند حەفتەیەکە شەڕێکی قورسە لە نێوان سوپای لیبی و گرووپە ئیسلامییە چەکدارەکان.

ئەوانەی بە مێژووی لیبیا ئاشنان، دەزانن کە لەدێر زەمانەوە، (جبل الاخضر)ـ کە دەکەوێتە سنووری میسر و شاری بەنغازی، هەمیشە مەکۆ و بنکەی لیبییە یاخیبووەکان بووە، عومەر موختاری ڕەمزی بەرگریی لیبیا، نزیکەی (٢٠) ساڵ لەو دەڤەرە شەڕی دەستەویاخەی لەگەڵ سوپای ئیتاڵیا کردووە. بۆخۆی ڕۆژهەڵاتی لیبیا، بە شاری بەنغازییەوە، قەت دانوویان لەگەڵ تەرابلس نەکوڵاوە و دەیان بزوتنەوەی چەکداریی لەو ناوچە بە درێژایی مێژوو ڕوویان داوە، ڕاپەڕینی (١٧ی شوباتی ٢٠١١)ش هەر لەوێوە دەستی پێکرد. بزووتنەوەی (الإخوان المسلمین)یش لە (١٩٤٩)وە لەو دەڤەرە هەبووە، لە ساڵی (١٩٧٦) بە گەورەترین چالاکی هەڵسان دژی قەزافی، هەوڵی تیرۆرکردنیشان دا، بەڵام سەری نەگرت. زۆریان کوژران و گیران و دەربەدەر بوون. لە سەرەتای نەتەوەکان

هیندێ گرووپی ئیسلامی گچکە گچکە پەیدا بوون بە ناوی (حركة التجمع الإسلامي) و(جماعة التبليغ). بەڵام گرووپە چەکدارەکانیان، زۆریان لە ئەفغانستان گەڕابوونەوە.

دەسەڵاتدارانی لیبیا، نەیانهێشت هێچ میدیای ناوخۆیی و دەرەکی، بە وشەیەک باسی ئەو شەڕ و کووشتارە بکەن. بە قسەی مامۆستا عبدولناصری، ڕۆژانە دەیان فڕۆکەی جەنگی ئەو دەڤەرە بۆمباران دەکات. یاخیبووەکان، کۆمەکی زۆریان لە خەڵکی ئەو ناوچەیەوە بۆدەچێ. ئەو دەیگوت، لە بن بنجە دەوەن و زەمەندەکان، خەڵک، خواردن و شتومەکی پێویستیان بۆ دادەنێن. ئەوکات ئەو ئیسلامییە چەکدارانە، پێیان دەگوترا( سەگی خوێری یان سەگی بەڕەڵا) یان (تاقمی زەندەقە). لە زاری مامۆستا عەبدوڵلا ڕەمەزان، کە یاریدەدەر بوو لە دەوامی دوای نیوەڕۆیان، بە سەدان لەو چەکدار و گرووپە ئیسلامییە توندڕەوانە لە گرتووخانەی (بوسلیم) لە تەرابلس زیندانی کراون. دیار بوو، یەکێک لە خزمەکانی ئەویش گیرا بوو. یەکدوجار، باسی ئەو گرتوخانەی بۆکردم، جارێکیان گوتی:"موعەمەر، ئەوانەی لە ژووری پەستاوە، دوور بن لە خەڵک و لە کۆمەڵگا، بەڵام نازانێ، ئەوەی شوان و گاوانە، لەو زیندانە بوون بە زانا و فەیلەسوف. چونکە مامۆستا و دکتۆرە گیراوەکان، ڕۆژانە دەرس و دەوریان لەبن گوێ دەخوێنن و ئەوەی نەخوێندەواریشە، فێرە خوێندەواریان کردوون!

هەر لە سەروبەندی ئەو ڕووداوانەدا، ڕۆژێک مامۆستا عبدولناصر، لە ڕیزبوونی بەیانیاندا، لە جیاتی بەرنامەکانی ئێستگەی قوتابخانە، بۆخۆی بۆ ماوی (١٥) خولەک، بە زمانێکی زۆر توند و بە تورەیی، وتارێکی ئاگرینی پڕ حەماسەتی بۆ قوتابی و مامۆستایەکان دادا، وتەکانی هەڕەشە و گەفی زۆری تێدا بوو، دژی ئەوانەی دەیانەوێ ئاسایشیی نەتەوایەتیی بشێوێنن و پڕۆپاگەندە دژی شۆڕش بکەن. هەمووانی ئاگادارکردەوە، کە ئەوان ئاگاداری خشەی مار و مێرون و دەزانن چ دەگوزەڕێ و دەزانن (هەنە) چی دەکەن و چی دەڵێن. دیار بوو مامۆستا و خوێندکارەکان، لە پەیامەکەی عبدولناصر تێدەگەیشتن، بەبێ ئەوەی، هیچ ئاماژەیەک بۆ کەسە تێکدەران یان جۆری پڕۆپاگەندەکان بکرێ.

دواتر، مامۆستا عبدولناصر، پێیگوتم، ئەو منداڵانەیان فێرە هێندێ هێما و ئاماژەی ناپەسندانە کردووە. بەڵام من نەمپرسی مەبەستی چییە. وامەزەندەکرد، کە ئەو گرووپە

یاخبووانه، هێمای تایبەت بە خۆیان هەبێ، لە نیشاندانی دەست و پەنجە و ئەو شتانە، بەڵام نەمزانی جۆری هێماکان چییە ـــ ئەگەر هەبوو بن!

کە بووە، ڕۆژی عارفە، من گەڕامەوە لای خوشکم لە تەرابلس و یەکەم جەژنەم لە وراتی غەریبی، دوور لە ماڵ و منداڵ و کەسوکار بەسەر برد. دیسان تەلم، بەو بۆنەیەوە بۆ منداڵەکانم کرد.

تاکو ئێستا، بە فەرمی کەس باسی مووچە و دامەزراندنی منی نەکردووە و نازانم ئایندەی بە کوێ دەگات!

# (٦)

# لیبیـــا، یان کیشووەری شانۆنامە و داستانی مێژوویی

ئێمە، هەر ئەو کاتە ناوی (لیبیا)مان دەزانی، کە لە پۆلی چوارەم و پێنجەمی سەرەتایی دابووین و لە ماڵەوە لەگەڵ خوشک و براکانمان، کێبرکێ و مەتەڵ هەڵهێنانمان دەکرد:

ـــ ناوی ئەو وڵاتە چییە، کە لە ڕاستەوە یان لە چەپەوە بیخوێنیتەوە هەر یەکە؟

ـــ لیبیـــا!

ـ ناوی ئەو شارە چییە کە لە دوو وڵاتدا هەیە؟

ـ تەرابلس.

ـــ ناوی ئەو وڵاتە چییە کە پاتەخت و دەوڵەتەکەی یەک ناون؟

ـــ تونس.

لە پرۆگرامەکانی بابەتی جوگرافیاشدا، هەر کە باسی سارا و بیابانە گەورەکانی جیهان دەکرا، ناوی لیبیا لە پێشەوە بوو. لە بابەتی مێژووشدا، جگە لە قارەمانیەتی و خەباتی شەهید عومەر موختار هیچی دیکەیان دەربارەی مێژووی ئەو وڵاتە فێرنەکردین.

کاتێک فلیمی (عومەر موختار یان شێری بیابان) کە ئەکتەری جیهانی بەناوبانگ، ئەنتۆنی کویین، ڕۆڵی عومەر موختاری تێدا بینی، لەساڵی (١٩٨١) لە سینەماکان و دواتر لە تیڤییەکانی بڵاو بۆوە، ئێمەمانان پتر بە مێژووی ئەو وڵاتە ئاشنا بووین، بەتایبەتی چونکە ڕووداوەکانی فلیمەکە هەمان ڕووداو و هەمان شوێن و زەمەنی حەقیقی بوون: دەڤەری (جبل الاخضر) لە ساڵەکانی (١٩٢٩)دا.

جا کە لە لیبیا بووم، زۆر وێنەی ئاسەوار و شوێنەواری دێرینم دەدیت، کە وامدەزانی هی ڕۆما و ئیتاڵیایە، یان جاروبار گوێم لە ناوی قارەمان و داستان و ڕووداوی مێژوویی دەبوو، بۆیە حەزم کرد، شتێک دەربارەی مێژوو و جوگرافییەکەیان بزانم. خۆشبەختانە لە ژووری مامۆستایان و بەڕێوەبەر نزیکەی (٢٠٠) کتێب و گۆڤارێک، لە چەند دۆلابێکی ئاسن دا هەبوو. منیش وردە وردە لە کاتی دەست بەتاڵیدا دەمخوێندنەوە. حەزم دەکرد وەڵامی ئەو پرسیارەم دەستکەوێ:

ئەو (لیبی)یانە کێن؟

ناوی وڵاتی لیبیا، لە وشەی (لوبییە یان لوبیا) داتاشراوە کە، ئاماژەیە بۆ دێرینترین هۆز کە لەو دەڤەرەدا نیشتەجێ بوون و پێیان دەگوترا(هۆزی لیبوو). هەرچەندە لە خاچی برنزییەوە، ئەوێندەر زێدی هۆزی (بەربەرە)کان بوو، بەڵام هەر ناوی ئەو هۆزە لەسەر زاران بووە. ئەو وڵاتە کە دەکەوێتە باکووری ئەفریقیا لە نێوان میسر (لە ڕۆژهەڵات) و تونس و جەزائیر (لە ڕۆژئاوا)دا هەڵکەوتووە. دەریای سپی ناوەند، بە درێژایی (١٨٥٠) کم سنووری باکووریەتی، لە باشووریشدا وڵاتی تشاد و نەیجەرە. سودانیش دەکەوێتە باشووری ڕۆژهەڵاتی. ڕووبەرە فراوانەکەی، یەک ملیۆن و (٧٦٠) هەزار کم² دادەپۆشی. واتا چوارەمین گەورەترین وڵاتی ئەفریقیا و (١٦) گەورەترین وڵاتی جیهانە ــ دەکاتە چوار هێندەی ڕووبەری عێراق و (٢٠) هێندەی ڕووبەری ئوردن. بەڵام لە (٩٠٪)ی ئەو وڵاتە بیابانە و دانیشتوانەکانی بە ڕێژەی (٨٨٪) لە شاری تەرابلس و بەنغازی دادەنیشن. ئیمڕۆ نزیکەی (٦) ملیون حەشیمەت لەوێ دەژین، کە هەر تاکێک نزیکەی (٥٠) کم² زەوی بەردەکەوێ. ئەوان تا ساڵی (١٩٥٠)، حەشیمەتیان لە دەوری ملیۆنێک و (٢٩٦) هەزار کەس بوو.

بەدرێژایی مێژوو ئەو وڵاتە قاقر و وشک و برینگە، گۆڕەپانی شەڕ و ململانێی زۆر بووە.

توێژینەوە و توێکارییە جیۆلۆجییەکان، ئاماژە بەوە دەدەن، کە ملیۆنان ساڵ بەر لە ئێستا، ئەو بیابان و سارایە، وەک ناوچەکانی ئەمەزۆنی ئیمڕۆ، هەمووی دارستان و جەنگەڵی چڕ وپڕ بووە. ئەو نەوت و گازەش هەر بەرهەمی ئەو دار و دەوەنەیە کە لەگەڵ گۆڕانکاریی ئاووهەوادا، ژێر خاک کەوتوون.

گریکە دێرینەکان، لە دەوروبەری سەدەی هەشتەمی پێش زایین، لە دوورگەی کریتەوە، هاتوونەتە ئەو وڵاتە. ئەوان شاری (خومس)یان درووست کردوە. دواتر هۆزەکانی بەربەر، تێیدا نیشتەجێ بوون، ئەوجا فینیقییەکان، لە سەدەی دەیەمینی پێش زایین، کۆچیان بۆ ئەوێ کردووە، تاوەکو هاتنی ڕۆمانییەکان، لە سەدەی دووەمی پێش زایین، شارستانییەتی دەوڵەتی قرتاج ناوناوبانگی هەبووە. لەسەدەی پێنجەمی زایینی لیبیا دەکەوێتە ژێر دەسەڵاتی (مندال)ییەکان و دواتر بێزنتییەکان. تا جارێکی دیکە بەربەرەکان دەبنەوە خاوەن دەسەڵات لەو ناوەدا. کاتێک قەڵەمڕەوی سقلییەکان فڕاوان دەبێ، لە

سەدەی دوانزدەیەمی زایینی، باکووری ئەفریقیا، بە شاری تەرابلسیشەوە، تا تونس داگیر دەکەن. ڕێک لە ساڵی (١٥١٠) سوپای ئیسپانیا تەرابلس دەگرێ دواتر لەگەڵ ڕۆمانەکان ڕێک دەکەون کە بەیەکەوە فەرمانڕەوای ئەو دەڤەرە بەڕێوە ببەن.

لە ساڵی (١٥٥١)ەوە تا ساڵی (١٨٦٤)، لیبیا کەوتە ژێر فەرمانڕەوایی عوسمانییەکان، و دوای شەڕی نێوان ئیتاڵییەکان و تورک لە (١٩١١)، لیبیا بووە خاکی باشووری ئیتاڵیا. بە هەزاران خەڵکیان لە ئیتاڵیاوە هێنا بۆ ئەوەی دیموگرافی ناوچەکە بگۆڕن، بەڵام ڕاپەڕینەکەی شەهید عومەر موختار، دوای شەڕێکی خوێناوی، دوورودرێژ، سەرلەبەری پیلان و نەخشەکەی لێتێکدان. لە ساڵەکانی (١٩٤٣ ــ ١٩٥١) لیبیا لە قەڵەمڕەوی هاوپەیمانان دابوو، فەرەنسا و ئیتاڵیا و بەریتانیا. مەلیک ئیدریسی یەکەم، وەک مەلیکی لیبیا دەستنیشان کرا لە ساڵی (١٩٥١)، ئەو بنەماڵەیە حوکمڕانی لیبیان کرد، تاوکو عەقید موعەممەر قەزافی لە (١ی سێپتەمبەری ١٩٦٩) کودەتای سەربازی بەسەردا کرد و جەڵەوی حوکمی گرتە دەست.

ئەوەی کە دەبێ بگوترێ، (عومەر موختار) کە لە (١٦ی سێپتەمبەر ی١٩٣١) لە شاری تەرابلس لە سێدارەدرا، لە ژێر ئاڵای ئیسلام سەرکردایەتیی شۆڕشێکی دژی ئیتاڵییەکان کرد،، کە نزیکەی (٨٠٠) هەزار قوربانیاندا و زەبری کوشندەیان لە داگیرکەرەکان وەشاند.... ((بەندە لەو خانووەی کە ئەو سەرکردەی تێیدا لە سێدارەدرا، لە ساڵی (١٩٩٦) پیشەنگایەکی کەلتووری کوردیم کردەوە ـ ئەو شوێنە ئێستا بۆتە مۆزەخانە)) هەر بۆ زانیاریتان، یەکەم بۆمب، کە تەیارە هاویشتبێتی لە مێژوو، لە ساڵی(١٩١١) فڕۆکەکانی ئیتاڵیا، لیبیایان پێ بۆمباران کرد.

ئاووهەوای لیبیا، هی دەریای سپیی ناوەڕاستە، بێگومان گەورەترین بیانی جیهان(سارای مەزن) زۆر گەرمە، بەڵام لە کەنار دەریا بەهاری خۆشە و شەوێ فێنکە، لە (جبل الاخضر)، ساڵ هەیە بەفر دەبارێ. بەڵام سەرەتای بەهار و پاییز ڕەشەبابییەکی خۆڵاوی هەیە پێیدەڵێن (گیبلی) کە سێ چوار ڕۆژ دەخایەنێ و زۆر زۆر ناخۆشە. ئەم ڕەشەبایە هێندە بە هێزە (سەگ)ی وەک کیسەی نایلۆن بە دەیان مەتر بەرزکردووەتەوە و بە ئاسماندا لورە لوری لێوە هاتووە. بۆخۆم جارێک لە ڕێگای نێوان تەرابلس و سرت، کە (٤٧٧کم )ە، تووشی ڕەشەبای گیبلی بووم کە هەر مەودای یەک مەتر بە (فوول لایت) ی

ئۆتۆمبیلەکەم، پێش خۆم دەدیت، خۆ (١٠سم) لە شەقام لابدەی، کە دیار نییە وهەمووی بە لم دادەپۆشرێت، ئەوا سەیارەکەت دەچەقێ و کارەساتی لێدەکەویتەوە... بەراستی تا بڵێی ئەو گیبلییە مەترسیدار و ناخۆشە... .

جا چونکە لە لیبیا هەر دوو جار ساڵێ باران دەبارێ. هەرکە باران دەبارێ. مامۆستا و خوێندکارەکان یەکسەر لە پول دێنە دەرەوە، دەرس و دەور نامێنێ، هەموویان، کوڕ و کچ، گەورە و کچکە، دەچنە ناوەندی حەوشە و لەبەر ئەو بارانە ڕادەوەستن، تا وەک پلووسک ئاو لەسەر و پرچیان دەچۆڕێتەوە... . وەک ڕۆژی شەرە بەفری لای خۆمانە. هیچ پێیان ناخۆش نییە کە جلکوبەرگیان تەڕ دەبێ، چونکە ئەوان تا ساڵێکی دیکە باران نابینەوە... . نا بێ ئەوەش لەبیربکەین. ئەوان ناهێڵن یەک دڵۆپ ئاوی باران بە زاعێ بڕوا... چۆن؟ جۆگەڵەیان لەبەر پلووسکی ماڵەکانیان دروست کردووە، ئاوی بارانی هەر ماڵێک دەچێتە ئەو حەوزەی لە حەوشە دروستیان کردووە و پێیدەڵێن (فاسکییە) کە تا چەند مانگێک هەر ئەو ئاوە دەخۆنەوە. ئەوە بۆ مەزرا و گێڵگەکانیش هەر وا دەکەن و ئاوەکە گلدەدەنەوە.

داهاتی لیبیا (٩٤٪) لە بەرهەمی نەوەتەوە دێ و کارگەی چەمەنتۆ و ئاسن و پۆڵا و پەین و پترۆکیمیاویی هەبوو. خاون نزیکەی (٤١) ملیار بەرمیل نەوتی یەدەگی ژێر زەوییە و لە ساڵی (٢٠١٠) بەرهەمی ڕۆژانەی دەگەیشتە (٣) ملیۆن بەرمیل لە ڕۆژێکدا.

لە دوای ئیتاڵیا، لیبیا بە دووەمین وڵات ئەژمار دەکرێت لە زۆری شوێنەوارە ڕۆمانییەکان، بۆیە شوێنەواری بۆ گەشتوگوزار زۆرە.

لیبیا (٢٤) پارێزگایە کە پێیدەڵێن (الشعبیە) و (٢١) زانکۆ و (٨) فڕۆکەخانەی مەدەنی هەبوو لە ساڵی (١٩٩٤).

وەک دەوڵەتیش، لیبیا، ئەندام بوو لە نەتەوە یەکگرتووەکان، لە یەکێتیی مەغریبی عەرەبی، لە کۆمکاری دەوڵەتانی عەرەبی، لە بزووتنەوەی دەوڵەتە بێلایەنەکان، لە ڕێکخراوی هاوکاریی ئیسلامی، هەروەها لە ڕێکخراوی وڵاتانی هەناردەی نەوت.

## (٧)

## موعەمەر قەزافی کێیە؟

کە چوومە لیبیا، وەک مامۆستایەک دەستبەکار بووم و قەت بیرم لەوە نەدەکردەوە کە ڕۆژێ ئەو بیرەوەرییانە تۆمار بکەم یان کتێبێک دەربارەی ئەو وڵاتە بنووسم. بۆیە تێڕاونین و دیدی منیش بەرانبەر موعەمەر قەزافی و وڵاتی لیبیا، جیاوازییەکی ئەوتۆی نەبوو لەگەڵ تێڕاونین و دیدی زۆربەی ئەو خەڵکەی وەکو من بۆ ئیشکردن ڕوویان لەو وڵاتە کردبوو، هەرچەندە، پتر ئەوە بارودۆخی ناخۆش و تاریک و تەمومژاویی کوردستان بوو، من ڕادەستی ئەو قەدەرە کرد. ئەگەر ئەوکات نیازێکی وام لە دڵ گرتبایە، ڕەنگبێ زانیاریی زۆرتر و وردترم پێ کۆکراباوە، بە شێوەیەک، فەرهەنگی زانیارییەکانم پووختتر و بەرپڵاوتر بن.

دوای ڕووداوەکانی بەهاری عەرەبی و کوژرانی قەزافی، لە پێجی فەیسبووک، هێندێ لە هاوڕێیەکانم داوایان لێکردم، کە شتێکیان دەربارەی لیبیا بۆ بنووسم. دوای نووسینی دوو سێ بابەت، قوباد بەهرەوەری شاعیر ـ ڕۆحی پاکی شاد، لە نامەیەکدا، داوای لێکردم کە وەڵامی ئەو پرسیارەی بدەمەوە: ئایا موعەمەر قەزافی سەرکردەیەکی قارەمان بوو، یان حاکمێکی دیکتاتۆر؟ داواشی لێکردم، کە درێژە بەو نووسینانەم بدەم و لە کتێبێکدا چاپیان بکەم. دوای نزیکەی (٦) ساڵ، (لە ئاداری ٢٠٢٢)، هاوڕێیەکی ڕۆشنبیر و خوێنەر، کە ڕۆژهەڵاتییەوە لە دوبلن دەژی، دوای لێکردم کە ئەو بیرەوەرییانە نەفۆتێنم و چاپییان بکەم. بە گوتەی ئەو:"ئەو نووسینانەم پتر لە هەموو نووسینەکانی دیکە سەرنجی ڕاکێشاوە و چێژی پێبەخشیوە!" بەڕاستی، ئەم ڕستەیی کۆتایی هانیدام، کە لە ئەرشیفکەمدا، بەدوای ئەو بابەتانە بگەڕێم و لە سەردوبێژینگیان بدەمەوە و لە کتێبێکدا بڵاویان بکەمە، وادام کەسانێک هەن، ئەو بابەتانەم بەرز دەنرخێنن و پێیان جوانن.

لە دیدی من، نووسینەوەی بیرەوەری، تۆمارکردنی مێژووە، هەرچەندە ئەمە بابەتێکی زاتییە و دەکەوێتە ژێر سۆز و هەست و تێڕاونین و فەلسەفەی نووسەرەکە، بەڵام "قەڵەمپاکیی و ئەمانەتیی و ڕاستگۆیی" سەنگی مەحەکی بەقیمەتی و بێقیمەتی بیرەوەرییە. هەرواشم بۆ قوباد بەهرەوەر نووسی، "ئەگەر هەر گوتەی ئیسلامییە توندڕەواکان تۆمار

بکەم، ڕەنگبێ غەدرێک لە قەزافی بکەم، چونکە ئەوان نەک قەزافی، هیچ سەرکردەیەکی ڕۆژهەڵاتی و ڕۆژاوایان پێ پەسند نییە و بە جەبەرووت و زاڵم و کافر لە قەڵەمیان دەدەن. خۆ ئەگەرخۆشەویستیی کوێرانەی گەنجێکی لیبیش بکەمە سەردەفتەری باسەکەم، کە لە دیدی ئەودا قەزافی مەرتەبەی خوداوەند و پێغەمبەرانی هەیە و گیانفیدای ئەوە، ئەوا دیسان غەدر لە قەزافی دەکەم و وای ئارایشت دەکەم کە پەپوولەیە. کەواتە، بۆ گەیشتن بە "ڕاستیی شتەکان"، با ئەوەی بە چاوی خۆم دیتیتم و ئەوەی بە گوێی خۆم بیستیتم، وەک خۆیان بگێرمەوە. ئەوجا خوێنەر، با بۆخۆی سەرپشک بێ، حوکمی خۆی بدا و وەڵامی پرسیارەکە بداتەوە.

وەک هاوڕێیەک پرسیای لێکردبووم:

"ئەرێ، ئەو موعەمەر قەزافییە کێیە؟!"

قەزافی ناوی(موعەمەر محەممەد عەبدول سەلام کوڕی حومەید ئەبو منیار)ە و دایکی ناوی (عائیشە کچی نیران)ە، لە خێڵی (القذاذفة)یە کە زۆربەیان نیشتەجێی شاری (سەبها)ن، کە گەورەترین شاری باشووری لیبیایە، ژمارەیەکی کەمیشیان لە (وادی الجارف) لە نزیک ڕۆژاوی شاری سرت دەژین. ڕەچەڵەکی ئەو هۆزە دەگەڕێتەوە بۆ سەر باپیرەگەورەیان کە ناوی (مووسا) بووە، قەزافیش چەندان جار دەیگوت ئێمە لە (کوڕانی مووساین)، باپیریان ناوی (عمرو قذافی ئەل دەم) بووە، کە گۆیا وەلییەکی کەرامەتدار بووە. ئەوانە لە ناوچەی غریان ژیاون، (٣٠٠)ساڵێک دەبێ هاتوونەدەتە پێدەشتی سرت. هێندێکیان لەبەر زوڵمی ئیتاڵییەکان، لەکاتی خۆی چوونەتە تشاد، دواتر گەڕاونەتەوە بۆ دەڤەری فەزان.

قەزافی لە (٧)ی تەموزی ساڵی(١٩٤٢) لە گوندێک بە ناوی (جهنم) لەو (وادی الجارف)ە لە خێزانێکی دەشتەکی موحافیزکار لە دایک بوو (ئەو دەڤەرە دوور نەبوو لەو جێیەی منی لێبوو). ئەو لە قوتابخانەیەکی بنەڕەتی لە شاری سرت، دەچێتە بەر خوێندن (ئەم قوتابخانەیە دواتر کرابوو بە مۆزەخانە و بەندە سەردانی کردبوو) و لە ساڵی (١٩٥٦) پۆلی شەشەمی بنەڕەتی تەواودەکات و یەکسەر دەیبەنەوە شاری (سەبها). لەو سەردەمەدا هەموو مامۆستاکانی لیبیا یان میسری بوون یان سوودانی، تاق ولۆقە مامۆستای لیبی هەبوو. جا هەر هەموو مامۆستاکانی قەزافی لە شاری سرت و سەبها میسری بوون.

میسرییەکان بە کەسی ڕۆشنبیر و پێشکەوتووخواز و چاوەکراوە ناسرا بوون. ئەوان لە ساڵی (١٩٥٢) یەکەم وڵاتی عەرەبی بوون کە بە سەرۆکایەتیی جەمال عەبدول ناصر، ڕژێمی پاشایەتیان گۆڕی بۆ کۆماری. ئەو مامۆستایانە زۆر بانگەشەی بیری نەتەوایەتیی عەرەبی و یەکگرتن و ئازادی و سەربەخۆییان دەکرد. جگە لەوەی ڕۆژنامە و گۆڤاری خۆیان بڵاودەکردەوە، ڕادیۆی(صوت العرب)ی میسری زۆر کاریگەری لەسەر هەرزەکار و گەنجەکان پەیدا کردبوو. جگە لەوەش لەو ڕۆژگارەدا چەند ڕووداوێکی مێژووغی ناوچەکەی هەژاند، وەک: کودەتای ساڵی (١٩٥٢) لە میسر و کێشەی کەناڵی سویس لە (١٩٥٢) دواتر شەڕی کەناڵی سویس لە (١٩٥٦) و گەرم بوونی کێشە و قەیرانەکانی نێوان عەرەب و جووکانی ئیسرائیل و سەرهەڵدانی بزوتنەوەی سۆشیالیزم و کۆمونیزم و دژایەتیی کردنی ئایدیای سەرمایەداریی و ڕۆژاوا، ڕۆژ بە ڕۆژ بڵێسەی بەرزتر دەبۆوە و ئاگرەکان خۆشتر دەبوون. ئا لەو کەش و هەوایەدا، قەزافی زۆر بە کەسێتیی جمال عەبدول ناصر موعجیب دەبێ و بیرۆکەی (الوحدة العربية)ی دەچێتە مێشک و لە تەمەنی (١٤) ساڵیدا لە شاری (سەبها) لە یەکەم چالاکیی سیاسی، بە بڵاوکردنەوەی ئەدەبیاتی دژە سەهیۆنیزم و سەرمایەداریی بەشداری دەکات. دواتریش پێشڕەویی چەندین خۆپیشاندانی دژی ڕژێمی پاشایەتی لیبیا ئەنجام دەدا و قەزافی دەبێتە گەنجێکی یاخی بوو لە دەوڵەت، بۆیە لە ساڵی (١٩٦١) لە خوێندن دەردەکرێت و ناچار دەکرێت کە خۆی و خێزانەکەی شاری سەبها بەجێبهێڵن. ئەوانیش ڕوودەکەنە شاری (موصراتە) و لەوێ خوێندنی ناوەندی تەواو دەکات. هەر لەو تەمەنە ناسکەدا، قەزافی قبوڵی نابێ بچێتە ژێر چەتری هیچ پارتێکی سیاسی (وەک پارتی بەعسی) یان ڕێکخراوی ئیسلامی (وەک الاخوان المسلمين)، یان حیزبی شیوعی، دژی تایفگەریی و ناوچەگەریش دەوەستێتەوە. هەر لەو تەمەنە ڕۆشنبیرییەکی باش دەبارەی شۆڕشی فەرەنسا و بیرەوەرییەکانی ئەبرەهام لنکولن و مستەفا ئەتاتورک پەیدا دەکات. بەڵام کارەکتەر و کەسێتیی (عومەر موختار) بە تەواوی ڕۆح و هزری ئەو گەنجە یاخی بووە، داگیر دەکات.

قەزافی بریار دەدات، ڕشتەی مێژوو لە زانکۆی بنغازی بخوێنێ، بەڵام زوو بیری خۆی دەگۆڕێ و بە ڕێککەوتن لەگەڵ تاقمێک لە گەنجە ئازادیخوازەکانی موصراتە، لە (١٩٦٣) دەچێتە کۆلێژی سەربازی و دوای ساڵێک بە دزییەوە (لیژنەی ئەفسەرانی ئازادیخواز)

پێکدێنێ، کە لە ژێر کاریگەری ئەفسەرە شۆڕشگێرەکانی میسر دەبێ. هەر بە دزییەوە قەزافی خۆی دەگەیێتە ئەوان و دەتوانێ کۆمەکی دارایی لەوانەوە بۆ خۆی مسۆگەر بکات. بۆیە لە سەرتاسەری لیبیا، دەکەوتە گەڕان و چرپ وجۆپ بۆ پەیداکردنی لایەنگران بۆ لیژنەکەی. حکوومەتی لیبیا هێندە ترسی لەو گەنجە نابێ چونکە وایدەیزانی کە دەستکورت و هەژارە و جێگەی مەترسیی گەورە نییە! لە ساڵی (١٩٦٥) قەزافی وەک ئەفسەری یەک نەجمە دەردەچێت ولە یەکەی پەیوەندییەکان لە سوپاس لیبیا (وحدة الاتصالات في الجيش الليبي) دەستبەکار دەبێت.

دوای ئەوەی قەزافی(کۆمەڵەی ئەفسەرانی ئازادی یەکێتیخواز) پێکدێنێ، لە تەمەنی (٢٧) ساڵیدا، بە کودەتایەکی سەربازیی لە (١) ئیلولی (١٩٦٩) کۆتایی بە فەرمانڕەوایی مەلیک ئیدریسی یەکەم دەهێنێت و کۆماری لیبیا دادەمەزرێنێ و ناویشی لە کودەتایەکەی دەنێ(شۆڕشی فاتحی ئەیلول). بەم شێوەیە تا ساڵی (٢٠١١) بۆ ماوەی (٤٢) ساڵی ڕەبەق، قەزافی فەرمانڕەوایەتی لیبیای کرد، کە هیچ سەرکردە و مەلیکێکی عەرەبی یان ئەفریقیایی، پێشتر، ئەوەندە ساڵە، بێ پسانەوە، حوکمڕانیان نەکردبوو.

قەزافی، بەبێ بوونی خۆشەویستی و دڵداری، لە تەمەنی گەنجیدا ژنێکی مامۆستا دەهێنێت، بەڵام پاش شەش مانگ لێکجودا دەبنەوە و کوڕێکیشی لەو ژنە دەبێت. دوای ماوەیەک حەز لە پەرستارێکی خۆی دەکات، بە ناوی (صفية فرقاش) و دەیهێنێ و (٧) منداڵی لێ دەبێت. بە ناوەکانی( محەممەد و سەیفی ئەل ئیسلام و ئەل ساعدی و موعتەصیم و هانیبال و سەیفی ئەل عەرەبی و خەمیس و عائیشە). دوو منداڵیش بۆخۆیان بەخێو دەکەن بە ناوی (هەنا و میلاد). میلاد، تەمەنی چوار ساڵان بوو، کە لە ئاکامی بوردومانکردنی کۆشکی قەزافی لە تەرابلووس لە لایەن فڕۆکەکانی ئەمریکاوە، کوژرا. (؟)

ئاساییە، کە ئەو مشتومڕ و قسە و باسانەی دەربارەی حامورابی و سنحارب و حەسەن وحوسێن و سەلاحەدینی ئەیوبی و سولەیمانی قانوونی... دەکرێن، تەمومژاوی و لێڵ و گوماناوی بن، چونکە مێژووی سەرچاوەکانیان دوورە و تۆمارکراوەکان جێی متمانەنین، بەڵام، مرۆڤ سەرسام دەبێ و دۆشدادەمێنێ، کە دەبینێ زۆربەی ئەو زانیارییانەی دەربارەی موعەمەر قەزافی تۆمارکراون و باس دەکرێن، گوماناوین و پڕن لە نیشانەی پرسیار، لە

کاتێکدا، (٤٢) ساڵی ڕەبەق، ڕۆژانە کامێرا و چاودێر و هەواڵنووسەکان بوو بوون بە سێبەری ئەو زاتە وخاڵێک لە ژیانی ئەودا نەماوەتەوە زووم و نووکە قەڵەمەکان وەستاکارییان تێدا نەکردبێ. چۆن چاوت بەش نابێتەوە، کاتێک دەبینی لە ساڵی (٢٠١٠)، ناوەندی ئاژانسی هەواڵگریی ئەمریکا (CIA)، داوا لە سەفارەتەکەی خۆی دەکات لە لیبیا، ڕاپۆرتێکیان دەربارەی موعەمەر قەزافی بۆ بنێرێ، ئەویش لە برووسکەیەکی نهێنی وەڵامیان دەداتەوە و دەڵێ: (قەزافی هەڵەوەڕێکی دەم دەمی مەزاج کشمیشییە، زۆر لە جێگەی بەرز دەترسێت و ناوێری لە ناو ژوور و باڵەخانەدا بخەوێت!). وەک بڵێیت ئەوە هەر چەند ڕۆژێکە، ئەو قەزافییە لە سەر (مەریخ) دابەزیووەتە سەر زەوی و قەت هیچ سەروک و سەرکردەیەک ناو و ناوبانگی ئەوەی نەبیستووە و کەس نازانێ ئەو کێیە، قەت جەنابی مامە قەزافی لەژێر ڕەشماڵەکەی خۆیدا لە بەرانبەر، خاڵە ئۆباما (سەرۆکی مەریکا)، قاچی لەسەر قاچ دانەناوە و دانەنیشتووە!

کەواتە، خوێنەرانی هێژا، ئێوەش حەقتانە بپرسن، ئێ باشە، بۆ ئەم پیاوە بووەتە ئەو مەتەڵە نادیار و جەفەنگەی ئەم سەردەمە، سرڕەکەی لە چ دایە؟ جا سەیرەکە لەوە دایە، ئەو سەرکردە، تەنها ژیان و سەربووردەکانی تەمومژاوی نین، تەنانەت ناوەکەشی، کە هەر (٩) پیتە، بە زمانی ئینگلیزی، بە (٣٧) شێوە و ڕێنووس دەنووسرێت، لەمەشدا قەزافی ناوی چۆتە نێو کتێبی (Genes)، ئەوە جگە لەوەی کە یەکەم سەرکردەیە لە هەموو مێژووی مرۆڤایەتیدا، کە (٤٢) ساڵ حوکمڕانی کردبێت و پاشا یان (مەلیک)یش نەبێت!

من نە مێژوونووسانە بابەتەکان تۆماردەکەم و نە ئەکادیمییانە توێژینەوەی بۆ دەکەم، ئەوەی دەیخوێنیتەوە، بیرەوەری و بۆچوونەکانی خۆمە، کە ڕەنگ بێ سەرلەبەری ـ لە دیدی کەسانی دیکەوە ــ وا نەبن. من (٣) شیتەڵکاریم بۆ بوونی ئەم (نادیاری و لێڵییە) لە ژیانی ئەو زاتەدا هەیە:

یەک: ئەوانەی دوژمنە بابەگەورەی ئەو پیاوە بوون، هەرچی شتی ناشیرین و قێزەون هەیە، (ڕاست و ناڕاست) بۆیان هەڵبەستووە و زەرڕەیەک ڕەحمیان پێنەکردووە. زۆر شت گوتراون، کە ڕەنگبێ دوور بن لە ڕاستی.

دوو: ئەوانەی زۆر پێی موعجیب بوون، هێندە سۆفیگەرانە و دەروێشانە ستایش و مەدح و سەنایان کردووە، بە ڕادەی (بە پێغەمبەرکردن)، لێرەشدا، زۆر گوتراون، کە ڕەنگبێ دوور بن لە ڕاستی.

سێیەم: کەسانی بێلایەن هەبوون، بۆ نموونە، کچە ڕۆژنامەنووسێکی فەڕەنسی، کەهیچ لە کەلتووری ئەو وڵاتە نازانێ، دەیەوەی بە چاوپێکەوتنێکی (٤٥) خولەکی، هەموو ژیاننامەی ئەو سەرکردە تۆمار بکات، ئاخر ئەمە تەم و تاریکی زۆری تێدەکەوێ. بۆ؟ چۆن؟ ئەو کچە دەبینێ، قەزافی لە ژێر ڕەشماڵێک دانیشتووە و عەبایەکی چنراوی سپی لە خۆی ئاڵاندوە و مێشکوژێکی بە دەستەوەیە، کە لە گەڵای خورما چنراوەتەوە، ناوە ناوە، ڕایدەوەشێنێ و مێشێک دەکوژێ! ئەو کچە ئەوە لێکناداتەوە، کە ئێرە لیبیایە و لە ژێر خێوەت دانیشتوون، بە باوکی قەزافیش ناکرێ هەرچی مێشی لیبیا هەیە بە ڕشاندنی دەرمان مێشکوژ لەناوی ببات، ناچارە بەو مێشکوژەی دەستی، مێشەکان لەخۆی دووربخاتەوە! کەچی کچە گاڵتەی بەو مێشکوژەی دەستی قەزافی دێ!

جا، بەڕێزان، شارەزابوون لە کەلتوور و داب و نەریتی میللەتێک و تێکەڵبوون لە گەڵیاندا و زانینی زمانی ئەوان، زۆر شت دەگۆڕێ، کاتێک دەرباری ئەوان دەدوێت. هەر بۆ نموونە، دەڵێن، قەزافی، (١٢٠٠) زیندانی لە بە ندیخانەی (بۆسلیم) لە تەرابلس لە ساڵی (١٩٩٦) گولـلەباران کرد(کە ڕەنگبێ ڕاست بێ). بەڵام ئەوەی من لە نزیکەوە، لە ناو گوندەکەی قەزافی زانیم. پلانێکی تیرۆرکردنی قەزافی ئاشکرابوو، ئەو ئەفسەری کە ددانی بە نەخشەی پیلانەکە داهێنا بوو، قەزافی فرمانی لەسێدارەدانی بۆ دەرکرد، بەڵام نەیتوانی جێبەجێ بکات، چونکە هەموو ئەندامانی (لێژنە شەعبییەکان) واژوویان لەسەر نەکرد! تاکو من لە لیبیا بووم (٢٠٠٥)، ئەو فرمانە هەر جێبەجێ نەکرا.

قەزافی لە ساڵی (١٩٧٦) دەڵێ:"هەرکەسێک ئەگەر لە ڕۆژێکدا هەوڵێدابێ بمکوژێ، با بڵێین لە ساڵی (١٩٧٠) یان ساڵەکانی دیکە، ئەو پیلانەی هەبووبێ، ئەوا من لێخۆش دەبم، جا هەر حوکم و سزایەکی بۆ بڕابێتەوە. لە ناوەوە بێ یان لە دەرەوە بێ، هەر پلە و پۆستێکی هەبێ. جا بۆ ئەوەی تاوانبارم نەکەن کە بێحەدد دڵسافم، یان وا تێنەگەن کەسێکی نەفام و نەزانم، دەڵێم، من تەواو هۆشیارم و بەئاگام کە پێغەمبەر هەیە، بەدەستی ڕەعیەی خۆی کوژراوە، قارەمان هەنە بەدەستی کەسانی نزیکیان کوژراون، قەشە و وەلی و پیاوچاک

هه یه کوژراون. مه سیحیان له خاچدا و به گوێره ی باوه ڕی وان چووه ته ئاسمان، ئه گه رچی له قورئاندا ده ڵێ، بۆیان ته شبیهکرا که مه سیحه و ئه و نه کوژراوه. ئه و مه سیحه ی که ده ڵێ، ئه گه ر که سێک شاپێکی له لای ڕاستی دایت، لای چه پی خۆتی بۆ وه رگێره با لێیدا. ئه گه ر که سێک ناچاری کردی هه نگاوێک له گه ڵی بڕۆی، تۆ هه زار میل له گه ڵی بڕۆ، ئه وه ی له سه ر پارچه کاڵایه ک شه ڕت پێده فرۆشی، تۆ هه موو پۆشاکی خۆتی پێشکێش بکه. ئه و مه سیحه، له لێبورده یی قه ت هیچ هاوتایه کی نییه، له گه ڵ ئه وه شدا ویستیان بیکوژ و له خاچی بده ن. عومه ری کوڕی خه تاب که ده ڵێن گوتویه تی: حوکمم کرد، دادپه روه ریم نواند، ئاسایشم زامنکرد و له ژێر دره ختێک خه وتم. جا له گه ڵ ئه وه شدا عومه ری کوڕی خه تابیان کوشت، له سوجده ی نوێژی به یانیدا له پشته وه دایانه به ر خه نجه ران. من به ئاگام له ئاکام و کۆتایی ئه و جۆره که سانه. مه سه له که ئه وه نییه، من ترسم هه یه، هه رچه ند تۆ مه سیح بی، ڕه نگبێ بکوژرێیت."

قه زافی چۆن کوده تای به رپاکرد؟

یه کێک له خه سڵه ته جیاوازه کانی که سێتیی قه زافی (پاراستنی نهێنی و خۆ به دیارنه خستن بوو). ئه و کاته ی نه خشه ی بۆ خۆپێشاندانێک له شاری به نغازی داده نا، خۆی به ره و شاری سه بها بۆی ده رده چوو، پێت سه یر نه بێ، که پلانی کوده تای داڕشت و له ساته وه ختی جێبه جێکردنیدا، له ته رابلس، ئه و له شاری به نغازی، له ناو جێگا خۆی خه واندبوو. بیرۆکه ی گۆڕینی ڕژێمی مه له کی لیبیا، ده مێک بوو له که لله ی ئه وی دابوو، بۆیه زیره کانه، له ساڵی (١٩٦٦)ناوی خۆی له خولێکی ڕاهێنانی سه ربازیی له ئینگلته را تۆمارکرد. له وێ خۆی فێره زمانی ئینگلیزی کرد و (٣) خولی فڕۆکه وانی و پێوه ندیی بێته لی و (مه شات)ی بینی. ڕاپۆرتێکی (ئه کادیمیای سه ربازیی ساندهێرستی مه له کی) وا باسی قه زافی کردووه: " که سێکی جددیی و به ویژدان و خۆش مه جلیسه و حه ز له خوێندنه وه و تۆپانی ده کات". ئه و که له ئینگلته را بوو، بۆ گه شت وگه ڕان هه ر پۆشاکی که لتووریی لیبی ده پۆشی و به پێشکه وتنی ئه و وڵاته سه رسام بوو.

ته وقیتی قه زافی بۆ جێبه جێکردنی کۆده تایه که ی زۆر زیرانه بوو، له لایه ک ده مێک بوو کرێکارانی کۆمپانیاییه کانی نه وت یاخی و توڕه بوون له کاتی شه ڕی که ناڵی سویسیش، ده رگای ئه و شه ریکانه یان داخست، جه ماوه ریش له ڕژێمی پاشایه تی وه ڕز و بێزار بوو

بوو، ئەو بوو کە مەلیک ئیدریس سنوسی بۆ گەشتوگوزار چووە بووە ولاتی یۆنان و تورکیا، قەزافی لە (۱ی ئەیلولی ۱۹٦۹) سەرکەوتوانە کۆدەتای کرد و هەردوو شاری تەرابلس و بەنغازی خستە ژێر کۆنترۆڵی خۆی و (حەسەن ڕەزای سنوسی)ی وەلی عەهدیشیان دەستگیر کرد. هەر قەزافی لە ڕادیۆ یەکەم وتاری خوێندنەوە و موژدەی سەردەم و مێژوویەکی نوێی بە جەماوەری ئەو ولاتە دا، ناویشی لە کوتادەیەکە نا (سەرەتای شۆڕشی سپی) چونکە خوێنی تێدا نەڕژا.

دەڵێن، لە دوای ئیسرائیل، دەزگای هەواڵگریی میسری، بە هێزترین و باخەبەرترین دەزگایە لە ڕۆژهەلاتی ناوەند، کەچی (٤٨) دەمژمێر بەسەر ئەو کودەتایە تێدەپەڕێت و ئەوان هیچ زانیارییەکیان لە بارەی ئەو تاقمە ئەفسەرە نەبووە، بۆیە بە فڕۆکەیەکی بچووک، چەند ئەفسەرێکی هەواڵگریی میسری لە فڕۆکەخانەی بەنغازی دادەبەزن، تەنانەت بە پەیژەی کریکارانی کارەبا، لە فڕۆکەکە دادەبەزن. قەزافی پێشوازیان لێدەکات و ئامانج و نەخشەی شۆڕشەکەیان بۆ ڕووندەکاتەوە.

لە ڕاستیدا لەسەرەتا حکوومەتی میسر، هیچ متمانە و باوەڕی بە قەزافی نەبوو، بۆیە ویستی لە ڕێی پیلانێکی سەرنەکەوتوو، ئەو ڕژێمە تازەیە لەناو ببات، بەلام سەری نەگرت! جا سەیرەکە لەوە دایە دەزگای (CIA) دەڵێ ئێمە ئاگاداری ئەو کودەتایە بووین، کەچی لە هێندێک بەڵگەنامە داهاتووە، کە وانەبووە، ئەو دەستە و تاقمەی لەژێر چاودێریی ئەوان دابوون، تاقمێک بوون بە ناوی (ئەفسەرە پۆستاڵ ڕەشەکان) ـ کە ڕەنگبێ قەزافی بۆ چەواشەکردنی دام ودەزگا هەواڵگرییەکانی ناخۆ و دەرەوە درووستی کردبێ.

یەکەم کاری قەزافی ئەوە بوو هەموو سەربازگە سەربازییەکانی ئەمریکا و بەریتانیای لە لیبیا داخست، هەرِەشەی لە کۆمپانیاییەکانی نەوت کرد کە دەبێ لە (۲۹٪) پتر داهات بدەنە لیبیا. ساڵنامەیەکی تازەبابەتی داهێنا و هەرچی ئیتاڵی و جوو هەبوو لەو ولاتە، ناردییەوە ولاتەکانی خۆیان وبەئاشکرا بانگەوازی بۆ (الوحدة العربية) دەکرد و وەک دوژمنی جووش خۆی نیشاندا. پاش دە ڕۆژان لە کودەتا، دەستوورێکی کاتی بۆ لیبیا دارشت. لە ساڵی (۱۹۷۰) لیژنەکانی شۆڕشگێرانی، بۆ ڕیفۆرم و ڕاپەڕاندنی کار و بەرنامەکانی لە هەموو لیبیا دامەزراند و بە هەزاران گەنج و ڕۆشنبیر چوونە نێو ئەو ڕێکخراوە جەماوەرییە شۆڕشخوازە.

ئێستا قەزافی درکی بەوە کرد کە (٣) کۆسپی زۆر گەورە لەبەردەم جێبەجێکردنی بەرنامە و خەونەکانی ئەودا هەیە: هەژاریی، نەخوێندەواری، ژێرخانی ئابووریی داتەپیووی وڵات.

## (٨)

# ســەرەتای ڕیفۆرم و یەکەم هەڵەی کووشــندەی قەزافی

شەوێک، لە دیوەخانی شێخێکی باڵادەستی خێڵی (فرجان) دانیشتبووم، دیوەخان مۆنجەی دەهات لە خەڵکی ئەوناوە ـ ئەم خێڵە لە ڕووخانی قەزافیدا لە ڕاپەڕینی (١٧)ی فیبریوەری (٢٠١١) دەستی هەبوو، شێخ گوتی:

ـ کوڕگەلینە، ئێوە هەر دوعا بکەن و بڵێن خوایە بە گەورەیی و لوتفی خۆت، دەست بە باڵای قەزافییە و بگرێت و بیپارێزێت و هەر لە ناومان بمێنێ.

کە درەنگانی شەو دیوەخان چۆڵ بوو، شێخ بانگی کردمە لای خۆی و لێی پرسیم:

ـ تۆ زانیت من بۆ ئەو دوعایەم بۆ قەزافی کرد؟

گوتم: غێر، خۆشتان دەوێ و سەرۆکتانە!

گوتی: مامۆستا فازیل، ئەگەر خوانەکا، ڕۆژێ، قەزافی نەمێنێ، ئەوا دەبێ من یان سەرهەڵگرم و ئێرە چۆڵ کەم، یان دەبێ خۆم و خانەوادەم، لێرە پارچە پارچە بکرێن!

گوتم: بۆ خێرە؟

شێخ بە ئەسەفێکەوە گوتی:

ـ ئاخر ئەم خانووبەرە و دیوەخانە گەورەیە و زەوی و زاری ئەم گوندە، هی ئێمە نییە. ئێمەیان بەزۆر هێناوە و لێرە نیشتەجێکراوین، خاوەن موڵک و زەوی و زار، دەست لە موڵک وماڵی خۆی هەڵناگرێ، قەزافی نەمێنێ، ئەوان دێن و داوای موڵکی خۆیان دەکەنەوە، کە حەق بە وانە.

***

دوای ئەوەی کە قەزافی، بێخەم بوو لە زامنکردنی تەخت و تاجی خۆی، کەوتە بیرکردنەوە لە هێنانە دیّ خەونەکانی، لە ڕاستیدا ئەو پیاوەی خەونە مەزنەکانی هی خەیاڵ و هزری خۆی بوون. لەلایەک لەژێر کارگەریی کەسێتیی جەمال عەبدولناصر دابووە ولە لایەکی دیکەش داڵغەی کارەکانی کەمال ئەتاتورک و کتێبەکەی میکاڤیلی لە مێشکیان دابوو. بەڵام ئەو زوو هەستی کرد کە بەو بارودۆخەی (لیبیای ١٩٦٩ ـ ١٩٧٣)، مەحاڵە

هیچی بۆ بکرێت. بۆچی؟ ١) ئەو دەیزانی کە پێویستی بە هەزاران هەزار کادیری لیهاتووی بەهرەمەندی لیبیی هەیە، کە بوونی نییە. ٢) ئەو پێویستی بە چینێکی ڕۆشنبیر و خوێندەوار و شۆڕشگێر هەیە، کە نییەتی.٣ ) ئەو دەبێ پێگەیەکی ئابووریی باش و خۆشگوزەرانی بۆ هاونیشتیمانییەکانی هەبێ. کە بوونی نییە. بەڵام ئەو زۆر باوەڕی بەخۆی بوو کە هەم هزرێکی قوول و هەم ئیرادەیەکی پۆڵاینی هەیە.

مێژوو دەڵێ، نەک من؛ کە قەزافی جەڵەوی حکومڕانی ئەو وڵاتەی گرتە دەست، ڕێژەی خوێندەواری لە لیبیا (١٪) بوو، واتا لە سەت کەس، (٩٩)ی نەخوێندەوار و بێسەواد بوون. هێشتا بیرە نەوت و گازەکان بەرهەمیان زۆر نەبوو و لە قۆناغی سەرەتاییدا بوون. وڵاتەکەش بۆ خۆی بیابانێکی قاقر و وشک و برینگە. کۆی حەشیمەتی دانیشتوانی ئەو کات، لە دەووری دوو ملیۆن کەس دەبوو. ئەوانیش دابەش ببوون بەسەر چوار بەش: شارنشینەکان کە لە تەرابلس و بەنغازی و موسراتە... دادەنیشتن، کۆچەر و دەشتەکییەکانی لەو سارا و بیابانانەدا وشترەوان و ئاژەڵدار بوون، ژمارەیەکی کەمیش، کە پێیاندەگوتن نیوە کۆچەر، وەزرێک کۆچیان دەکرد و وەرزێک نیشتەجێ دەبوون. کۆمەڵەی چوارەمیش ئەمازیغی و تەوارقەکان بوون کە کەلتوور و دابونەریت و زمانیان جیاواز بوو.

خاڵێکی بایەخدار هەیە، کە قەزافی زوو درکی پێکردبوو، لیبیا بریتییە لە کۆمەڵێکی زۆر لە خێل و عەشرەت و هۆز، بەسەر جوگرافیایی ئەو وڵاتەدا دابەش بوون. لەڕاستیدا قەت لە مێژوودا شتێک نەبووە بە ناوی (گەلی یان میللەتی لیبی). ئەوان بۆ خۆیان دوو بەرە بابن، ئەوانەی کە ڕەچەڵەکیان دەگەڕێتەوە سەر بەربەرکان ــ کە دانیشتووانی ڕەسەنی ئەو وڵاتەن، وە ئەو خێڵە عەرەبانەی لە سەدەی دەیەمی زایینییەوە لە نیوە دورەگەی عەرەبی هاتوون و لەو ناوە نیشتەجی بووین و لەگەڵ بەربەرەکان تێکەڵ بوون. بە درێژایی مێژوو ئەو خێڵ و هۆزانە بەسەر دوو زوون دابەش بوون، ئەوانەی لە کەنار دەریا و نزیک دەریا نیشتەجێ بوون، هەمیشە مەیل و هەوادارییان بۆ دەوڵەتانی عوسمانی و ئیتاڵی و ئەوروپایی هەبووە، ئەوانەی ناوەند و سارا و بیابانەکانیش پتر ئینتمایان بۆ خاکی خۆیان هەبووە و ئەوانەی کەنار دەریایان نەحوباندوە و بگرە ناخۆشیشیان زۆر بووە.

کەواتە ئەو میراتەی بۆ قەزافی بەجێماوە، هی ئەوە نییە کەس حەسوودی پێببات. بەڵام ئەو بێئومێد نەبوو، هەنگاوی جددی نا بۆ هێنانەدی خەونەکانی.

یەکەم هەنگاوی ئەو نیشتەجێکردنی ئەو دەشتەکی و کۆچەرییانە بوو. خۆ ناکرێ لەو سارا و بیابانانەدا قوتابخانە و نەخۆشخانە بکاتەوە. ئەو پێویستی بە دەستیکار و سەرباز و کرێکار بوو. بۆیە دەستی کرد بە جێبەجێکردنی گەورەترین پرۆژەی نیشتەجێکردن. چل چل، پەنجا پەنجا خانووی دروست دەکرد، باوەڕ بفەرموون بە سەدان گوندی سەردەمییانەی بونیاتنا، هەر هەموو گوندەکانی لیبیا(جگە لە ژمارەیەک گوندی زۆر لاچەپ نەبێ) بە نەخشە و دیزاینی سەردەمییانە بەدەستی کۆمپانیای بێگانە دروستکران، جا هەر هەموو خانووەکانیش یەک نەخشە بوون، نزیکەی (٢٥٠) مەتر چوارگۆشە، (٢) ژووری دانیشن، (٢) خەوتن، (٢) حەمام (٢) هەیوان و بەرهەیوان، لەگەڵ دەروازەیەکی کراوەی بێ دەرگا بۆ ئۆتۆمبیل. ئاوی بیرییان بۆ لوولەکێشکرابوو، کارەبایان بۆ چوو بوو. ڕێگا و بانی بۆ قیرتاوکردبوون و لە نزیک ئەو ئاوایانەش مەزار و گێلکەی بۆ ئامادەکردبوون، زۆربەی زەوییەکانیان هەڵگەڕاندبۆوە و تێکەڵ بە خۆڵ و پەینکرابوون، تا بۆ کشتوکاڵ و شینایی شیاو بن. نەمام و دارزەیتونی زۆریشی بەسەردا دابەشکردن. جا بە زۆرەملێ، لەو بیابانە ئەو خێڵ و هۆزانەی دەهێنا و ئەو خانووانەی بە خوڕا بەسەردابەش دەکردن. لە ڕاستیشدا توانی سەرکەوتن بەدەست بێنێ. تەنانەت دەرگای بۆ ئەو هۆزانەش کردەوە کە بە ڕەچەڵەک لیبین و لە میسر و سوودان و مالی و تشاد دەژین. قەزافی بەمەش نەوەستا، هەڵسا بە هاوردەکردن و نیشتەجێکردنی هێندێک لە خێلە عەرەبییەکانی وڵاتی (مالی) کە دەکەوێتە باشووری لیبیا. ـ ئێستا لیبییەکان بەو (مالییانە) دەڵێن (عەرەبی بیابان). پێشتریش، لە ساڵی (١٩٥٤) ڕەگەزنامەی لیبی بەخشرا بە هەموو ئەوانەی پێیان دەگوترا(کراغیلییەکان) واتا کورد و شەرکەس و تورک و ئەلبان و تەتەر و جورجییە ..... نیشتەجێیەکانی لیبیا.

بۆ نموونە، شارێکی وەکو سرت، تا ساڵی (١٩٨٤) خەڵکی ئەوێ بۆ وێنە گرتن دەبوایا بچنە شاری موسراتە، کەچی قەزافی ئەو شارەی کردە پایتەختی دووەم.

ئێستا قەزافی دەستی کرد بە دابەشکردنی ئەو خانووانە بەسەر کۆچەر و گوندنشینە لا چەپەکان و بۆ هەر خێزانێکیش گێلکە (مزرعە)ی بە بیر وئاوەوە دابینکرد. لە زۆربەی گوندە تازەکان قوتابخانە هەبوو، تەنانەت خانوو بۆ مامۆستا غەیرە لیبییەکانیش دروستکرابوو، لە هەر دەڤەرێکیش بنکەی تەندروستی و هۆڵێکی گەورە وەک

ئۆریزدیباگی جارانی عێراق و بنکەی کشتوکاڵ و ئاژەڵداری هەبوو . جا، گۆند هەبوو (٥٠) خانووی تێدا بوو بەڵام (٢٥) ماڵی تێدا بوو، ئەوانی دیکە چۆل و هۆل بوون. من گوندی نوێم دیوە چۆل و هۆل بووە!

کورد دەڵێ، شەڕێک بوو خێری تێدابوو. شەڕی نێوان عەرەب و جوو لە ساڵی (١٩٦٧)هەڵگیرسا و بە ناوی شەڕی حوزەیرانی (١٩٦٧) یان (نەکسەی ١٩٦٧) چووە ناو مێژوو، لەو شەڕەدا، ئیسرائیل دەستی لە عەرەبەکان وەشاند و بەرزاییەکانی گۆلانی سوریا و و بەرەی رۆژاوای ئوردن و بیابانی سینای داگیر کرد. جگە لە کوژران و برینداربوون و بەخسیرکردنی سەبازێکی زۆر، بە هەزاران فەڵەستینی ئاوارە و دەربەدەری شاران بوون. ئەوبوو، لێشاوەکە گەورە بوو، بۆیە ئەو فەڵەستینییە ئاوارانەیان بەسەر وڵاتانی عەرەبی دابەش کرد و لیبیاش نزیکەی (٣٥)هەزاری بەرکەوت.

زۆربەی ئەو فەڵەستینییانە مامۆستا و رۆشنبیر و خوێندەوار بوون، بۆیە زوو قەزافی بریاری دا، کە زۆربەی ئەو فەلەسەتینییانە وەک مامۆستای سەرەتایی دابمەزرێنێ. لەڕاستیدا، وەک لیبییەکان بۆ خۆیان دەڵێن، ئێمە قەرزاری ئەو فەڵەستینییانەین، چونکە ئەوان بەردی بناغەی پەروەردە و فێرکردنیان لەو وڵاتە دانا و هەموو لیبییەکانی دوای ساڵی (١٩٦٩) لەسەر دەستی ئەو مامۆستا فەڵەستینییانە پێگەیشتن و چوونە پەیمانگە و زانکۆکان و دواتر بوونە مامۆستا و کادیر و کارگێڕی وڵات.

هەموو قوناغەکانی خوێندن، لە لیبیا بەخۆڕایی بوو، تەنانەت مەسرەفی ئەو خوێنکارانەی دەچوونە دەرەوەش لەسەر دەوڵەت بوو، بێ بەرانبەر. هەردوو وەزارەتی فێرکردن و وەزارەتی خوێندنی باڵا، بە هەزاران قوتابخانە و بە دەیان زانکۆ و پەیمانگەیان لەسەرتاسەری لیبیا کردەوە. هەرچەندە لە ساڵی (١٩٥٧)وە یەکەمین زانکۆ لە تەرابلس کرابۆوە.

لە ساڵی (١٩٩٧) بە گوێرەی راپۆرتی یۆنیسکۆ، رێژەی خوێندەواری لە لیبیا گەیشتە (٩٢٪)، بەوەش بووە یەکەمین وڵات لە ئەفریقیا لە ئاست بەرزیدا لە خوێندەواری. رێژەیی نەخوێندەواری کەمتر بوو لە (٩٪).

بە هەمان شێوەش، ژمارەیەکی بەرچاوی لە نەخۆشخانە و مەڵبەندی تەندرووستی دروست کرد و پزیشکی بیانی و عەرەبیی بۆ دەهێنان، بە تایبەتی لە میسر و لە جەزائیر.

بۆ زامنکردنی، بووجەی پێویستیش، بایەخی بە کەرتی نەوت و گاز دا و کۆمپانیا ئەمەریکی و بەریتانییەکانی نیمچە خۆماڵیکرد، بەوەش توانی پارەیەکی باش بۆ خەزێنەی وڵات بەگەڕبێنێتەوە.

یەکێک لە هەڵە کووشندەکانی قەزافی ئەوەبوو، کە ئەو زەوی و زارەی بەسەر خەڵکەکە دابەشکرد، بەبێ لەبەرچاوگرتنی لایەنی یاسایی و مافی خاوەن موڵک. دەبووایا بەڕەزامەندی و ڕێککەوتنێک ئەوەی بکردبا. ئەم هەڵەیەی قەزافی هیچ جیاوازی نەبوو لەگەڵ، هەمان شت کە عەبدول کەریم قاسم، لە عێراقدا کردی لەگەڵ مەلاک و خاوەن زەوی و زارەکان لە ساڵی (١٩٥٩). یەکەم هەڵەی قەزافی ئەوە بوو (لەدیدی منەوە) کە بەبێ لەبەرچاوگرتنی کەلتووری لیبیا، دیمۆگرافیای ئەو وڵاتەی هەموو گۆڕی، هەرچەند ئەو نیازی پاک و باش بوو، لە پێناو بەرژەوەندیی ئەوانیش ئەوەی کردبوو. خاوەن موڵک و مەلاکەکان هەمیشە، وەک شێخەکەی فرجان گوتەنی، ئومێدێکیان هەبووە، ڕۆژی بێنەوە سەر زەویوزار و ئاوی خۆیان! موسراتییەکان وەکو کورد، ئەسمەر و سپیلکەلەن، بەڵام کە سەیری خەڵکی (تاورغا) دەکەی، کە هەر (٦٠) کم لەو شارە دوورە، هەمووی ڕەش پێستن.

جا، ئەو (تاورغاییانە) خەڵکی ڕەسەنی ئەو ناوچەیە نین، نموونەیەکن لەوانەی لە بیابانی لیبیاوە، قەزافی لەوێی نیشتەجێکردوون. بەڵام قەزافی دەرەقەت و دەروەستی ئەمازیغییەکان (تەواریقەکان)ی لیبیا نەهات و بۆی نیشتەجێ نەکران و ماڵی نەبوون.

لە ساڵی (١٩٧٠) لە زانکۆی تەرابلس، هێندێ خوێندکار خۆپیشاندانیان کرد، قەزافی بە دەستێکی ئاسنیین لەسەری دان و لیژنەی شۆڕشگێریی لە خوێندکارە هەوادارەکانی خۆی دامەزراند و چەند خوێندکارێکی هاوزانکۆی خۆیان لە سێدارەدا. ئەوە کاردانەوەی خراپی لێکەوتەوە، چونکە دواتر ئەو زانکۆیانە کەوتنە ژێر دەسەڵات و فەرمانی ئەو لیژنە شۆڕشگێڕانەی هەواداری قەزافی بوون. لە یادێکی ئەو ڕووداوەدا، دیسان لە زانکۆی گاریونیس لە بەنغازی خۆپیشاندان کراو، دیسان چەند خوێندکارێکیان، لە سێدارەدا. هەمیشە بەنغازی و ڕۆژهەڵات، ناکۆک بوون لەگەڵ ڕژێمی قەزافی ــ بەهاری عەرەبیی لیبیش، هەر لەوە شارە یەکەم چەخماخەی لێدا!

## (٩)

## شـەعبی سـەیید

کە گەیشتمە لیبیا، ئەزموونێکی کەمم نەبوو لە پەروەردە و فێرکردندا. لە ڕەواندز و شنۆ و ڕومادی و عەنکاوە و هەولێر و کۆیە، لە هەموو ئاستەکانی خوێندن دەرسم گوتوبۆوە، قۆناغی ناوەندی، دواناوەندی، ئامادەیی، ئامادەییە پیشەییەکان، پەیمانگە، تەنانەت زانکۆش. قوتابخانە هەبوو (٨) ساڵ بەردەوام دەرسم تێدا گوتووتەوە. دوومانگ بەسەر دەستبەکاربوونم، لە لیبیا، تێنەپەڕی بوو، کە هەستم بە جیاوازییەکی زۆر گەورە کرد، لە پەیوەندیی کۆمەڵایەتی و هاوڕێیەتیدا لە نێوان مامۆستاکاندا و لە نێوان مامۆستا و قوتابییەکاندا، بە بەراورد لەگەڵ ئەو ئەزموونەی لە عێراق و کوردستان هەمبوو. بەدێژایی ساڵانی مامۆستایەتیم، لە هەموو قوتابخانەکاندا، دەمدیت پەیوەندیی نێوان مامۆستاکان زۆر سنووردارە، تەنانەت مامۆستا پیاوەکان لە دوو سێ مامۆستای هاوڕێی نزیک زیاتریان نییە، پەیوەندییەکانیان لەگەڵ کۆی مامۆستاکانی دیکە، زۆر کاڵ و ئاسایی و ڕووکەشە. خۆ پەیوەندیی نێو مامۆستای پیاو و مامۆستای ژن، هەر زۆر لاوازە یان بوونی هەر نییە. گەرچی لە زێدی خۆم بوویم و هەموو مامۆستاکان ناسیاو بوون، چەندان ساڵیش بەیەکەوە بووین، چ لە قوتابخانەکانی کوڕان، چ لە قوتابخانەکانی کچان، پەیوەندی و هاوڕێیەتیی نێوانمان (من و مامۆستا ژنەکان)، لە بەیانی باش، تێنەپەڕاندوە، ئەوەیش هەر لەگەڵ سێ چوار مامۆستا. نەبووە، ڕۆژێ بچین لە ژووری بەڕێوەبەری ژن، قاچ لەسەر قاچ دانیشین و چا بخوێنەوە، ئەوانیش نەهاتوونەتە ژووری مامۆستا پیاوەکان و گفتوگۆمان لە نێواندا هەبێ!

لە قوتابخانەکەمدا، لە غەربییات، زۆربەی ڕۆژان مامۆستا عەبدولناصر، بەیانییەکەی ئامادە دەبوو و سەرپەرشتیی ڕێوڕەسمی ڕیزبوونی بەیانیانی دەکرد. دوای دەرسی دووەم، قوتابخانەی بەجێدەهێشت، گەر کارێکی پێویستی نەبوایە، تاوەکو بەیانی نەدەهاتەوە. ئەو وەک کادیرێکی پێشکەوتوو و بەرپرسێکی باڵای ئیداریی دەڤەری سرت، ئیش و کار و بەرپرسیارەتیی زۆری لەسەر شان بوو. ڕۆژ هەبوو، دەیگوت، ئیمڕۆ پێنج شەش کۆبوونەوەمان هەبووە! جا هەر خۆم، وەک تاکە مامۆستای پیاو، لە قوتابخانەکە دەبووم.

سیستمی، دەرسی ڕۆژانە، بەم شێوەیە بوو؛ (٣) دەرس لە دوای یەکتری دەخوێندران، بەبێ ئەوەی پشوویان تێدابێ. قوتابییەکان لە پۆل دەرناچن و (٣) دەرس، (٣) مامۆستا دەچێتە لایان. ئەوجا پشوویەکی (٣٠) دەقیقەیی هەیە، بۆ نانخواردن. کافتریایەکی بچووک هەبوو بۆ ئەوانەی بابۆڵەیان دەکڕی، کە پتر ماسی توونەی قوتوو بوو، لەگەڵ ساردەمەنی. مامۆستاکانیش نانیان دەخوارد. زۆربەی مامۆستا و قوتابییەکان، لەماڵەوە خواردنی خۆیان دەهێنا. لەم پشووەدا، ئیستگەی قوتابخانە هەمیشە سروودی نیشتیمانی لێدەدات. دوای پشوو، دوو دەرس لەدوویەکتری دەخوێندرێت، ئەوانیش بەبێ پشوو، ئەوجا کۆتایی بە ڕۆژی خوێندنەکە دێت.

لەم ماوە کورتەدا، پەیوەندیی نێوان من و مامۆستاکان ڕۆژ بە ڕۆژ لە گەشەسەندن و بەهێزی دابوو. دەتوانم بڵێم، منیش هەروام هەست دەکرد، برایەکی ئەوانم. بەدرێژایی ڕۆژ بەیەکەوە دادەنیشتین، چونکە هەر مامۆستایەک خواردنی خۆی دەهێنا، ڕۆژ هەبوو سێ چوار مامۆستا، داوەتیان دەکردم. هەبوو خواردنی ژەمی نیوەڕۆشی بۆ دەهێنام. ئەو دەرسانەی کە وانەم نەبوو، هەمیشە لەگەڵ چەند مامۆستایەک بەیەکەوە بووین. پێشتریش، باسم کرد، کە لە کەلتووری لیبییەکاندا، هەموو بەیانییەک دەبێ دەستی یەکە یەکەی مامۆستان بگوشی و بەیانی باشیان لێ بکەی.

لەو (٣٧) مامۆستایەی کە لە هەردوو دەوامی بەیانی و پاشنیوەڕۆ، هاوپیشەم بوون، تەنها شەش یان حەوتیان شوویان کردبوو. ئەوانی دیکەش تێکڕا تەمەنیان لە نێوان (٢٥) و (٣٥) ساڵیدا بوون. زۆر ئاسایی بوو، کە لە پشوو بە بەرچاوی خوێندکارەکان، یان کە وانەم نەدەبوو، بەتەنیا لەگەڵ مامۆستایەک دانیشم یان لە هەیوان و حەوشەدا پیاسە بکەین. تەنانەت، کە پیاوێکی غەریبەش بۆ کارێک بهاتبا ئەو قوتابخانەیە، هیچ مورچ و مۆنییەکم لە ڕوخساریدا نەدەدیت، کە وا نیشان بدا، نیگەرانە، لەو دانیشتن و پیاسەکردنەمدا لەگەڵ کچە مامۆستایەکی لیبی.

پرسیارەکە، لێرەدا ئەوەیە، ئەو کچە لیبییانە، ئەو متمانە و باوەڕبەخۆبوون و کەسیەتییە بەهێزەیان، لە کوێوە سەرچاوەی گرتووە و چۆن درووست بووە؟

قەزافی هەر زوو بە گوفتار و بەڕەفتار نیشانیدا، کە ئەو نەک هەر سەرکردەیەکی عەرەبیی جیاوازە، بەڵکوو شۆڕشگێڕێکی یاخی و ڕابەرێکی خەونبین و دارێژەری نەخشە و

بونیاتنانەوەی تەواوی کۆمەڵگەیە، نەک هەر کۆمەڵگەی لیبیی، بەڵکوو تەواوی ئوممەی عەرەبی. ئەو درکی بەوە دەکرد، کە ئەگەر هەموو لیبییەکان بە ژن و پیاوەوە، ببنە خوێندەوار و ڕۆشنبیر و گەنجینەیەکی ئابووریی دەوڵەمەند و پڕ سامانیشیان هەبێ، ئەگەر ئینتما و باوەڕ و هزر و هۆشیان بە فەلسەفەکانی (ئەو) ئاوجۆش نەدرێت و نەبن بە مرۆڤی خاوەن بیروباوەڕی شۆڕشخوازی و گۆڕانکاریی نەبیتە بەشێک لە خەونەکانیان بۆ ئاینده، ناتوانن بەردەوام بن لە درێژەدان بەو کاروانەی کە خۆی جەڵەوەکەی گرتووە.

ئیستا، ئەو مامۆستایانەی هاوپیشەی منن لەم قوتابخانەیە، بۆ نموونە، هەموویان نەوەی کودەتا، یان بە زمانی قەزافی بڵێین، شۆڕشەکەی (۱)ی فاتحی (۱۹٦۹)نە. واتا ئەوان پەروەردەی فەلسەفە و ڕێبازی ئەون. (۲٥) ساڵیش، پڕ بە پێستییەتی، بتوانێ نەوەیەکی نوێ، جیاواز بخولقێنێ و پەروەردە بکەی.

ئەوەندەی قەزافی کاری لەسەر گۆڕینی کەسێتیی ژن کرد، هێندەی خۆی بە پیاوەکانەوە ماندوو نەکرد، لە لایەک ژن نیوەی کۆمەڵگەی لیبیا بوون و نەدەکرا، ئەو خەونەکان تەنها بە بازووی پیاوەکان بهێنێتە دی. لە لایەکی دیکە، ئەو پتر متمانەی بە ڕەگەزی ژن هەبوو، بەتایبەتی دوای ئەوەی لە ساڵی (۱۹۷۰) و لە ساڵی (۱۹۷٦)، لە دوو ڕووداودا، هەوڵی تیرۆرکردنی ئەو درا، نەک لە لایەن نەیار و ناحەزەکانیەوە، بەڵکوو لەناو پیاوانی هۆزەکەی خۆیدا، کە نزیکترین کەس و پشتیوانیی ئەو بوون.

دەبینین، تاکۆ ئیستا لە وڵاتیکی وەکو عەرەبی سعوودی، کێشمەکێشی بەخشینی مۆڵەت بە ژن، بۆ لێخوڕینی ئۆتۆمبیل لە ئارادایە، لە کاتێکدا، دەمێکە لە لیبیا، کە خوێندکاری کچ، قوناغی ئامادەیی تەواو دەکات و دەچێتە زانکۆ، یەکەم دیاریی باوکی بۆ ئەو، ئۆتۆمبیلە. لەو دەشت و دەردەدا، دەبینی ئەو کچە چاوڕەشانە بەو پەڕی ئازادی و بوێری و باوەڕبەخۆبوونەوە، بە تاقی تەنیا ئۆتۆمبیلی خۆیان لێدەخڕن، نەک هەر لە شارەکان، تەنانەت لەو گوندەی منیشدا ــ مامۆستای کچمان هەبوو، بە پیکابی باوکی ڕۆژانە هاتووچۆی دەکرد و بە تراکتۆریش، دوای دەوام زەوی دەکێڵا.

قەزافی، بە داڕشتنی بەرنامەیەکی تیروتەسەڵی درێژخانەن، ئاودراو بە بیروبۆچوون و فەلسەفەکانی خۆی، کاری لەسەر گۆڕینی کەسێتیی هاووڵاتیی لیبی کرد، بە شێوەیەک کە (۳) خەسڵەتی بەرچاوییان تێدا ببینرێ:

یەک: قەزافی، ئیمجی ئەوەی لە خەیاڵدانی هاوولاتیان درووستکرد و چەسپاند، کە ئەوان (شەعبێکن سەیید و گەورە و کوێخوان)، کەس نییە لەوان بالاتر و دەسەلاتدارتر بێ. واتا وایکرد، کە هاوولاتی لیبیی ـــ هەر نەبێ لەناو ولاتەکەی خۆیدا، نمرە یەک بێ، لە هەموو شتێک. هەتا ئەو حزووری هەبێ، هەموو غەیرە لیبییەکان دەبێ لەدوای ئەوان بووەستن و نۆرە بگرن ـ ئەگەر ئەمە لە دیدی ئێمەمانان، نەژادپەرستیی و خۆویستیی بێ، ئەوا لە دیدی ئەوان، تەلەسمێکی شۆڕشگێڕیی و خەباتگێڕیی وان بووە و شانازیشیان پێوە دەکرد.
دوو: چاندنی ڕۆحی باوەڕبەخۆبوون لە ناخی هاوولاتیاندا، بە ژن و پیاوە، بەوەی کە ئەوان هەمیشە هەست بکەن، سەرکردە و دەسەلات و هێزێکی بالادەست هەیە، پشت و پەنای وانە و هەرگیز درێغی ناکات لە پارستن و پشگیریکردن و پشتیوانییان.
سێ: تێکشکاندنی زۆر لە کۆت و زنجیر و بەند و سندمی کەلتووری کۆنی کۆمەڵگا. جاران شێخی خێڵ و هۆز، مەرجەعی هەموو بریارێکی چارەنووسساز بوو، بۆ هەموو ئەوانەی لەژێر دەواری ئەو شێخەن. قەزافی ئەو نەریتە کۆنەی، تا ڕادەیەک، هەڵتەکاند و وایکرد کە شێخەکانیش باوەڕیان بە هەر فرمان و گوتار و پەیامێک هەبێ، کە ئەو دەیەوێ جێبەجێ بکات. واتا هاوولاتییەکی پەروەردە کرد چیتر، بەندە و کویلەیی شێخی عەشرەت نەبێ، بەلام، وەک نەریت و کەلتوور، ڕێز لە پێگە و مەقامی شێخ هەر دەگیرا. ـــ بەلام کە ڕەووتە ئیسلامییەکان هات پەربسێنن، ئەو خاڵە کاڵ بۆوە و قەزافی دەهات دەسەلاتی لە کزی بدا.
بەڕاستی، لە ماوەی ئەو (٢٥) ساڵدا، قەزافی بە جددی بە بەرنامە و بە نەخشە و بە پارە و بە کار و چالاکیی، ئیشی کرد، لەسەر خولقاندنی ئەو نەوەیە. ڕۆژانە لە قوتابخانە و پەیمانگە و زانکۆکاندا، دەرس و دەورریان هەبوو. لە پشووەکانی هاویناندا، چەندان مەڵبەند و سەنتەری مەشق و ڕاهێنانی فکری و سەربازیی و ئەدەبی و هونەری و مەعریفیان هەبوو. ڕەنگ بێ پێت سەیر بێ گەر بڵێم، لە سەرەتای نەوەتەکاندا، ژمارەی ئەوانەی، لە سایەی مەڵبەندە تایینیەکانی قەزافیدا، قورئانی پیرۆزیان ختم کردبوو و ئەزبەریان کردبوو، نزیکەی یەک ملیۆن کوڕ و کچ دەبوون!
قەزافی، هەمیشە خۆی وەک سەرکردەیەکی عەرەبیی جیاواز نیشان دەدا، ئەو، هەموو مەلیک و پاشا و حاکم و سەرکردەکانی (٢١) ولاتەکەی عەرەبی بە شەپرەلیدرا و هیچ و پیاو و نۆکەرانی بێگانە دەزانی. لە کۆبوونەوەی کۆمکاری عەرەبی لە دیمەشق، لە ساڵی

(٢٠٠٨) و پێشتریش لە قاهیرە، وتاری سەرەکیی ئەو زاتە، هەر هەموو ڕەخنەی تەنزئامێز و گاڵتەکردن بوو بەو مەلیک و پاشا و حاکمانە، کە بە پێکەنینەوە شانیان بۆ قسەکانی هەڵدەتەکاند و دواتریش زۆربەی بۆچوونەکانی ئەو هاتنەدی، ــ پێشبینی ئەوەی کرد، کە ڕۆژێ هەموو ئەوانەی لە هۆڵەکەدان، بە خۆشییەوە، وەک سەددام حوسێن لە سێدارە بدرێن! لە کۆبوونەوەی لوتکەی کۆمکاری عەرەبی لە سرت لە ساڵی (١٩٨٠)، قەزافی هەموو مەلیک و سەرکردەکانی عەرەبی لە پاشکۆی لۆرییەک سوارکرد و بردنی بۆ هۆڵی کۆبوونەوە. واتا نیشانی دونیایی دا کە ئەوانە ئاژەڵن!

لێرەدا، دەکرێ، (٤٢) ساڵی حوکمڕانی قەزافی بەسەر چەند قۆناغێک پۆلین بکەین، چونکە ئەو ساڵە دوورودرێژانە چەندان ڕووداوی مێژوویی و کەوتن و هەڵسانەوەیان بەخۆیانەوە بینیووە.

کاتێک، قەزافی، دەیەوێ هاووڵاتییەکانی هەست بکەن کە (شەعبێکی سەییدن و کەس لەسەروو ئەوانە نییە)، دەبێ، بە کرداریش ئەوە، بەرجەستەبکات. واتا دەبێ خزمەتی ئەو هاووڵاتییانەی بکات پێش ئەوەی ئەوان بڵێن، کوا مافەکانم کە من شەعبی سەییدم؟!

کە من ساڵی (١٩٩٤) گەیشتمە لیبیا، سەرەڕای کەموکوڕییەکان، بەگشتی لیبییەکان، هەستیان دەکرد کە ژیان و خۆشگوزەرانییەکی خۆشیان هەیە و لە سەرکردەکەیان ڕازین و پشتیوان و پشگیریی جددیشی دەکەن، چونکە ئەوان، چاوەڕوانی هاتنی قۆناغی خۆشتر و گۆڕانکاریی مەزنتریان لە خەیاڵدانی خۆیان وێنا کردبوو و لەو باوەڕیشدا بوون، کەژاوەی پێشڕەویی قەزافی هەر بۆ پێشەوە بەردەوام دەبێ و وەستان و چەقین نازانێ.

لە شاری سرت، بازارێکی سەردەمییانەیان دروستکردبوو، جوان و خۆش و جیاواز بوو، ناویان لێنابوو(شەقامی دوبەی یان کۆگاکانی دوبەی). ڕۆژێک، لەگەڵ هاوڕێیەکی لیبی، بەو بازارەدا دەڕۆیشتم. ئەو گوتی:

ــ زۆرم پێناخۆشە، لە شاری سرت، شەقامێکمان هەبێ بە ناوی (شەقامی دوبەی). ئێمە لە هەموو شتێکدا، لە دوبەی دەوڵەمەندتر و بە تواناتر و پێشکەتووترین. بۆچی لە دوبەی شەقامێک نەبێ بە ناوی (شەقامی سرت)، دەبووایا خەڵکان لاسایی ئێمە بکەنەوە.

ئەوەی من هەستم پێکرد، لەسەرەتای ئەو دوو سێ مانگەی یەکەمم، لە لیبیا، هاووڵاتییانی لیبی، تا ڕادەیەکی زۆر ڕازی بوون لە سەرکردە و دەسەڵاتەکەیان، لەهەمان کاتیشدا،

سەرکردە و دەسەڵاتەکەیان باوەڕی پتەوەیان بە جەماوەرەکەی خۆی هەبوو. قەزافی کە دەهاتە سرت، وەک زێدی خۆی، هەر چەند پاسەوانێکی کەمی لەگەڵ بوو، کە لە شەقام و بازارەکاندا دەچووە لای دوکاندار و هاووڵاتییەکان، ئەویش هاووڵاتییەکی ئاسایی بوو.

ڕۆژانی یەکەم، زۆر سەیرم پێدەهات، کە قوتابی هەر بە ناوی ئاسایی، بەبێ نازناو و پێشگر، ناوی مامۆستا و بەڕێوەبەرەکەیان دەهێنن، واتا لە کاتی ئاخاوتندا دەیانگوت "فازیل، عەبدولناصر، موفتاح" لە جیاتی "مامۆستا فازیل، مامۆستا عەبدولناصر، مامۆستا موفتاح". ئەوەش هەر بۆ ئەوە بووە، کە هەست بە کەمیی خۆیان نەکەن و نەڵێن ئەوان "مامۆستان" و ئێمە" پێگەمان نزمترە". وەک پێشتر گوتم، بە قەزافیان دەگوت"موعەمەر"، گەنجەکانیش لە دیوەخان و مەجلیسان دەیان گوت "الاخ القائد".

## (١٠)

## سیستم و ڕژێمی جەماهیرییەم چۆن دیت؟

گەرچی ڕۆژانە لەگەڵ قوتابی و مامۆستاکان دەخافلام و خۆم لە بیر دەکرد و زۆربەی شەوانیش یەک دوو میوانم، تا نزیک کاتی خەوتنان، هەر هەبوو. دەمەوە ئێوارەکان تەواو خەفەتبار و بێتاقەت دەبووم، کە لە ڕادیوکەمەوە گوێم لە هەواڵەکانی ئێستگەیەکی کوردی باشوور ڕادەگرت. دەمزانی ڕۆژ بە ڕۆژ چ دەگوزەرێ و چۆن ڕۆژ بە ڕۆژ، بڵێی سەعات بە سەعات، شەڕ و پێکدادانەکان خوێناویتر و پیستر دەبوون. کە ئێوارەیەک بیستم، شەو بارەگایەکی ئیسلامییەکانیان لە هەولێر تۆپباران کردووە، تەواو خەم دایگرتم، چونکە ئەو بارەگایە لەسەر ڕێی گەڕەکی نەورۆز، زۆر لەماڵمان دوور نەبوو، پێشتر ئەو شوێنە بارەگای جەیش شەعبیی سەددامی بوو. سەرکۆنەی خۆم دەکرد، کە چۆن ژنێکی گەنج و سێ منداڵی وردی جوان و ژیکەڵەم بەجێیشتووە و هاتوومەتە ئێرە. ئێوارەیەکی دی، ئێستگەکە باسی ئەوەی دەکرد کە چۆن کادیر و ئەندام و هەوداری حیزبێک، لە ترسی کوژران و گیران و کێشە، زێدی خۆیان بەجێدەهێڵن و ڕوودەکەنە زوونی حیزبەکەی خۆیان، لەویشدا، دەچنە سەر ماڵ و حاڵی ئەو کەسانەی لەو زوونەدا ئاوارەی بەرەکەی دیکە بوون. بۆ نموونە، زانیم کە ماڵی کەسایەتییەکی وەکو عوسمان عەونی شاعیر، کۆیەیان بەجێهێشتووە و ئاوەرە چوونەتە سەر ماڵ و حاڵی وان، تەنانەت، بەرپرسێک، ڕۆژانە بە ئۆتۆمبیلەکەی عەونی لە شەقامەکانی شار، بە پۆزلێدانەوە دەسووڕێتەوە ـــ دواتر خوێندمەوە کە چۆن ماڵی دکتۆر نووری تاڵەبانی و خاتوو دکتۆر عەتیەی هاوسەری، لە هەولێر داگیر دەکەن، ئەو کات ئەوان بەسەفەر لە دەرەوەی وڵات بوون، جا کاتێکیش شەڕ، لەو گەڕەکە نزیک دەبێتەوە، ماڵەکەیان فەرهود دەکەن، بەوەش ئەو خێزانە عارف و عالمە، بەقیمەترین کتێبخانەیان دەفۆتێ، کە ئەرشیفەکەی وێنەی نەبووە لە دەستنووس و ژێدەر و سەرچاوەی کەموێنە!

***

هەفتەی دوو سێ عەسران، لەگەڵ بەڕێوەبەرەکەم یان مامۆستاکانی ڕەفاقەتیم لەگەڵیاندا پەیدا کردبوو، دەچوومە ئەو مەزرا و باخ و باخچانە یان بە ئۆتۆمبیل دەچوینە ئەو دەشتەودەرە. دەمزانی لەو ناوە، بازاڕ یان کۆگایەکی تەشاروکی حکومی هەیە، پۆشاک و شتومەکی پێویست، بە نرخی داشکاو دەفرۆشێت. لە نێو هەر پانزدە بیست ئاوایییەک، حکوومەت کۆگایەکی وای بۆ خەڵکەکە کردبۆوە. عەسرێک دڵم توند بوو، کەسیش لە هاورێکانم دیار نەبوون، بریارمدا بە پیاسە بچمە ئەو کۆگایە. نزیکەی بیست دەقیقەیەک ڕۆیشتم، دەم جادە قیرتاوکراوەکە هەموو مەزرا و دار زەیتون و هەوێزی مەڕ و بزنان بوو، تاق و لۆقەش خانوو، لەبەرەکەی دیکەی جادەکە هەبوو. گەیشتمە چۆلەوانییەک، شوانێکی ئیختیارم دی لە پۆشاکی کەلتووری لیبییاندا، مێگەلە مەڕ و بزنێکی دەلەوەڕاند، نەختۆکەک لێم دوور بوو، دیتم دەنگم دەدا و بانگم دەکات. سەرەتا گوێ خۆم نەدایە، بەڵام کە بە گۆپاڵەکەی دەستی بانگی کردم، گوتم بەڵکوو پێویستیی بە یارمەتییەک بێ، با بچم. لێی نزیک بوومەوە و سەلامم لێ کرد، نازانم سەلامەکەی وەلام دامەوە یان نا، یەکسەر بە دەنگێکی ئاغایانە تێیخوڕیم و گوتی:

ــ تۆ کێیت و چ کارەیت و چ دەکەی لەوناوە؟

ویستم بۆی ڕونکەمەوە، کە ئەو ئاواییانە من دەناسن و لە فلان قوتابخانە مامۆستام، سوودی نەبوو، ئەو گوتی:

ــ کێ دەڵی تۆ ڕاست دەکەی! جا با مامۆستاش بیت، تۆ دەبێ لە قوتابخانەی خۆت دانیشیت و کێی ڕێی بە تۆ داوە وا ساڵدانە ساڵدانە، لێرە هاتووچۆ بکەی؟ ئەو کۆگایەش، دوورە، تۆ نابێ بچیتە ئەوێ!

لەو مشتومڕە دابووین، شوانەی ئیختیار دەیگوت دەبێ ڕادەستی کەسێکت بکەم، بتباتە پۆلیسخانە، لەو کاتەدا بە غاردان دوو سێ مێرمنداڵ بەرەو ڕوومان هاتن، بینیم، خوێندکاری خۆمن. زۆر گلەییان لە حاجی سەلیمی ئیختیار کرد، کە چۆن بەم شێوەیە لەگەڵ مامۆستای وان دەدوێ، ئەوان گوتیان، ئەو مامۆستایە ئێمەیە و زۆر پێمانەوە ماندووە. حاجی سەلیم، پشتی تێکردین و کەوتە هەڕە هەڕە لە مەڕ و بزنەکانی، منیش بە دڵشکاوی بەرەو قوتابخانە هاتمەوە. لە ڕێگادا هەر بیرم لەوە دەکردەوە، ئاخۆ، ئەو شوانە ئیختیارە، کەوتووەتە ژێر کاریگەریی وتار و گوتارەکانی قەزافی، یان ئەوە هەر نەریت و

ڕەفتاری وانە بۆ هەر غەوارەیەک پێ بنێتە سنووری مەزار و ئەرزی وان؟ پێشتر، لە وتارێکیدا لە تەلەڤزیۆن، بینیم قەزافی داوی لە هاووڵاتیان دەکرد کە دەبێ چاوکراوەبن و هەموویان خۆیان بە پیاوی ئاسایش و سەربازی ئەو وڵاتە بزانن، چونکە دوژمن هەمیشە چاوی بڕیووەتە خێروبێری ئەو وڵاتە و هەر دەرفەتی هەبێ دەستیان لێ دەوەشێنێ. ئەو دەیگوت:"تۆی خانم، کە لە موتبەقی ماڵەکەتدا، خەریکی قاپ و قاچاغ شووشتنی و دەبینی بە بەر پەنجەرەکەتدا، کەسێکی بێگانە بەو ناوەدا تێدەپەڕێ. دەست لە ئیشەکەت هەڵگرە و بەدوای ئەو کەسە دابڕۆ، بزانە کێیە و چ کارەیە و بۆ هاتووەتە ئەو ناوە!" گوتەکانی حاجی سەلیم، وتارەکەی قەزافی بەبیر هێنابوومەوە. دەمگوت، قەت قوتابی دەرسی مامۆستا وا ئەزبەر ناکات، وەک ئەو ئیختیارە، وتەکانی قەزافی ئەزبەر کردووە!

نزیکەی، سێ مانگ بەسەر دەستبەکار بوونم تێپەڕی، نەک قرشێکم وەرنەگرتووە، بەڵکوو پێشیان نەدەگوتم مووچەکەم چەندە، مامۆستا عەبدولناصریش هەر دەیگوت، من شەو و ڕۆژ لەسەر خەتم، بەو زووانە ژمارەی حیسابی بانکت بۆ دەکەینەوە و قرشێکت ناچێ. چەند جار ویستی بڕێک پارەم بداتێ، من لێم وەرنەگرت، دەمگوت کەنگێنێ پیویستیم پێبوو، خۆم داوات لێ دەکەم.

شەوێک، دەمێک بوو میوانەکانم ڕۆیشتبوونەوە، دەمەویست بچمە سەر جێگا و بخەوم، گوێم لە دەنگێ بوو، وەک گاشەبەرد بەربێتەوە سەر بانی ژوورەکە، گوێم نەدایە، گوتم ڕەنگبێ ڕەشەبا بێ، درەختەکان بە دیواری دادا. ئەوەندەم زانی، وەک ئارپێچییەک، کوچکە بەردێکیان لە دیواری نزیک پەنجەرەکەم دا، ئەگەر بە شووشەکە بکەوتبایە، بێگۆمان لەشم هەموو دەبووە ساچمە شیشۆق، زوو دەرپەڕیم و چوومە گۆشەیەک کە بەرد و وردە شیشۆق نەیگرێتەوە. بۆ ماوەی شەش حەوت دەقیقیە، ئەو ژوورەی من بەرباران کرا، دیاربوو، دوو کەس بوون، وام هەست دەکرد، بەردەکان بە قۆچەقانی دەهاوێن، چونکە دەتگوت مەترەلۆزن بە دیوار و دەرگای قوتابخانەکە دەکەوتن. بیرم کردەوە کە دوو دەرگای هەیوانەکە هیچ قفڵ و کلیلیان نییە، بە پارچە شیشەیەک وەک سوورگی کلۆم دراون، دوو شانیان لێبدەن دەکرێنەوە سەرپشت، بۆیە چەقۆیەکم بە دەستەوە گرت، گوتم هەرنەبێ دەستێک بکەمەوە گەر لێم بە ژوورێ کەوتن. گەرچی سەعاتێک بوو ناوەکە خامۆش و بێدەنگ بوو، هەر لەو قوژبنە بووم و دەترسام بچمەوە سەر جێگا و ئەو

پەنجەری کە وشتری پێدادەچی، بەسەرمدا بپرژێ. دواتر جێگەی قەرەوێلەکەم گواستەوە گۆشەیەک، بەرد نەیگریتەوە. ئەو شەوە هەر گورگە خەو نووستم.

کە بیانی زوو، مامۆستا عەبدولناصر هاتە قوتابخانە، ڕووداوەکەم بۆ گێراوە، زۆر پێی دڵتەنگ بوو، گوتی، دڵنیابە دووبارە نابێتەوە و کەمتەرخەمی منیشی تێدایە. منیش گوتم، ئەو دەرگا و پەنجەرانە نە قفڵ و کلیلیان هەیە نە تۆڕ و تەلیان لەسەرە، هەر نەبێ، بەرد بگێرێتەوە. ئەو گوتی، من، لە کەمتەرخەمیی، مەبەستم ئەوە نییە، خۆ ئێرە بەندیخانە و پۆلیسخانە نییە، ئەگەر یەکێک بیەوێ بێتە ژوورەوە هاسانە دەرگاکە دەشکێنێ، مەبەستم ئەوەیە دەبووایە من کلیلی ژووری ئیدارەت بدەمێ، هەر شتێک ڕوویدا تەلەفۆنم بۆ بکەی، من بە (٧) دەقیقە دەگەیشتمە ئێرە.

ئەوجا گوتی:

ــ ئەوەی کراوە، لە دژی من کراوە، ئەوا دوو سێ شەو پێش ئێستا ئەمپریفایەر و دوو ڕایەخی باشی مزگەوتیان دزی بوو. لەم ئاواییە تەنها دوو سەرسەریی مەشروبخۆر هەنە، ئاگادارم کردنەوە کە ئەگەر ئەو شەو کەلوپەلە درزراوەکان نەبەنەوە شوێنی خۆیان، من ماڵەکەیان دەپشکنم. لێرەش، ماڵپشکنین، ئابڕووچوونە. جا ئەوان شەو، شتە دزراوەکانیان بردووتەوە مزگەوت و لەو ڕقە، قوتابخانەکەیان بەردباران کردووە. ئەوڕۆکە، ئینزاریان دەدەمێ، کە ئەو کارە دووبارە بکەنەوە قاچیان دەبڕمەوە.

ئەوەشی گوت:

ــ هەرچەند ڕۆژێکم سەبرم لێبگرە، من مامۆستای بیرکاری و فیزیک و بایەلۆژیم نییە، هەر مامۆستایەک لەوانە بێتە سرت، یەکسەر بۆ منی دەنێرن، ئەوکات، ئێرە ئاوەدانتر دەبێ و هەست بەو تەنیایی و غەریبایەتییە ناکەی.

وەک دەڵێن، چۆم بێ چەقەڵ نابێ. منیش هەرلەو بڕوایەدا بووم کە هیچ کام لە خوێندکارەکانم یان کەسوکاریان، دەستیان لەو بەردبارانکردنە نەبووە، قەت هیچ کێشە و ناخۆشییەک ڕوویان نەداوە و خەڵکەکە بێحەد ڕێزیان لێ دەگرتم. بیستبووم کە دەرمانخۆر و مەشروبخۆری سەرسەری و بەرەڵلا لە شارەکانی لیبیا هەنە، بۆیان هەڵکەوێ تەشقەڵە بە غەریب و بێگانان دەکەن.

چەندە قوتابخانە و خوێندکار و ستافی مامۆستاکانم پتر دەهاتنە بەردڵ، پتر سۆز و حەنینم بۆماڵەوە هەڵدەستا و هەمیشە پرسیارێکی لێڵ و ئاڵۆز یەخەی دەگرتم و وەڵامی تەواویشیم پێنەبوو:

ــ ئێستا، من چ دەکەم لێرە؟ بۆچی هاتوومەتە ئەو سارا چۆل و هۆلە؟

***

دوو سێ حەفتە بەسەر ئەو ڕووداوانە تێپەڕی بوو، یەکدوو شەوان خەونی زۆر ناخۆش ناخۆشم دەدیێ و دڵم هەزار ڕێی دەکرد، کە بەیانی لە خەو هەڵدەستام دەمگوت، دەبێ ڕۆژی هەینی بچمەوە تەرابلس و لەوێڕا ڕانەوەستم هەتا دەگەمەوە هەولێرێ!

شەوێکی هەینی، جانتا و شتومەکم پێچایەوە و بریارمدا بگەڕێمەوە تەرابلس و بەیەکجاری غەربیات بەجێبهێڵم. بەیانی دەوری سەعات هەشت و نیو بە خۆم و جانتای دەستم گەیشتمە جادەی سەرەکی و پیکابێک بۆم ڕاوەستا ــ ئەوە نەریتە، هەر کەسی لەسەر جادە ڕاوەستێ، ئەو ئۆتۆمبیلەی بەلای دا تێدەپەڕێ، ئەگەر ژنی لەگەڵ نەبێ، دەبێ ئەو کەسە هەڵگرێ، بیناسی یان نەیناسی. کابرای شۆفێر، ماڵی ئاوا لە سرت منی گەیاندە گەراج. لەوێ کە ویستم ناوی خۆم تۆمار بکەم و پەساپۆرتەکەم دا کاتبەکەی نووسینگەی گەراج ــ هەموو موسافیرێک ناوی تۆماردەکرێ، تەنانەت لیبییەکانیش، کۆپییەک لە تۆماری ناوەکان دەدەنە شۆفێرەکە لەگەڵ پەساپۆرت و ناسنامەکان. بەڵام ناسنامەی لیبییەکان ڕادەستی خۆیان دەکەنەوە. کە کاتبەکە ناوی منی بینی، گوتی، تۆ مامۆستا فازیلی؟ گوتم بەڵێ. بە هێمنی پەساپۆرتەکەی دامەوە و گوتی تۆ نابێ سەفەر بکەی! کە لە هۆکاریی ئەو ڕێگرییەم پرسی، گوتی، تەلەفۆنمان بۆکراوە، کە نابێ تۆ لە سرت دەرچی.

نازانم، چۆن وەسفی ئەو ساتەوەختە ناخۆش و سەختە بکەم، وام هەست دەکرد، مەراقێک لە ئەوکمدا گیر بووە، ئێستانا ئێستا دەمخنکێنێ. هیچ ڕاڤەیەکی پەسندم نەبوو، کە چۆن زانیویانە ئەمن سەفەر دەکەم. دڵنیام شۆفێری پیکابەکە، خەبەری لێنەدوام ــ خۆ ئەو کات مۆبایل نەبوو، کە من گەیشتمە گەراج، تەلەفۆنیان بۆ کرا بوو. کەواتە هەبێ و نەبێ، یەکێک لە ئاوایی منی بینیوە و عەبدولناصری لێ ئاگادارکردووەتەوە. لەخۆشم دەپرسی، جا خەڵکی گوندی چ هەقیان بەسەر منەوە هەیە سەفەر بکەم یان نەکەم؟ ئەوان چوزانن بەرنامەی سەفەری من چییە؟

وەک ئاوارەیەک بگاتە شارێک و هیچ جێگەیەکی نەبێ بچێ تێیدا پشوویەک بدا، بەزۆر، لاشەی بێ ڕۆحی خۆم وەک جانتاکەی دەستم بە دوای خۆمدا ڕاکێشا و وردە وردە هەنگاوم هەڵدەگرت و بەرەو بازاڕ دەچووم. خۆم لە گۆشەی کافتریایەک دیتەوە و بە دەم داڵغەلێدان و دڵێکی پڕەوە، پەرداغە چایەکم خواردەوە. لەدوای سەعات دە، دە ونیو، بە خەمباری، بڕیارمدا، سەرێک لە ماڵی دکتۆرێکی زانکۆ بدەم کە خەڵکی سلێمانی بوو و لەگەڵ خێزانەکەی یەک و دوو مانگ بوو لە زانکۆی تەحەددی، لە سرت، دامەزرا بوو و تەعاروفمان لەگەڵ یەکدی کردبوو، یەک دوو جاریش لە ماڵەوە زەحفەتی کردبووم ـ بە داخەوە ناوەکەیم بیر نەماوە، چونکە ئەوانیش زوو گەڕانەوە کوردستان. کە لە دیوەخان دانیشتین و دەردە دڵی خۆم بۆ کردن، ئەوانیش گوتیان ناهەقیت نییە. زەحمەتە، لەو سارا چۆل و هۆلە دوور لە خێزان و ماڵ و منداڵ، وا زگورتییانە بژی. بەڵام، پێشنیارێکیان کرد و منیش بە پەسندم زانی. گوتیان، کەس ناتوانێ، ڕێی سەفەر کردنت لێبگرێ، چونکە تۆ گرێبەستیی ساڵانەت لەگەڵ واژوو نەکردوون، بەڵام وادام پتر لە سێ مانگە لێرەی، چاوەڕوان بکە، مووچەکانت وەرگرە، ئەوجا بڕۆوە، هەر نەبێ (١٠٠٠) دۆلارێکت دەدەنێ و حەقی خۆتە، پارە ڕێیەکەت، هێندێک، تێدەبێنێتەوە!

ئەو ڕۆژە، ئەو ماڵە کوردە، دۆڵمەیەکی کوردەواریی یەکجار بەتام و خوێیان کردبوو، پەنجەی خۆت لەگەڵ دەخوارد. دەوری سەعات سێ و چوار ماڵاوایم لەو دۆستانە کرد و تەکسییەکم گرت و گەڕامەوە ژوورە ساردوسوڕەکەی غەربییات.

هەر نیو سەعاتی پێنەچوو، مامۆستا عەبدولناصر، هات و دەستی لە ملی کردم و گوتی، من لە بەیانییەوە، جادە و شەقامی سرت نەما بەدواتدا نەگەڕێم، لە کوێ بوویت؟

بۆم ڕوونکردەوە، کە من زۆرم پێناخۆشە بەجێتان بهێڵم و هەمووتانم خۆش دەوێ، بەڵام ئەم ژیانەش بەم شێوەیە زۆر زەحمەتە بۆ من!

زۆر دڵێدامەوە و چەند نەخشە و بەرنامەیەکی بۆ داڕشتم. تا ڕازی بم، هەر نەبێ ئەو ساڵیان لەگەڵ تەواوکەم.

***

لەگەڵ ڕۆژگاردا و لەو چەند ساڵەی لەو وڵاتە بووم، بە هێندێ کایە و بوار و شێوازی کارکردن و بەڕێوەبردن و ئیدارەدانی ئەو جەماهیرییە و دەوڵەتدارییەکەیان ئاشنا بووم.

دەڵێم (هیندێ) چونکە، یەکێک لە خەسڵەتە زەقەکانی ئەو جەماهیرییە و سیستم و ڕژێمەکەی (نهێنی و شاردنەوە و بەرەواژکردنەوەی شتەکان بووە.) نەک بۆ بێگانە و غەوارەکان، بەڵکوو بۆ خودی لیبییەکان و ئەوانەی نزیکیش بوون لە خودی قەزافی. هەر بۆ نموونە، کە یەکەم بەیاننامەی کودەتا لە (١)ی ئەیلولی (١٩٦٩) خوێندرایەوە، ناوی هیچ کەسێکی لەسەر نەبوو. کودەتاکە دواتر بە ناوی ئەفسەرێک بوو، کە لە ئیتاڵیا بوو، کە چوون چاوپێکەوتنی لەگەڵ بکەن، گوتی:"بەخوا، ئەمن ئاگام لە هیچ نییە! ئینقلابی چی؟"هەمیشە ئەو پرسیارەت لە مێشکدا دەزرینگایەوە(ئەو شتە بۆچی وایە؟ لەکاتێکدا دەکرێ بە شێوەیەکی شیاوتر و باشتر بێ)، بەڵام کەس نەبوو، وەڵامی ئەو پرسیارە بداتەوە.

ئەو ڕۆژەی ئەنجوومەنی سەرکردەی شۆڕش، کودەتای سپی بەرپاکرد و ڕژێمی حکومڕانی مەلەکیەتی (پاشایەتی) ڕوخاند، ناویان لەو ولاتەکە نا (کۆماری لیبی عەرەبی)، ئەمە لە دەستووری کاتیی لیبیادا جێگیرکرا. بەڵام لە (٢)ی مارتی ساڵی (١٩٧٧)، بە ناوی کۆنگرەی شەعبی گشتیی ــ پەرلەمانی لیبیا، بریاردرا کە ناوی ولاتەکەیان بکرێت بە: (جەماهیرییەی عەرەبی لیبیی شەعبی ئیشتراکی) و قورئانی پیرۆز بکرێت بە شەریعەتی کۆمەڵ و دەسەڵاتی شەعبیی ڕاستەوخۆ، ببێتە بەردی بناغەی ڕژێمی سیاسی ئەو ولاتە. دەسەلات دەسەڵاتی شەعبە و هیچ دەسەڵاتێک لەو باڵاتر نییە. شەعبیش لە ڕێی کۆنگرە شەعبییەکان و لیژنە شەعبییەکان و سەندیکا و کۆنگرەی شەعبی گشتی، یاسای کارەکان دەستنیشان دەکات. هەموو شەعبیش دەبێ مەشق و ڕاهێنانی سەربازیی پێبکرێت. پاراستنی نیشتیمان لە ئەستۆی شەعب دایە. لە (١٤)ی نیسانی (١٩٨٦) شدا، کە هێزی ئاسمانی ئەمریکا کۆشکی قەزافی لە تەرابلس بۆمباران کرد، زاراوەی (مەزن)یان خستە سەر ناوی ولاتەکەیان و بوو بە:(جەماهیرییەی عەرەبی لیبیی شەعبی ئیشتراکی مەزن).

لە ڕاستیدا، هیچ لیبییەک نەبوو کە نەزانێ، تاکە سەرکردەی ئەو ولاتە کە بەرپرسی تەواوی ولاتە و هەموو دەسەڵاتەکانی لە دەستە، خودی قەزافییە. باشیش دەیانزانی کە ئەو زاراوانە و گۆڕینیان، زەرڕەیەک لە واقیعی فەلسەفەکانی قەزافی ناگۆڕێت و هیچ پەیوەندییەکیان بە گەشەکردن و پێشخستن و پێشکەوتنی کۆمەڵ نییە. ئەوەی بریار دەدات و ئەوەی بریار دەگۆڕێ، هەر قەزافییە. هەموو ئەو میکیاژ و ئارایشت و جوانکارییانە، هەر بۆ خافڵاندنی خەڵک و میدیاکان بووە. کەسیش، زاتی نەکردوە لە هەمبەر مەسەلە

چارەنووسسازەکاندا بەرامبەر قەزافی بکۆخێت و ڕای خۆی دەربڕێ. بەڵام لە مەسەلەی لاوەکی و شتی بێ بایەخ، وەک پڕۆپاگەندەی میدیاکان، شت، لە ڕووی قەزافی دەگوترا.

کاتێک قەزافی بڕیاریدا کە دەسەڵات ڕادەستی شەعب بکات، گوتی:"من لەوڕۆکەوە، سەرکردەی ئەنجومەنی شۆڕش نیم و هیچ دەسەڵاتێکم لە دەست دا نییە، من هاووڵاتییەکی ئەو ولاتەم، خۆتان دەسەڵات و سەرکردەن." بەڵام خۆی کردە (زەعیمی شۆڕش)، شۆڕشێک کە هەتا هەتا بەردەوامی هەیە.

کەم سەرکردە و ڕژێم هەیە بەقەد قەزافیێ و جەماهیرییەکەی شتیان لەسەر گوترابێ، بەڵام گوتن و وەسفکردنێک کە تەواو دژبەیەکن و خوێنەر و پەیامگر سەری لێدەشێوێ نازانێ کە کامیان ڕاست دەکەن. لە نەوەتەکان سەدەی ڕابردوودا، موفتی ولاتی عەرەبی سعوودی فەتوای دەرکرد کە "قەزافی کافر و مولحیدە."، لەکاتێکدا، قەزافی هەر هەموو قورئانی ئەزبەر بوو، لەو ساڵەشدا لە (٢٠٪) حەشیمەتی لیبی، لە مەڵبەندەکانی قەزافی بۆ ختمکردن و فێرکردنی قورئان، قورئانیان لەبەر کردبوو. بڕوانامەی ئاستی زانکۆکانی بەو کەسانەش دەبەخشی و بۆ دامەزراندیش، ئەوان لەپێشتر بوون لەو کەسانەی قورئانیان ئەزبەر نەبوو. لە نوێژی جەژنانیش، قەزافی بۆخۆی پێشنوێژی بۆ دەکردن و سورەتی (البقرة)شی لە نوێژەکەیدا دەخوێند. لە هەموو قوتابخانە بنەڕەتییەکانی لیبیا، لە پشووی هاوین، خوولی فێرکردنی قورئان بۆ منداڵان دەکرایەوە و خەرجییەکەشی لەسەر دەوڵەت بوو. لەکاتێکدا، عەبدوڵلای کوڕی عەبدولعەزیز، مەلیکی سعوودیە، ئەو خەسڵەتانەی نەبووە! بێگومان گرووپە ئیسلامییە چەکدارەکان لە ڕۆژی یەکەمی کودەتاکەوە، لە هەوڵی تیرۆرکردنی قەزافی دابووین، بەڵام لە (٢٠١١) دەرفەتیان بۆ ڕەخسا. وەک پێشتر ئاماژەم پێدا، لە ساڵی (١٩٤٨)ەوە گرووپی (ئیخوان) لە لیبیا هەبووە.

بۆیە، من هەر ئەو بیرەوەرییانە تۆماردەکەم کە خۆم شاهید حاڵیان بووم ــ هەرچەندە ئەوانیش شتی دژبەیەکیان تێدایە، بەڵام من هیچ خەتایەکەم لەوەدا نییە، من چاوی کامێرام و وێنەکان دەگرم و دەیانخەمە بەر چاوی خوێنەر.

## پۆلیس و سەرباز:

وابزانم ساڵی (١٩٩٦؟) بوو، لە ڕۆژی نەورۆز لەگەڵ چەند خێزانێکی کورد و عەرەبی عێراقی چووبوینە ئەو دەشت و دەرە. کە ئێوارە دەگەڕاینەوە ماڵ، تازە دەهات دونیا بوڵێڵ بێ، مەفرەزەیەکی چەکدار ڕایان گرتین، هەمووی دەمامکدار بوون و کلاشنکۆفیان لە ناو دەستی بوو، مشەوەشایەیان پێوە دیار بوو، یەکێکیان سەری هێنایە ناو ئۆتۆمبیلەکە و پرسی چ کارەین و بۆ کوێ دەچین. ئەوان زانیان کە ئێمە عێراقین، چونکە تابلۆی ئۆتۆمبیلی غەیرە لیبی، لە تەنیشت ژمارەکەی، ژمارەیەکی دیکە هەیە، وەک ڕەمز بۆ هەر وڵاتێک، بۆ نموونە ژمارە (٣١) واتا عێراقی. ئەمەش ناسینەوە و چاودێریکردنی کەسانی بیانی هاسانتر دەکات. ئەو ئێوارەیە تا گەیشتنەوە ماڵ، تووشی چوار یان پێنج بازگەی دیکەش بووین، دیاربوو، لە پۆشاک و دەمامک و چەکەکەیان هەمووی یەک دەستە و تاقم بوون. ئێمە وامان مەزەندە کرد، کە کودەتا کراوە یان قەزافی شتێکی لێ بەسەرهاتووە، بەڵام کە چووینەوە ماڵ، لە ڕادیۆ و تەلەڤزیۆن هیچ خەبەرێک نەبوو. ئێستاشی لەگەڵ بی نەمانزانی ئەوانە کێبوون و چ ڕووی دابوو.

جارێکیشیان، لە تەرابلس، دوو سەربازم لە نێو دەرگای فەرمانگەیەک بینی، وابزانم وەزارەتی بەرگری بوو، کلاشنکۆفیان پێبوو.

بە درێژایی ئەو ساڵانەی لە لیبیا بووم، جگە لەو دوو دیمەنەی سەرەوە، قەت هیچ کەسێکم نەدی چەکبەشان بێ. سوێندم لەو کەژاوانە ناکەوێ کە یاوەری قەزافی بوون لە هاتووچۆیەکانیدا. بە درێژایی ئەو ساڵانەش بۆ سۆدرەی سەران گوێم لە دەنگی تەقەی فیشەکێک نەبووە. ئەو بازگانەی لە نێوان هێندێ لە شارەکاندا هەبوون، زۆربەیان پۆلیسی هاتووچۆ بوون و ئەوانەی کە هی ئاسایش و پۆلیسیش بوون، چەکبەشان نەبوون.

دەمزانی کە لە لیبیاش، وەک هەموو دەوڵەتێک پۆلیس و پۆلیسخانە هەیە، بەڵام قەت چاوم بە پۆلیسێک نەکەوت و فەرمانگەی پۆلیسخانەشم نەدیت، لە شاری سرتیش کە تێیدا دەژیام، ئێستاشی لەگەڵ بێ، نەمزانی پۆلیسخانەیان لە کوێیە. ئەگەرچی لە دووری دەڤەری ماڵەکەماندا، سەربازگەیەکی گەورە هەبوو، بەڵام ئەفسەر و سەربازم لەو ناوە نەدەدیت.

**ئاسایش:**

که پێدەنێیتە سەر خاکی لیبیا، وەک بێگانەیەک، هەست دەکەی کە هەموو ئەو چاوانەی تەماشات دەکەم، پیاو و ژنی ئاسایشن، دەیانەوێ زۆرترین زانیارییت لێ وەرگرن، گەر بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆش بێ! بۆ نموونە، لە سەفەری نێوان شارەکاندا، پەساپۆرتەکەت، تا دەگەیتە شوێنی مەبەست، لە لای شۆفێرەکە دەبێ. ناتوانی لە هیچ شار و شارۆچکەیەکی دیکە دابەزیت و لادەی. کە بە تەکسیش دەتەوێ بچیتە شوێنێک، ئەوا تا دەگەیتە ئەو شوێنە، شۆفێرەکە، دەبێ زانیاریی تەواوت لێ وەرگرێ و دڵنیابێ کە دەچتە کوێ و سەردانی ماڵی کێ دەکەی. دوای ماوەیەک، لە زاری لیبییەکان زانیم کە تێکڕای شۆفێرەکانی لیبیا سەر بە دائیرەی ئاسایشن و مووچەیان هەیە. لەڕاستیدا، ئەمە ئەو پەڕی کارامەییە بۆ چاودێری و چاوگێران، لە لایەک، هەر ساتەی ئەو شۆفێرانە لە جێگە و شوێنێکن، لە لایەکی دیکە مەسافیرەکان خۆیان زانیارییەکانیان پێدەدەن. واتا، ئەگەر لە شارێکی خۆمان لە کوردستان ژمارەیەکی کەم لە ئۆتۆمبیلی پۆلیسی (نەجدە) هەبێ، ئەوا تێکڕای ئۆتۆمبیلەکانی شارەکانی لیبیا ئۆتۆمبیلی پۆلیسی (نەجدەن)، ئەمەش لە هیچ وڵاتێکی دونیادا، جگە لە لیبیا بوونی نییە.

زۆربەی هەرزۆری خوێندکار و زانکۆیی و گەنجەکان و فەرمانبەرەکانی ئەو وڵاتە، ڕۆڵی پیاوانی ئاسایش دەبینن، ئەگەر بە فەرمیش ئەوە کارەیان نەبێ. ڕووداو و بەسەرهاتەکان زۆرن ــ لێرە هەموویان تۆمار ناکرێن. گەنجێکی میسری دەچێتە گوندێک، بەڵام لە سەرەتای ئاوایییەکە دادەبەزێ و ناچێتە ناو گوندەکە، یەکسەر شۆفێری تەکسییەکە گومانی لێدەکات و کابرا دەگرن و ئاشکرا دەبێ، کە بە نیازی تۆڵەسەندنەوە لە خێزانێکی میسری، ویستوویەتی سەردانی ئەو گوندە بکا.

سەر لە ئێوارەیەک، دوو کچە فەرمانبەری عێراقیم لە سرتەوە هێنایە ماڵەوە، ئەوان لە نەخۆشخانە کارمەند بوون و ئاشنایەتیمان لەگەڵیاندا پەیدا کردبوو، ئەوەندەم زانی، یەکێک لە لیبییە دراوسێیەکانمان، خۆی کرد بە ژوورە و ویستی قسە لەگەڵ ئەو دووکچە بکات، تا دڵنیابێ ئەوانە کێن و کێنین و بۆ هاتوونەتە گوندی!

پێش ئەوەی مۆبایل بگاتە ئەو وڵاتە، بەڕێوەبەرەکەم دەیگوت، هەرشتێ لەو دەڤەرە ڕوویبدا من دوای (٧) دەقیقە پێینەزانم، کارەساتە! لەو (٧) دەقیقەیەش مەبەستی ڕێیەکە بوو تا ماڵیان.

**حیزب:**

دیاردەیەکی دیکەی جەماهیرییە ئەوبوو کە هیچ حیزبێکی سیاسی لەو وڵاتەدا بوونی نەبوو. دەتوانین بڵێین بە درێژای ئەو (١٠٠) ساڵەی دوایی، واتا لەسەردەمی ئیتاڵییەکان و فەرمانڕەوایی پاشایەتی و دواتر هاتنی قەزافی، هیچ حیزبێکی سیاسی نەیتوانیوە لەو وڵاتە کاری حیزبایەتی بکات. جا درووشمەکەی قەزافیش (من تحزب خان : واتا ئەوەی حیزبایەتی کرد، خیانەتی کرد)، هێندەی دی دەرگای حیزبایەتی بە قوڕێ گرت. قەزافی هەرگیز بانگەشەی بۆ هیچ حیزبێک نەکردووە، لێ دەیەویست هەموو گەنجانی وڵات بچنە لیژنە شۆڕشگێرەکان، ئەوەش وەک حیزبایەتی نا، وەک ڕێکخراوێکی مەدەنیی جەماوەریی.

دوایی ئەوەی، عێراقییەکان بە لێشاو ڕوویان لە لیبیا کرد، لە نەوەتەکانی سەدەی ڕابردوو، دووسێ مامۆستای زانکۆی عێراقی، لە دەرەوی خانووە تەرخانکراوەکان بۆ مامۆستایانی زانکۆ، بۆ خۆیان خانووێک بە کرێ دەگرن لە تەرابلس. دواتر ئاشکرا دەبێ، کە ئەو مامۆستایانە بەعسین و دەیانەوێ بانگەشە بۆ حیزبی بەعس بکەن و سێ چوار خوێندکاری لیبیشیان هەڵخەڵەتاندبوو. یەکسەر ئەو مامۆستایانەیان لە سەرکارەکانیان دەرکرد و لە ڕێی میسر ڕەوانەی عێراقیان کردنەوە و خوێندکارە لیبییەکانیش گیران، خانووەکەشیان تەقاندەوە. تا ببێتە دەرس و عیبرەت بۆ کەسانی دی.

لە قوتابخانەی دواناوەندی (شهداء البدر)، کە چەند کیلۆمەترێک لە ماڵمان دوور بوو، دوو مامۆستای عێراقی دامەزرابوون، ڕشتەکەیان بیرکاری و ئینگلیزی بوو، پاش دوو ڕۆژ لە دەست بەکاربوونیان، یەکسەر ڕەوانەی عێراق کرانەوە، لیبییەکان گوتیان، ئەو دوو مامۆستایە بەعسی بوون و ئەفسەر بوون لە عێراق.

بەدێژایی مێژووش، گرووپە ئیسلامییەکان هەمیشە قاچاغ بوون. حکوومەتی میسری و لیبیی، ڕادەستی یەکتریان دەکردنەوە. چەند ئیخوانێکی میسری لە لیبیا گیران و ڕادەستی میسر کرانەوە. بە پێچەوانەشەوە. دواتر ئەمەریکاش هاتە سەر خەت و ئیسلامییە لیبییەکانی

دەگرت و ڕادەستی قەزافی دەکردنەوە، بەتایبەتی دوای ڕووداوی (١١)ی سێپتەمبەری (٢٠٠١).

**ئاڵا:**

عەسرێک، مامۆستا عەبدول ڕەحمان زەرگە، هاتەو ژوورە من خەریکی بۆیە کردنی پێڵاوەکانم بوو، هێندەم زانی پڕی دایە دەستم و گوتی:

ــ کوڕە مامۆستا فازیل دەخیلت بم، ئەوە چیدەکەی؟ شوکری خودا بکە ئەوە من و کەسێکی دیکە نییە، دەنا ئێستا کەوڵت دەگەیشتە دەباخانان؟

پارچە پەڕۆیەکی کەسکم بەدەستەوە بوو، ئەو گوتی، ئەوە ئاڵای لیبیایە، هەرکەسێک بتبینێ پێڵاوی پێدەسڕیتەوە، دەتکوژێ!

منیش وێرای سوپاسکردنی، کە ئاگاداری کردمەوە، نیازپاکیی خۆم نیشاندا و نەمزانییە هەر شتێک لێرە ڕەنگی کەسک بێ، پیرۆزە و بە ئەنقەست ئەو کارەم نەکردووە.

ئاڵای سەردەمی مەلیک، کە لە (٧)ی ئۆکتۆبەری (١٩٥١) هەڵکرا، بە ناوی ئاڵای ئیستقلال ناسرابوو، بە شێوەی ئاسۆیی ڕەنگەکانی سوور و ڕەش و سەوز بوون و هیلال و ئەستێرە لە ناوەندی دابوو. کە قەزافی کودەتای بەرپاکرد تا ساڵی (١٩٧٢) ئاڵای جەمهوری ڕەنگی سوور و سپی و ڕەش بوو. تا ساڵی (١٩٧٧) ئاڵای یەکێتیی عەرەبییان هەڵدا، وەک هێمایەک بۆ یەکێتیی نێوان لیبیا و میسر و سووریا، ڕەنگی ئاڵاکە سوور و سپی و ڕەش بوو، ئارمی بازی لەسەر بوو، لە ژێری نووسرابوو(اتحاد الجمهوريات العربية)، لە بن ئەوەش نووسرا بوو (جمهورية العربية الليبية). بەڵام لە ساڵی (١٩٧٧) لەگەڵ چاپکردنی (كتاب الاخضر) دەرکردنی بەیاننامەی سوڵتەی شەعب، ئاڵاکەشیان گۆڕی. ئاڵایەک هەر یەک ڕەنگ بوو، ڕەنگی کەسک، هیچ نووسین و هیچ ئارم و هێما و ڕەمزێکی لەسەر نەبوو. بەمەش، ئاڵای لیبیا بووە یەکەم ئاڵا کە لە جیهاندا هاوتای نەبێ و هەر یەک ڕەنگ بێ و هیچ هیچی لەسەر نەبێ.

**ساڵنامەی جماهیرییە:**

شەوێک دوو گەنج، بە ئۆتۆمبیل لە بەردەرگایماڵەکەمان ڕاوەستان و دوای زەنگلێدان و چاکوخۆشی گوتیان هاتووین داواکارییەکی سەیرمان هەیە، پێمان بڵێ "ئێمڕۆ چەندی

مانگە بە ساڵنامەی فەرەنگی و ئەو فاکسەشمان بە زمانی ئینگلیزی بۆ بنووسە بۆ دەرەوەی دەنێرین."

ئەو دوو گەنجە کە پەروەردەی قەزافی بوون و لەوەتەی چاویان کردووەتەوە هەر ئەو شتانە فێرکراون کە ئەو زاتە دارپێژەر و دانەری بەرنامە و یاساکان بووە. ئەوان بە ساڵنامەی زایینی (میلادی) دەڵێن ساڵنامەی فەرنگی.

مێژووی ساڵنامە دێرینەوە، چەند ساڵنامەیەکی جیهانیی بەناوبانگ کاریان پێدەکرێ، وەک ساڵنامەکانی زایینی، هیجری، چینی، فارسی، عیبری، ڕۆمانی... تاد.

قەزافی پێیوابوو کە بەکارهێنانی ساڵنامەی زایینی کە ئەو پێیدەگوت (ساڵنامەی مەسیحی)، کفر و بدعەیە، چونکە ناوی مانگەکانی ئاماژەن بۆ بتپەرستی و بەنەمرکردنی قەیسەر و پاشا جەبەرووت و دڕندەکانیان. بە بۆچوونی ئەو، ناوی (ینایەر) ئاماژەیە بۆ بتێک کە ڕۆمانییەکان دەیانپەرست، (مارس)، خودای شەڕ و جەنگە، (یۆنیۆ) ناوی خێڵێکی ڕۆمانییە، (یۆلیۆ) ناوی (یۆلیۆس قەیسەری ئیمپراتۆری ڕۆمایە کە باکووری ئەفریقیای داگیر کردبوو)، (سێپتەمبەر و ئۆکتۆبەر و نۆڤێمبەر و دیسەمبەر) ژمارە حەوت و هەشت و نۆ و دەن، کە ڕیزبەندەکەشیان هەڵەیە،( سێپتەمبەر)واتە حەوت، کەچی کراوەتە ناوی مانگی نۆ!

ئەو دەڵێ، لە ژیاندا تەنها ڕۆژی لەدایکبوون و ڕۆژی کۆچکردن گرنگە، ڕووداوەکانی نێوانیان بایەخی نییە. بۆیە ڕۆژی کۆچیدوایی (پێغەمبەری موسولمانان، موحەممەد، د.خ.) دەکاتە سەرەتایی ساڵنامەکەی کە خۆی دایهێناوە. واتا (١٢) ی مانگی (ڕەبیعی یەکەم)، کە دەکاتە (٨)ی حوزەیرانی (٦٣٢)ی زایینی یەکەم ڕۆژی ساڵنامەیەکە. بەو پێیە، بۆ نموونە، ساڵی (٢٠٠١) لە ساڵنامەکەی قەزافی دەکاتە (١٣٦٩).

ناوی مانگەکانیشی بەم شێوەیە گۆڕیێ:

١) مانگی ینایر، بووە مانگی (ای النار) واتا (کوا ئاگر؟)، چونکە لەو مانگە ئاگر خۆشە.

٢) مانگی فبرایەر، بووە مانگی (النوار) واتا گوڵە بەیبوون، کە لەو مانگە زۆر دەبێ.

٣) مانگی مارس، بووە مانگی (الربیع) واتا (بوهار).

٤) مانگی ئەپریل، بووە مانگی (الطیر) واتا مانگی (تەیروتوار)، هێلکەدەکەن و فەرخە هەڵدێنن.

٥) مانگی مایۆ، بووە مانگی (الماء)، واتا (ئاو). چونکە زەوی تینووی ئاو.
٦) مانگی یۆنیۆ، بووە مانگی (الصیف)، واتا (هاوین).
٧) مانگی یۆلیۆ، بووە مانگی (الناصر)، ئاماژە بۆ ناوی (جەمال عەبدولناصر).
٨) مانگی ئۆگست، بووە مانگی (هنیبال)، واتا (هانیباڵی قارەمان) سەرکردەی فینیقی کە لەشکری ڕۆمای شکاند.
٩) مانگی سێپتەمبەر، بووە مانگی (الفاتح) واتا (فاتیح) کە کودەتایی تێدا کرد.
١٠) مانگی ئۆکتۆبە، بووە مانگی (التمر)، واتا (خورما)، پێدەگا.
١١) مانگی نۆڤیمبەر، بووە مانگی (الحرث)، واتا (کێلان)، وەختی زەوی کێلانە.
١٢) مانگی دیسێمبەر، بووە مانگی (الکانون)، واتا (مقاڵە)، بۆ گەشکردنەوەی پشکۆ تا لەبەری دانیشن، چونکە مانگەکەساردە.

هەرچەندە قەزافی دەیەویست ئەو ساڵنامەیە لە هەموو جیهانی عەرەبی و ئەفریقی پەیڕەوبکرێت و بەکار بێت، زۆریش بانگەشەی بۆ کرد، کە چووە کۆنگرەی ئەفریقی لە (ئەنجەمینا)ی پایتەختی (تشاد)، سەرەتا باسی ئەو ساڵنامەیەی کرد و داوای لێکردن کە بەکاری بێنن. بەڵام لە سنووری لیبیا دەرنەچوو، چونکە تایبەت بوو بە سرووشت و ئاوهەوای ئەو وڵاتە. بۆ نموونە، مانگی (١٠)، مانگی (خورما)بوو، بەڵام لەو مانگە لە سۆماڵ مانگی مۆز و لە لوبنان مانگی قەیسی و لە ئۆغەندا مانگی مانگۆیە!
لە ڕاستیدا، لیبییەکانیش کێشەیان لەگەڵ ئەو ساڵنامەیە هەبوو، بە تایبەتی کە دەبووە سەر ساڵی نوێ، نەیاندەزانی چ ڕۆژێک ساڵی نوێیە ــ دوای کوژرانی قەزافی، ساڵنامەکەشی نێژرا، ڕژێمی نوێی لیبیا گەڕاوە سەر ساڵنامەی هیجری و میلادیی.
ئاڵای ئیستقلالیشیان زیندوکردەوە و هەڵدا.

## (١١)

# شــەڕی ئۆزۆ

وەک چۆن تاکو ئێستا لە باشووری کوردستاندا، هێندێ لە پیاو و ژنانی بە تەمەن، لە دیوەخان و مەجلیسەکانی لای خۆماندا، باسی ڕووداو و بەسەرهاتە خوێناوی و دژووارەکانی سەردەمی حەرەس قەومی دەکەن، لە لیبیاش، زۆرجار شێخ و بەساڵاچووەکانیان، لە مەربوعەکانیاندا، سەرگوزشتەی ڕووداوی ناخۆش ناخۆش دەگێڕنەوە، کە یان ئەوەتا خۆیان تێیاندا قارەمان و ئەکتەر بوون یان لە زاری کەسانی شایەتحاڵ و بەشداربوو، ڕووداوەکان دەگێڕنەوە.

ڕۆژێک لە مامۆستا عەبدولناصرم پرسی، ئێمەی عیراقی شتێکی وا نازانین دەربارەی ئەو کووشتار و خوێنڕێژییەی لە نێوان ئێوە و خەڵکی تشاد ڕوودا. ئەوە چیی بووە و چۆن بووە؟

مامۆستا بە دەنگێکی پڕ لە حەسرەت و خەفەتەوە گوتی:

ــ مامۆستا فازیل، هەر بەردێکی لەسەر دانێ! برینان مەکولێنەوە، ئەوەی خەڵکی لیبیا لەو شەڕەدا بینی و دووچاری بوو، بڵێ خوایە ناحەزیشت نەیبینێ. بۆ، چمان هیچ خانەوادەیەک هەیە لەو لیبیایە، قوربانییەک، دوو قوربانی، سێ قوربانی، لەو شەڕەدا نەدابێ؟ بۆ چما هیچ لە گەورە ئەفسەر و پلەدار ناودارەکانی سەربازیمان ما؟ کێمان لەو شەڕە نەگریسەدا نەبووە قوربانی؟ دوو ڕووداو، گورزی کوشندەیان لە لیبیا وەشاند، یەک، شەڕی تشاد، دوو، ئابلوقە ئابوورەییەکەی کە ئەمریکا و ئەورووپا و دەرودراوسێکانمان بەسەریاندا سەپاندین. ئاگربەستی شەڕی تشاد ڕانەگەیندرابایە، لیبیا تێچوو بوو. لە ئابلووقە ئابووریەکەشدا، چما پاکەتێک حەب، قووتوە شیرێکی منداڵان، بڵێ مۆزێک، لەو لیبیایە بەدەست دەکەوت؟ هەتا خۆمان گرتەوە و بە ڕێی قاچاغ و ماچاغ بازاڕەکانمان ژیانداوە."

لێرەدا، منیش حەزم کرد خوێنەری کوردیش، زانیارییەکی لەبارەی ئەو ڕووداوە مێژووە هەبێ، کە بە ناوی (شەڕی ئۆزۆ) چووەتە نێو مێژوو.

لەم زنجیرە بیرەوەرییەدا، ژیاننامەی قەزافی و چونیەتیی گەیشتنی ئەومان بە دەسەڵات باس کرد. دواتر پوختەی ئەو (٣) هەنگاوەمان خستە ڕوو، کە قەزافی مەراقی بوو جێبەجێیان بکات: نەهێشتنی نەخوێندەواری و نیشتەجێکردنی ڕەوەند و کوچەرییەکانی لیبیا و بووژاندنەوەی باروبژێوی خەڵکەکەی. گوتمان وڵاتانی دەرودراوسێی قەزافی، کە زۆربەیان موحافیزکار و کورسییپەرست بوون، بە جددی نیگەران بوون لە فەلسەفە نوێیەکانی ئەو سەرکردە و بۆ سەر وڵات و حوکمڕانی خۆیان بە هەڕەشەیان دەزانی، بۆیە میسرییەکان هەوڵی کودەتایەکیان دا کە تێیدا سەرنەکەوتن. بە درێژایی ژیانی حوکمڕانی (٤٢) ساڵەی قەزافی، دوو جار هەوڵی کودەتا و زۆر (٢٤) جاریش هەوڵی تیرورکردنی ئەو درا، لێ هەر هەموویان شکستیان هێنا. هەرچەندە مەلیک عەبدوڵڵا عەبدولعەزیز، لە کۆبوونەوەی کۆمکارانی عەرەب، ڕوو بە ڕوو، قەزافی بە پیاو و دەستوپێوەندی بێگانە ناوبرد و گوتی "دەزانین کێ تۆی هێنایە سەر تەخت!" بەڵام تاوەکو ئێستا، هیچ بەڵگەیەکی باوەڕپێکراو لە بەردەست دانییە، قسەکەی مەلیک عەبدوڵڵا بسەلمێنێ.

ئێستا، بۆ لاوازکردن و لە عەردیدانی قەزافی، وڵاتانی زلهێز، لیبیایان لە شەڕێکی خوێناوی درێژخانەی مەسرەف قورس تێوەگلاند و کارتی سووریان نیشانی ئەو سەرکردە دا، کە نابێ سنووری دیاریکراوی خۆی ببەزێنێت، دەبێ پێ، بەقەد بەڕەکەی خۆی ڕابکێشێ.

لە مێژووی نوێی لیبیا و ئەفریقیادا ئەو شەڕە بە (شەڕی ئۆزۆ) ناسراوە کە بە دەیان هەزار کەسی تێدا کوژرا وماڵوێرانی زۆری بەدوای خۆیدا هێنا.

ئۆزۆ(Aozou)، ئەو پارچە زەوییەیە کە لەباشووری لیبیادا، سنووری نێوان وڵاتی تشاد و لیبیا دیاری دەکات. نزیکەی (٨٠٠) کم درێژ و (٥٠) تا (٩٠) کم پانە و ڕووبەرەکەی نزیکەی (٨٠) هەزار کم[٢] دەبێ، بە یۆرانیۆم و مەنغەنیز دەوڵەمەندە، پتر لە نیوەی دانیشتووانەکەی موسڵمان و (٣٠٪)ی مەسیحیی و باقییەکەی بتپەرست و بێ ئایینن. لەسەردەمی عوسمانلییەکانەوە خەڵکەکەی ئەوێ خۆیان بە لیبی دادەنا، بۆیە کە لیبیا بووە موستعمەرەی ئیتاڵیا و تشادیش بووە هی فەرەنسا، لە ساڵی (١٩٥٣) پەیماننامەی مۆسۆلینی ـ لاڤاڵ واژووکرا و ئۆزۆیان داوە حکوومەتی لیبیای ئەو کات هەرچەندە پەرلەمانی ئیتاڵیا بەم ڕێککەوتنە لالووت بوو. (مۆسۆلینی سەرۆک وەزیرانی ئیتاڵیا و بیر

لاقاڵ سەرۆک وەزیرانی فەرەنسا بوون). جا لەساڵی (١٩٧٢) تشاد بۆخۆی ڕێککەوتنی بازرگانی و هاریکاریی لەگەڵ لیبیا واژوو کرد و پەیوەندییەکانیان مووی بە بەیندا نەدەچوو. لیبیاش ئۆزۆی خستە سەر پارێزگای (مەرزوق) لە باشووری وڵات و پێناسەی باری شارستانی و ڕەگەزنامەی لیبی بۆ دانیشتوانەکەی ناوچەکە دەرکرد.(کتومت وەک کوێت و سەددام)، ئا لەو سەین و بەینەدا، شەڕ و پێکدادان لە نێوان موسڵمانەکان و مەسیحییەکانی تشاد بەرپا بوو، خوا بۆ ناحەزەکانی قەزافی نارد. کەوتنە پڕۆپاگەندە و ئاژاوەنانەوە، کە گۆیا قەزافی چەک و هاریکاریی سەربازی بۆ موسڵمانە چەکدارەکان دەنێرێ و پەیوەندیی خۆی لەگەڵ سەرکردەکەیان ـ کە حوسێن حبری بوو ــ خۆش کردووە. لە بێ بەختی قەزافیش لەو ساڵەدا، (١٩٧٥)، سەرۆکی تشاد (فرانسۆ تومبالبای) کە مەسیحیی بوو دەکوژرێت و هێندەی دێ ئاگری دوژمنایەتییەکەی نێوان لیبیا و تشاد خۆش دەکەن. ناچار لیبیا هێزی سەربازیی بەرەو ئۆزۆ جوولە پێدەکات و بۆ ماوەی (٤) ساڵ خوێناویترین شەڕ لەم ناوچە بیابانە قاقڕ و چۆل و هۆلە بەردەوام دەبێ. دواتر موسڵمانەکانی تشاد دەیانەوێ یەکێتیی خۆیان لەگەڵ لیبیادا ڕابگەیێنن و بارودۆخەکە زۆر ئاڵۆز دەبێ و وڵاتانی ڕۆژاوای دەست ڕۆیشتوو، هەموو ئەو شتانەیان بە فیتیی قەزافی دەزانن و هێندەی دی لێی بەرق دادەکەون.

من لەم دەمەدا لە لیبیا نەبووم، بەڵام لەو سەربردە و ڕووداوانەی باسیان دەکرد، ئەو شەڕە (کتومت وەکو شەڕەکەی نێوان عێراق و ئێرانی لای خۆمان بوو، لە ساڵەکانی ١٩٨٠ ـ ١٩٨٨). لە کۆتایدا سوپای لیبیا دەشکێ و ئۆزۆ دەکەنە دوو کەرت نیوەی بەبەر لیبیا کەوت و نیوەکەی دیکەشی بەبەر تشاد کەوت.

لیبییەکان بۆخۆیان ددان بەوە دادەنێن، کە ئۆزۆ جگە لە تەڵەیەکی مەحکەم هیچی تر نەبوو، وڵاتانی دژە شۆڕشی لیبیا دایان ناوە تا قاچی قەزافی پێوە بێ. بەڕاستیش قەزافی بەو تەڵەیەوە بوو و بە زۆر لەسەری شکایەوە و لیبیا و لیبییەکان زۆرتییدا زەرەرمەند بوون.

جا بە درێژایی ساڵەکانی ئەو شەڕە، نە میدیاکانی لیبیا و نە هی وڵاتانی ناوچەکە و جیهانی، هیچیان دەربارەی ئەو شەڕە خوێناوییە نەدەدرکاند. تا هەر نەزیفی خوێنەکە بەردەوام بێ بە بێدەنگی.

دوای ئاشتبوونەوەیان، چەندان جار قەزافی سەردانی تشادی کرد و خەڵکەکە ئەم بەر ئەو بەری شەقامەکان پێشوازییان لێدەکرد. ئەلهەقی قەزافیش هێندێ کۆمەکی ماددی کردن و وزەی کارەبای بۆ چەند ئاوەدانییەکی سەر سنوور ڕاکێشا و هێندێ ڕەوەندیشی نیشتەجێ کرد.

زەرەروزیانە مادییەکانی، لەو شەڕەدا، بە قەپرغەی لیبیا کەوت، هیچی کەمتر نەبوو لە قوربانییە گیانییەکانی. ئەوکات ئابووری لیبیا لاواز و هەژار بوو و تازەداهات بەسەر پێ بکەوێ. کەسێتیی قەزافیشی هێنابووە سەر محەک!

# (١٢)

## هەنگاوێکی بچووک، لەسەرە ڕێیەکی دوور و درێژدا

له شەی (١٥)ی نیسانی ساڵی (١٩٨٦)، لەهیکرا، (٦٦) فرۆکەی (F-١١٧)ی هێزی ئاسمانی ئەمەریکی بە پاڵپشتی هێزی دەریایی مارینز لە دەریای سپیی ناوەند، بۆمبارانی چەند بنکە و مەکۆیەکی سەربازییان کرد لە تەرابلس و بەنغازی. لەو هێرشە گەورەیەدا، کۆشک و سەرای قەزافیش لە تەرابلس، چەند بومبێکی تێگیرا. (٤٥) سەربازی لیبی لەگەڵ کچێک کە قەزافی هەڵیگرتبۆوە بە ناوی (هناء؟) کوژران و ژمارەیەکیش لە خەڵکی سڤیل بریندار بوون. ڕۆناڵد ڕیگنی سەرۆکی ئەمریکا، لە تەلەڤزیۆن، گوتی:"ئەوە سزایی ئەو تیرۆرستانەیە کەدژایەتیی ئەمریکا و گەلی ئەمەریکی دەکەن.". کە ڕۆژ بۆوە، لە هەموو شارەکانی لیبیا بووە خۆپیشاندان دژی ئەو هێرشە دۆژمنکارییەی ئەمەریکا. خۆپیشاندەران حاشایان لەهەر شتێک کرد کە ئەمەریکی بێ، بۆیە قوتابی و مامۆستاکانیش، هەرچی کتێبی ئینگلیزی هەبوو سووتاندیان و هاواریان دەکرد (طز باللغة الانجليزية).

لەو ڕۆژەوە، خوێندنی زمانی ئینگلیزی لە پرۆگرامی خوێندنی ئەو وڵاتە، لە هەموو قۆناغەکاندا سڕایەوە. کە من لە ساڵی (١٩٩٤) گەیشتمە لیبیا، لە نوێ، خوێندنی زمانی ئینگلیزی لە پرۆگرامی خوێندندا داندرابۆوە، لە پۆلی حەوتەمی بنەڕەتییەوە تا دوا پۆلی زانکۆ. واتا بۆ ماوەی (٩) ساڵی ڕەبەق، نەوەکانی لیبیا مەحرووومکران لە فێربوونی زمانی ئینگلیزی. ئەوان تەنانەت ئەلفوبێی ئەو زمانەشیان نەدەزانی.

من دەستپێک، بۆ پۆلی حەوت و هەشت و نۆی بنەڕەتی، یەک پرۆگرامی خوێندم هەبوو، کە کتێبێک بوو لە پرۆگرامی خوێندنی وڵاتی ئۆستوڕالیا وەگیرا بوو.

لەڕاستیدا، مێژووی خوێندن لە لیبیا، تا ئەم ساتەوەرختەش، پڕە لە چاڵ و کەندولەند و هەڵدێرە. خوێندن لەو وڵاتە هەر لە حوجرەی مزگەوتان بووە، تا لە ساڵی (١٨٤٢) یەکەم قوتابخانەی سێ پۆلی لە تەرابلس لەسەر دەستی والی محەممەدەمین پاشا کرایەوە، ئەویش بەزمانی عەرەبی و تورکی بوو. چونکە ئیتاڵیای مۆسۆلینی، بە خراپترین داگیرکەر

ـ بە بەراورد بە بەریتانیا و فەرەنسا ـ ناوزەندکراوە، لەو (٤٠) ساڵەی داگیرکردنیی لیبیا (١٩١١ ـ ١٩٥١)، کاریکی وای بۆ نەکردن، دەستخۆشییان لیبکریت. خۆ بە گوتەی لیبییەکان بێ، لە شەڕ و پیکدادانەکانی نیوان بەرەی یاخیبووی عومەر موختار و سوپای فاشییەکان، بە سەدان هەزارکەس بوونە قوربانی، بۆیە نە ئیتاڵیای داگیرکەر و نە لیبیای کۆیلەکراو دەرفەتی ئەوەیان هەبووە، بیریک لە خویندن و پەروەردە بکەنەوە و ئاکامەکەشی ئەوەبوو، بیابانیکی کاکی بەکێ بیسەواد و نەخویندەواریان کردە میرات بۆ موعەمەر قەزافی خەونبین. ئیتاڵییەکان لە ساڵی (١٩١٤) قوتابخانەی سەرەتاییان کردەوە بە زمانی عەرەبی و ئیتاڵی. یەکەم قوتابخانەی دواناوەندیش لە لیبیا لە ساڵی (١٩٤٧) کراوەتەوە. لەگەڵ دامەزراندنی کۆماری لیبیا (لەسەرەتا و جەماهیرییە دواتر)، بەرنامە و پڕۆگرامی خویندن، لە داڕشتن و ئامادەکردنی خودی قەزافی بوو. ڕشتەی بابەتە مرۆییەکانی وەک زمان و ئایین ومێژوو و جوکرافیا وپەروەردە، پەیوەست بوو بە ژیان و کەلتوور و خەونەکانی خۆیان، بەڵام ڕشتەی بابەتە زانستییەکان، چونکە ئەو پیاوە بۆخۆی ئینگلتەرای دیبوو وپێی موعجیب بوو، هەمان بەرنامە و کتیبی کە خویندکارە ئینگلیزەکان لە ئینگلتەرا دەیانخویند وەرگێڕدرایە سەر زمانی عەرەبی و کردی بە پڕۆگرامی خۆیان. باوەڕ بفەرموون، مامۆستای عیراقی زۆر کاراما و بە ئەزموون، نەیدەتوانی خۆی لە دەرسی بیرکاریی قوناغی دوانزدە بدات، چونکە زۆر قورس و جیاوازتر بوو لەگەڵ پڕۆگرامی لای خۆمان.

کە قەزافی حوکمی وڵاتی گرتەدەست، تەنها (٢) زانکۆ لە لیبیا هەبوو، ئەو کە کوژرا، ژمارەی زانکۆکان گەیشتبووە (٢٢) زانکۆ. (٣٠٣) بنکەی خزمەتگوزاریی پەروەردەیی (ئیمە پیدەڵیین بەڕیوەبەرایەتیی پەروەردە)، لە هەموو لیبیا سەرپەرشتیی هەزاران قوتابخانەیان دەکرد.

تا ئەمساتە وەختە، کیشەی گەورەی پڕۆسەی پەروەردە و فیرکردن لە لیبیا، نەبوونی کادیری بە توانا و شارەزایە. ئەوان پشتیان بە مامۆستایانی میسری بەستبوو، بەداخەوە، ئەو مامۆستایانە زۆر ناپەروەردەییانە پەیامی خۆیان جیبەجێ دەکرد، درووشمیان ئەوەبوو "با لیبییەکان فیر نەبن، تا منداڵەکانم بین ببنە مامۆستایان!". مامۆستا فەلسەتینییەکانیش، کە مامۆستای باش بوون، ژمارەکەیان کەم بوو. سیستمی پڕۆگرامی خویندنیان، هەمان

پرۆگرامی بەریتانی بوو، کە بۆ ئەو جۆرە ئاستە زۆر زەحمەت بوو. خودی خوێندکارە لیبییەکانیش وا فێرکراون، یان بڵێین نازیان دراوەتێ، کە هەردەبێ دەرچن و کەوتن نییە. دەنا بە گشتی، ئاستیی زیرەکی خوێندکارەکانیان باش بوو، بەڵام لەم دوایەدا لە کورتیدا وکیرڤەکەی بۆ خوارەوە داشکاوە.

واتا پرۆسەکە هەر گۆڕینی پۆلەکان بوو، بەبێ ئەوەی ئاستیی زانستی و مەعریفی و فیکری و هزری و ڕۆشنبیریی خوێندکارەکان گەشەی پێبدرێ. بۆیە کە زانکۆشیان تەواو دەکرد، دەیانەویست زوو لە پشت مێزێک دانیشن و فەرمان دەرکەن و هیچ کارێک ئەنجام نەدەن، چونکە توانست و ئاست و ئەزموونیان لاواز بوو.

ئەوانە هەموو وایان کردبوو، کە پرۆسەی خوێندن لەو وڵاتە خاڵی بێ لە پەیام و مۆڕاڵ و ئامانج.

***

من لەگەڵ بەڕێوەبەرەکەم، ئەوەم براندبۆوە، کە شێواز و بەرنامەی تایبەت بە خۆم هەیە و زۆر پابەندی کتێبەکەی پرۆگرامی زمانی ئینگلیزی وان نابم. لەیەکەم سەردانیشی، سەرپەرشتیاریی ڕشتەکەم، زۆر سەرسام بوو کە چۆن ئەو خوێندکارانە، لەو ماوە کورتەدا، ئەو ئاستە باشەیان هەیە. دوو قۆڵی، هەموو خاڵە لاوازەکانی ئەو کیبیەم بۆ سەرپەرشتیارەکەم، بەیان کرد و حاڵیم کرد، کە ئەو کتێبە، دوور و نزیک پەیوەندیی بە هزر و سرووشت و ژینگەی لیبیاوە نییە. ئەوەیش قەولیدا کە ئەو تێبینیانە بگەیێنێتە وەزارەتی پەروەردە. خۆشبەختانە لە ساڵی نوێی خوێندن، پرۆگرامێکی دیکەیان لە کتێبی دیکەدا ئامادەکردبوو.

ساڵانە، لە وەرزی بەهاردا، لە هەموو قۆناغەکانی خوێندن، لەو وڵاتەدا، یەک حەفتە تا (١٠) ڕۆژیان تەرخان دەکرد بۆ چالاکیی ڕۆشنبیری و ئەدەبی و هونەری هەمەڕەنگ. تەنها مامۆستایانی بابەتە زانستییەکان و زمانی ئینگلیزی دەتوانن، ئارەزوومەندانە، لە دەستپێکی دەوامەکە، دەرسێک یان دوان بڵێنەوە، دەنا هەموو ڕۆژەکە تەرخان دەکرێ بۆ چالاکیی فرە مەبەست و شێواز.

دوای چەندان کۆبوونە و ئامادەکاریی، بەرنامە و پرۆگرامی چالاکییەکانی ڕۆژەکان دیاری دەکرێن و هەر مامۆستایەی ئەرک و بەرپرسیاریەتیی خۆی دەدرێتێ. بۆ من ئەوە

دەرفەتێکی باش بوو، بۆیە لەگەڵ خۆم بڕیارمدا کە چالاکییەک بنوێنم جیاواز و جێگەی سەرنج بێ. لە یەکەم کۆبوونەوەش، بەرنامەی خۆم پێشکێش کردن و ڕەزامەندیان لەسەردا.

بە بۆنەی ئەو حەفتەیەوە، کە پێیدەڵێن (هەفتەی ڕۆشنبیریی)، قوتابخانە جوان پاک دەکرێتە و بە نیگار و تابلۆ و درووشم و ئارم دار و دیواری دەڕازێتەوە، لە ناوەندی گۆڕەپانی قوتابخانەکەدا، ڕەشماڵێکی گەورە هەڵدەدەن. لە هێندێ دالان و پۆل و ژوورەکان کەرەستە و کەلوپەلی کەلەپووری خۆیان نمایش دەکەن. مامۆستاکانیش، دەستە دەستە سەرقاڵی خۆمادەکردن دەبن. لەڕاستیدا قوتابییەکان، حەز لەو بۆنەیە دەکەن، چونکە هەم چالاکییەکان جیاوازن لەچاو ئەوانەی ڕۆژانی ئاسایی و هەم دەرس و لێپرسینەوەی تێدا نییە.

جار هەیە هێندێ دامودەزگای دەرەوەی قوتابخانەش، هەماهەنگی ئەو بۆنەیە دەکەن، وەک بەڕێوەبەراتەیی هاتووچۆ، بەرگریی شارستانی، تەندرووستی، ژینگەیی، تەنانەت سەربازیش.

چونکی زۆربەی دەمەو عەسران، لەگەڵ مامۆستا عەبدولناصر، بە ئۆتۆمبیل دەچووینە ئەو دەشت و دەرە یان سەردانی ناسیاوێکمان دەکرد، ئەویش ڕۆژ بە ڕۆژ پتر بە توانا و ئەزموون من ئاشنا دەبوو، دوام لێکرد، کە لەو ڕۆژەی من چالاکیی خۆم پێشکێش دەکەم، هێندێ لە کەسایەتییەکانی دەڤەرەکە و دۆست و برادەرەکانی داوەت بکات، چونکە من دەمەوێ، پەیامەکەم هەر بۆ قوتابییەکان نەبێ. ئەویش بڕیاریدا کە کورسی لە گۆڕەپانەکە ڕیز بکات و وەکو ساڵانیش، قوتابییەکان لەسەر ئەرز دانیشن.

لەو حەفتەیەدا، من دوو چالاکیم هەبوو، یەکێکیان، هاوبەش لەگەڵ کچە مامۆستایەکی بە توانا، ناوی (ڕەجعە)بوو، بۆ تەواوی مامۆستا و قوتابییەکان، شێوازی نمایشکردنەکەمان ناوازە و جوان و نوێ بوو. یەکەمجار بوو، ئەو جۆرە سیمیناره ببینن، بابەتەکەشمان دەربارەی (خوێندەوە و ڕۆشنبیری)بوو.

دەتوانم بڵێم، چالاکیی زۆربەی مامۆستاکان، دووبارە و کاوێژی ساڵانی ڕابردوو بوو، چونکە ئەوان (٢٥) ساڵە ئەو ڕێوڕەسمە بەڕێوەدەبەن و زۆریشیان، بابەتەکانیان بە تۆمارکراوی بۆ دێ، ئەوان هەر دەیخوێننەوە!

لە ڕۆژێکی دیکەدا، نۆبەی سیمینارەکەی من بوو، جگە لە ستافی مامۆستایان و قوتابیان، میوانێکی زۆر ئامادەبوون ــ بە قەولی وان کەمجار بووە، لەو جۆرە چالاکییەدا میوانیان بێ.

سیمینارەکەی من دەربارەی (ماددەی هۆشبەر بوو) نزیکەی (٩٠) دەقیقەی خایاند، کەرەستە و ئامرازی پێویست و وێنە و نیگاری جوانم ئامادەکردبوو، ئەزلەبەر زانیارییەکانم بۆیان دەخستە ڕوو، هێندێ لە قوتابی و مامۆستاکانیش لە هێندێ برگەی نمایشەکە هاوکارم بوون.

بە کوردی و کرمانجی، بەڕێوەبەرەکەم، چەندان جار پەنجەی خۆی دەگەزت، کە چۆن وەزیری پەروەردەی داوەت نەکردوە. ئەوە یەکەم چالاکیی سەرکەوتوو و ناوازەی من بوو. لە نێو مامۆستا و خەڵکی دەڤەرەکە دەنگی دایەوە.

لەڕاستیدا، ئافەتی ماددەی هۆشبەر لە لیبیا، ئەو کات لە بلاوبوونە و گەشەسەندن دابوو، لە ئاواییەکەی ئێمە، هەر دوو گەنج ئاڵودە ببوون. بەڵام دەمزانی کە خەڵکێکی زۆر بەدەست ئەو ئافەتەوە گرفتارن، زۆریش گلەییان لە قەزافی دەکرد، ئەو دەیگوت، پارە پۆل و پۆلیس و ئاسایشم بۆ پاکتاوکردن و نەهێشتنی ئەو بەڵایە دابین و ئامادە کردەوە، چیبکەم؟ ئەو پەتایە، پەتایەکی جیهانییە!

ئەوەی کە هاندەرم بوو بۆ وروژاندنی ئەو بابەتە، ئەوەبوو، بەڕێوەبەرێکی لیبیی، داوای لێکردم کە قسە لەگەڵ دکتۆرێکی دەروونناسی عێراقی بکەم، کە ئاشنام بوو لە سرت، تا هاریکاری بکات بۆ چارەسەرکردنی کوڕێکی خۆی، کە تازە دەهات ئاڵوودە و گیرۆدەی ئەو ماددە نەفرەتییە بێ.

***

ساڵی (١٩٩٥)، ساڵی شۆڕشی گاشەبەردی فەلەستینی بوو، لە زۆربەی شارەکانی فەلەستین گەنج و منداڵانی ئەو وڵاتە ڕۆژانە بە بەرد و دارلاستیک و قۆچەقانی، شەڕیان لەگەڵ سەربازانی ئیسرائیلی دەکرد. دەنگوباس هەر دەنگوباسی کووشتن و بریندارکردنی ئەو گەنجە یاخیبووانە بوو. قەزافی وتاری ئاگرینی لە تەلەڤزیۆن دەدا. لە گۆڕەپانێکی تەرابلسیش، پەیکەرێکی ڕەمزییان، لە بەرد و کوچکەبەردان، بۆ شکۆمەندیی ئەو شۆڕشە دروستکرد بوو. منیش بریارمدا، کە لە بۆنەی (حەفتەی ڕۆشنبیری)، شانۆگەرییەک

نمایش بکەم، لە پاڵ چالاکییەکانی خۆم. شانۆگەرییەکی جوانم دارشت، بە ناوی (شەهید). بۆ ماوەی نزیکەری (٢٠) ڕۆژ، ڕاهێنان و پرۆڤەم بەو (١٥) قوتابییە کوڕە و کچە دەکرد کە شانۆگەرییەکەیان نمایش دەکرد. ڕۆژی نامیشکردنەکە، کە میوانێکی زۆر هاتبوون، لەگەڵ ژمارەیەک لە فەلەستینەکان و مامۆستایانی قوتابخانەکانی دەرودراوسێمان. زۆر سەرکەوتووانە، شانۆگەریەکەیان نمایش کرد. لەڕاستیدا، زۆر بەو شانۆگەرییەوە ماندوو بووین، کەرەستە و کەلوپەلێکی زۆرمان ئامادەکردبوو، لە تەلەڤزیۆن و کورسی چەرخەدار و دارەمەیت و کەژاوی شەهید، بە تابلۆ گەورەی شەهیدەکەوە ــ کە پێشتر لە ستودیۆ ئامادەمان کردبوو، بەناو جەماوەرەکەدا دەیانگێرا و سروودی (منتصب القامة امشي - مارسيل خليفة) لێدەدرا و کچە سەربازە ئیسرائیلییەکانیش، لە پۆشاکی سەربازیی و تفەنگ لە دەست، لەگەڵ سەگی پۆلیسیی، ئەوانە هەموو بە حەقیقی نمایشکران ـ کەرەستە سەربازی و پۆشاک و چەکەکانمان لە سەربازگە خواستبۆوە، قوتابییە کچەکان، ڕۆڵی ژنە سەربازە ئیسرائیلییەکانیان وەرگرتبوو. مامۆستا عەبدولناصر داوی لێکردم کە لە زانکۆی تەحەددی ئەو شانۆگەرییە دووبارە نمایش بکەینەوە، منیش ڕازی بووم بەو مەرجەی کەسوکاری قوتابییەکان، ڕەزامەندی نیشان بدەن کە کچەکانیان لە زانکۆ بەشداری نمایش بکەن.

ئەو ڕۆژە، زۆر لە ئامادەبووان گریان بە تایبەتی فەلەستینەکان. دوای چەند ڕۆژێک، وەک پاداشت و دەستخۆشییەک، خەڵاتیان کردم.

بۆ من ئەو چالاکییانە، هەنگاوی بچووک بوون، لەسەرە ڕێیەکی دوور و درێژی وڵاتی غەریبیدا.

# (١٣)
## دزەخوێندنەوەی چەند گۆڤارێکی شاراوە

شەوێک لە ژوورەکەمدا لە قوتابخانە، کە زانیم کاتی سەردانی میوانەکانی شەوانەم تێپەڕیوە، چووم دەرگای ژووری بەڕێوەبەرم کردەوە، بەنیازی ئەوەی لە کتێبخانە بچکۆڵەکەیدا، کتێبێک بدۆزمەوە خۆمی پێبخافڵێنم ــ لە دوای بەردبارانکردنەکەی شەوەکە، مامۆستا عبدولناصر کلیلێکی ئەو ژوورە پێدابووم، تا لە کاتی پێویست بە تەلەفۆن پەیوەندی پێوەبکەم. کتێبەکانی لەو ژوورە دابوون زۆربەیان ڕۆمانی چەند نووسەرێکی میسری و سووری بوون، دیوانی شاعیران بوون، لەگەڵ چەند کتێب و گۆڤارێکی هەمەڕەنگ، کە زۆربەیان تایبەت بوون بە شۆڕش و قەزافی و لیبیا و نەتەوە و نیشتیمانی عەرەبی و ئایینی ئیسلام. لە چەکمەچەیەکدا، لە خوارەوەی ئیغدانێک، زەلفێکی گەورەم بینی، کە سەیرم کرد پێنج شەش گۆڤاری تێدایە. بە ناونیشانی (هۆشیاریی شۆڕشگێڕیی). پێرستەکان سەرنجیان ڕاکێشام. گۆڤارێکم دەستدایەوە، ئەو شەوە، تا هەموویم نەخوێندەوە نە خەوتم، (١٢٠) لاپەڕەیەک دەبوو. لە ماوەی حەفتەیەک، بە دزییەوە، هەموو گۆڤارەکانم خوێندەوە، هەر شەوەکان، بە جوانی لە شوێنی خۆیانم دادەنانەوە و هیچ ئەسەرێکم لەدوای خۆمدا بەجێنەدەهێشت، کە هەست بکەن، دەرگاکە کراوەتەوە.

ئەو گۆڤارانە، تایبەت بوون بە هۆشیاریی و ڕۆشنبیریی کادیرە پێشکەوتووەکانی (لێژنەی شۆڕشگێڕان) ــ کە جەرگسۆزترین و وەفادارترین پشت و پەنای قەزافی بوون. وتار و بابەتەکانی گۆڤارەکان، ناوی قەزافی و چەند نووسەرێکیان لەسەر بوو. بابەتیشیان تێدا بوو هەر بەناوی گۆڤارەکە.

بەڕاستی، خوێندنەوەی ئەو چەند گۆڤارە، کاریگەریی گەورەی هەبوو لەسەر دید و تێڕوانینی من، لەهەمبەر ئەو سەرکردە و خەڵکی لیبیا و شۆڕش و هەڵسوکەوت وجموجۆڵیان. بەواتایەیی کە هۆشیاریان کردمەوە، دەبێ چۆن خوێندنەوە بۆ هەموو شتێکی ئەو وڵاتە بکەم و خۆشم بە دوور بگرم لە هەر ساتمە و زەلـلەیەک.

لیرەدا، ئەوەندەی لە زەینم دامابێ، دەربارەی (٣) بابەتی بایەخدار، ناوەڕۆکی گۆڤارەکانتان بۆ تۆماردەکەم. هەموو زانیارییەکان، لە وتارەکانی قەزافیدا ئاماژەیان بۆ کراوە ـ من بیرۆکەکانتان دەخەمە بەر چاو، نەک دەقی وەتەکان چونکە ئەوە پێش (٢٨) ساڵ بووە.

**بابەتی یەکەم: دەربارەی ئایینی ئیسلام:**

لە وتارێکی دوور و درێژیدا، قەزافی لە حزوور چەند گەورە پیاوانی ئایینی و شێخ و مشایخی لیبی، چەند سەرنج و تێڕوانینێکی خۆی دەربارەی ئایینی ئیسلام دەردەبڕێ. داواش لە ئامادەبووان دەکات، کە بێ شەرم و شکۆ، ئەوانیش بۆچوون و ڕای خۆیان دەربڕن. ئەو خاڵانەی قەزافی قسەی لەسەر کردن ئەمانە بوون:

- مەسەلەی حەج:

قەزافی دەڵێ، ئەو حاجیانەی دەچنە سعوودیە بۆ جێبەجێکردنی فەریزەی حەج، حەجەکەیان قبوڵ نییە. چونکە مەکە و مەدینە و کەعبەی شەریف، لەژێر ڕەحمەتی فرۆکەکانی ئەمریکا و بەریتانیا و ئیسرائیل دان. مەلیک و میرەکانی ئەو وڵاتە، هەموو وڵاتەکەیان، بە شوێنە پیرۆزەکانیشەوە، ڕادەستی غەیرەدین کردووە. جگە لەوە، ئەو پارە جوانەی حاجیان لەو حەجەدا خەرجی دەکەن، هەموو دەچێتە گەنجینەی ئەو سێ وڵاتە داگیرکەرە و ئەوانیش بەو پارەیە خەڵکی سڤیلی فەڵەستینی و عەرەبی پێدەکوژن. چونکە ئەوان بە پارە بوونەتە پاسەوانی سعووودیە. بۆیە قەزافی پێشنیار دەکات، کە ڕێکخراوێکی ئیسلامی لەسەر ئاستی جیهان پێکبهێنن بۆ سەرپەرشتی و بەڕێوەبردنی شوێنە پیرۆزەکانی سعوودیە. ئەو مەلیک و ئەمیرانە لە دین دەرچووین و ئەو شوێنە پیرۆزانەیان گلاو کردوە. لە جیاتی چوونە حەج، با حاجییەکان پارەکەیان ببەخشنە هاووڵاتیی فەڵەستینی و ڕێکخراوە شۆڕشگێڕەکانی ئەوێ تا قودس و فەڵەستین ئازد بکەن.

- زیارەتی کەعبە:

ئەو دەڵێ، خودا دەفەرمووێ: "جعلَ اللهُ الكعبةَ البيتَ الحرامَ قيامًا للناس." لیرەدا خواد دەرگای بۆ هەموو کەسێک کردووەتەوە کە دەیەوێ سەردانی کەعبە بکات. بەبێ گوێدان بەوەی کە ئەو کەسە لەسەر چ دینێکە. خودا دەفەرمووی "للناس"، خودا

بیویسبایه دەفەرموو بۆ "موسڵمانان". کەواتە قەشەیەکی فاتیکان، مافی هەیە بێتە سەردانی کەعبە و هیچ دەقێکی قورئان نییە، ئەوە بە تاڵ بکاتەوە، بەو مەرجەی ئەو کەسە گلاو نەبێ و لەشی پیس نەبێ.

- شەریعەتی ئیسلامی:

قەزافی دەڵێ، شەریعەت بریتییە لە فرە ئیجتهادی فوقەهای ئیسلام. هەر یەکەی بە گوێری تێگەیشتنی خۆی ئایەتێکی ڕاڤە کردووە. جا هەیە زۆر دووریش دەکەونەوە لە دەقە پیرۆزەکان. زەحمەتە ئیجتهادی دوو لەو فوقەهایانە، وەک یەک بن بۆ یەک دەقی پیرۆزی دیاری کراوە. کەواتە چ جیاوازییەک هەیە لە نێوان شەریعەتی ئیسلامی و یاساکانی ناپلیۆن و دەستوورەکانی یۆنانی؟ ئەوانیش ڕاڤە و نووسراوی مرۆڤەکانن. ئەو دەڵێ، شەریعەتمان بۆ چییە؟ لە کاتێکدا، کتێبێکی پیرۆزمان لەبەر دەستە کە هەموو هەموو شتێکی تێدا بەیان کراوە، کە قورئانی پیرۆزە.

- سوننەت:

ئەو دەڵێ، خودا، پێویستی بە کەسێک بووە بۆ ئەوەی پەیامەکانی بگەێنێت و ببێتە نێردراو. محەممەدی پێغەمبەر، ڕۆڵی تەتەری بینیوە، بۆ گەیاندنی ئەو پەیامە پیرۆزە. ئێمە دەزانین کە قورئانی پیرۆز، کتێبێکی خوداوەندیی تەواو و تەکمیلە. کەواتە چ عەوجە بە سوونەتین؟ بۆ دەبێ گوفتار و ڕەفتار و هەڵسوکەتی ئەو پێغەمبەرە بکرێتە بەشێک لە یاسا و دەستوورەکانی ئایینی ئیسلام، کە قورئان هەموو شتێکی بەیان کردبێ؟ بەڵگە چییە، کە ئەو هەموو فەرموودەی پێغەمبەر، جێگەی متمانەن و باوەڕن. هەر پیاوانی ئایینی خۆیان، چەندان فەرموودەیان بە ساختە لە قەڵەمداوە، بۆ دەبێ ئێمە خۆمان تووشی ئەو سەرئێشییە بکەین؟

- شەفاعەت:

قەزافی دەڵێ، باوەڕدار و موسڵمان بۆ شەفاعەت و دوعا و نزا، هەردەبێ لەبەر خودای میهرەبان و بەخشندە بپاڕێنەوە. پێغەمەری ئیسلامیش، عەبدێکە وەکو ئێمە، ئیشی ئەو گەیاندنی پەیامەکەیە بووە، نابێ ئێمە بۆ شەفاعەتکردن لەو بپاڕێنەوە. ئەو هیچی پێناکرێ بۆ ئێمە. ئەگەر پێبکرابووایە، ئەو شەفاعەتی بۆ خۆی دەکرد.

- حەدیسی قوودسی:

ئەو دەڵێ، زاراوەی فەرموودەی قوودسی، کوفرە، نابێ بگوترێ، چونکە پێغەمبەر هەر فەرموودەی ئاسایی هەیە. تۆ کە زاراوەی قوودسی بەکاردەهێنی، واتا، ئەو مرۆڤە دەهێنیتە ڕیز و مەقامی باری تەعالا. کە ئەمە کوفرە، خودا خودایە و پێغەمبەر مرۆڤە. چۆن دەبێ خەسڵەت و سیفەتی خودای مەزن ببەخشینە مرۆڤ؟ ئەو دەڵێ، هیچ دەقێکی پیرۆز، لە قورئاندا نییە، بوونی فەرموودەی قوودسی پشت ڕاست بکاتەوە.

- الإسراء والمعراج:

ئەو دەڵی دەقی قورئانی پیرۆز هەیە کە بە جوانی ئاماژە بە (الإسراء) دەکات، بەڵام هیچ دەقێکی ڕوون و ئاشکرا نییە، کە ڕووداوی (المعراج) پێشت ڕاست بکاتەوە، ئەو زاراوەیە لە قورئاندا ئاماژەی پێنەکراوە. ئەوەی دەگوترێ، ڕاڤەی زانایانی ئیسلامە. ئەمە تەنها ئەفسانەیەکی خەیاڵییە.

- حیجاب:

قەزافی باسی لەچکی سەر سەری ژن دەکات و دەڵێ، ئەو لەچکەی ئیسلامییە سیاسییەکان بەسەر سەری ژناندا فەرزی دەکەن، لە قورئانی پیرۆزدا، باس نەکراوە. ئەوە لاسایی کردنەوەی کاری شەیتانە. ئەو لەچکە، گەڵا هەنجیرەکەی شەیتانە کە لەشی حەوای پێداپۆشی. لەچکی ژن، بریتییە لە باوەڕبەخۆ بوون، بوونی ئیرادەیەکی پۆڵاین و هزرێکی ڕۆشن و مێشکێکی کراوە. ئەگەر ژن لاواز بێ و ئیرادەی نەبێ، لە جاجمیشی وەرپێچی کاری خراپی لەگەڵدا دەکرێ. دەبی لەچکی ماددی کە پارچە قوماشیکە، بکرێت بە لەچکی مەعنەوەی، کە هێز و باوەڕ و ئیرادەیە.

- فرە ژنی:

ئەو دەڵێ، ڕاڤەرکەرانی قورئانی پیرۆز، بە هەڵە لەو ئایەتە گەیشتوون، کە دەفەرمووی"

**وَإِنْ خِفْتُمْ أَلَّا تُقْسِطُوا فِي الْيَتَامَى فَانْكِحُوا مَا طَابَ لَكُمْ مِنَ النِّسَاءِ مَثْنَى وَثُلَاثَ**

وَرُبَاعَ فَإِنْ خِفْتُمْ أَلَّا تَعْدِلُوا فَوَاحِدَةً أَوْ مَا مَلَكَتْ أَيْمَانُكُمْ ذَلِكَ أَدْنَى أَلَّا تَعُدلُوا." خودا تەنها ڕێی داوە پیاو یەک ژنی هەبێ لەیەک کاتدا. نەک دوو و سێ و چوار.

- خەلیفەی ئیسلام:

ئەو دەڵێ، لەگەڵ کۆچی دوایی پێغەمبەر، ئایینی ئیسلام ختمکرا و تەواو بوو. قورئان شەریعەتی ئیسلامە، کەس مافی ئەوەی نییە بە ناوی ئایینەوە حوکمی موسڵمانن بکات. هەرچی خەلیفە هەیە دوای کۆچی دوایی پێغەمبەر، ئایینی ئیسلامی بۆ بەرژەوەندیی خۆی قۆرغ کردووە. بەناوی خودا، خۆیان کردووەتە سیبەری خودا لەسەر زەوی، یان شمشێری خودا، هەرچی خودا حەزی لێناکا، لە پێناو تەخت و تارج و دەسەڵات، دژی موسڵمانان کردوویانە. تا بوون بە مەلیک و پاشا، دواتر بوون بە ئیمپراتۆر، دوای ئەوەش بوون بە زاڵم و دیکتاتۆر و فیرعەون. کەس مافی ئەوەی نییەوە، بە ناوی خودا، خۆی بەسەر خەڵکدا بسەپێنێ. هیچ دەقێکی پیرۆز نییە بۆ ئەم نەریتە.

- ڕەجم کردن:

دوو سزادان بە ڕوونی، لە قورئاندا ئاماژەی پێدراوە، بە گوتەی قەزافی، ئەوانیش : دەستبڕینی دز و جەلدکردنی زانییە. هیچ دەقێکی دیاری کراو نییە، سزادانی (ڕەجمی) کردبێتە یاسا. ئەوە لە ئیش و کرداری مرۆڤە، نەک پەیامی خودای مەزن.

- وشەی (قل):

ئەو دەڵێ، جوبریلی مەلایکە کە پێغەمبەری دواندوە فەرموویەتی:" قل هو الله أحد."؛ " قُلْ اَعُوْذُ بِرَبِّ الْفَلَقِ."؛ " قُلْ يَا أَيُّهَا الْكَافِرُون." ئێمە کە ئەو ئایەتانە دەخوێنینەوە، خۆ جوبیریل ڕوو زاری لە ئێمە نییە. بۆیە پێویست ناکا، وشەی (قل)، لەسەرتای ئەو ئایەتاندا بڵێینەوە. دەکرێ بەبێ (قل)ەکان بیان خوێنین.

- جیهاد:

ئەو لە وتارەکەیدا دەڵێ، هیچ ئایەتێکی دیاریکراو لە قورئانی پیرۆزدا نییە، فرمانی جیهاد کردن بدا بەوەی موسڵمان بچێ بجەنگێ لەگەڵ برای موسڵمانی تەنانەت لەگەڵ مەسیحی و جووشدا. ئەوا خەلیفە و حاکمەکانی سەر ئەرزن، بۆ بەرژەوەندیی خۆیان بۆ دەسەڵات و تەخت و تاراجیان، ئەو فەتوایە دەدەن.

- غەیبیات:

قەزافی دەڵێ، پیاوانی ئایینی و شێخ و مشایەخی خێڵ و هۆزەکان، لە پێشکەوتن و داهێنانی زانستی دەترسێن، چونکە ئەوان دەیانەوەی خەڵک هەمیشە گوێڕایەڵی وان بن و هزر و مێشکی خۆیان بەکار نەهێنن. ئەو دەڵێ لەو ئایەتەدا، کە خودا دەفەرمووێ: "إِنَّ اللَّهَ عِنْدَهُ عِلْمُ السَّاعَةِ وَيُنَزِّلُ الْغَيْثَ وَيَعْلَمُ مَافِي الأَرْحَامِ وَمَا تَدْرِي نَفْسٌ مَاذَا تَكْسِبُ غَدَاً وَمَا تَدْرِي نَفْسٌ بِأَيِّ أَرْضٍ تَمُوتُ إِنَّ اللهَ عَلِيْمٌ خَبِيرٌ"، ئیمڕۆ، زانست دەزانێ کۆرپەڵەی نێو زاندانی ژنی دووگیان، نێرە یان مێ. زانست کات و شوێنی بارینی هەورەکانیشت پێدەڵێ. جا ڕووی زاری لەو زانا ئایینی و شێخانە دەکات، کە لە دانیشتنەکەدا گوێیان لێراگرتووە و ئەو پرسیاریان لێدەکات: ئێوە چۆن ئەمە ڕاڤە دەکەن؟

لە راستیدا، هێندێ بابەتی دیکەشی وروژاند بوو، لە گۆڤارانەدا، بەڵام چاکم بە بیر نایەنەوە. لە یەک و دوو ژمارەی گۆڤارەکە، دوای ئەو ژمارەیە، زانایانی ئایینی وەڵامی قەزافیان داوەتەوە، بەڵام ئەوەی بە وردی وەڵامەکانی ئەوان لە سەرد و بێژینگ بدا، هەست دەکەی کە وەڵامەکانیان جۆرە (شەرم و ترس و پەردەپۆشییەکیان) تێدایە. بەڕاستی وەڵامەکانی هێندێکیان گومان ڕەوێن و بوێرانە نین ــ لە دیدی منەوە.

**بابەت دووەم: میرنشینانی وڵاتانی کەنداو:**

لە وتارێکی دورودرێژدا قەزافی تێڕوانین و هەڵسەنگاندنی خۆی دەربارەی میرنشینەکانی کەنداو، بۆ کادیر و ئەندامانی لیژنەی شۆڕشگێران دەخاتە روو و پلان و بەرنامەی کاری ئایندەش، بۆ گۆڕینی واقیعەحاڵی وڵاتانی کەنداو دادەڕێژێ.

سەرتا پووخەتەکی مێژووی و جوگرافی دەربارەی یەکە یەکە لەو وڵاتانە تۆماردەکات ئەوجا دێتە سەر مەتنی بابەتەکە و دەنووسێ: "میرنشینانی عەرەب لە کەنداودا گەورەترین و مەترسیترین پەتا و ئافات و نەگبەتین خودا بۆ ئوممەی عەربی ناردووە. ئەوان دوور و نزیک، پەیوەندییان بە کۆمەڵگای عەرەبییەوە نییە تەنانەت لە نێو جەماوەر و ئێڵ و عەشرەتی خۆشیان غەریب و غەوارەن. ئەوان ڕۆبۆت و بت و سەنەمن، ئیمپریالیزمی جیهانی بەسەر ئەو وڵاتانەیاندا سەپاندوون، چونکێ ئەوان ڕۆحی خزمەتکاریی و نۆکەرایەتیی بێگانەیان تێدایە، خاک و ئاو و ئاسمانی وڵاتانی کەندوایان بە هێزەکانی ئەمریکا و ئینگلیز و جوو سپاردووە. ئەوان کووشندەترین گورزیان لە گیانی ئوممەی عەرەبی داوە. لە لایەک خاکەکەیان داگیر کردووین، لە لایەکی دیکە سامانی ئەو وڵاتانە فەرهوود و تاڵان دەکەن، بەوەش ئێمە دووجار زەرەرمەند دەبین، لە لایەک، ئابووری و دارایی مادیمان نابێ بۆ جێبەجێکردنی خەونەکانمان، کە یەکێتیی ئوممەی عەرەبییە، لە لایەکی دیکە، بەو سامان و گەنجینەیە چەک و چۆڵی پێدەکرن بۆ کووشتنی فەلەستینییەکان و شۆڕشگێران و ئێمەماناندا. جا چونکێ ئەو میرنشینانە، غەوارە و بێگانەپەرستن، ئاساییە لەلای وان هەموو نیشتیمانی عەرەبی و ئوممەی عەرەبی لە پێناو تەخت و تاراجی خۆیان بکەنە قوربانی.

لەسەر ئێمەی شۆڕشگێرە، کە یەکێتیی و سەربەستیی ئوممەی عەرەبیمان لە ئەستۆ دایە، بە جددی نەخشە دارێژین و پلان دانێین بۆ گۆڕینی سیستمی سیاسی ئەو وڵاتانەی کەنداو. ئەو سەرە گەندەڵ و بۆگەنانە کاتی دروێنەکردنیان هاتووە. ئێوەش وەک گەنجی خوێن گەرمی ئەم وڵاتە، ئەرکی قورستان دەکەوێتە سەر شان. دەبێ هەموو هاووڵاتییەک لە مەترسیی ئەو گەندەڵچییانە ئاگادار بکرێنەوە. بەهیچ شێوەیەک ڕێ نەدرێ ئەوانە تخووبی وڵاتی ئێمە بکەون، لە هەر شوێنێکیش، پیاوان و سەگوسواری ئەو میرنشینانەتان دیت، بیانکوژن، بەردبارانیان بکەن، ئەگەر بەرد نەبوو، مەترەق و بەرچیغ و شیشەی ئاسن

بکێشن بەسەریاندا، ئەگەر ئەوانەش نەبوون، بە ددان و نینۆکان پارەچە پارچەیان بکەن.
تاکو ئەو میرنشینانە لەسەر کورسی بن، ئێمە هەر بۆ دواوە پاشەکێشی دەکەین.
خۆ ئێمە لەگەڵ، ئەمەریکا و ئینگلیزی هیچ ناخۆشییەکمان نییە، ئەوەندەیە ئێمە کویلایەتی قبوڵ ناکەین. خۆتان دەزانن، ژنانی لیبیا حەزیان لە بنێشتە، ئەوان بنێشتیان لەمن دەوێ، ئێ بۆ ئەوەی منیش بتوانم بنێشتیان بۆ بکڕم، دەبێ نەوەتەکەمان بفرۆشین، خۆ نەوت ناخورێتەوە، هەردەبێ بیشیفرۆشینە ئەو دەوڵەتانە، ئێمە کارگە و فابریکەمان نییە، تا لە ناوەخۆ، نەوتەکە ساغ کەینەوە. ئەو وڵاتانەی ئیمپریالیزم، هێزیان هەیە، بەڵام گەمژە و گێلن، بۆچی نایەن لەگەڵ ئێمە بە ئاشتییانە بازرگانی بکەن؟ بۆ لە ئێمە دەترسن؟ خۆ ئێمە هێزی بەربەرەکانی و ڕووخاندنی ئەوانمان نییە؟
ئەوان بۆیە لێمان دەترسێن، چونکە ئێمە خاوەن ئیرادە و باوەڕی شۆڕشگێرین.
لەبیرتان نەچێ، دوژمنی بابەگەورەی ئوممەی عەرەبی میرنشینانی کەندوان، بە هەر شێوەیەک و بە هەر نرخێک بێ، دەبێ ڕایانماڵین."

**بابەت سێیەم: بەرپرسیارەتی شۆڕشگێرانی لیبی، وەک سەییدی ئوممە:**

ئەم وتارەی قەزافی، کوورەیەکە لە سکڵ و پشکۆی ئاگرین، بۆ وروژاندن و بەرزکردنەوەی حەماسەتی گەنجی لیبی. هانیان دەدا، کە وەک ڕابەری ئوممەی عەرەبی بەرپرسیارەتی بگرنە ئەستۆ. چونکە هەر ئەوانن دەتوانن ببنە فریادڕەس و نەجاتدەری ئەو ئەممەتە مەزڵوومە. قەزافی، هەوڵدەدا بە شان و شەوکەتی ئەواندا هەڵبڵێ و بیانهێنێتە مەقامی باڵاترین و بەهێزترین و بلیمەتترین گەنجی نەتەوەی عەرەب. ئەوە لە مێشکییاندا دەچەسپێنی، کە هەر تاکێک لەوان پڕۆژەیەکە بۆ گیانفیدایی لە پێناو هێنانە دی ئامانجەکانی شۆڕش کە یەکێتی و سەربەستی و ئیشتراکییە.
ئەو بەو نموونەیە، ئاگر لە هەستی گەنجە شۆڕشگێرەکان بەردەردات و دەڵێ:"من وەک سوارچاکێکی ڕەشیدی بەدوو، لە نێو جەرگەی ساراوە هاتووم، بۆ زیندووکردنەوەی شکۆی و ناوبانگی لیبیا، هەرچەندە دەزانم لەو ڕێیەدا دەکوژرێم، بەڵام بیروباوەڕی شۆڕشگێرم، قەت لەو خەباتەدا ساردم ناکاتەوە."

هیچ بوار و کایەیەک لە ژیانی قەزافیدا بە قەد مەسەلەی ئایین و دید و بۆچوونەکانی ئەو زاتە، جێگای تێڕامان و مشتومڕ و شتیەڵکاری و لێکدانەوە نەبووە. وا نزیکەی (١٢) ساڵ بەسەر کووشتنیدا تێدەپەڕی و ئەو بابەتە ڕۆژ بە ڕۆژ لێڵتر و ئاڵۆزتر دەبێ. بۆ خۆم ناتوانم هیچ حکومێک لەسەر فەلسەفەی ئەو زاتە بدەم دەربارەی ئایینەکان. ئاخر لە لایەک ڕەخنەی توند لە چەندان ڕوکنی بنەڕەتی ئیسلام دەگرێ و لەلایەکی دیکەش، بەچەندان شێوە خزمەتی ئەو ئایینە و شوێنکەوتووەکانی دەکات. زۆربەی زانایانی ئیسلامی، کە سەر بە ڕەووتە سیاسیی و چەکدارەکان بوون، هەر زوو قەزافیان وەکو"هەڵگەڕاوە، زەندیق، مولحید" ناساند و فەتوا لەسەر فەتوایان بۆ دەرکرد. تەنانەت، کووشتنەکەشیان وەک ئەسیرێک، بە کارێکی ڕەوا و حەقانی لێکدایەوە.

قەزافی، لە شوێنێکدا، هاوار دەکات و دەڵێ، من هیچ کێشە و جیاوازی و خیلافێکی فیکریم لە گەڵ بزووتنەوەی" ئیخوان" دا نییە. تاکە شت کە ڕێگرە لە بەیەکگەیشتنمان ئەوەیە، من حیزبایەتی بە خیانەت دادەنێم و قبوڵم نییە، "من تحزب خان: ئەوەی حیزبایەتی کرد، خیانەتی کرد". بەڵام ئەوان، ئەوەم لێقبوڵ ناکەن.

لە جێگەیەکی دیکەدا ئەو دەنووسێ:" هەر کتێبێک بیروباوەڕی هەڵخەڵەتێنەری هاوردەکراوی تێدا بێ، من دەیسووتێنم و دەیدڕێنم. شۆڕشێک لە دژی کتێبخانەکان و زانکۆکان و هەر شتێکی نووسراوە هەیە بەرپا دەکەم، بیروباوەڕی تێکدەرانە دەسوتێنم، جا نەخۆش و شێت وشوور و قژ پژەکان هەر پرۆپاکەندەیەک دەکەن با بیکەن. ئەوان نەخۆشن و بەدوای کتێبە تێکدەراەکانی ڕۆژهەلات و ڕۆژاوادا دەگەڕێن. بەدوای کۆنەپەرستیی ڕۆژهەلاتی و بەدوای سەرمایەداری و شیوعی و ڕۆژاوایدا دەگەڕێن. نەک هەر کتێبەکان، ئەوانەی دەستیش بۆ ئەو کتێبانە دەبەن، دەیانسووتێنم."

بەڵام دەبێ بۆ مێژووش ئەو ڕاستییانە تۆمار بکەین، کە خۆم شایەتحاڵی هێندێکیان بووم، لەو ماوەیەی لە لیبیام بەسەر برد:

هەردوای کودەتاکەی ساڵی (١٩٦٩)، قەزافی فرۆشتن و مامەڵەکردنی شەراب و بادەی لە وڵات قەدەغەکرد ــ تەنانەت بۆ عێراقییە مەشروبخۆرەکان، ئەوە گرفتێکی گەورە بوو، ناچار هێندێکیان لەماڵەوە بۆخۆیان ئارەق و شەرابیان درووست دەکرد. هەرچی یانەی شەوانە و تیاترۆخانە هەبوو، بە یاسای دایخستن. لە ئارایشتگەی ژنان، ئیشکردنی

پیاویانی قەدەغەکرد. ئەو بەکارهێنانی وشەی (شکرا: سوپاس)ی بە ناشیاو زانی و پێباش بوو بگوترێ (الشکر للە: سوپاس بۆ خودا). ئەو کۆمەڵەی بانگەوازی ئیسلامی دامەزراند لەساڵی (١٩٧٢)، کە بۆ چەند دەیەیەک د. محەممەد ئەحمەد ئەل شەریف سەرپەرشتی دەکرد ـــ ئەو زاتە سەر بە ئیخوانەکان بوو. لە ڕادیۆ و تەلەڤزیونەکاندا بەرنامە و پەیام و دەرس و دەوری زانایانی ئیسلامی پەخش دەکرد. لە ساڵی (١٩٧٣) ئەو دەرگای بە ڕووی هەموو هزر و فکرێکی چەپ و قەومییەچی و شۆڤێنی داخست، بەڵام ڕێگری نەکرد لە چاپکردن و پەخشکردنی کتێبی ئایینی بەو مەرجەی سیاسی نەبن. لەسەردەمی قەزافی لە (٢٠٪) دانیشتووانی لیبیا، بە نێر و مێ، قورئانیان ئەزبەر کرد. بڕوانامەی پێدەبەخشین کە یارمەتیدەر بوو بۆ دامەزراندنیان لە فەرمانگەکانی دەوڵەتدا. ئەو پشتیوانیی موجاهیدەکانی ئەفغانی دەکرد و کۆمەکیی ڕێکخراوە ئایینەییەکانی جیهانی کە پەیوەست بوون بە ئیسلام دەکرد. ئەو مزگەوتی عەبدولسەلام ئەسمەری لە شاری زلیتن، کردە زانکۆیەک بۆ خوێندنی زانستە شەرعییەکانی ئایینی ئیسلام. خوێندکارانی لیبیی (کوڕ و کچ) و هەزارانی دیکە کە لە مەغریب و تونس و ئەفریقیاوە هاتبوون، بێبەرامبەر دەیان خوێندن، کۆمەکی ماددیش دەکران. یەکەمین کۆنگرەی ئیسلامی بۆ وڵاتانی عەرەبی و جیهانی لە لیبیا سازکرا. لەسەردەمی حوکمی ئەودا، قورئان بۆ زۆربەی زمانە زیندووەکانی جیهان تەرجەمەکرا و چاپکرا و پەخشکرا. نزیکەی (١٢٠) ملیۆن دانە، لە قورئانی پیرۆزی چاپ کرد و لە جیهاندا بڵاوی کردەوە. لەسەر دەستی قەزافی شەش لە مەلیک و سوڵتانەکانی ئەفریقیا بوونە موسڵمان ئەوا جگە لە نزیکەی (٣٠٠٠) هاووڵاتی ئەفریقی. لە هەموو جیهاندا، ئەو زاتە نزیکەی (٥٠٠) مزگەوتی دروستکردوە.

کە سەردانی مۆسکۆی کرد، بانگی خودای بەرزکردەوە، دوای چوار دەیە، کە کەس گوێی لە بانگی ئیسلام نەبیبوو لەو وڵاتە. ئەو ناوی بیانی لەسەر هەموو تابلۆیەکی شارەکاندا قەدەغکرد و ڕێی نەدا هیچ بەرهەمێکی ئیسرائیلی لە بازاڕەکانیدا بفرۆشرێت. کۆمەکی ماددی بۆ هەزاران هەزار خێزانی موسڵمان ناردووە لە هەموو جیهاندا.

لە وتارێکیدا، قەزافی، هۆکاریی نەچوونی بۆ حەج یان عومرە بۆ ئەوە دەگەڕێنێتەوە کە حەج و عومر لە لای خودا قبوڵ نابێ، کاتێک، کەعبە و گۆڕی پێغەمبەر لەژێر وسایەیی داگیرکەرانی مەسیحی و یەهودی بن. (مەبەستی ئەمریکا و بەریتانیا و ئیسرائیلە)، لە

کاتێکدا هەموو یان زۆربەی مەلیک و میر و سەرۆکەکانی وڵاتانی عەرەبی چوون بۆ حەج و عومرە. بەڵام هەموو جەژنێک لە گۆڕەپانی سرای لە تەرابلووس، بۆ خۆی پێشنوێژی بۆ موسڵمان دەکرد.

## (١٤)

# هاوپیشەیەکی نوێ و هێنانی ماڵ و منداڵم بۆ لیبیا

چێشتەنگاوێک، ئەفەندییەکی ڕیش ماش و برنجی بنیسی نە باڵابەرز و نە کورتیلە، ڕەنگ ئەسمەر، پرچە ڕەشەکەی بەلایەکی سەریدا داهێنا بوو، پێش ئەوەی بگاتە نزیک میزەکەی بەڕێوەبەر و سەلاو بکات، لە ڕوخساریدا زانیم عێراقییە. ئەو میوانە، بووە هاوپیشە و هاوڕێی گیانی بە گیانیم تا ئەو ڕۆژەی لیبیام بەجێهێشت. مامۆستا تەحسین عەبدولکەریم، نزیکەی بیست ساڵێک لە فەلوجەی زێدیدا، مامۆستای بیرکاری بوو. ئەمن چەندە دڵخۆش بووم، بە دامەزراندنی ئەو لە قوتابخانەکمدا، مامۆستا عەبدولناصر دووهێندە، چونکە ئەو ترسی لە ڕۆیشتنەوەی من هەبوو، کە بەدڵ پێناخۆش بوو ڕێگریشی لێدەکرد. ئێستا بیانگەیەکی منی بڕی، کە نە لە ژوورەکەم تەنیام و نە لە هاتووچۆ و گەڕانانمدا نامۆ و غەریبم، چونکە مامۆستا تەحسینیش وەک من هەر خۆی و خۆی هاتبوو، بەو نیازەی کەش و هەوای ولاتە بۆن بکات، ئەوجا بڕیاری هێنان یان نەهێنانی خێزانەکەی بدات کە لە فەلوجە بوون.

کە ئەو هاتە ژوورەوە، ئەمن لە دڵی خۆمدا هەر ئەوەندە دوعایەم کرد کە بەعسی نەبێ، جا لەسەر هەر دین و بیروباوەڕێک بێ گرنگ نییە. چونکە داغی دوو سەرسەرییە بەعسییەکەی کۆمپانی نەوتی زاویەم هەر لە دڵدا مابوو! خۆشبەختانە دوعایەکەم هاتە دی.

دوای ئەوەی چوارپای نووستن و دۆلاب و شتومەکمان بۆ میوانی نوێ ڕێکخست، وەرزی پرسیار و وەلامدانەوە دەستی پێکرد. مامۆستا تەحسین لەگەڵ چەند هاوڕێیەکی دیکەی خۆی ڕوویان لە لیبیا کردبوو، بەلام هەر یەکەی پەرتەوازەی شوێنێک بوون. مەراقی گەورەی ئەو، ئەوەبوو، چۆن دەکرێ ئەو دەست بەکاربێ و بەڕێوەبەرایەتیی پەروەردە، پسوولە کاغەزێکیان نەداوەتێ و بە زارەکی ڕەوانەی ئەو ناونیشانەیان بکات. تا درەنگانی شەو، هەر پرسیاری دەکرد و منیش، بە وردی و بە ئەمانەتەوە، وەلامم دەدایەوە، پێش ئەوەی بچی بخەوێ، گوتی،" وەڵلا مامۆستا فازیل، قابلەمە، قەپاغی خۆی

دۆزییەوە، من لە نێو دۆزەخیش بم لەگەڵ تۆ هەڵدەکەم. ئەوەی خودا لەگەڵی کردووم، هەر شوکرانەبژێری دەوێ!".

ئەو ڕۆژە، پێش بانگی شێوان، مامۆستا تەحسین خۆی گەیاندە مزگەوتی ئاواییەکە، کە لێمان دوور نەبوو، لەسەر گردێک هەڵکەتوبوو بەسەر هەموو ئاواییەکەیدا دەیڕوانی. کە گەڕایەوە زۆر دڵخۆش بوو، چونکە نوێژکەران، پێیان گوتبوو، خودا لە ئاسمانەوە، تۆی بۆ ئێمە ناردووە.

مامۆستا تەحسین، موسڵمانێکی باوەڕداری ڕۆشنبیری به ئاگا و هۆشیار بوو. بەشێکی زۆری قورئانی لەبەر بوو، لە مەسەلەی جێبەجێکردنی ڕووکن و فەریزە و سوونەتدا، مەلایەکی سەربەخۆ بوو، لەهەموو شتێک شارەزای هەبوو. لەپاڵ ئەمانەش، دەنگ و سەدایەکی خۆشی هەبوو، لە خوێندنیدا، لاسای هێندی قاریئی ناوداری دەکردەوە. جگە لەوەش، توانایەکی لەڕادە بەدەری هەبوو، لە خوێندنەوەی چاو و ڕەفتار و کەسێتیی ئەوانەی ئاشنایان دەبوو. کە ناسیاویی لەگەڵ هەر کەسێک پەیدا دەکرد، زوو کەسێتیی ئەوەی دەستنیشان دەکرد و هەڵدەسەنگاند. جارێک، بە هەڵکەوت تووشی دوو مامۆستای عێراقی بووین، هەر دوای دوو سێ دەقیقە، مامۆستا تەحسین، نقورچەیەکی لێدام، وەک ئاگادرکردنەوە. دواتر کە لێم پرسی، ئایا پشتر ئەوانی دەناسی؟ گوتی،"نەخێر، زوو، لە خوێندنەوەی کەسایەتییاندا، تێگەیشتم، ئەوانە ڕەفیقی ئێمە نیین و باشترە تێکەڵیان نەبین." دواتر قسەکەی ڕاست دەرچوو.

لەگەڵ ڕۆژگاردا، بۆم دەرکەوت، کە مامۆستا تەحسین، لە دیوەخان و مەجلیسەکاندا، وەک من، خراپەکارییەکانی سەددام و حیزبی بەعس باس ناکات، هەرچەند، بۆچوون و قسە و لێکدانەوەکانی من ڕەد ناکاتەوە، ئەوەش لەبەر ئەوە بوو، کە ماڵ و منداڵی لەژێر ڕەحمەتی دەسەلاتی بەعس دابوون و دەیزانی کە ڕژێمی بەعس جێگەی متمانە نییە و بە هەزار و یەک ڕێگە پیاو و دەست و پێوەندی خۆی بلاوکردووەتەوە. بەڵام دەربارەی مەسەلەی کورد و ئەنفال و هەڵەبجە، هاوسۆزیی و هاوخەمیی خۆی نیشاندەدا، ئەوەیش پتر لە ڕوانگەی ئەوەی کە "باوەڕدارەکان برای یەکەن." کوردیش زۆربەی موسڵمانی سوونننە مەزهەبن.

به کوردی و کرمانجی، هەرگیز جیاوازیی بیروباوەڕ و بۆچوون و لێکدانەوەکانمان نەبووە بەربەست و کۆسپ و ساتمەکردن. بەتایبەتی لە بابەتی پەروەردە و ئەرک و چالاکییەکانی قوتابخانە زۆر پشتی بەمن دەبەست و ددانی بە توانستی من دەهێنا.

نزیکەی حەفتەیەک پێش ئەوەی مامۆستا تەحسین بێ، مامۆستا عەبدولناصر، دەمەوە عەسرێک هات و پشتی پیکابەکەی پڕ کردبوو لە میوە و سەوزە و قووتە توونە و مەعکەڕۆنی و نان... . گوتی: مامۆستا فازیل، ئەوانەم بۆ تۆ هێناوە، بە قەراری قەتعی تۆ لە دەرگای قوتابخانە نایەیتە دەرەوە و لە حەوشەش نابێ کەس بتبینێ، شەویش دەرگا دادەخەیت و لە کەسی ناکەیتەوە. فرمان دراوە، هەر کەسێک، لیبی نەبێ، بیگرن و سنوورداشی بکەن. کە گوتم، "من لێرە مامۆستام و ئیقامەی فەرمیمم هەیە!". گوتی "شتی وا ناخوات، فرمانی موعەمەریە، بتگرن نە بەمن نە بە باوکی من دەربازت نابێ!"

بۆ ماوەی چوار شەو و چوار ڕۆژ، من لە ژوورەکەی خۆم دەرنەچووم و شەویش، هەر بە تاریکی دادەنیشتم. مەسەلەکە ئەوبوو، شیخ و سەرۆک خێڵ و ئێلەکانی دەڤەری سرت، لە دانیشتنێکدا، گلەیی ئەوەیان لە قەزافی کردبوو، کە منداڵەکانیان دانامەزرێنێ و ئەو غەریب و بیگانانەی هیناوەتە وڵات. کەس لەبەر وان ئیش و کاری دەست ناکەوێ. قەزافیش پێیگوتبوون، "ئیش زۆرە، منداڵەکانی ئێوە، نازیان دراوەتێ و ئیش ناکەن. فەرموون، با سبەینێ، بۆخۆیان بچن ئیش بکەن!"

بۆ بەیانی، لەنکاوڕا، هەموو هێزەکانی ئاسایش و پۆلیس و گومرک، دەستیان کرد بە گرتن و ڕەوانەکردنی هەر کەسێک، کە پێناسەی لیبی پێ نەبێ. هەرچی جۆتیار و کرێکار و دوکاندار و سەوزەفرۆشی میسر و سوودانی و عێراقی و مەغریبی و ئەفریقی هەبوو و دەستیان پێڕاگەیشت، یەکسەر ڕەوانەی بەنغازی و تەرابلسیان کردن، تا لەوێوە سنوورداشی میسر و تونسیان بکەنەوە.

دوای چوار ڕۆژەکە، ئاگادارکرامەوە، کە شاڵاوی گرتن و ڕاپێچکردنەکە کۆتایی پێهاتووە. بەڵام بینیم، دونیا دونیایەکی دیکەیە: لەو شارەی سرت، یەک نانەواخانە نییە... کێک و پسکتیش لە بازاڕ زەحمەت دەست دەکەوێ! یەک گابییە تەماتە بە کەمتر لە دینارێک بوو، ئێستا یەک کیلۆ بووەتە (٣) دینار...! هەرچی دەستی لۆدەبەی نەماوە، تەنانەت قەسابیش دوکانی داخستووە. جا لەوە خۆشتر، گەنجی گوندی دەهاتنەلام،

مەقەستیان پێبوو، داوایان دەکرد، سەریان بتاشم، سەرتاشخانە هەمووی داخرا بوو...! کابرایەک، تەلەڤزیۆنێکی بۆ هێنابووم، تا بۆی چاکبکەمەوە...! مامۆستای ژن، ئامێری قژوشککەرەوەی دەهێنا بۆی چاک بکەمەوە...! ئێوارەیەکیش، دوو گەنج هاتن، تا بچم ئۆتۆمبیلەکەیان چاک بکەمەوە... ! بە هەزار سوێند و قورئان قەناعەتیان نەدەهێنا کە من ئەو شتانە نازانم.... .

بازاڕ شلەژا...! شار بووە زبڵخانە ... ! هیچ دەستنەدەکەت...! ناچار خەڵکەکە بۆ خۆیان بەدوای کرێکار و دوکاندار و فیتەر و سەرتاش و.... تاد، دەگەڕان. حکوومەتیش چاوپۆشی لێکردن. قەزافیشی، بەچاوی دادانەوە، کە سەدان هەلی کاری بۆ ڕەخساندن، بەڵام کەس ئامادە نەبوو، بچێ کار بکات، خەتاکەی خستە ئەستۆی خۆیان، کە بەناز پەروەدەکراون و حەزیان لە کارکردن نییە.

***

پشووی هاوینە، بۆ مەمانان، هەر یەک مانگ بوو، دوای لێکدانەوەیەکی زۆر، بە تەلەفۆن، لەگەڵ ئاواتی هاوژینم، بڕیارمان دا، کە ئەوانیش بێنمە لیبیا، تاوەکو خودا ئاوێک بەو ئاگرەی شەڕی ناخو دادەکات و ژیان ئاسایی دەبێتەوە و ئەو ئابڵوقە ئابوورەییە چەند لایەنییەش، لەسەر خەڵکەکە سووک دەبێ.

کۆتایی مانگی تەمووز، بە هەمان کەشتی تولەیتەڵە، لە بەندەری تەرابلس گەڕامەوە ئەزمیر و لەوێشڕا بۆ سلۆپی. سەفەرەکە ئاسایی بوو هەمووی سێ ڕۆژ و چوار شەوی خایەندن.

لە سلۆپی لەگەڵ دوو گەنجی دهۆکی کە ئەوانیش لە ئەوروپا گەڕابوونەوە، ئۆتۆمبیلێکمان بەکرێ گرت بۆ ئیبراهیم خەلیل. لە بازگەی ئیبراهیم خەلیل، کە چەند ژوورێکی ئاسایی بوو، دابەزین تا پەساپۆرتەکەمان مۆر بکەن، فۆڕمێکمان پڕ کردەوە و پەساپۆرتەکانمان ڕادەست کردن، یەکسەر پەساپۆرتی دوو گەنجەکەیان مۆر کرد و چوون سواری ئۆتۆمبیلەکە بوونەوە. کە نۆرەی من هات، گوتیان، تۆ باجی (٣٠٠) دۆلارت لەسەرە دەبێ بیدەی.

بۆ من ئەوە جێگەی سەرسوڕمان بوو، کە پێمگوتن، ڕۆژانە بە سەدان کەس دەگەڕێنەوە کەس نەیگوتەوە، دەبێ لە ئیبراهیم خەلیل باج بدەی. ئەوەتا دوو هاوڕێکەشم دۆلارێکیان

نەدا. لیمان بووە کێشمە کێش. یەکسەر بە شۆفێری تەکسییەکەیان گوت، کە لەو شوێنە بڕوا، هەرچەند داوام لێکردن، کە پێنج دەقیقەیەک ئارام بگرن، بێهودە بوو. تەکسی تێیتەقاند و ڕۆیشت. کە من هەر پێداگریم کرد و گوتم هیچ نووسراوێکی فەرمی هەڵنەواسراوە، کە بڕی باجی دەستنیشان کردبێ. ئەفسەرێک، فرمانی دا کە جارێ من ببەنە ژوورەکەی ئەو دیو. هەر لە تەنیشت ئەو نووسینگەیە، ژوورێکی دوو مەتر چوارگۆشەی سەر جەمەلۆنی دەرگا ئاسنی قەدیمی هەبوو، کورسییەکیان بۆ دانم و گوتیان، فەرموو لێرە دانیشە، یەک ترمس ئاو و پەرداغێکیشیان هێناو لە ڕۆخی پەنجەرە یەکچاوەکەیان دانا. هەر پاسەوانەکە چووە دەرەوە، دەرگاکەی داخست و شیشەکەی پشتی ڕاکێشا و دەرگام لەسەر قوفڵ درا.

تەمموز، قیری جادەی تواندبۆوە، سەرتاپای لەشم ئارەقەی ڕەش و شین بوو، هەر کە گەیشتمە بازگەکە و پەرداغە ئاوێکم خوارەوە، لە دڵی خۆمدا گوتم:"ئەڵڵا، چەند شیرین و سازگارە، ئاوی کوردستان". لەو ژوورە تەسک و تەندوورەدا، چاوم سپی بوو، هەستم دەکرد دێ لە هۆش خۆم بچم، چونکە خەم و مەراقێکی زۆرم خستەوە نێو سینەم. تەمەننام دەکرد دەمانچەیەکم پێبێت و خۆم بکوژم، یان پەتێکم دەست کەوێ و بە ئەنگلاینی ژوورەکەوە خۆم هەڵواسم. لە یەک چرکەساتدا، دەیان وێنە خەیاڵدانی داگیر دەکردم. ئەو قەسیدەیەم بە بیرهاتەوە، کە شەوێکی بەفر دەبارێ و من لە تاو پێشمەرگەی ئەشکەوتەکان خەو نەدەچووە چاوم و شیعرم بۆ دەنووسین! کەچی ئێستا، ئەو پێشمەرگانە، بوون بە دەرگەوان و دەرگا لەسەر منی بێ تاوان قوفڵ دەدەن. لە خۆم دەپرسی، بۆچی ئەفسەرەکە گوتی، "ببەنە ئەو دیو!" و نەیگوت،"ببەنە بەندیخانەکە؟" بۆ بە فێل منیان لەوە ژوورە پەستا؟ هەر لەو چرکەساتەدا، وتەی قارەمانێکی ڕۆمانێکی حەننا مینەم بیرکەوتەوە، کە دەڵێ:'ئەوانەی، بە دۆلار دەتفرۆشن، ئامادەن هەموو تاوان و توومەتێکت بۆ هەڵبەستن!".
دەستم لە پەنجەرە یەک چاوەکە دەردەهێنا و بانگی پاسەوانەکەم دەکرد. نەک کەسێک وەڵامی نەدەدامەوە، بەڵکوو ئەوەی بەلای پەنجەرەکە تێدەپەڕی و منی دەدیت، وای دەزانی، تیرۆرستێک، قاچاغچییەک، پیاوکوژێک، دەرمانخۆرێک، لەو ژوورەدا بەند کراوە.

دوای پتر لە نیو کاتژمیر، دەرگای بەندیخانەکەیان کردەوە و چوومەوە بەردەم ئەفسەرەکە و پیمگوت:

ـــ من مامۆستام، (٢٠) ساڵی ڕەبەقە، بەربەرەکانی ژوورەکانی زیندان دەکەم و قوتابی و شاگردەکانم. فیردەکەم، هەمیشە جواندۆست و مرۆڤدۆست بن، تا ژووری بەندیخانە نەبینن، ئیستا بۆ یەکەمینجار لە ژیانمدا، بەبێ تاوان، لە کوردستانی ئازاد دا، من خۆم لە بەندیخانەدا دەبینمەوە. گلەیی بێ! ڕۆژێ ئەمە لە بیرەوەرییەکانمدا بنووسمەوە.

ئەفسەرەکە، گوتی "تۆ، سووکایەتیت بە یاسای حکوومەتی هەریم کرد."

دیسان، قسەکەی حەننا مینەم بەبیرهاتەوە، کە باشترە، لەگەڵ ئەو جۆرە کەسانە شەڕەچەقە نەکەی. بۆیە پیمگوتن، لە (١٥٠) دۆلار، یەک دۆلار پتر نادەم گەر (١٥٠) ساڵیش بمخەنە بەندیخانە.

بەبێ ئەوەی هیچ قسەیەک بکەن پەساپۆرتەکەیان ڕادەستکردمەوە و (١٥٠) دۆلارەکەیان خستە نیو چەگمەچەیەک و ئیزنیان دام، نە پسوولە کاغەزەیکیان دامێ نە هیچ!

لە پشتی پیکابیک، وەک قەرەج و لانەوازان، بە دڵیکی پڕ حەسرەت و بریندارەوە هاتمە گەراجی ئیبراهیم خەلیل و لەویشرا بۆ هەولیرێ.

(تا ئیمرۆ، منی (٧١) ساڵ، لە ژیانمدا، بەندیخانەم نەدیوە، هەر ئەوەی ئیبراهیم خەلیلی حکوومەتی هەریم نەبێ.)

***

هەولیر...، چ هەولیر...!

نەخۆشیکی ڕەنگ زەردی سەرجیگا، ئیستانا ئیستا گیان دەدا. شاریک نەغرۆ لە چەکبەدەست و ئۆتۆمبیلی دۆشکە و بیکەیسی لەسەر! هەرچی دەهاتە بەرچاوت، تیکشکاو، داڕووخاو، لەبەریەک دەرهاتوو، شەکەت و ماندوو و برسی و بیدەرەتان! بازاڕیکی گران و کز و ڕەنگمردوو، نەک هەر مرۆڤەکان، بیگیانەکانیش ڕەنگی مردوویان گرتبوو. دەتگوت، هۆلاکو و جەنگیزخان، تازە بیرەدا تیپەڕیوون.

ئاگرم تیبەربوو، کە بەڕیوەبەریکی خۆم بینی، لە ساڵانی خۆشیدا، جوانتر ئۆتۆمبیلی هەبوو، کەچی ئیستا لەسەر کورسییەکی بچووک، لە نیو دەرگای ماڵەکەیدا، عانە عانە،

گوڵەبەڕۆژە دەفرۆشێ. گوتیان، هەموو سەروەت و سامانی خۆی بە پێستە دابوو، ئەوەیش لە بازگەی مووسڵ لە لایەن ڕژێمی بەعسەوە، بە لۆرییەوە دەستی بەسەردا دەگیرێ و بە قاچاغی لە قەڵەم دەدەن!

لە شێخەڵڵا، مامۆستایەکی کۆیی، هاوڕێی خۆم بینی و خۆم لێشاردەوە تا نەمبینێ، لەسەر پارچە کارتۆنێک شەش حەوت قالبە سابوون و دوو سێ پاکەتە تایتی دانابوو دەیفرۆشت... ! هاوڕێیەکی دیکەشم دیار بوو پارەی دەگۆڕییەوە، ئەو بڕوانامەی ماستەری هەبوو ـــ ئێستا لە زانکۆی سەلاحەددین وەک پسپۆڕی ئەدەبی کوردی مامۆستایە.

لە دەووری عەرەبانەیەکدا، قەرەباڵغییەکی گەورە هەبوو، شان شانی دەسمی و قەرەپەستە بوو، کە نزیک بوومەوە دیتم، فڕان فڕانە، مێرمنداڵێک، قاچە مریشکی زەرد زەرد دەفرۆشی و بەبەرناکەوێ، نازانم کیلۆی بە چەند بوو...!

باش دوو سێ ڕۆژ، کە چوومە گەراجی کۆیە، تا سەردانیکی دایە و بابە بکەم، سەرەخۆشیش لەو دۆست و ناسیاوانە بکەم، کە کەسێکیان بووەتە قوربانی یان بە مردنی خوای کۆچی کردووە. لە گەراج، شۆفێرەکە پێگوتم:

ـــ مامۆستا، ئەوە چیت پێیە؟ وەی، وەی، لەو چوار پێنج جووت پێڵاوە نایاب و جوانانە! دەزانی، تا دەگەیتەوە کۆیە، یەک جووتت زیاتر بۆ نامێنێتەوە، هەر بازگە و باجی خۆی دەوێ. دیارە لە دەرەوە هاتوویتەوە؟!

لە لیبیا، لە بازاڕی تەشاروکی، کە هی دەوڵەت بوو و تایبەت بوو بۆ هاوولاتی لیبی، باشترین کەرەستە و شتومەکی ئەورووپایی بە نرخێکی داشکاو، دەفرۆشرا، منیش پتر بە سایە مامۆستا عبدولناصرەوە، شتم دەستدەکەوت. جا ئەو پێلاوانەم، وەک دیاری، لەوێ کڕی بوو. شۆفێرەکە، کەسێکی زۆر باش بوو، داوی لە نەفەرەکان کرد، کە هەر یەکەی جووتێک لەو پێلاوانە لە پێبکەن و پێلاوەکانی ئەوانیشی فڕی دایە سندووقی ئۆتۆمبیلەکە. بەو شێوەیە لە باج و باجدان ڕزگاری کردم و منیش شتێکم خستە سەر کرێیەکەی و سوپاسم کرد.

کۆیە، حاڵی لە هەولێر باشتر نەبوو. هەر دوای دووسێ ڕۆژ، دەستە دەستە خەڵک، بە تایبەتی مامۆستای دواناوەندی دەهاتنە لام و پرسیاری چوون و سەفەر و هەلی دامەزراندنیان دەکرد لە لیبیا. خەڵکانێکی دەستکورتیش، ژن و پیاو، بە ئاشکرا داوای

کۆمەک و هاوکارییان لێدەکردی، کە ئەوە دیاردەیەش بۆ من نوێ بوو، پێشتر نەمدیتبوو، ئەو خەڵکە بەم شێوەیە داوای کۆمەک بکەن. لەلایەکی دیکە هێ ئەوتۆ دەهاتن، کە پێشتر هەبوو بوون و حاڵیان زۆر باشبوو.

قەت دیمەنی ئەو مامۆستایەم لەبیر ناچێ، کە هاتەلام، بەنی ڕەشی کردبووە قەیتانی جووتە پێلاوە کۆنەکەی. شەرمیشم دەکرد پێ بڵێم، ئەو جووتە پێلاوەم بۆ تۆ هیناوە، چونکە پێشتر ئەوەمان لە نێواندا نەبوو، دەترسام تەریق بێتەوە!

شەڕ لە هەموو بەرەکان گەرمم بوو. ئەو کوردستانە یەک پارچە ئاگر بوو. جەلالیی و مەلایی خوێنی یەکتریان فڕ بکردبایە، ئوخەیان نەدەهات. خەڵکەکە، زۆربەی بەسەر ئەو دوو بەرەیەدا دابەش ببوون و هێندە بە حەماسەتەوە داکۆکیان لە بەرەی خۆیان دەکرد، هێ ئەوەنەبوو، پیاو قسەیان لەگەڵ بکات. تیڤی و ڕادیو و میدیاکان، پشکۆیان لێدەباری... ئاینندە هێندە تاریک و لێڵ بوو، پێشبینی ڕووداوەکانی سبەینێت بۆ نەدەکرا. قەت قەت کوردستانم وا ناخۆش نەدیتبوو. مەگەر ڕۆژانی ئەنفال!

بۆ پرسەی خزمێکمان چوومە ڕانیە، لە گەڕانەوەمدا، ڕووداوێکی دڵتەزێنم بینی ــ لە کتێبێکمدا تەوزیفم کردووە: کە لە گەراجی ڕانیە، لە پێشەوەی ئۆتۆمبیلەکە دانیشتبووم، گەنجێکی سمێڵ ڕەش، تەمەنی هەر (٢٥) ساڵ دەبوو، هێندێ کارتۆنی مۆقەبای لەبن هەنگڵی بوو، داوای لێکردم، کە لە ژێر پێی خۆمدا ڕایانخەم و قاچیان بخەمەسەر. دیار بوو کارتۆنەکان هێ پاکەت و قوتوو بوون، ئەو هەڵیوەشادبوونەوە. ئەو کوڕە گەنجە جوانە، لە مەچەکییەوە، هەردوو دەستی قووتکرابوو. دواتر زانیم، لە نێو کیسەیەکی گونییە، هێندێ بزماری لە نێو سندووقی ئۆتۆمبیلەکە بارکردووە. کە گەیشتینە، یەکەم بازگە و سندووقی ئۆتۆمبیلیان هەڵدایەوە، گوتیان، "ئەو فەردە بزمارە هێ کێیە؟" گەنجە دەست قووتکراوەکە، زۆرلێیان پاڕاوە و گوتی "بۆ فرۆشتنەوەم نییە و دوکاندارم، بۆ خۆم کڕیوە." سوودی نەبوو، گوتیان دەبێ گومرک بکرێ." هەرچەند ویستم چەکبەدەستەکانی بازگەکە ڕازیکەم بەوەی واز لەو گەنجە بێ دەستە بهێنن، قبوڵیان نەکرد. منیش نەمهێشت، ئەو گومرگەکە بدا، خۆم پارەکەم دانێ و ڕۆیشتین. دیاربوو، ئەوگەنجە، مامەڵەی بزماری دەکرد، دواتر، بزمارەکانی لە پاکەتەکان دەکردەوە و دەیفرۆشت، تا پاروە نانێکی حەلاڵی چەنگ کەوێ. لە دڵی خۆمدا، دەمگوت، ڕەنگ بێ ئێستا کەسانێک هەبن،

حەسوودی بەو گەنجە ببەن. ئاخر لەو ڕۆژگارەدا، دوو دەستی قووتکراوی لەو شێوەیە، پارەیەکی باش بۆ سواڵکەران کۆدەکاتەوە!

لە کۆیە، بەڕێوەبەری پەروەردەی کۆیە ـــ ئەوکات پارێزگاری کۆیەش، بەرەی یەکێتیی نیشتیمانی کوردستان لە کۆیە بوو، داوایان لێکردم، کە وەک سەرپەرشتیاری زمانی ئینگلیزی دەستبەکار بم و نەگەڕێمەوە لیبیا، بەڵام من ئەو داوایەم پەسند نەکرد.

دوای چەند ڕۆژێک گەڕامەوە هەولێر. با ئەوەشتان بۆ بگێرمەوە:

لە گەڕاجی کۆیە، مامۆستا دڵشاد نەجیب چەلەبی، کە لە پۆلی یەکی ناوەندییەوە تا پۆلی شەشی دواناوەندی، کە قوتابی بووم، مامۆستای نیگارکێشانم بوو، کە بوومە مامۆستای دواناوەندی کۆیەی کوڕانیش، هەشت ساڵ پێکەوە هاوپیشە بووین، ئەویش دەگەڕایەوە هەولێر. تازە خانوویەکی لە هەولێر کڕی بوو، جا گەڕابۆوە کۆیە، تا هێندی لە مینای پەنجەرەکانی کۆنە خانووەکەی کۆیە، لێکاتەوە و بچێ لە پەنجەرەکانی خانووەکەی هەولێری بگرێ. تا گەیشتنە بازگەی تۆپزاوە، دیار بوو هەر ئایەتولکورسی دەخوێند. هەر سندووقی ئۆتۆمبیلەکەیان هەڵداوە، چەکبەدەستەکانی بازگە، هاواریان کرد، "ئەو هەموو مینایە هی کێیە، با دابەزێ بچی گومرگ بدا؟". مامۆستا دڵشاد، زۆر هەوڵیدا، کە قەناعەتیان پێبێنێ، ئەو کۆنە مینایانە، هی گومرک کردن نیینە و شتێکی هێندە گران و بە قیمەت نین. سوودی نەبوو. ناچار کە ویستی شتێکیان بداتێ، ئەوان ڕازی نەبوون. مامۆستا دڵشایش، گوتی:" دە ئەوە نەتان خوارد! بەو برە پارەی ئێوە، بە ناوی گومرک داوای دەکەن، من لە هەولێر شووشەی نوێی پێ دەکڕم!" بە تووڕەیەوە، چوو، دەستە دەستە شووشەکانی لە نێو ئۆتۆمبیلەکە دەردەهێنا و، تا هێزی تێدا بوو بەو دار و بەردەی لای دەستە ڕاستی بازگەکە دادەدا و ورد و خاشی دەکردن!

تا ئەمڕۆش (٢٠٢٣)، ئاسەواری هێندێ لەو شیشۆقانە، لە لای دەستە ڕاستی بازگەکەی تۆپزاوایە ماوە. هەموو جارێ بەویدا ڕەت دەبم، دەیان بینم دەبریسکێنەوە... کەسیش، وەک من، نازانێ حیکایەتی ئەو شیشۆقانە چییە!

لێتان ناشارمەوە، هەموو ئەو دیمەنە ڕەزا قورسانە، لەگەڵ ئەو هەموو بەسەرهات و ڕووداوە ناخۆشانەی کە ڕۆژانە دەمدیت و دەمبیست، هاندەرم بوون، کە ڕۆژێک زووتر بگەڕێمەوە لیبیا. دیقەتم دایە کەسیش لە خزم و خۆێ، پێشنیاری سەفەرنەکردمان بۆ

ناکات، وەک بڵێی، سەفەرکردنەکەیان لە مانەوەمان پێباشتر بێ. ڕۆژانەش بە دەیان خێزان سەرخۆیان هەڵدەگرت و هەرێمیان بەجێدەهێشت.

لە قوتابخانە، کارتی گواستنەوەم بۆ تایەنی کچم و ڕەسەنی کوڕم وەرگرت، کە دەچوونە پۆلی شەشەم و دووەمی بنەڕەتی. بەڵام هیچ شتێکم بۆ ئاوات نەکرد، کەرچی (١٥) ساڵ ڕاژەی لە بەڕێوەبەرایەتیی کارەبای هەولێر هەبوو.

پێش ئەوەی لە لیبیاوە بگەڕێمەوە هەولێر، لەسەر داوای خۆم، برا و خەزوورانم دوکانەکە و کەرەستەکانیان بۆ فرۆشتبووم، چونکە کە ڕۆیشتم، دەستم لە دوکانەکە نەدا، نەکۆ بگەڕێمەوە سەری!ماڵەوەش هێندێ کەلوپەلی ماڵیان فرۆشتبوو. کێشەی گەورەم کتێبخانەکەم بوو، هیچ جێگەیەکم نەبوو تێیدا بیپارێزم، ناچار وەک بەدەستی خۆت چاوی خۆت دەربێنی، کتێبفرۆشێکم هێنا سەری و بە نرخێکی کەم زاعیم کرد. یەکدوو شەو هەر خەریکی ئەوە بووین، ناوی ئەو نووسەرە ئازیزانە، لەسەر کتێبەکان بسڕینەوە کە ڕۆژێ بەدیاری پێشکێشیان کردبووم. شەش حەوت کتێبم هەر گێڕایەوە تا لەگەڵ خۆمان بیان بەینە لیبیا.

چونکە لە سەفەری یەکەممدا بۆ لیبیا، دەرسم لە بەڵێن و مەوعدی نووسینگەی هاتووچۆی دەریایی لیبیا وەرگرتبوو لە ئەزمیر. تا هەمان شانۆگەری جاری یەکەم دووبارە نەبێتەوە، بریارماندا، تا خوشکم لە تەرابلس دڵنیامان نەکات، کە کەشتییەکە لە لیبیاوە بەرە و ئەزمیر بەڕێ کەوتووە، لە هەولێر دەرنەچین، کە لە هەولێر دەرچووین، لە بازگەکانی کوردستان و تورکیا هیچ کێشەیەکمان نەبوو، چونکە نووسراوی فەرمی لیبیام پێبوو کە بۆ کارکردن دەچینە دەرەوە.

بڕیارماندا هەر دوو شەو و دوو ڕۆژ لە ئەزمیر بمێنینەوە. پاشنیوەڕۆی ڕۆژی یەکەم چووینە نووسینگە و (٥) پلیتمان کڕی. کە بۆ سبەی پاشنیوەڕۆ هوتێلمان بەجێهێشت و چووینە بەندەری ئەزمیر، هەرچەندی چاومان گێڕام ئەو کەرتە شاخە، توڵەیتەڵە، دوور و نزیک هیچ دیار نەبوو. دیسان کەوتینە گومان و خەمخواردن، ترسمان هەبوو، شانۆگەرییەکەی سەفەری یەکەمم لێ دووبارە ببێتەوە و جا ئەوجارە، لە جیاتی دوو کەس، پێنج کەسین. باش بوو دوای نیو سەعاتێک، ئاگاداریان کردینەوە، کە بە پاس دەمانبەن بۆ بەندەرێکی دیکە، لە خوار شاری ئەزمیرە، بۆ شاری کوشەداسی، کە نزیکەی سەعات و

نیوێک دوو بوو. لەو ڕێگایە ئاوات زۆر نەخۆش کەت و ژانی گرت. لە دڵی خۆمدا، دەمگوت، تووکی ئەو کچە تورکمانە، لێم بووەتە نەفرەتیی فیرعەونەکان و وازم لێ ناهێنێ.
خوا خوام بوو زوو بگەینە سەر کەشتییەکە، هیچ نەبێ لەوێ دکتۆر و داودەرمان هەیە.
سەرلە ئێوارە، تولەیتەڵە، بەڕێکەوت. هەواکەی، لەسەر ئەو دەریایە خۆش بوو، ئاوات و تایەن و ڕەسەن و ڕەندی، سەفەرەکەیان پێناخۆش نەبوو. یەکەمجار بوو، کەشتیی وا گەورە و دەریای وا بی سنوور ببینن. نزیکەی (٢٠) سەعاتێک بەڕێوە بووین، ئاوات، لەگەڵ دوو دەستەخوشکی خۆی، کە مامۆستای زانکۆ و کارمەندی تاقیگەبوون، گێژەنی دەریا و سەرەسووڕی کەشتی لەبیر چووبۆوە. ئەو دوو خوشکە خەڵکی هەولێر بوون. لەو سەفەر ژمارەیەک کوردی دیکەشمان لەگەڵ بوو.
لە نیوەی ڕێگابووین، دیتم، یەکێک لەو دوو خوشکە، بە پەشۆکاوی هاتەلام و هەرچی جنێو و قسەی ناشیرین بوو بە گەنجێکی سلێمانی دەدا، کە لە گەڵمان بوو. دەیگوت:"ئەو سەرسەرییە، وادەزانێ، کە ئێمە دوو کچی بەڕەڵلا و شەلاتی سەر جادانین". بەڕاستی منیش زۆرم پێناخۆش بوو، کە پرسیاری ئەوەم لێکرد، ئەو کوڕە چی گوتوە و چی کردوە؟ گوتی:" نە شەرم و نە حەیا، هاتیە پێمان دەڵێ،" ئەگەر دیناری لیبیتان دەوێ، گەلاّم بدەنێ، من دەتان دەمێ!" منیش بە دەستە خۆم نەبوو دەستم کرد بە پێکەنین و پێم گوت: خوشکی ئازیزم، ئەو گەنجە هیچ قسەی ناشیرینی پێنەگوتوون. لە سلێمانی بە (١٠٠) دۆلاری کاغەز، دەڵێن (گەلاّ). ئەو دەیەوێ یارمەتیتان بدا و پارەتان بۆ بگۆڕێتەوە. دیارە ئەو کوڕە لە لیبیا ئیش دەکات و پارە لیبی پێیە.
دەووری سەعات دووی پاشنیوەڕۆ، تولەیتەڵە گەیشتەوە بەندەری تەرابلس و دوای لەنگەرگرتن، وردە وردە خەڵکەکە دابەزین.
ئێمەش تەکسییەکمان کرد، بازۆ بۆ ماڵی خوشکم، لە خانووەکانی ئیتاڵی لە نێو کەمپەسی زانکۆی فاتح( زانکۆی تەرابلس).
شۆفێری تاکسییەکە، تەمەنی لە پەنجا ساڵ کەمتر نەبوو، چاکەت و پانتۆڵێکی لەبەر بوو بەلاّم، طاگییەکی ڕەشی لەسەر بوو ـ کە جۆرە کلاوێکی کەلتووریی لیبییانەیە. بەدەم ڕێگەوە، کە لەگەڵ منداڵەکان قسەم دەکرد، شۆفێر لێ پرسیم، " ئێوە بە چ زمانێک قسان دەکەن و خەڵکی کوێن؟ زمانەکەتان غەریبە لەبەر گوێم" هەر ئەوەندە گوتم:"کوردین و

خەڵکی کوردستانی عێراقین!" وەک فیشەکەشێتە، کابرای بە ڕووماندا تەقییەوە و بە توڕەیی و بە دەنگێکی بەرز، ڕوو لە من، شیڕاندی؛"توخوا! ئێوە عەیب ناکەن!؟ شەرم ناکەن؟! ئێوە بەشەرن؟!"

بەڕاستی، وەک برووسکە، قسەکانی لەشی گەرم داهێنام و ئارەقەی ڕەش و شینم دەردا. حەپەسام، ساڵێکە من لە لیبیام، کەس کەس بەم شێوە ناشیرینە قسەی لەگەڵ نەکردووم. بە هێمنی گوتم؛" خاڵۆ! خێرە، ئێمە شتێکی نەشیاو و ناشیرینمان کردووە، بۆچی وامان پێ دەڵێی؟" بە هەمان نەبرە و ڕتمی جاری یەکەم گوتی؛"جا دەتانەوێ شتی لەوە ناشیرینتر و بەدتر بکەن؟" بە کوردی بە ئاواتم گوت."خودایە، تووشی چی بووین، ئەوە، بۆ وادەکا؟"

ئەوجا شۆفێرەکە، نەختۆکەک هێمنتر گوتی:" برای بابم، ئێمە خەمی ئێوەمانە، دەبینن (الاخ القائد)، چەند بە پەرۆشە بۆ ئێوە! چەندە کۆمەک و هاوکاریتان دەکا! شەو و ڕۆژ دەڵێ دەبێ کورد مافی نەتەوەیی خۆی وەربگرێ... باشە، ئێستا پێم ناڵێی، ئەو مەسعوود و جەلالە بۆ وا دەکەن؟ شەڕیان لەسەر چییە؟"

بەم قسانە، هێور بوومەوە و بەڕاستی، تووشی هەڵوێستێکی زۆر دژووار بووم، جا چونکە خۆم هەواداری هیچ کامیان نەبووم، ئێستاشی لەگەڵ بێ نازانم، چیم وەڵامی ئەو شۆفێرە دایەوە. چونکە قەباحەتەکە هێندە گەورە بوو، بەمن پینە نەدەکرا، بەڵام هێندێکم بە شان و شەوکەتی قەزافی داهەڵگوت.

ئێمە (١)ی ئۆکتۆبەر گەیشتینە تەرابلس، واتا لەسەروبەندی سەری ساڵی نوێ خوێندن. دوای پشوویەکی کورت لە لای خوشکم، ناوی خوامان لێهێنا و چووینە ئەو خانووەی پێشوەخت لە غەربیاتی دەڤەر سرت بەکرێم گرتبوو. خانووەکە، وەک هەموو خانووەکانی ئەو دەڤەرە یەک نەخشە و دیزاینی هەبوو، سێ چوار ماڵی لیبیمان دراوسێبوون، جگە لە ماڵێکیان هەبوو و بازرگان بوون، ئەوانی دیکە مەزرا و گێڵگە و ماڵاتیان هەبوو، نزیکەی چارێکە سەعاتێک بە پێ لە ئاواییە گەورەکە و قوتابخانەکەم دوور بوو. ڕێک بەرامبەر ماڵی ئێمەش، مەزرا و کێڵگەی خاوەن خانووەکەی ئێمە بوو، کە خۆی لە سرت دادەنیشت و پاڵەیەکی سووادنی سەرپەرشتیی ئەو مەزرا و کێڵگەیەی بۆ دەکرد.

لەو ساتە وەختەی پێمان نایە ناو ئەو خانووە، تا بەجێمانهێشت، کێشەی هەر گەورەمان ئاو بوو. حاجی سەلیمی خاون خانووەکە، کە پیرەمێردێکی لاواز و بچکۆڵەی گۆپاڵ لەدەست و چاوێلکە لە چاو بوو، گوتوبووی، حەفتەی سێ جاران ئاوی پڕۆژەمان دەبێ. بەڵام وانەبوو، حەفتەی یەکجار ئەگەر ئاو هەبووا ئەوا جەژنەمان بوو. جا سەربار و بن باری ئەو بێ ئاوییەش، حاجی سەلیم، دەیەویست ئەوندە ئاوەش ڕاکێشێتە مەزراکەی خۆی. ڕۆژی یەکەم تانکەرێک ئاومان کڕی، خانووەکەمان شووشت و ئەو تانکییەی لە حەوشەکە بوو پڕئاومان کرد. دەبووایە ڕۆژانە بچینە سرت، بە (دەبەی چوار گاڵۆنی) ئاوی خواردنەوە بینین. جا چونکی بێ ئۆتۆمبیلش بووم، تا بڵێی حاڵمان بێ حاڵ بوو، ئاوات دەیگوت، "چانەبوو لە هەولێرەکە، بای خۆمان ئاومان هەبوو قیرسیا لە گرانی و تەقووتۆقەکە!"

یەکەم ڕۆژی خوێندن، کە تایەن و ڕەسەنم بردە قوتابخانەوە قەیدم کردن، تایەن لە پۆلی شەشەم و ڕەسەن لە پۆلی سێیەم، نەک هەر خوێندکارەکان، مامۆستاکانیش دەووری کچەکەمیان دابوو، دەستیان دەدا پرچ و دەست و پەنجەی، دەیان گوت ئەو بووکەشووشەیە. چاوی شین و پرچی زەرد و پێست مەیەیی، بۆ خۆشیان زۆربەیان ئەسمەر بوون. ئەو کوڕ و کچەم یەک وشەی عەرەبیان نەدەزانی.

جیهانی منداڵ، جیهانێکی تایبەتمەندە، هەر منداڵ لە ڕاز و نهێنییەکانی تێدەگا و چێژ لە ڕۆژ و دیاردە و گەمە و وازییەکانی وەردەگرێ. زۆرم پێ سەیر بوو، لە یەکەم ڕۆژدا، ڕەندی، سێ ساڵانم، لە نێو ئەو لمەدا لەبەردەرگای ماڵ، لەگەڵ منداڵەکانی هاوتەمەنی خۆی، یاری دەکرد، ئەوان بە عەرەبی و ئەو بە کوردی، قسەیان دەکرد، باوەڕ بفەرموون، باش باش تێکدەگەیشتن.

ئاوات، کە لە بەغدا گەورە ببوو، کێشەی زمانی عەرەبی نەبوو، بۆیە زوو لەگەڵ چەند مامۆستایەکی ژن بووە هاوڕێ و تا دوو سێ مانگان، حەفتانە لە چەند ماڵان زەحفەت و زەحفەتکاری بوو. دوای مانگێکیش تایەن و ڕەسەن، گرفتی زمانیان نەما و وردە وردە ئاست و نمرەکانیان باشتر دەبوو.

مەزرا و گێڵکەکەی حاجی سەلیمی خاوەن خانووەکەمان، لەو بەری جادەکە بوو، دوای عەسران دەچوومە لای پاڵە سوودانییەکە، کە ناوی (صغەییەڕ) بوو، تەمەنی لە سەرووی

سی ساڵ دەبوو، قوولەکی ڕەش ڕەش هەر ددان و سپیانی چاوەکانی سپی بوون، دەنا نینۆکەکانیشی مەیلەو تارک بوون. ئەو سەرپەرشتیی دارزەیتون و هەنجیر و هەنار و شینایی ئەو مەزرایەی دەکرد، ئاو و ئەلەفیشی دەدایە ئەو پێنج شەش مەڕ و بزن و دوو سێ وشترەی حاجی سەلیمی.

(صغەییەر) دووەم هاووڵاتی سوودانی بوو، دوای (عوسمان سوودانی)، کە ناسیاویم لەگەڵدا پەیدا کردبوو. دەتوانم بڵێم سێ بەشی پاڵە و جووتیار و شوانکارە و وشترەوانی لیبیا هاووڵاتی سوودانی بوون. ئەو پاڵەیە کۆلیتێکی بچووکی هەبوو، شەو و ڕۆژی تێدا بەسەر دەبرد. ئەو قوناغی خوێندنی ناوەندی لە سوودان تەواوکرد دبوو.

بۆمن (صغەییەر) و(عوسمان سوودانی)، کتێبخانە یان فەرهەنگێکی پڕ زانیاری بوون، چونکە ئێمەی کورد لەوان دوورین و تێکەڵاویمان نییە و شارەزایان نین. لە ڕێ سینەما و تەلەڤزیۆن و ڕادیۆ و کتێبی قوتابخانەکان، وامان چۆتە مێشکی کە هاووڵاتی سوودانی ناڕۆشنبیر و نەفامن. بەڵام لە ڕاستیدا، ئەوان زۆر زیر و ڕۆشنبیر و تێگەیشتوون ئەوەندەیە تا بڵێی باری بژیویی و گوزەرانیان خراپ و دژوارە. ئەوکات (١٩٩٥)، ڕۆژانە کرێکار، لە سوودان، یەک دۆلار بوو. ڕاستە نەختێ شەرمن و گۆشەگیرن. دەنا، لە دیدی لیبییەکانیشەوە، ئەوان دەستپاکن، پاڵە و جووتیاری کارکەرن، زمان شیرین و ڕەفتار جوانن و ڕێزی هەمووان دەگرن.

***

لە ژوورەکەی قوتابخانە، مامۆستا تەحسین بە تەنیا مایەوە، بەڵام من ڕۆژانە لە قوتابخانە هاودەمی بووم و زۆربەی ڕۆژان بەیەکەوە دەچووینە سرت. ئەویش هاوڕێی و دۆستی زۆری پەیدا کرد و شەوانە سەردانیان دەکرد و دەچووینە بۆنە کۆمەڵایەتییەکان، پرسە و ژنهێنان و هاتنەوەی حاجیان و سەردانی نەخۆشان و ئەو جۆرە بۆنانە.

هەر ئەو ساڵە، مامۆستا عومەر فەڵەستینی، کە مامۆستای وەرزش بوو، ڕاگوێزابۆوە بۆ قوتابخانەی ئێمە، ئەوەش ئاوەدانییەکی دیکە بوو بۆ ئێمە، وەک سێ مامۆستای غەریب سەرمان بەیەکەوە نابوو.

## (١٥)
# کشـکۆ

نه به ڕۆمانێک و نه به دووان، باس و خواسی ئەو زاتە تەواو نابێ. چییکەم ڕۆمانووس نیم، دەنا ئەو مرۆڤە فەڵەستینییە پەژمووردە و لانەواز و زەبوون و حەکیمەم، بە جیهان دەناساند و جامەدانی سووری نەمرییم دەخستە سەر شانی. دیقەت دەنە ناوەکەی: (کشـکۆ)، خۆی لە خۆیدا، پڕ هونەرکاریی ئەدەبی و جوانناسی و زمانەوانییە: خۆشئاواز دێتە سەر زمان، سەرنجڕاکێش، ناوێکی گەردوونییە و لەلای گەورە و زارۆکان هاسان دێتە گۆ. بۆ خۆشنووس و شێوەکارانیش، هەڵکەوتەی (٤) پیتەکەی، نەخشەسازی و داهێنانی هونەریی تێدا دەکرێ. بۆ بانگی سەر سەکۆی شانۆ و ئاوازی حەیرانبێژ و لاوکبێژانیش، سەدا و نەغمەکەی پڕ جۆش و ئاوازی هەیە!

دەمەو عەسرێک، بەڕێوەبەرەکمان، بە یاوەریی کەسێکی دیکە، هاتە قۆتابخانە و، گوتی:"مامۆستا فازیل، ئەوا مامۆستا کشکۆم بۆ هێنای، دە بڕۆن لوولە شکاوەکەی ئەو ئاوە، چاکبکەنەوە." ــ چەند ڕۆژێک بوو، لوولەکێشی ئاوی قوتابخانەکەمان شکابوو، منیش کەرەستەی چاککردنەوەم نەبوو، بەڕێوەبەرەکەم قەولی دابوو، یەکێک بێنێ، کەرەستە و حاجەتی هەبێ.

ئەگەر بەڕێوەبەرەکەم، نەیگوتبا (مامۆستا ....)، قەت هیچ کەسێک نەبوو مەزەندەی ئەوە بکات، کە ئەو زاتە (٢٥) ساڵە مامۆستای بنەڕەتییە. دوو چاوە بچووکەکانی لە نێو برژانگە پڕ و پژ و بڵاوەکانی بزببوون، زەحمەت بوو بزانی چاوەکانی چ ڕەنگێکن. ڕەنگی پێستی دەم و چاوی، ڕەنگی دەست و پەنجەکانی گرتبوو، هەر یەک ڕەنگت دەهاتە بەرچاو، ڕەنگی پێستی سووتاوی بەر خۆرەتا. لە داوی سمێڵ و قژوپرچی ڕادیار بوو، کە هەر سەرتاشین و سەرتاشین، شانە دەکرێن و ڕێک دەخرێن. پانتۆڵەکەی پێی، هەر لە شەڵواری پاڵەکانی لای خۆمان دەچوو، نەک ئۆتووی پێوەدیار نەبوو، بەڵکوو ڕەنگیشی تەواو چووبۆوە. کراسە مەیلەو شینەکەی، پەڵە پەڵە شوێنی ئارەقەی شینی پێوە بوو. پێڵاوەکەشی، وەک قەتماغەی سەر برین، لەچەندان جێگە، زامدار زامدار بوو.

کە دەستی خستە نێو دەستم، وەک تەزووی برووسکە، بە خێرایی تیشکی خۆر، منی گەڕاندەوە نێو مەزرایەکی پڕ دار گێلاسی شاری شنۆ، کە ئەو کات (١٩٧٤)، دەستم نایە

نێو دەستی باخچەوانێکی شنۆیی و وام هەست کرد، دەستی من، هی منداڵێکی ناسکۆڵەیە، لە نێو خرچانێکی قاش قاش و زبر دایە. دەستی کشکۆ، هەر لە دەستی ئەو جووتیارەی شنۆیە دەچوو. زوور زوور، پڕ درز و قڵیش، بەڵام بە هێز و گەرم و زیندوو!

کشکۆ، تازە دەهات لە پاییزی تەمەن نزیک بێتەوە، دیار بوو، پەنجا بەهار و پاییزی بەڕێکردبوو. نە باڵا بەرز نە کورتیلە بەڵام سینە پان و شان ئێسک گەورە و دەمووچاو خر، تۆکمە و تێکسمڕاو. لە جوولەی برژانگ و برۆ و دەست و پەنجەی تێدەگەیشتی، کە جست و چالاک و کارامە و ئیشکەرە.

هەر ئەوەندە، بەڕێوەبەرەکەم، گوتی:"مامۆستا کشکۆ، ئەوە مامۆستا فاضلە"، یەکسەر کشکۆ، وەک ئەوەی فەرهەنگی (مونجد)ی ئەزبەر کردبێ، کەوتە لێکدانەوە و شیتەڵکاری و هەڵسەنگاندنی ناوەکەی من، ئەوجا هەرچی پەند و دێڕە شیعری پەیوەست بەو ناوە هەیە، خوێندەوە، تا باسی ئەو زانا و دانا و عالمانەی هەڵگری ناوی من بوون، تەواو نەکرد، دەرفەتی کەسی نەدا، قسە بکات. بۆیە لە یەکەم چرکەسات، هەستم کرد، کە کشکۆ، کەسێکی یان مامۆستایەکی جیاوازە، تەواو جیاواز!

من وامدەزانی، کە لەو ئاواییە، کەس نییە لە پێشنوێژیی و سەلەوات لێدان و نزاکردن، بگاتە مامۆستا تەحسین، بەڵام کە لە هۆڵەکە نوێژی عەسریان بە جەماعەت دابەستا، کشکۆ پێشنیوێژی کرد و دەرکەوت کە چەندان هەنگاو لە پێش مامۆستا تەحسینیە!

لەو چرکەساتەوە، کشکۆ بووە هاوڕێ و کەس و هاوخەمی پلە یەکی من لەو وڵاتەدا. تەنانەت دوای بەجێهێشتنی لیبیاش، پەیوەندیمان هەر بەردەوام بوو. (ئێستا، ٢٠٢٣، ئەو لە لای جیهادی کچیەتی لە شاری زلیتن لە لیبیا، نەخوشی زەهایمەر پەکی خستووە.).

ئەو زاتە، توانست و بەهرەیەکی یەکجاری بێسنووری هەبوو لە نمایشکردن و لاسایی کردنەوە، هەر ئەوەش، وایکردبوو وەک مامۆستایەکی سەرکەوتوو لە دەڤەرەکە بناسرێ. کە لە دیوەخان و دانیشتنەکانیدا، بەسەرهاتی ڕاودونان و دەربەدەربوونی خۆی و خانەوادەکەی لە گوندێکی نزیک ئەسقەلان دەگێڕایەوە، واتدەزانی، ئەوا حیکایەتی ئەمیر ئەرسەلانت بۆ نمایش دەکات. دەبووایە تۆش لەگەڵ نەبرەی دەنگی ئەو، کە جارێ هێمن و لەنکاوڕا دەبوو هاوار هاوار، خۆت بجولێنیە و ئەملاو ئەولا تەماشاکەی. کە دەیگوت:

"دەمەوە عەسرێکی درەنگ بوو، ئەوەندەمان زانی، باوکم بە شلەژاوی و پەشۆکاوییەوە خۆی کرد بە حەوشەکە و دەنگی داین و گوتی، خێراکەن، هەستن! هاتن! جوو هاتن! زوو دەرباز نەبین هەموومان دەکوژن. نازانم چۆن هەڵاتین، منی پێخواست، هەر بەردەبوومەوە، باوکم دەستی ڕادەکێشام، جار هەبوو دوو سێ هەنگاو لەسەر سک دەخشام، تا دەمتوانی هەستمەوە سەرپێ، باوکم، منی حەوت ساڵانی، وەک بەرخۆڵە لە باوەش دەکرد. ناوە ناوە، دوو و سێ جگەرەکێش خۆمان لە بن جۆغین و پەنا کەڵەکە بەرد و غەوارن دەشاردەوە، دەترساین، جووەکان بمان بینن... هەر هێندەمان دەزانی، لە هەموو لایەکەوە گولـلەمان بە دەستەڕێژ بۆ دەهات... سەرەتا وامانزانی، هەر ئێمەین، وا ڕادەکەین، دوای بینیمان تا دوورتر دەکەوینەوە، ئاپوورەی خەڵکی گوندەکانی دیکە پتر و پتر دەبێ... ئەو شەوە تا بەیانی هەر ڕامانکرد، نە نان، نە ئاو، نە دنکە خورمایەک! من منداڵ بووم، نەمدەزانی کێوەدەچین و بۆ دەبێ هەڵێین... باش دوو ڕۆژ، کە گەیشتینە سەر سنووری میسر، لە نزیک ڕەفەح، بینیمان هەموو گەلی فەڵەستینی، دەیەوێ بەسەر ئەو تێلبەند و دڕکەزی و دار و دیوارەدا ئاوای ئەودیوو بێ. پۆلیس و سەربازی میسریش، بە قەمچی و توپزان، دەتتگوت، کەوتوونەتە نێو ڕەووە سەگ و بەرازان، بێڕەحمانە دارکارییان دەکردین، نەیان دەپرسی ژنە، پیاوە، منداڵە، ئیختیارە... . نازانم پاش دوو سێ ڕۆژان، خۆمان لە کەمپێکی تەیمانکراو دیتەوە. دواتر لەبەر برسیەتی و تینییەتی، ئەو حەشاماتە، تەلبەندیان شکاند و بەو گوند و شارانەی ئەو ناوە وەربوون. بەم شێوەیە (١٨) ساڵی ڕەبەق، بووینە کۆیلە و ئاوارە و لانەوازی ئەو میسرە. کە ڕەوانەی ئەم لیبیایە کراین، ئەمن ژنم هێنا بوو و شەش حەوت منداڵمی سەلک و پەلکم لە لای دایکیان بەجێهێشتبوو، گوتمان، بەڵکوو کۆڵێتیک بدۆزینەوە و تێیدا بحەوێینەوە و پاروە نانێکی حەڵاڵ بۆ خۆمان پەیدا بکەین. وا بووە (٢٥) ساڵ، من ئا لەم ئاواییانە، دەرس دەڵێمەوە و هەرچی لێرە دەیبینی، شاگرد و قوتابی بەردەستی منن. عەبدولناصریش هەر شاگردی خۆم بوو. ئێمە کە هاتینە لیبیا، کێ خوێندەواری هەبوو...؟ "

هەموو ئەوانەی کشکۆیان دەناسی، لەو باوەڕەدابوون، کە ئەو زاتە جنسێکی دەچێتەوە سەر ڕەچەڵەکی جندوکە. جگە لەو سێ چوار سەعاتەی، دەوام کردنی نەبێ لە قوتابخانە،

کەس نەبوو بزانێ مەکان و مەنزڵی ئەو پیاوە لە کوێیە. ئەو لە هیچ جێگەیەک نەبوو، لە هەموو شوێنێکیش حزووری هەبوو.

ئەو دەڤەری مە، لە (سەددەی ئاواییەکەی قەزافییەوە، لە ڕۆژاوا) بگرە تا دەگاتە مزگەوتی هەمالی، لە دەروازەی سرت، هەموو مەزرا و گێلگە و باخچە و دارزەیتون و هەنجیر و هەنار بوو. ئەوەی نزیک سەددەکە، نزیک ماڵی کشکۆ، پێیان دەگوت (دۆڵی صلول)، چونکە وەک ڕەشەمار، بە درێژایی ڕێگاکە، پێچی خواردبۆوە. جا کە کشکۆ لە قوتابخانە دەردەچوو، چوونە ماڵەوەی نەبوو، یەکسەر خۆی لە یەکێ لەو مەزرا و باخچانە دەکرد، کە هەر سێ چوار دەقیقە دوور بوون، لە گەڵ کرێکارە میسرییەکان، وەک خانە خۆیێ دەستی دەکرد، بە زەویێ کێلان و بەر ڕنین و ئاودێری کردن، گیا درووینەوە و تەیمان چاکردن و ئەلف و ئاو بردن بۆ گا و گاجووت و وشتر و ماڵاتەکانیان. ڕۆژ هەبوو، تا دەبووە ئێوارە، دوو سێ مەزرای بەسەر دەکردەوە. خەڵکەکە خۆشیان دەویست و هەرچی بێکردبا و بیگوتبایە، قبوڵیان بوو. ئەو بە پارە ئیشی نەدەکرد. دەیگوت،"بەدەستە خۆم نییە، یەک سەعات، بێ ئیش دانیشم، دەبێ لەگەڵ خۆم بە شەڕ بێم، ناتوانم، بێ ئیش هەڵناکەم."

تۆ تازە ئەوت لە مەزرایەک بینیوە، کاتێک دەچوویتە نەخۆشخانە بۆ سەردانی نەخۆشێکی ناسیاو، دەبینی، کشکۆ لەپێش تۆ لەوێ حازرە، ئەو نە ئۆتۆمبیلی هەبوو، نە کەر و ولاغ!

هەرچی خانەوادەی فەڵەستینی و خانەوادەی لیبی هەبوو، لەو ناوە، شتێکیان لێ عاسێ بووایە، هانایان بۆ کشکۆ دەبرد، ئەوەیش قەت نەیزانیوە بڵێ (نا، یان پێمناکرێ). لە هەموو شتێک بایخۆی شارەزا و مەعلان بوو، جگە لە ئیشی کارەبا و کارەباچییەتی، نەک شارەزا نەبوو، نەختۆکەکیش لێی دەترسا!

ئەو ڕۆژەی، بەڕێوەبەرەکەم، کشکۆی هێنا بوو، تا پێکەوە لوولە شکاوەکەی قوتابخانە چاک بکەینەوە، کە لێبووینەوە، دیقەتم دایە، هەرچی کۆنە چووپی تایەیی ئۆتۆمبیل هەیە، کە لە لوولە شکاوەکەیان پێچا بوو، کشکۆ کردیە تۆپەڵە و خستەی نێو کیسەکەی سەر شانی، کە بە سەرسۆڕمانەوە پرسیاری ئەوەم لێکرد، ئەو چووپەت بۆ چییە؟ گوتی، ئامرازی دەرسگوتنەوەی لێدرووست دەکەم بۆ قوتابییەکانم. کە پێمگوت، "ئاخر ئەو خاوێن نییە، چۆنە ئەو منداڵە ناسکۆلانە، دەستیکەنێ و بەکاری بێنن؟"بە چاوێک تەماشای

کردم، وەک بڵێی کوفرێکم کردبێ، بە هێمنی گوتی:"بەڕێزم، ئەوە جوان جوان پاکدەکرێتە و دەشووردرێتە و دواتر بۆیە دەکرێ، بۆ نایەی تەماشای پۆلەکەم بکەی؟"

دواناوەندی (شهداء البدر)، نزیکەی چوار کیلومەتر لە قوتابخانەکەی من، ڕوو لە ڕۆژاو، دوور بوو. هەموو مامۆستا و خوێندکارەکانی لە خانەوادەکانی قەزافی بوون کە لەو دەڤەرەدا بوون. ساختومانی قوتابخانەکە گەورە و سەردەمییانە بوو، ئەویش زۆربەی مامۆستاکانی هەر ژن بوون، کشکۆ لەگەڵ چەند مامۆستایەکی پیاوی دی لەوێ دەرسی دەگوتەوە. وەک پێشتر گوتم، (٢٥) ساڵ بوو ئەو، هەر پرۆگرامی پۆلی یەکی بنەڕەتی دەگوتەوە. جا تاکە مامۆستا بوو، کە قوفڵی لە دەرگای پۆلەکەی خۆی دەدا. چووبایتە نێو پۆلەکەی سەرت سووڕدەما. جا گەر بەرپرسێکی باڵا، ڕووی لەو دەڤەرە کردبا، یەکسەر پۆلەکەی کشکۆیان نیشاندەدا و شانازیان پێوە دەکرد. هەرچی تۆ بەخەیاڵت دادێ، وەک ئامرازیی یاریدەدەری بینراو و هەستپێکراو، بە دار و دیواری ئەو پۆلە هەڵواسرا بوو. قۆچێکی مەڕی کردبووە پیتی (ر)، ڕەگی دارێکی جوانی کردبووە پیتی (س)، چڵی دارتووێکی کردبووە پیتی (ع)، لە تاکە ئیسفنجی کۆنە سەندەلان، پیتی (ق)ی هەڵکەند بوو، لە گەڵا و لقی دارخورما، ئەو ژمارانەی هێندە جوان چنیبۆوە، دەتگوت، دەستکردی ژاپۆنن. جا لە وێنە و نیگار و کاری دەستیی، ئەوە هەر باس ناکرێ. تەنانەت شێوەی تەختە سڕ و تەباشیردانی جیاواز بوو. تۆش بوویتایە، دەتگوت" هەقیەتی، دەرگای پۆلەکەی قوفڵ داو، کلیلەکەی لە تەنکەی باخەڵی نێ، ئەوانە هێ ئەوەنین، لاساریێ بچێ، تێکیان بشکێنێ یان تێکیان بدا!"

کشکۆ، بۆ خۆی ڕۆمانێکە، ئەوی خوێنتەوە، هەر پێناسەیەکی سەر پێی بوو. ئا لەم چرکە ساتەدا من غەریبی قسە و گفت و لوتفتی دەکەم، بە توڕەبوونەکانیشیەوە! کشکۆ، تا کۆتایی ئەو بیرەوەرییە لەگەڵمان دەبێ... .

## (١٦)
## ماڵی تازه و دراوسێی تازەم

که گەڕابوومەوه کوردستان، ئەگەر پەرداغەئاویان به پڕی بۆ هێنابام، هێندێکم لێ له سوراحییەکه دەکردەوه، که به تەشت و لەگەنان ئاویان دەڕیشت، خۆم لێ عێدز دەکردن، که ئۆتۆمبلیان به صۆندی ئاو دەشووشت پێ دڵگران دەبووم، پێیان دەگوتم:

ـ ئەیەڕۆ! ئەوه مامۆستا لۆ وای لێهاتییه!؟

ڕۆژێک که دەچوومه بازاڕ، ژنێکم بینی، له نێودەرگای ماڵەکەیدا، صۆنده ئاوی لەسەر مافوور بەجێیهێشت بوو، که گەڕامەوه، ئاوکه هەر لەسەر مافوورەکه دەڕۆیشت، خۆم پێنەگیرا، به ژنەکەم گوتم،" به قەد نرخی مافوورەکه، ئاوت بەفیرۆدا، ئەوه له لیبیا بووایه، بای ئەوەنده دیناره بووا!. ژنه به لالووتی و لێوهەڵقەچانێکەوه گوتی: جا، خۆ ئەمن له لیبیا نیمه!

ڕۆژێک لەسەر سفرەی نانخواردنی نیوەڕۆ بووین، کشکۆ هات و گوتی،"خێرا، صۆنده و مۆندەی بینه، وەره بڕۆین، خانووێکی باشم بۆ بەکرێ گرتووی، بچین بیشۆین."

شێوازی، ئەو پیاوه وابوو، بەبێ پێشەکی و بەبێ ڕوونکردنەوه، فەرمانی بەسەر دادەکردی و دەبووایه تۆش جێبەجێی بکەی، چونکه دەتزانی له دڵسۆزیی خۆیەتی.

لەگەڵ کشکۆ چووینه خانووەکه، پێشتر له سەردانی ماڵه فەڵەستینییەکان ئەو ئاواییەم دیتبوو. نزیکەی (٥٠) ماڵێک لەسەر چەند گردۆڵکەیەکی بەردینی سەرپان و تەختی وشکوبرینگ، به هەمان نەخشه و دیزاینی خانووەکانی دیکەی دەڤەرەکه بونیات نرابوون. مزگەوتێکی گەورەی تێدا بوو، له دووری (٥٠٠) مەترێک، لەسەر گردۆڵکەیەک نەخۆشخانەیەکی سەردەمیانه درووستکرابوو. ئەو ئاوایيه به ناوی (سەددە) ناسراوه، چونکه بەندواێکی نزیکەی (٣٠٠) مەتریان له دۆڵێکدا بونتای نابوو، بۆ گلدانەوەی ئاوی باران، ئۆتۆمبیل بەسەر ئەو بەنداوه تێدەپەڕی له چوون و هاتنیان بۆ ئەو گوندە.

لەسەر گردۆڵکەکی دیکه، بەرامبەر گوندەکه و ئەو دیوی بەنداوەکه، قوتابخانەیەکی بنەڕەتی هەبوو لەگەڵ وێستگەی دابەشکردنی ئاو و یەک دوو دوکانی بچووک.

ئەم گوندە سەرەڕێی چەند گوندێکی دیکەیە بە قولایی بیابان. جگە لە ماڵەی فەڵەستینییەکان و ماڵی دکتۆرێکی میسری، هەموو خەڵکی گوندەکە لە تیرەی (گحوص و اولاد سلیمان) بوون، کە بەرەبابی خێلی قەذاذیفەن.

خانووەکانی ئەو گوندە، هەموو چوار بوون، دووان دەرگایان دراوسێ بوو، دووەکەی دیکەش دەکەوتنە پشتەوە. دروانسییکەی من، کە ناوی عەبدوڵلا عیسا بوو، شۆفیری تانکەری بەنزین بوو، باخچەیەکی ژێکەڵەی لەبەردەم ماڵەکەیدا هەبوو. ئەو زاتە تا بڵێی خۆش مەشرەف و جوان ڕەفتار بوو. هەر ڕۆژی یەکەم خۆی وەک برا و ئامۆزا ناساند و هێندێ ڕێنمایی و زانیاریی دەربارەی خەڵکەکەی ئەوێ دامێ.

کە بۆ بەیانی لەلای بەڕێوەبەرەکەم، باسی گواستنەوەی ماڵم بۆ ئاواییەکەی سەددە کرد، تەواوەک دڵگرانی نیشاندا و لێوی هەڵقرچاند، و گلەیی ئەوەی لێکردم، چۆن پێشوەخت ئەوم ئاگادار نەکردۆتەوە.

دووبارەی دەکەمەوە، ئەوەندەی من لەو لیبیایە بووم، شتێکم نەدی بە ناوی (گەلی لیبی). دەیان و سەدان خێڵ و هۆز و عەشیرەت، هەر یەکەی لە پێگەیەکی جوگرافیی، وەک میراتگری باب و باپیرانیان، نیشتەجێ بوون و ژیانیان دەگوزەراند. هەر خێڵەی شێخی خۆی هەیە و هەموو ئەوانەی لە خوێنی ئەو خێڵەن، گیانفیدا و خۆبەخش و خزمەتکاری یەکترین. زۆربەی خێڵەکانیش دانوویان لەگەڵ یەکدا ناکوڵێ. ئەوەی ئەوانی بەیەکەوە بەستۆتەوە قەزافی و بەرنامەکانی قەزافی بوو. ئەو زاتە، زیرەک بوو، دەیزانی، هاوولاتی ئەو سارایە بێ سنوورە بەوی ڕام ناکرێن، بۆیە هەرچی شێخ و ڕیشسپیی هەبوو لە دەووری خۆی کۆکردە و هەمووی کردن بە مریدی خۆی. بەو شێوەیە، ئەندامانی خێڵەکانیش بە فرمانی شێخی عەشیرەت گوێڕایەڵی قەزافی دەبوون بەتایبەتی لە سالانی سەرەتای شۆڕشکەدا.

قوتابخانە و خانووی یەکەمی من، لە نێو خێڵی (فرجان) بوو، ئێستا من دەگوێزمەوە نێو خێڵی قەذاذیفە، ئەو دوو خێڵەش، بەزەبری سیاسەتیی قەزافی ئێستا لەگەڵ یەک هەڵدەکەن، دەنا لە دڵڕا یەکتری ناحوێنن. جا بەڕێوەبەرەکم پێخۆش نەبوو، من لەناو ئەواندا دانیشم و کارەکەشم لەگەڵ فرجانەکان بێ، جگە لەوە، دەترسا، لە ئایندەدا، ئەوان

منیش بگوازنەوە بۆ یەکێک لەو دوو سێ قوتابخانەی خۆیان، کە لە دەڤەرەکە هەنە. من بەڵێنم بە بەڕێوەبەرەکم دا، کە تا لیبیا بم هەر لە لای ئەو دەمێنیمەوە. هەرواشم کرد.

ساتەوەختی، بەجێنیهێشتنی خانووەکەم لە بیر ناچێ، چونکە صغەییری سوودانی، وەک منداڵی ساوا بۆمان دەگریا. ئەو ماوەیە تەواو هۆگری یەکتری ببووین. ئەو ناوی هەموو خواردنەکانی کوردی فێر ببوو، لەگەڵ ڕەسەن و ڕەندیش، فێرە چەندان وشەی کوردیی ببوو.

ئەو شەوەی فەڵەستینییەکان بۆ بەخێرهاتن، سەردانیان کردین، شێخ بەیووگ، گوتی:"مامۆستا ئەگەر حەزت لە خزمایەتمانە، ئەو سەگە لێرە دوور خەوە، ماڵێک سەگی تێدابێ، نوێژی قبوڵ نییە."

(بۆرە)، ببووە ئەندامێکی نوێ خێزانەکەمان، بەڵام نەدەکرا قسەی شێخ بەیووک بشکێنم، ناچار، ئەو سەگەمان بردەوە مەزرایەکی صغەییر، خێریشی تێدا بوو، ناوە ناوە کە دەچووینە کنی، بەشە خواردنی صغەییرپشمان لەگەڵ خۆمان دەبرد.

شێخ بەیووگ، لە هەموومان بە تەمەنتر بوو، چاویلکەکانی دەتگوت، بنی شووشەی نەفتێن، چاوی کز بوو، کە وتاری ڕۆژی هەینی دەخوێندەوە، کاغەزەکەی بە چاویلکەکەوە دەنووساند. تا بڵێی کەسێکی هێمن و لەسەرخۆ و قسەزان و ئەڕباب بوو. وانەی ئایینی دەگوتەوە لە دواناوەندی (شهداء البدر)، هەمیشە وەک ڕابەر و دەستگری فەڵەستینییەکان بوو. بە کوردی، ئەویش شێخی ئەو شەش حەوت ماڵە فەڵەستینییانە بوو. ئەوان هەموو شتێکیان بە تەگبیر و ڕای شێخ بەیووگ بوو. ئەو لە لای لیبییەکانیش قەدر و حورمەتی هەبوو. شێخ، وەک هەموو فەڵەستینییەک، سەددام و ڕژێمەکەی بە پشتیوانی خۆیان دەزانی، بەڵام دەربارەی کورد، یان قسەی نەدەکرد، یان لەدەمی نەدەدایەوە و بەرگریی لە سەددام نەدەکرد. ئەو مەیلێکی ئیخوانی هەبوو و موریدی (شێخ ئەحمەد یاسین)ی فەڵەستینی بوو ـ کە ئیسرائیل دواتر شەهیدی کرد.

لە گەڵ ماڵەکەی کشکۆ، نێوانمان تەنها شەقامە قیرتاوەکەی گوندی بوو. ئێستاشی لەگەڵ بێ، من خاوەن ئەو خانووەم نەدیت، کشکۆ، بریکاری من بوو بۆ هەموو شتەکان.

لەئاکامی تێکەڵبوون و میوان و میوانداری لەگەڵ خەڵکی ئاواییەکە، زانیم، کە زۆربەی پیاوەکانیان، بەرپرس و کاربەدەستی دەوڵەتن و پۆستی باڵا و گرنگیان لە تەرابلس و

بەنغازی و موسراتە و شارەکانی دیکەی لیبیا هەیە. ئەوا جگە لەوانەی لەگەڵ خودی قەزافیین و لە وەزارەتەکانی نەوت و ناوخۆ و بەڕێوەبەرەیاتییەکانی ئاسایش و پۆلیس و سەربازگەکان بالآیان هەیە. هێندێکیان ڕۆژانی هەینی دەگەڕانەوە گوندی، هەش بوو بە دوو حەفتە جارێک یان مانگێ جارێک دەهاتەوە.

ئەوەی کە جێگەی سەرنج بوو، ئەو کەسانەی کە ئەو پێگە و پۆستانەیان هەبوو، کە دەگەڕانەوە گوندی، وەک هاوولاتییەکی ئاسایی هەڵسوکەوتیان دەکرد و خەڵکەکەش بە چاوی خەڵکی گوندی تەماشایان دەکردن. بۆ نموونە، ئەگەر لای خۆمان، وەزیرێک تێکەڵ خەڵکی ئاسایی بێ، ئەوا دەوری دەگرن و عەرزوحاڵی دەدەنێ و داوای هەزار و یەک شتی لێدەکەن. ئەوان کە دەهاتنە مزگەوتەکەی گوندی بۆ نوێژی هەینی، وەک باقی خەڵکەکە ڕەفتاریان دەکرد و کەسیش تێیان نە دەئالا بۆ داواکاریی شەخسیی خۆیان ــ مەگەر، ناوە ناوە فەڵەستینییەکان، داوایەکیان هەبوو بێ. دەنا خەڵکی گوندی هیچ.

فڕۆکەخانەی سرت هێندە لێمان دوور نەبوو، ئیستگەیەکی سەردەمیانەی ڕادیۆ و تەلەڤزیۆنیش، لە قولایی بیابانی ئەو دەڤەرە هەبوو، بەلام کاری نەدەکرد. هەموو ئەرشیڤی ڕادیۆ و تەلەڤزیۆنی تەرابلس، کۆپییەکی لەوێ هەبوو. ڕۆژانە کارمەندەکانیشی دەوامیان دەکرد، ئەو ئیستگەیە بۆ ئەوەبوو، ئەگەر خوانەخواستە، کودەتا یان شتێک لە تەرابلس ڕوویدات و ئیستگەی ڕادیۆ و تەلەڤزیۆنەکەیان لە کاربکەوێ یان دەستی بەسەردا بگیرێ، یەکسەر، ئەو ئیستگەیە دەست بکات بە پەخش و بەرنامەکانی پیشکیش بکات!

هەر لەو ناوە، یەکێک لە سەربازگە گەورەکانی لیبیا بە ناوی (معسكر القرضابية) هەبوو، کە هەموو چەکێکی قورسی وەک مووشەکی زەوی بە زەوی و مووشەکی زەوێ بە ئاسمانی تێدا بوو ــ هێزی ئاسمانی ناتۆ لە کاتی ڕاپەڕینی بەهاری عەرەبی، ئەو سەربازگەی بۆمباران کرد و زیانی گەورەی لێدا.

لە دووری چەند کیلۆمەترێک، بەرەو باکووری ڕۆژاوا، لە چۆلەوانییەک، گلکۆی(عائیشەی کچی نیران)، دایکی قەزافی هەبوو. گومبەزێکی جوانی لەسەر دروستکرابوو، لە تەنیشتیشی مزگەوتێکی سەردەمییانە بونیاتنرابوو ــ لە کاتی ڕاپەڕینەکە، ئەو گڵکۆیە خاپوور کراو، ڕووفاتی دایکی قەزافیشیان دەرهێنا. وەک ڕووفاتی باوکیشیان لە گۆڕستانی خۆی دەرهێنا و شونبزریان کردن. لە (٢٠٢٣) دا بنەماڵەی قەزافی داوایان لە

دادەگا دژی ئەو چەکدارە توندڕەوانە تۆمارکردوە کە گۆڕی ئەو مردووانەیان تێکداوە. پێشتر لە کەلتووری لیبییەکاندا هەرگیز شتی وا نەکراوە.

قەزافی بۆ خۆی، جاروبار سەردانی ئەو گوندەی دەکرد. کە دەزانرا ئەو هاتۆتە گوندی، ئیمەمانان و فەڵەستینییەکان لە ماڵ دەرنەدەچووین، چونکە دەمانزانی ئەوان وایان پێباشتر بوو.

لە کاتی هاتنی قەزافی بۆ گوند، دوو دانیشتنی هەبوو، یەکەمجار، لەگەڵ ژنەکانی گوندی دادەنیشت. شۆڕەژن و ژنە بەتەمەنەکان دەچوونە سەردان و پێشوازی کردنی. دایکی عەبدوڵلا عیسای دروایسیمان، هەمیشە لە لای دەستە ڕاستی قەزافی دادەنیشت. قەزافی، یەک بە یەک ئەو ژن و خانەوادەی بەسەر دەکردەوە و لە ئەحواڵ و گوزەرانی دەپرسین. ئەوانیش بەردەوام نزا و دوعایان بۆ دەکرد و قورئان و ئایەتولکورسیان بەسەردا دەخوێند. جارێکیان لەو ژنەم پرسی: "کە قەزافی دێتە لاتان، داوای هیچی لێناکەن بۆتان بکات، یان هیچ داخوازیتان نییە؟" گوتی: "کەس کەس، تا ئێستا هیچی لی داوا نەکردوە. ئەو بۆ خۆی چاوی دەبینی، گەر بزانێ یەکێک نەخۆشە یان چاوی کزە، دەینێرێتە لای دکتۆری ئێرە یان ڕەوانەی نەخۆشخانەی تونسی دەکا."

دانیشتنی دووەمیشی لەگەڵ شیخ و ڕیشسپی و خانەدانەکانی ئەو دەڤەرە دەبوو. نەمبیستووە، قەت لە دانیشتنەکانی ئەو، خەڵکی غەیرە لیبی هەبوو بێ.

ئەگەر لەهەر شوێنێک، لە سەر ڕێگا، ڕەشماڵی پرسە ببینێ، قەزافی دەچێتە پرسەکە و فاتیحە دادەدا. بەهەمان شێوە، ئەگەر ڕەشماڵی بووک گواستنەوە و ژنهێنانیش ببینێ، دەچێ پیرۆزباییان لێدەکات و هەموو مەسرەفەکەشیان دەکێشێ و دیارییان پێشکێش دەکا.

## (١٧)

# شـــاربەدەرکردنی فەڵەستینییەکان

پێشینانی عەرەب گوتویانە،"کل غریب للغریب نسیب."(پیاوی غەریب، کەس و کاری غەریبانە.)، جا چونکێ مامۆستا عومەری ڕشتەی وەرزش، فەڵەستینی بوو، زۆر دڵی بە ئێمە دەکرایەوە و ڕۆژ بە ڕۆژ پەیوەندیمان لەگەڵ فەڵەستینییەکانی ئەو دەڤەرە تۆکمەتر و خوشتر دەبوو. ئەوانیش، ناوە ناوە، لە قوتابخانە سەردانی مامۆستا عەبدولناصریان دەکرد، بۆ ڕاپەڕاندنی هێندی ئیش و کاری فەرمییان لە سرت. ناسیاویمان لەگەڵ ئەو حەوت هەشت خانەوادەیە پەیداکرد کە دەمێک بوو ئاوارەیی، پەرتەوازەی ئەو دەڤەرەی کردبوون.

ئاماریی فەڵەستینییەکان لە لیبیا بەنافەرمیی بە پتر لە (٣٥) هەزار کەس خەمڵێندرا بوون. تێیاندا بوو، دوو بەرە نەوەیان لەوێ لەدایک ببوو. زۆربەیان، چونکە خوێندەوار بوون، یان مامۆستا بوون، یان لە فەرمانگەکانی دەوڵەت دەستیان لە وەزیفەیەک گیرببوو. منداڵەکانیان، وەک منداڵە لیبییەکان، مافی خوێندنیان هەبوو بەبێ فەرق و جودایی، بەشە خۆراکی مانگانەشیان پێدەدرا.

لە (٢٨)ی سێپتەمبەری (١٩٩٥)، نوێنەرانی ڕێکخراوی فەڵەستینی، ڕێککەوتن نامەیەکی ئاشتییان لەگەڵ ئیسرائیلییەکان لە شاری (طابە)ی میسری مۆر کرد. یەکێک لە بەندەکانی ئەو ڕێککەوتنە، گەڕانەوەی فەڵەستینییە ئاوارەکان بوو، بۆ سەر ماڵ و حاڵی خۆیان لە فەڵەستین. ئەو ڕێککەوتنە درێژەپێدەری، گفتگۆیەکانی (ئۆسلۆ)بوو.

قەزافی، وەک پیشە و کاری هەمیشەیی خۆی، لە وتارێکی پڕ هەڕەشە و گورەشە، بە فەڵەستینەییەکانی گوت"سەرکردەکانتان درۆتان لەگەڵ دەکەن، فێڵتان لێدەکەن، کە دەڵێن دەگەڕێنەوە زێدی خۆتان. درۆیە، جوو ڕێ نادا یەک منداڵی فەڵەستینیش جارێکی دی پێ بنێتە سەر خاکی فەڵەستین." پەیوەندیی نێوان سەرکردەکانی فەڵەستینی و قەزافی ڕۆژ بە ڕۆژ ناخۆشتر دەبوو و لە میدیاکاندا پەلاماری یەکتریان دەدا.

بۆیە قەزافی، بۆ ئەوەی قسەی خۆی بسەلمێنێ، لەنکاوڕا، فرمانیدا، ئەوەی فەڵەستینییە، بە پەلە و بێ سین و جیم، دەبێ خاکی لیبیا بە جێبهێڵێ!

کەس بە حاڵی ئەو فەڵەستینییانە نەبێ، وەک ئەنفالی سەردەمی بەعسییەکانی خۆمان، هەرچی پۆلیس و ئاسایش و هێزی سوپا بوو، دەستیان کرد بە ڕاودونانی خێزانە فەڵەستینییەکان. دەیانگوت، مەنجەڵی سەرئاگریان پێ داگرتوون و پێیان گوتوون، بڕۆن لە فەڵەستین بۆ خۆتان چێشتەکەتان بخۆن! ڕۆژانە بە پاسی گەورە، ئەوانیان دەبرد بۆ بازگەی سەلومی سەر سنووری لیبیا ـــ میسر. بۆ ئەوانەی لەکاتی خۆیدا، لە لوبنان و سوریا و ڕەفەحەوە هاتبوون، گیران و لە کەشتییەکی یۆنانییان پەستان بۆ ڕادەستکردنەوەیان.

مامۆستا عومەری فەڵەستینی، نامەیەکی بۆ ناردم ـــ ئەو ماڵەکەی لە لای سەددە بوو، (٨) کیلومەترێک دوور بوو، تا شەفاعەتێکیان لە لای عەبدولناصر بۆ بکەم، بەڵکوو کارێکی وا بکات، ئەوان لە جێی خۆیان بمێننەوە و نەنێردرێنەوە فەڵەستین.

لەو ماوە کورتەدا، لە لای مامۆستا عەبدولناصر، متمانەیەکی باشم پەیدا کردبوو، خەڵکەکە دەیزانی، کە ئەو بێحەد ڕێزم لێدەگرێ و قسەم وەردەگرێ. لە چەندان بۆنە و کێشەدا، لیبییەکانیش دەهاتنە لام، بۆ تکا و ڕجا ـــ بەڕێوەبەرەکەم، پێگە و مەقامێکی باڵای هەبوو، نەک لە سرت، لە تەرابلس و شارەکانی دیکەش، زۆر کاری پێ ڕایی دەکرا.

مامۆستا عەبدولناصر، پێی گوتم، کە ئەو هیچی لەدەست نایە، فرمان فرمانی قەزافییە. بەڵام با ئەوان لە ماڵی خۆیان دانیشن و نەیەنەدەرەوە. با دەوام نەکەن. خۆیان نیشانی کەس نەدەن. وەک ئەوەی ڕەوانەی سەر سنوور کراوون و لێرە نەماون!"

چەندان هەزار فەڵەستینی، لە ژن و پیاو و گەنج و منداڵ، لەو سارایەیی سەر سنوور، بەبێ نان و ئاو تێلبەند کران. حکوومەتی میسری ڕێی نەدا مێش ئەودیوی سنوور بێ. بازگەکانی لیبیشی، دەیانەویست بە زۆر بیانێرنەوە میسر. بارودۆخی ئەو ئاوارانە، لەبەر ئەو تیشکی خۆرە. ڕۆژ بە ڕۆژ دژووارتر دەبوو، تا هێندێ فەڵەستینی کە لە میسر بازرگان و توجاری گەورەبوون، هێندی کۆمەک و نان و ئاویان بۆ بردن. ڕۆژ بە ڕۆژ ژمارەی دەرکراوەکان زۆرتر دەبوو.

ئەوانەی لەسەر پشتی کەشتییە یۆنانییەکە بوون، گەیشتنە بەندەری لازیقیەی سوریا، بەڵام حکوومەتی سووری ڕێینەدا بستێک، لە بەندەرەکە نزیک ببنەوە، دوای بێ ئومێد

بوون، لەسەر ئەو دەریایە، باش دوو سێ ڕۆژان، ڕوویان لە بەندەری بەیروت کرد. ئەویش گوتی، ئەوەی مۆڵەت و پەساپۆرت و ڤیزەشی پێیە، ڕێی پێنادرێ بێتە نێو لوبنان. ئەوجارەی، خۆیان دەخیلی ڕەفەح کرد. ئیسرائیل، گوتی، لە کوێ هاتوونە، بڕۆنەوە ئەوەێ، نە "پسوولەی سپی" نە "پسوولەی سەوز" ناخوا. ئەوەیش کەسی وەرنەگرت. لە بۆ سوندێ، چەند ئیختیارێکی نەخۆش و پەککەوتەیان وەرگرت کە لەسەرەمەرگدا بوون، ئەوەیش لە ڕووی مرۆڤایەتییەوە، نەک جێبەجێکردنی ڕێکەوتننامەکە.

لەسەر سنوور، بۆە خۆپیشاندان و پێکدادان و تەق و تۆقی پۆلیسی میسری و گازی فرمێسک ڕێژیان بەسەر ئەو حەشاماتە دادەکرد. تا (UN)، چوو کەمپێکی بۆ کردنەوە و خواردن و ئاوی بەسەردابەشکردن.

ئەو فەڵەستینییە بەخت ڕەشانە، تا سێ چوار حەفتە لەناو ئەو تەپوتۆزی سارایەوە و ئەو گێژەخوولکەی سەر دەریا مانەوە.

تا دەمەوە عەسرێک، قەزافی، چووە شاری سەلوم، لەسەر سنووری میسر و وتارێکی بۆ فەڵەستینییە ئاوارەکان دادا و گوتی:"من، وا دەرگاتان بۆ دەکەمەوە، بگەڕێنەوە سەر جێگە و ڕێگەی خۆتان لە شارەکانی لیبیا، من ویستم، پێتان بڵێم کە ڕێککەوتنی ئۆسلۆ جگە لە درۆیەکی گەورە هیچی دیکە نییە، سەرکردەکانتان درۆتان لەگەڵ دەکەن، جوولەکەکانیش درۆ لەگەڵ سەرکردەکانتان دەکەن. بینیتان، لەو دەشت و دەرە، کەسێک بە هاناتانەوە نەهات! کوا دەوڵەتی فەڵەستینی؟ کوا ڕێکخراوی ئازادیخوازیی فەڵەستین؟ کوا یاسیر عەرەفات؟ بینیتان، ئێوە ئێستاش هەر پەناهەندە و ئاوارەن. هەر دەبێ چاوتان لە (UN) و لە دەستی کەسانی وەک من بێ. فەرموون وەرنەوە سەر جێی و ڕێی خۆتان."

خۆشبەختانە لافاوەکە، فەڵەستینییەکانی غەربیاتی نەگرتەوە و ئەو جارەش شاربەدەر نەکران. لەڕاستیدا، لیبییەکانی ئاوایی، داپێویستیی ڕۆژانەیان بۆ دەکڕین و خۆشم، ناوە ناوە سەردانم دەکردن، ئەوکات ئۆتۆمبیلم کڕی بوو.

## (١٨)

## سەرژمێری بندیواران[١]

دیسان ڕۆژێکیان، بەڕێوەبەرەکەم ئاگاداری کردمەوە کا دەبێ ڕۆژانە لە قوتابخانەکە حزوورم هەبێ و یەک دەقیقە، یەک مەتر دوور نەکەومەوە. بەبێ ئەوەی هیچ زانیارییەکی دیکەم بداتێ. بەڵام هەر ئەو کاتە بینیم، سێ چوار کەسی گوندی، لەگەڵ ئێمە لە بەیانییەوە تا کۆتایی هاتنی دەوام، لە قوتابخانە دەمێننەوە. ئەوانم هەموو دەناسی و هامووشۆمان هەبوو. یەکێیان بازرگانیی لەگەڵ وڵاتانی ئەورووپادا هەبوو، پتر کەرەستەی یەدەگی ئۆتۆمبیلی هاوردە دەکرد. ئەوانی دی ئیشی سەرپێیان دەکرد لە شارەکانی دیکە و ماڵ و منداڵیان هەبوو.

پاش دوو سێ ڕۆژان، دەستەیەک لە کاربەدەستان، هاتنە قوتابخانەکەمان، هیچیان خەڵکی ئەو ناوە نەبوون، لە تەرابلسەوە هاتبوون. زۆر لە پیاوانی ئاسایش دەچوون، یەکە یەک ناوی مامۆستاکانیان دەخوێندوە و دەبووایە بچینە ژوورەوە، فۆڕمێک لە حزوور ئەواندا واژوو بکەین. ئەو سێ چوار کەسەی گوندیش کە وەک ئێمە ناویان خوێندرایەوە و چوون واژووی خۆیان کرد.

ئێوارە، بەڕێوەبەرەکەم داوای لێکردم کە دەبێ، ئەو شەوە لە ماڵەوە هاوکاریی هێندێ کاروباری کارگێڕیی و دۆسیە و تۆمارگەی لەگەڵدا بکەم. تا درەنگانی شەو هەر دۆسیەمان هەڵگێر و وەرگێر دەکرد و ناومان تۆمار دەکرد و تێبینیمان لەسەر دەنووسین. بەڕێوەبەرەکەم، سەرپەرشتیاریی چەندان دەزگا و ڕێکخراوی دیکەی هەموو دەڤەری سرتی لە ئەستۆدابوو. ئەوە یەکەمینجار نەبوو، لە ماڵەکەیدا، ئەو جۆرە ئامار و سەرژمێرییە بکەین.

---

[1]) بندیوار: زاراوەیەکی چەفەنگی ماناداره، دوای ڕاپەڕینی ١٩٩١ پەڕیوەتە نێو فەرهەنگی کوردی، بەو کەسانە دەگوترێ کە مووچە لە دەوڵەت وەردەگرن بەبێ ئەوەی هیچ ئیش و کار و فەرمانێکیان لەلای دەوڵەت هەبێ. واتا مووچەکانیان بۆ دەچێتە ماڵەوە و لە ماڵەوە بۆ خۆیان دانیشتوون. ئەمانە لە ناوەند و خوارووی عیراق پێیان دەگوترێ (الفضائیون) واتا (خەڵکانی نێو ئاسمان یان بێگانە).

مەسەلەکەی ئەو هاتوباتە ئەوەبوو، شێخ و ڕیشسپییەکانی سرت، دیسان گلەییان لە قەزافی کردبوو، کە ئەو مامۆستا و دکتۆر و کارگێرە بیانییانەی هێناوەتە لیبیا و مامۆستا و دەرچووەکانی خۆشیان شەقامان دەپێون و بێ ئیش و کارن. بۆیە لە پایتەختەوە، لیژنەیەکی دەستپاکی پێکهێنرابوو، بۆ لێکۆڵینەوە و لەو کەسانەی کە بندیوارن و مووچە دەچێتە سەر حیسابی بانکیان و دەوامیش ناکەن.

ئەو ڕۆژە من زانیم، کە ئەو سێ چوار کەسەی، ئەو چەند ڕۆژە دەهاتنە قوتابخانە، مامۆستای بندیوار بوون، لەسەر میلاکی ئێمە دامەزرابوون، بەڵام دەوامیان نەدەکرد. ڕشتەکانیان بیرکاری و زمانی عەرەبی و کۆمەڵایەتی بوو.

پاش چەند ڕۆژێک، لە بەڕێوەبەرەکەم پرسی، ئاماریی بندیوارەکان گەیشتە کوێ؟ گوتی:"کوڕە، هەر بەردێکی لەسەردانێ، ئابرووچوونە! (٨٣٠٠٠) بندیوار لە لیبیا هەیە، هەموویان مانگانە، وەک من و تۆ، مووچەیان بۆ دەچێتە سەر حسابی بانک و یەک ڕۆژیش دەوام ناکەن.

ئەو ئامار و سەرژمێریانە هیچی لە مەسەلەکە نەگۆڕێ، تەنها بۆ ئەوە بوو بە شێخ و سەرۆک هۆزەکان بڵێن، داواکارییەکانیان جێبەجێکرا!

لە لیبیاش، وەک ڕژێمی بەعس، لە هەموو دەزگا و فەرمانگەیەکی حکوومی، کەسانێک هەبوون کە بە فەرمی و بە مۆڵەتی مۆرکراو، لە دەوامکردن بەخشرابوون. ئەوان پتر ئەو گەنجانەبوون کە لە لیژنەی شۆڕشگێڕان، بەرپرسیارەتییان هەبوو. لە ڕێکخراو و کۆمەڵە و بنکە و بارەگاکانی قوتابی و لاوان و ژنان ...تاد.، بەرپرس بوون و ئیشیان دەکرد. تەنانەت، ئەرکی ئاسایش و سەربازیشیان لە ئەستۆدابوو. ئەوەشمان لەبیر نەچی، خەڵکی سرت، جێگەی متمانەی قەزافی و هۆزەکەی بوون. لە شارەکانی سرت پۆستی باڵایان هەبوو و دڵسۆزانە کاریان بۆ ڕژێم دەکرد. خەڵکی شارەکانی دیکەش، مامەڵەیەکی تایبەتیان لەگەڵ خەڵکی سرت دەکرد، دەیانزانی پێگە و پۆستی باڵایان هەیە.

## (١٩)

# سوودانییەکان و کاروانی ڕێی هات و نەهاتێ

ئەبوبەکری خوارزای قەزافی، دەمەو عەسرێک، وەکو زۆر ڕۆژانی دیکە، بە پیکابەکەی، لە ماڵەوە هاتە دوام و ویستی بچینە پیاسە. خۆ گوند و ئاوایی، چایخانە و کافتریا و باغی گشتی نییە. دوای نزیکەی بیست دەقیقە ڕێ، ڕوو لە باکووری ڕۆژاوا، لە گڵکۆی دایکی قەزافی تێپەڕین و لای دایە نێو شیوێک، لەوێ بیرێکی لێدابوو و پارەچە زەوییەکی بە نەمامە خورما و زەیتون داچاندبوو.

لەو سارا و چۆڵەوانییە، لە دەم ڕێگا، سێ لۆری گەورە و نیمچە کۆنم بینی، ئێمە جاران بەو لۆریانەمان دەگوت (عەنتەڕناش). کە تووشێ سەرسوڕمان و مەراق و تێڕامانێکی زۆریان کردم. تامردن ئەو دیمەنەم لەبیر ناچێ.

لۆرییەکان، جووت تایەکانی دواوەیان، دوو دوو بوون، واتا هەر لۆرییەی (١٠) تایەیی هەبوو. هەموویان بە بەرزایی پاشکۆی لۆرییەکان، پڕ کۆنە گونیەی سەرپێچراو بوون، وەک ڕەشکەی کا، شتیان تێپەسترابوو. لەسەرەوەی ئەو گونیانە، بڵێ چل، پەنجا، قوولی سوودانی، هەموو گەنج، پیرەکەیان هەر (٤٥) ساڵ دەبوو، خۆیان خسبووە سەر یەکدی و شیشە و لوولەکانی دەوری لۆرییەکانیان بە دەستی گرتبوو. واتا بەو سێ لۆرییە، لە نێوان (١٢٠) بۆ (١٥٠) کەسیان بارکردبوو. ئەوان لە دانیشتن و قەرەپەستە و تێکسمرانەکەیان، هەر لە دیمەنی ئەو ژن و منداڵ و پیرانەی ناو ئیڤایەکانی بەعس دەچوون، کە لە ڕۆژی هەینی، (١٣) ڕەمەزان، بەناو شەقامی حاجی قادری کۆییدا ڕاگوێزرانەوە بۆ بیابانەکانی باشوور و ڕۆژاوای عێراق، لە ڕۆژانی ئەنفالدا.

ئەوەی کە وەک تیر مێشک و ناخی سمییم، ئەو دەبە ئاوانە بوو، کە لە سەرەوە بۆ خوارەوە بە هەر چوار دەوری لۆرییەکان، بە پەت و شریت بەسترابوون و شۆڕکرابوونەوە. هەموویان پڕ ئاوبوون. هێندێکیان هەر بستێکی مابوو لە زەوی بخشێ. هیچ شوێنێکی لۆرییەکان بەدەرەوە دیار نەبوو، دەبە لەسەر دەبە کەڵەکەچن کرا بوون. دەبەکان هەمووی

چوار گالۆنی و شەش گالۆنی بوون، بە ڕەنگی بۆیەی ڕەش و سوور، ناو یان ژمارە یان هێمایان لەسەر داندرابوو. ئەوکات مۆبایل نەبوو، کامێراشم پێنەبوو.

داوام لە ئەبو بەکری کرد، کە چەند مەترێک لە دووری وان، پیکابەکەی ڕاگرێ، بەڵام ئەو گوتی،"نا، نابێ، شتی وا بکەم، ئێستا هەر بەوەستم، هەموویان لەسەر لۆرییەکان خۆیان فڕێ دەدنە خوارێ و ڕادەکەن، دوور نییە مل و دەست و قاچیشیان بشکێ، وا دەزانن، ئێمە پیاوانی ئاسایش و پۆلیسین!"

ئەوجا ئەو، حیکایەتی ئەو لۆریانەی بۆ باسکردم و گوتی:" ئەو سوودانییانە، هەموو پاڵە و جووتیار و شوان و وشترەوانن لەو دەشت و دەر و ئاواییانەی دەڤەری (سرت). ئەوان بە ڕێی قاچاغ هاتوونەتە لیبیا و دەبێ هەر بەو ڕێگایەش بگەڕێنەوە. تێیداندایە دوو ساڵ، سێ ساڵە، مەفتەن و دایک و باوک و منداڵی خۆی نەدیتیە، زۆربەشیان خوێندەوارن. من بۆ خۆم ماستەرم لە زانکۆی خەرتووم وەرگرتووە. ژیان تا بڵێی لەوێ پڕ زەحمەت و دژوارە. ڕۆژانەی کرێکار، لە بەیانیی زووەوە تا ئێوارە، یەک دۆلار نییە. ئەو گونیانەی دەیبینی، ئەوە هەموو کۆنە جلک و بەرگە، خێرەومەند دەیاندەنێ، ئەوانیش وەک دیاری بۆ کەسوکاریان دەبەنەوە."

پرسیاری ئەو سەدان دەبە ئاوەم لێکرد.

ئەبو بەکر دەستی بۆ لای باشوور درێژ کرد و گوتی:

"ئەو سارایە پان و بەرینەت لێ دیارە؟ دەبێ دەمێکی دیکە ئەوان بەڕێ بکەون، بە ناو ئەو سارا و بیابانە لماویەدا. نە جادەیە و نە ڕێگە براوە، نە هیچ ئاماژە و دار و درەخت و کێو بەردیک دیارە، تا چاو حوکم دەکا هەر بیانانی کاکی بە کاکییە. شۆفێرەکانی ئەو لۆرییانە. شارەزای فەلەکناسیین. ئەوان تەنها بە شەو سەفەر دەکەن، لەو سەفەرشدا، قیبلەنمایەکەیان ئەستێرەیە. هەتا ئەستێرە ئاوا دەبێ و ئاسوو گزنگ دەدا، ئەوانە هەردەڕۆن. کە ڕۆژ بۆوە بە یەکەوە ڕادەوەستن، هێندێ لە دەبە ئاوەکان لە ژێر لۆرییەکان دادەنێن، چونکە گەرمای ئەو بیابانە ئاو دەکوڵێنێ، هێلکەوڕوون لەسەر تاشابەرێک بکە بەبێ ئاگر! ئەوجا دەبێ چاوەڕێ بکەن تا دیسان شەو دادێ و بەڕێبکەونەوە، خۆ ئەگەر لۆرییەکیان لە نێو ئەو لمەدا بچەقێ، ئەو دەبێ دوو لۆرییەکەی دیکەش بوەستن، چونکە نابێ لێکدابڕێن، ئەوان سێ سێ و چوار چوار دەڕۆن بۆ ئەوەی باشتر ئاسمانەکە بخوێننەوە و ئەگەر لۆریەکیش برزبێ،

هیچ نەبێ خەبەر بۆ کەسوکاریی ونبووەکان ببەنەوە. مەترسیی گەورە، گەردەڵوولی بیابانە، خوانەخواستە هەڵ بکا، گردۆڵکە درووست دەکا، جا ئەو گردۆڵکانە لەو لۆرییانە دەئاڵێن و دایان دەپۆشن، گردۆڵکە هەیە پێنج شەش مەتر بەرزە. جا کە دەبێتە گەردەلوول، ئەستێرەش دیار نابێ، جار هەیە ئەو گەردەلوولە سێ چوار ڕۆژ دەخایەنێ، چاو چاو نابینێ."

من باسی گەردەلوولێکم بۆ ئەبو بەکر گێڕایەوە، کە خۆم و کوڕەکەم، لە گەڕانەوەمان لە تەرابلس بۆ سرت، تووشی بووین و خودا ڕزگاری کردین، کوڕەکەم، وەک منداڵی ساوا دەگریا. مەودای بینین، هەر دوو مەتر دەبوو بە فوول لایتی ئۆتۆمبیل، جادەش، هەموو بە لم داپۆشرا بوو.

ئەویش گوتی" لەو ساڵانە، لۆرییەک لەو لۆرییانە، لە قافڵەکە دادەبڕێ، هەرچەند بە دوایاندا دەگەڕێن و چاوەڕی دەکەن، بێهوودە، هیچ شوێن پێیەکیان نادۆزنەوە، دوای لە ترسی ئەوەی ئەوانیش لە بێ ئاوی بخنکێن، ناچار بەردەوام دەبن و بە سەلامەتی دەگەنە سوودان. پاش مانگێک ئەوجا بە هەلیکۆپتەر، لۆرییە بزبووەکەیان دۆزیەوە، وا سەرلیان لێشیوا بوو، لە جیاتی بەرەو سوودان برۆن، ڕوویان لە تشاد کردبوو. گەردەلوول هەمووی لەژێر لم داپۆشی بوون، ئەو چل پەنجا کەسە هەموویان مردن."

منیش گوتم:" بڵێ هەموویان شەهید بوون، چونکە ئەوانە هەم بەدوای نانی حەلاڵ دا گەڕاون و هەم لە غەریبیدا بزربوون." ئەوجا گوتم:" باشە، ئێوە بەبێ ئەو سوودانییانە، کاروباری کشتوکاڵ و ئاژەڵدارییتان بۆ مەیسەر نابێ و هەڵناسوڕێ، بۆچی بە فەرمی، لە ڕێی دەروازە فەرمییەکان، ڕێ نادەن، بە ئاسایی و بەبێ ترس، ئەو بەستەزمانانە بێنە ولاتەکەتان؟"

ئەوەیش گوتی:" ئەوەش بیری لێکراوەتەوە، بەلام ئەگەر دەروازەی سنووریان بۆ بکەینەوە، بە یەک حەفتە، ئەو سوودانە زەلامی تێدا نامێنێ، ئەمن دەزانم حاڵ و گوزرانیان چەند سەختە!"

گوتم:"باشە، کەس هێندی ئێوە بانگەشەی (یەکێتیی عەرەبی) ناکا، ئەوە یەکێتییەکەتانە ؟ بۆ پلان و بەرنامەیەک، بۆ ئەو کێشە دانانێن؟"

ئەبو بەکریش، بە زەردەخەنەیەکەوە گوتی،"ماmۆستا فازیل، یەکێتیی عەرەبی بە جددی وەرگرتووە! کوڕە، ئەوە هەر بۆ میدیایە. سەرکردەکانی عەرەب، زۆر خۆشحاڵن بەو بارودۆخە، چونکە، جەماوەر حاڵی باش بێ و عەوجە بەوانە نەبێ، بە دوو ڕۆژان، هەموویان ڕادەماڵن، خۆ، کەس بە دەنگدان و دیموکراسیی نە هاتۆتە سەرتەخت، بەو موعەمەڕی خۆشمانەوە."

کە پرسیاریم لێکرد، دەبێ بە چەند ڕۆژ بگەنە مەفتەنی خۆیان؟ گوتی،"الله اعلم! کێ دەڵێ دەگەنە جێ، چوار شەو، پێنج شەو دەبێ لەو ڕێگا و بانە بن و ئەوەی ئاوەدانییە لەو سارایە بوونی نییە. هەیە و نییە، هەر دووپشکە سوورەیە، ئەوەیش ناخۆرێ!"

یەک دوو شەو، هەر مۆتکەی ئەو کاروانەم دەهاتە بەرچاو و خۆم بەیەکێک لەوان دادەنا، کە گەردەلوول هەڵدەکا، یان کە لۆرییەکەمان دەچەقێ، یان کە بزردەبین، چمان لێدێ و چۆن واوەیلا دەکەین و وردە وردە گیان دەدەین و دەمرین.

لە زۆر دانیشتن و مەجلیسان، دیمەنی ئەو سوودانییانەم بۆ باس دەکردن کە ڕێی هات و نەهاتیان لە پێش بوو، سەرنجم دا، بەلای ئەوانە، نمایش و دیمەنێکی ئاسایی بوو، تۆمەز پێشتر بینوویان و پێیان ئاشنان.

زۆرجار، گەشکەم لە خۆم دەکرد، کە چۆن ئەو وڵاتە پڕ خێر و بێرەی خۆمانم بەجێهێشووە و هاتوومەتە ئەو سارایە. ئەدی ئەگەر کورد، لە جێی ئەو سوودانییانە بووایە چی دەکردا!

ئێمە لە بەهەشتین و بە هیچیش ڕازی نین. لەگەڵ ئەو حاڵە و ژیانەشدا، ڕێژەی خۆکوشتنیش یەکجار نزمە لە سوودان.

ئێمڕۆ، (٢٠٢٣)، کە چیا سەرکەشەکانی ئەو کوێستانانەی خۆمان و ئەو بیابانە قاقرەی ئەفریقیام دێتەوە بەرچاو، دیمەنی کۆڵبەر و هێستری خوێناوی سەر سنوورەکانی خۆمان و لۆرییەکی پڕ لاشەی بێگیانی بەجێماوی سوودانییەکانی نێو ئەو لمە داغەم دێتەوە بەرچاو. کە دەبووایە هەوارگەی گەشتیار و سەیرانکەران بوونایە. ساراش دیمەن و مێرگی جوانی هەیە بۆ گەشتوگوزار. لێ داخی گرانم بەرژەوەندخواز و گەندەڵچییەکان لە پێناو خۆشیی خۆیان،

ئەو خەڵکە بەستەزمانە وا دەربەدەر و ئاوارە دەکەن!

## (٢٠)

# ئەو شەوەی گوندەکەمان چۆلکرا

پشووی هاوین بوو، دەوری سەعات (١١) شەو، لەنکاورا، لە کۆلانە و تەواوی گوندی، بووە دەنگە دەنگ و هات و هاوارێک، کە پێشتر نەمانبیستبوو. دیار بوو بە پەشۆکاوی و شلەژاوی خەڵکەکە ئۆتۆمبیلەکانیان، کە زۆربەی پیکاب بوون، بەگەڕدەخست، گەورە و کچکە، بە مشەوەشی سواری دەبوون و بە دەنگی گەورە گەورە بانگی یەکتریان دەکرد. ئێمە کەسمان نەچووینە کۆلان، هەر بە سەرەتاتکێ، تەماشای ماڵەکانی ڕیزی خۆمان دەکرد. دەیقەتمان دایە، زۆربەی گەنج و پیاوەکان چەکبەدەست بوون. لە ماوەیەکی کورتدا، دەیان ئۆتۆمبیل بە دوای یەکدی کەوتن و بەرەو سرت بەڕێکەوتن، ماڵەکەمان وا هەڵکەتبوو، کە لەوە دیوی دۆڵەکەوە، ڕێگا سەرەکیی شارمان لێوە دیاربێ. ئۆتۆمبیلەکانیان بەتیژرەوی و بە هۆڕنلێدان لێدەخوڕی.

دوای، بڵێی (١٥) خولەکێک، گوند، بووە ئاشی ئاو لێبڕا، جگە لە بارە بارِی مەڕ و قارەقاری بزنان هیچی دیکەی نەدەهاتە بەر گوێ.

ئێمە، مەزەندەی ئەومان کرد کە لە تەرابلس کودەتا کرابێ، یان قەزافی شتێکی لێ بەسەرهاتبێ. بەڵام کە تەماشای تەلەڤزیۆنمان کرد، بەرنامەکانی ئاسایی بوون و پێنەدەچوو شتێکی وا ڕووی دابێ. بۆیە بیرمان بۆ ئەوە چووە، کە ڕەنگ بێ شەڕ و ناخۆشی لە نێوان قەزافییەکان و خێڵێک یان چەند خێڵێکی دی، لە شوێنێک، ڕوویدابێ!

بۆ بەیانی زوو، یەکێک لە دراوسێیە فەڵەستینییەکانم بینی، پێش ئەوەی من پرسیاری ئەو هات و هاوارەی شەوی ڕابردووی لێبکەم، ئەو پرسیاری کرد، دیار بوو، ئەوەیش هەمان لێکدانەوەی ئێمەی هەبوو و هیچ خەبەرێکی پێنەبوو.

دەوری سەعات (١١)ی پێش نیوەڕۆ، مێردمنداڵێکی دراوسێمان، کە ئەلەفی بۆ مەر و بزنەکانی خۆیان دەبرد، گوتی:"کەسمان لە ماڵ نییە، هەمووی ئەمشەو چوون بۆ تەڕابلوس، چونکە موعەممەر قاچی شکاوە، لە گەرماوی ماڵەوە خلیسکی بردووە و بەربۆتەوە.

لە ماوەی یەکدوو ڕۆژدا، وردە وردە ئاوەدانی کەوتەوە گوندی و خەڵکەکە هاتنەوە.
سێ حەفتە پاش ئەو ڕووداوە، لە هەواڵێکدا تەلەڤزیۆنی جەماهیرییە گوتی:
"موعەمەر قەزافی، لە کاتی وەرزشکردندا، بەیانی زوو، ئێسکی لولەقاچی چەپی درزێکی بچووکی بردووە. ئەو، دوێنێ شەو، تاوەکو دەمژمێری پێنجی بەیانی هەر خەریکی پێشوازیکردن بوو لە چەند مەلیک و سەرکردەیەکی وڵاتان. جا پێش ئەوەی نیشتەرگەریی بۆ قاچە شکاوەکەی بکرێت، لە دیدارێکی تەلەڤزیۆنیدا، ئەو بۆ خۆی هەڵوێستەکەی ڕوون کردەوە، نەکۆ ناحەزان ــ وەک گوتراویشە، پڕۆپاگەندەی ئەوە بڵاو بکەنەوە، کە هەوڵی تیرۆرکردنی قەزافی دراوە! ئەو مەلیک و سەرکردانە، بە بۆنەوی جەژنی مەولوودی نەبەوی، هاتبوونە لیبیا تا قەزافی پێشنوێژیان بۆبکا. بریار بوو، (٥٠)هەزار نوێژکەر کە لە (٣٠) وڵات هاتبوون، بەشداریی ئەو ڕێوڕەسمە بکەن، لە نێویاندا چەندان مەلیک و سەرۆک ئەفریقیایی هەبوون."
نزیکەی بۆ ماوەی مانگێک، قەزافی شەقەی لەبن هەنگڵ بوو کە لە بۆنەکاندا بەدیار دەکەوت.

## (٢١)

# مامی قەزافی چی پێگوتم؟

چونکە ڕەبەن بووم و خێزانم لەگەڵدا نەبوو ــ وەک پێشتر ئاماژەم پێدا، ساڵی یەکەمم لە لیبیا، لە هۆدەیەکی قوتابخانەکەمدا دەخەوتم. بۆ هەر قوتابخانەیەک کە لە گوند بێ، سێ چوار خانووش بۆ مامۆستاکانی دەرەوەی گوندەکە دروستکرا بوون، بەڵام لەم گوندەی من، هەمووی درابوون بە مامۆستاکانی خۆیان. جا قوتابخانەکەشم لاچەپ بوو، لەم بیابانە چۆلەدا، تاکە بینایە کە (٢٠٠) مەترێک لێم دوور بوو، دائیرەی دابەشکردنی (ئەلەف) بوو بەسەر ئەو جوتیارانەی کە ئاژەڵدار بوون. (کتومت چۆن ئێستا ئێمە بەشە خوراکمان لە عێراق هەیە ـ مەڕ وبزن و گا وگاجووت و وشترەکانی لیبیاش بەشە ئەلەفی مانگانەی خۆیان هەبوو کە نرخێکی ڕەمزی بۆ داندرابوو.).

ڕەنگ بێ ئەم زانیاریەشم، بۆ هێندێک خوێنەر نوێ بێ ـ لە نێو دانیشتوانی وڵاتەکانی عەرەبی باکووری ئەفریقیا ـ واتا مەغریب و جەزائیر و تونس و لیبیا و میسر، کەم کەس هەیە بەقەد خەڵکی وڵاتی (سوودان) ڕۆشنبیر و تێگەیشتوو و هۆشیار بێ. بۆ منیش ئەمە دیاردەیە جێگەی سەرسورمان بوو! زۆربەی خوێندەوار و ڕۆشنبیرەکانیان بە قەد کادیرێکی کۆمەنیستی لای خۆمان لە فەلسەفەکانی مارکس و لینین شارەزان، خۆ کە باسی ئایینش بکەی، هەر دەڵێی (حەسەن تورابی)ن، زەحمەتە لێیان ببەیتەوە. بەڵام بەداخەوە باری گوزەرانی و بژێوویان زۆر سەخت و خراپە.

(عوسمان سوودانی)، فەرمانبەرێکی ئەو دائیرەی ئەلەفە بوو. ئەویش هەر لە دائیرەکە دەخەوت. زۆر ماندوو بوو چونکە دوو منداڵی لە زانکۆی خەرطوم دەیانخوێند، دەبوایا خەرجییەکیان بۆ بنێرێتەوە. جا زۆربەی ڕۆژان من دەچوومە لای ئەو یان ئەو دەهاتە لای من لە قوتابخانە عەسرە چایەکمان پێکەوە دەخواردەوە.

ڕۆژێک، دەمەو عەسر، دوای دانیشتن و چاخواردنەوەیەکی یەک دوو سعاتی، کە خواحافیزیم لە (عوسمان سوودانی) کرد و گەیشتمە لای دەرگا ئاسنە دوودەرییەیکەی دائیرەکە، کە (٣٠) مەترێک لە عوسمان دوور بوو، بینیم پیرەمێردێکی لیبی تەمەن نزیک

(٧٥) سالآن، له پۆشاکی لیبی، له تەنیشت پیکابێکی تویتە ڕاوەستا بوو و (٥) فەردە ئەلەفیش لەسەر زەوی بوون. شوینەکە چۆل بوو کەسی لێ نەبوو. یەکسەر دوای چاکوخۆشی، داوای لیکردم کە لەگەڵیدا دەستێک بگەیێنمە ئەم فەردە ئەلەفانەوە باریان بکەین. بەدەم قسە کردنەوە کارەکەمان ئەنجامدا، کە دەستەکانی لیکخشاند و تەپووپۆزی لە جلکە پاک و خاوێنەکەی داتەکاند، ڕووی تێکردم و گوتی:" تۆ هی لای ئێمە نی! خەڵکی کوێیت؟" منیش یەکەسەر گوتم:" کوردم و خەڵکی کوردستانی عێراقم." من قسەکەم تەواو کرد و نەکرد، ئەم پیاوە ئیختیارە، وەک ئەوەی برا و ئامۆزام بێ، بە هێمنی گوتی:

ــ ئێوە، ئەو شەڕەتان لەسەر چییە؟ بۆ ئەو دوو تاقمە کۆردە واتێکبەربوون؟

ڕەنگم سپیی بوو، تۆپێکم لەخۆم زانی. ئاخر لەم بیابانە چۆل و هۆڵە، ئەم لادێیە لیبییە باس چی دەکات؟ مێیش گوتم:"باوەڕ بفەرموو، چونکە هەڵکەوتەی کوردستان وایە، دەستی ناحەز و وڵاتە ئیقلیمییەکان ڕۆڵییان لەم شەڕە نەگریسەی نیوان ئەم دوو حیزب و دوو سەرکردەیەدا هەیە." ئەمجارە چاوەکانی تیبڕیم و وەک بەهەند وەرنەگرتنی قسەکەم، گوتی:"بۆ چما سەرکردەی کورد بۆ (ئوممەی کوردی) خەبات دەکەن، یان پیاوی وڵاتانی ئیقلیمین و نەخشە وپلانی ئەوان جێبەجێ دەکەن؟ ئێمە لە قووتی خۆمان دەبڕین و بۆ ئێوەی دەنێرین، ئێوەش دەستتان ناوەتە بینە قاقای یەکتری" زمانم لاڵ بوو، قوڕگم گیرا.

پێش ئەوەی سواری پیکابەکەی بێت، گوتی:" بتگەیێنم، بۆ کوێ دەچی؟" من سوپاسم کرد و بە دەستی ئاماژەم بۆ قوتابخانەکەم کرد کە من لەوێ دەژیم ودووریش نییە. دیار بوو (عوسمان سوودانی) ئێمەی بینی بوو. بۆیە بانگی کردمەوە. کە چومەوە لای گوتی:" دەزانی ئەم مام ئیختیارە کێیە؟ ئەوە مامی قائیدیە (مەبەستی موعەمەر قەزافی بوو). منیش گوتم: مامی قائیدی، لەلای ئێمە دوو کاروان ئۆتۆمبیلی زرێپۆشی بەدواوەیە. (عوسمان) گوتی:" قائید دەڵێ، حەماڵی جۆرێکە لە کویلایەتی، هاووڵاتیی لیبی، مافی ئەوەی نییە کەس بکاتە حەماڵی خۆی. جا با برای قەزافیش بێ، دەبێ بۆخۆی کاری خۆی مەیسەر بکات."

## (٢٢)

# شـالاوی عیراقییـەکان بۆ لیبیـا

چوار ڕۆژ دوای داگیرکردنی کوێت، نەتەوە یەکگرتووەکان لە (٦)ی ئابی (١٩٩٠)، بڕیاری ژمارە (٦٦١)ی دەرکرد، بە سەپاندنی گەمارۆیەکی زۆر قورس و کوشندە بەسەر عیراق وەک گوشارێک، تا سەددام هێزەکانی لەو وڵاتە بکێشێتەوە.

بەڕاستی، سەرەڕای حوکمی دیکتاتۆریی بەعس، عیراق پێشکەوتنی باشی بە خۆوە بینیبوو لە بواری پەروەردە و تەندرووستی و ئاوەدانی و پڕۆژە و پێشکەوتنی تەکنەلۆژیی و خۆشگوزەرانیی خەڵک. بەڵام جێیمس بێکەری وەزیری دەرەوەی ئەمەریکی، قسەکەی خۆی هێنایە جێ، کە گوتی:"کارێک دەکەین، عیراق بگەڕێتەوە پێش سەردەمی شۆڕشی پیشەسازی".

گەمارۆی خنکێنەر، سەپێندرا بەسەر خۆراک و داودەرمان و هەناردەکردنی نەوت و هەموو بەرهەمێکی عیراقی بۆ دەرەوە. عیراق هەر بەندەری عەقەبەی ئوردنی بەدەستەوە مابوو. زۆربەی ئێستگەی وەبەرهێنانی وزەی کارەبا و بەندەر و پرد و ڕێگاوبانی وڵات خاپوور و وێران کران. برسییەتی و نەبوونی و نەخۆشی ـــ بە گوێرەی هێندێ سەرچاوە، نزیکەی ملیۆنێک و نیو عیراقی کردە قوربانی. تا بەرنامەی خۆراک بە نەوتی نەتەوە یەکگرتووەکان، لە لایەن ڕژێمی بەعسەوە قبوڵ کرا.

شاڵاوی کۆچکردنی عیراقییان بۆ دەرەوە دەستی پێکرد، ئەوجا ئەوان تەنها دەرگای ئوردنیان بۆ کرابۆوە، لە وڵاتانی جیهانیش تەنها لیبیا و یەمەن، بەبێ ڤیزە هاووڵاتی عیراقییان قبوڵ دەکرد. جا چونکێ یەمەن بۆ خۆی وڵاتیکی هەژار بوو، خەڵکەکە بە لێشاو ڕوویان لە لیبیا کرد.

سەرەتا هەر مامۆستای دواناوەندی ڕشتە زانستییەکان و زمانی ئینگلیزی و مامۆستای زانکۆ و پزیشک، لە لیبیا دادەمەزران، بەڵام دواتر، لە ڕشتە و پسپۆڕایەتیی دیکەش خەڵکیان وەردەگرت.

هیندەی پێنەچوو، سەفەرکردن بۆ لیبیا لە هەموو عیراق دەنگیدایەوە، وای لێهات، ئەو دوو پاسەی ڕۆژانە کۆچبەری عیراقییان لە ئوردن و میسرەوە دەهێنا، بوو بە (٦) پاس و (٧) پاس. تا وای لێهات، سەرت بەسەر هەر گۆشە و خانەقایەک دادەگرت، دەتبینی هاوولاتی عیراق لێیە و لە هەموو لایەک پەنگیان خواردووەتەوە.

خۆتان دەزانن، کە ڕژێمی بەعس، چەند بە سام و تۆقێنەر بوو لەسەرمان، جا کە ئەو عیراقییانە ڕوویان لە لیبیا کرد، بە دزییەوە پیاوانی ڕژێم و سیخوڕەکانی بەگەڵیان کەوتن و وای لێهات، لەوێش حەزەر لە خۆت بکەیت و بترسییت. چەندە حیزب و گرووپ و ڕێکخراو لەو عیراقە هەبوو، ئەوەندەش هەوادار و موریدانی ئەوان کەوتبوونە لیبیا. جا چونکێ سرووشتی پەروەردە و باری دەروونی عیراقییان، لەو شەڕوشۆڕ و برسییەتییە، تەواو ئاڵۆز شێواو بوو، ئەوە بە زەقی لە ڕەفتار و گوفتاریاندا ڕەنگی دابۆوە.

زوو زوو سەردانی ماڵی خۆشکم دەکرد لە تەرابلس. ئاشنایەتیم لەگەڵ چەند مامۆستایەکی کورد پەیدا کردبوو کە لە زانکۆی فاتیح ـ تەرابلس، دامەزرابوون. ڕۆژێک، لەو باڵەخانەی مامۆستایانی زانکۆ، کە تایبەت بوو بە غەیرە لیبییەکان و چەندان خێزانی فرە نەتەوەیی تێدا دەژیا، دوو خێزانی عیراقی، دەستیان نابووە بینەقاقای یەکتری و ژنەکانیشیان قژی یەکتریان دەڕنیەوە، ئەو حەشاماتە هاتبوونە سەیریان، ئەوان ئەو شەڕەچەقەکەیان لەسەر تاکە سەندڵێکی منداڵان بوو!

هەیان بوو، مامۆستای زانکۆ بوو، بەڵام پیاوی سەفارەتی عیراقی بوو. ئاشنایەتیم زۆر خۆش بوو لەگەڵ گەورە دەرهێنەر و ئەکتەری عیراقی ناسراو بەدر حەسوون فەرید. ئەو دڵی زۆر بەمن دەکرایەوە. ئەو بڕوانامەی ماستەری لە شانۆ، لە شیکاغۆ وەدەست هێنابوو، لە ساڵی (١٩٩٥) دەچێتە مەغریب و لە زانکۆی (الرباط) دادەمەزرێ. ڕۆژێک گوتی، "لە دەست بەعسییان لە عیراق هەڵاتم چوومە مەغریب، لەوێش هەر بەدواوەم بوون، ناچار ئەوێشم بەجێهێشت، ئێستا هاتوومەتە لیبیا، لێرەش وازم لێ ناهێنن. دەڵێن، دکتۆرێک هەیە ڕاپۆرتی لە هەموو عیراقییەکان داوە، جا لە تەنەکەی خۆڵ و خاشاک، کۆپییەک لە ڕاپۆرتەکانی کەوتووەتە دەست خەڵک، کە بە کاغەزی کاربۆن نووسراوە ـــ جاران ئەو کاغەزەیان دەخستە ژێر نووسراوێک، تا کاغەزەکەی ژێری، کۆپی دەرچێ ـــ ئەو زاتە ئەو

ڕاپۆرتەی لەسەر ژنەکەی خۆی نووسیوە. ئێستا لیرە ناویان لەو دکتۆرە ناوە، (دکتۆر عەباس کارپۆن)!

مامۆستا بەدر، دەیگوت،" لیرە زۆر دورەپەرێزم لە عێراقییەکان ـــ حسێبی تۆ جیاوازە، لە ژوورەکەم تەنیام، هەر کیسەڵەکەم لەگەڵە. شەو هەیە تا کاتی خەوتنان، هەر بەیەکەوە قسان دەکەین، لەو شەوانە شێتەڵکاریی بابەتێکی فکریمان بەیەکەوە دەکرد. ئەویش ڕاوبۆچوونی جوان جوانی هەبوو."

دکتۆر بەدر (٦٩ ساڵ)، کیسەڵێکی پەیدا کردبوو، وەک هاودەنگ و ئاوەدانی، لە ژوورەکەی خۆی خزمەتی دەکرد. ئەو دەیگوت:"خودا عومر بدا، دەمەوێ منیش شانۆنامەیەک یان چیرۆکێک لە نێوان و خۆم ئەو کیسەڵە بنووسم. وەک زۆر لە ئەدیبانی عەرەبی و جیهانیی شاکاریی جوانیان لەسەر گیاندارەکان هەیە: تۆفیق حەکیم، جیران خەلیل جبران، بەرناردشۆ، جۆرج ئۆرێوڵ، هەزاران حیکایەتی فۆلکلۆری و میللیش هەیە!"

لە سەردانێکمدا، مامۆستا بەدر، باسی ئەوەی بۆ گێڕامەوە، کە چۆن بە جددی مامۆستایەکی عێراقی کە لە زانکۆ لەگەڵیان بووە، حەزی کردووە ببێتە سواڵکەر.

ئەوەندە ساڵەی من لە لیبیا بووم، بە یاسا حەمباڵیکردن قەدەغەبوو، لە دیدی قەزافی، ئەوە شێوەیەکە لە بە کۆیلەکردنی مرۆڤ، کە بە بەخشینی نەختێ پارە، مرۆڤێک بار دەکەیت. لە لیبیا، نە پینەدۆز، نە بۆیاغچی پێلاو هەبوو، لە گرتەیەکی ڤیدیدا، قەزافی دەردەکەوێت، کە پێلاوەکانی خۆی بۆیاغ دەکات. بە هیچ شێوەیەکیش، سواڵکەر و سواڵکردن نەبوو. جارێکیان، لە بەردەم نەخۆشخانەیەک، قەزافی ژنێک دەبینێ سواڵ دەکات، لە ئۆتۆمبیلەکەی دادەبەزێ و هۆکاری ئەو سواڵکردنەی لێ دەپرسێ، لە کاتێکدا کە ئەو بیمەی کۆمەڵایەتی وەردەگرێ و خزمەتگوزاریی تەندرووستی و داودەرمانی بێبەرامبەرە. دەرکەوت، ژنەکە خەڵکی تونسە، ئەوجا، ئەو پێگوت:"دادە، ئێستا بێگانەیەک بتبینێ، دەڵێ، ژنەکانی لیبیا، لەبەردەم نەخۆشخانەکان دەرۆزە دەکەن، کێ دەزانێ کە تۆ لیبیی نیت، بۆ ئابڕومان دەبەیت؟"

جا کاتێک ئەو عێراقییانە بە لافاو ڕوویان لە لیبیا کرد، هەرچی ئیش هەبوو دەیان کرد، سەوزە و میوەفرۆشی، کرێکاری، چەرچییەتی و دەستگێڕی و سەرتاشی و فیتەری...تاد بەوەش نەوەستان هەبوو کەوتە سوالْکردن.

بەتایبەتی ژن و پیرێژنی عێراقی لە گەراجەکان، دەچوونە ناو پاسەکان و دەستیان دەکرد بە گریان و پاڕانەوە: دوو کوڕم شەهیدە، ماڵم سووتاوە، خانوونم ڕووخاوە، مێردەکەم یان منداڵەکەم نەخۆشە و زامدارە...تاد. جا خەڵکی لیبیی سگیان پێدەسووتان و سەدەقەی باشیان دەدانێ، لە هیچ پاسێک کەمتر لە (٤٠ ـ ٥٠) دیناریان کۆنەدەکردەوە.(١٠٠ دۆلار بە ١٥٠ دینارێک بوو). وای لێهات، گەراج نەبوو لەو لیبیایەی، سوالْکەری عێراقی لێ نەبێ. ڕۆژ بە ڕۆژیش ژمارەیان لە هەڵکشان دابوو و هەمیشە فەن و فنوونی نوێیان دادەهێنا تا زۆرترین پارە کۆکەنەوە، دیار بوو دەوڵەتیش ڕێگری لێنەدەکردن.

جا مامۆستا بەدر دەیگوت:" مامۆستایەکی هاوڕێیان بە جددی حەزی چووەتە ئەو پیشەیە و حسێبی کردووە، کە دەستکەوتی مانگانەی سوالْکەرێک، دە هێندەی مووچەی مامۆستایەکی زانکۆ دەبێ. بۆیە دەیەوێ بچێتە دوورە شارێک، لەوێ ببێتە سوالْکەر لە جیاتی مامۆستایەتی.

لە شاری سرت، چونکە هەر هوتێلی حکوومی گرانبەهای لێیە ــ تایبەتە بە میوانەکانی قەزافی و دەوڵەت، عێراقییە بێجێگەکان دەچوون، لە مزگەوتەکان دەخەوتن، دواتر، خەڵکی سرت، ئەوەیان قبوڵ نەبوو، بەڕێوەبەراتیی شارەوانیان ئاگادار کردەوە کە ئەوە عەیب و شوورەیە بۆ شکۆی شارەکەیان و دەبێ جێگەیەک بۆ ئەو کەسانە دابین بکەن.

پێشتر لیبییەکان لە میسری و سوودانی و مەغریبی و ئەفریقییەکان شارەزابوون و ئەزموونیان لە گەڵیاندا هەبوو، بەڵام عێراقییان قەت لە وڵاتی خۆیان نەدیبوو. بەداخەوە، عێراقییەکان ڕۆخسارێکی ناشیرینیان لە بیرەوەریی لیبییەکاندا بەجێهێشت. زۆر لەگەڵ یەکدی بەشەڕ دەهاتن و ڕاپۆرتیان لە یەکتری دەدا و بۆ خۆ ڕەپێشکردن، بڕوانامەی ساختەیان لە یەکتری ئاشکرا دەکرد و دەردەکران. هەر چی نەشیاو بوو بەرامبەر هاوخوێنەکانی خۆیان دەیان کرد. جارێک لە پەیمانگەیەک لە سرت، دوو مامۆستای عێراقی بەشەڕدێن، بەڕێوەبەرەکە، لە جیاتی ناوبژیوانی و ئاشتکردنەوەیان، پێیان دەڵێ:"تکایە، بڕۆنە دەرەوە تێک هەڵدەن!". شەوێک خێزانێکی عێراقی کە بەدیار

کەناڵەکانی سەتەلایت دانیشوون، لەنکاوڕا دەبینن، هیچ کەناڵێک نامینێ و پیاوە دەڵێ:" ئافرەت، پێدەچێ کارەبای هەموو دونیا کوژابێتەوە!" بۆ بەیانی دەبینێ، درواسێیە عێراقییەکەی سینی و ئەلەمپی سەتەلایتەکەی لەسەر بانی لێ دزیووە! بێگومان هەموو عێراقییەکان وانەبوون، کەسانی زۆر قورس و گران و ڕێزداریشیان تێدا بوو.

## (٢٣)

# سەردانی ڕێزدار مەسعوود بارزانی بۆ سرت

تا هەشتایەکانی سەدەی ڕابردوو، دانیشتووانی شاری (سرت) دەبووایا بۆ وێنە گرتنێک، بچنە شاری (موسراتە) کە (١٥٠) کم دوورە و سێیەمی شاری لیبیایە. موعەمەر قەزافی ئەم شارەدێیەی کرد پایتەختی دووەمی لیبیا. هۆتیل (وەفا) کە ڕاستەوخۆ بە فرۆکەخانەی (سرت)ەوە بەسترابۆوە، هەر (٢٠٠) مەترێک لە گەورەترین هۆڵی کۆنفراسەکان دوور بوو، کە بە تازەترین و سەردەمییانەترین تەلاری کۆبوونەوە لە هەموو باکووری ئەفریقیا دادەنرا. (ئەیمەن فەڵەستینی) کە هەڵگری بڕوانامەی بەکەلۆریوس بوو لە باغچەوانی، لەم هۆتیلە باغچەوان بوو، دراوسێمان بوو، شەوانە بۆ شەترنجکردن بەیەکەوە کاتمان بەسەردەبرد، هەرچەند بردنەوە لەو کوڕە فەڵەستینییە زۆر زەحمەت بوو چونکە ئەو لەسەر ئاستی لیبیا شەترنجزانێکی بەرچاو بوو. شەوێک گوتی:"وا مەزندە دەکەم بەم زووانە ئابلووقە ئابوورییە قورسەکەی سەر لیبیا هەڵبگیرێت. چونکە سەرۆکێکی زۆر گەورە بە دزییەوە دێتە هۆتێلەکەمان لە سرت، ( مەبەستی هوتێل وەفا بوو کە تایبەت بوو بە سەرکردە و پیاوە مەزنەکان). گوتم:"چووزانی؟"گوتی "وا کۆمپانیایەکی ئیتاڵی ڕۆژانە بە فرۆکە کەلەپەلی تازە بۆ ئەم هوتێلە دەهێنێ و دەبێ لە ماوەی چوار ڕۆژدا سەرلەبەری کەلەپەلەکانی ئەم هوتێلە نۆژەن بکرێنەوە و گرێبەستەکەشی بە بڕی (٩١) ملیون دولارە، کارەکەش دوور لە چاوی میدیا، کۆمپانیایەکی ئیتاڵی ئەنجامی دەدات."

دایکی عەلی (ئەو کوڕەی کە پاسەوانی قەزافی بوو) دوای کۆچی مێردەکەی، کۆزێک منداڵی ورتکوپرتکی بەسەردا بەجێما بوو، بۆیە هەفتانە دوو سێ جار لەگەڵ شتومەکی خۆمان، بازاڕیم بۆ ئەوانیش دەکرد. وەک گوتم، گوندەکەمان (١٣) کم لە شاری سرت دوور بوو. هەر (٥) ڕۆژ دوای قسەکانی (ئەیمەن فەڵەستینی)، تازە لە بازار گەڕابوومەوە، کە لە دەرگای ماڵی (عەلی)مدا تا شتومەکی بازاڕیان پێبدەم، عەلی دەرگای کردەوە، دوای چاک وچونی و بەخێر هاتنەوەکردنی، گوتی:"خەبەرێکی خۆشم پێیە بۆت، بەڵام جارێ ناتوانم پێت بڵێم."من هەر لە بیری خانوو پەیدا کردن دابووم، چونکە خاوەن خانووەکەم،

کە ئەویش پاسەوانی قەزافی بوو، داوای کرد بوو خانووەکەی بۆ چۆل بکەم . سەیر بوو کە شەویش لەگەڵ (ئەیمەن فەڵەستینی) شەترنجمان دەکرد، گوتی:"مامۆستا فازیل، هیچ میوانتان نەهاتووە لە دەرەوە؟" منیش بە نەرێ وەڵامم دایەوە. ئەو هیچی تری نەگوت. دوای سێ ڕۆژان (ئەیمەن فەڵەستینی) گوتی:" ئیمڕۆ دوو مامۆستای کورد بە چەپکە گوڵەوە هاتبوونە هۆتیل وەفا، دەیانەویست زەعیم مەسـعوود بارزانی ببینن، بەڵام پێیان گوتن کە هیچ میوانێک بەو ناوە لێرە نییە و بە دڵساردی گەڕانەوە." (ئەیمەن فەڵەستینی و عەلی) هەردووکیان گوتیان:"بۆ یەک شەو سەرۆک مەسعود بارزانی لە هوتێل وەفا مایەوە. نەمان توانی پێت بڵێین، چونکە سەردانەکە دوور لە چاوی میدیا بوو. ئێستاش باسی دەکەین چونکە گەڕاوەتەوە." پرسیم:"ئێوە کاک مەسعوود دەناسن؟"هەر دووکیان گوتیان بە چاوی خۆمان ئەومان بینی و وەسفکردنەکەشیان زۆر لە ڕاستی نزیک بوو.

دوای چەند ڕۆژێک. مامۆستا (عەلی زاخۆیم) بینی کە مامۆستای ڕشتەی کیمیا بوو لە یەکێک لە قوتابخانە ئامادەییەکانی سرت و هەوادار و موریدێکی دڵسۆزغی بارزانی بوو و پارتییەکی تۆغ بوو. کە ئەم باسەم بۆ گێڕایەوە، گوتی :"من یەکێک بوو لەم دوو مامۆستایە کە چووین بۆ پێشوازی کاک مەسعوود. بەڵام ئێمە درەنگ زانیمان و ئەو گەڕابۆوە کوردستان."

من بە چاوی خۆم کاک مەسعوودم نەبینی، بەڵام ئەم سێ ناسیاوە، ئەم باسەیان وا گێڕایەوە وەک باسم کرد. ئەمە دووساڵ دوای ڕێککەوتنامەی دوبلن بوو کە پارتی و یەکێتی بڕیاری ڕاگرتنی شەڕی ناوخۆیان واژوو کردبوو.

گەڕانەوەی (عەلیو پاسەوانی قەزافی) بۆ گوندەکەمان، بەڵگە بوو کە موعەممەر قەزافییش لە هەمان ڕۆژدا لە شاری (سرت) بووە، چونکە ئەم کوڕە پاسەوانی خودی قەزافی بوو ــ پشتریش باوکی، کە لە ڕووداوێکی هاتووچۆ گیانی سپاردبوو، هەر پاسەوانی قەزافی بوو.

بەڵام ئەم تەدارەکە گەورەییە وگۆڕینی هەموو کەلەپەلی هۆتیل وەفا بە (٩١) ملیۆن دۆلار، چ سرڕێک بوو؟ دواتر ئەویش ئاشکرابوو.

لەوەتەی (١٩٦٩) وەکە قەزافی هاتە سەر حوکم، پەیوەندیی نێوان مەلیک وپاشایەکانی وڵاتی سعوودیە و کەنداو لەگەڵ موعەممەر قەزافی نەوت و ئاگر بوو. قەزافی هەمیشە هێرشی دەکردە سەریان و دەیگوت: ئەوان داگیرکەریان هێناوەتە سەر خاکی عەرەب و

موسڵمانان. دووەمیش: ئەوان خۆیان کردووەتە وەرەسەی (پێغەمبەر)، کە وانییە و کەس ئەو حەقەی بەوان نەداوە. جگە لەوەی کە قەزافی ئەوانی بە گەندەڵ و نەووتمژ و خوێنمژی کەنداو دەزانی. جا لەم سەین و بەینەدا، بۆ یەکەمینجار وەزیری دەرەوەی سعوودیە بە دزییەوە، دوای سەردانەکەی کاک مەسعوود، هاتبووە هەمان هۆتێل. هۆکاریی گۆڕینی کەلوپەلەکانیش لەسەر داخوازیی ئەم وەزیرە بووە، دوای ئەوەی کە پێشتر یاوەرەکانی ئەو وەزیرە، هاتبوون بۆ بینین و پشکنینی شوێنی حەوانەوەی بە گوێرەی پرۆتۆکۆلی سەردانی گەورەکان.

ئەو سەردانەی ڕێزدار مەسعود بارازنی لە ڕۆژی (١٨)ی تشرینی دووەمی (٢٠٠٠) بوو.

# (٢٤)

# بازەکەی سەر سەری قەزافی

ماڵەکەمان هەر چەند کیلۆمەترێک لە قەبری دایکی موعەمەر قەزافی دوور بوو. هەموو دانیشتووانی ئەم گوندە لە بنەماڵەی خێڵی قەزافی بوون. ئەوان زۆر تیرەن. قەزافی لە تیرەی (غەزالە)یە و زۆربەی زۆری ئەم گوندە لەو تیرە بوون. دەرگای ماڵەکەمان هەر یەک مەتر لە دەرگای ماڵی (عەلی قەزافی دوور بوو). عەلی تەمەنی (٢٠) ساڵان بوو. دە دوانزدە خوشک وبرای هەتیوی بەسەردا بەجێما بوو، وەک پێشتر گوتم، باوکی، کە شۆفێری قەزافی بوو، لە ڕووداوێکی هاتووچۆ گیانی لە دەست دابوو. (عەلی) پۆلی (١٢)ی ئامادەیی تەواو نەکرد و بوو بە یەکێک لە پاسەوانەکانی قەزافی، کە زۆر جەرگسۆزانە هەمیشە لەگەڵ ئەم سەرکردە دابوو. ئەو هەر بە پشوو دەگەڕایەوە گوندی.

جارێک سەرنجمدا چوار پێنج ڕۆژە عەلی گەڕاوەتەوە ماڵەوە و هەمووشیان زۆر نیگەران و عێدز دیار بوون. هەر چۆنێک بوو، لەگەڵ عەلی کورتە پیاسەیەکم کردوو. لە هۆکاری ئەو ڕەوشە نائاساییەی ماڵی ئەوانم پرسی. عەلی زۆر ڕێزی منی دەگرت، زۆر نهێنیی ژیانی قەزافی بۆ باسکردووم. عەلی بەم شێوەیە قسەی بۆ کردم و گوتی:

"من لە پاسەوانی سەرۆک قەزافی دەرکراوم و دوورخراومەتەوە و سزادراوم. هۆکارەکەشی (باز)ێکی ناپەسند بوو."

ساڵانە قەزافی چەند جارێک دەچێتە بیبانی گەورەی لیبیا بۆ گەشتوگوزار لەوێ خێوەتگەی خۆی هەیە. ــ ڕەنگ بێ ئەم زانیارییە نوێ بێت بۆ تۆ، بیابان دیمەنی زۆر جوان و خۆش و دڵگیری هەیە بۆ گەشتوگوزار. عەلی گوتی:"بەیانییەکی زوو کە منیش یەکێک بووم لە پاسەوانەکانی قەزافی لە بیاباندا. بازێک بە ئاسمانەوە بەسەر خێوەتەکەی قەزافی تێپەڕی. منیش کەوتمە تەقە کردن. زۆرم تەقەم کرد و بەڵام نەمتوانی بازەکە بپێکم و بیکوژم. بۆیە من ئێستا سزادراوم و دوورخرایمەوە و مووچەم بڕاوە."

پرسیم: جا چی تێیایە. با باز و هەڵۆ و تەیروتوار بە ئاسماندا بسوڕێنەوە؟ بۆ دەبێ بیانکوژن؟

عەلی گوتی:" ئێمە زانیاریمان هەیە کە لە ئاسمانی لیبیا، ژمارەیەک باز و هەڵۆ بەڕەڵاکراون و کامیرای چاودێرییان پێوە بەستراوە. بۆیە هەر باز و هەڵۆیەک لە خێوەت و سەیارەی سەرۆک قەزافی نزیک بێتەوە دەبێ یەکسەر بکوژرێت. جا چونکە نەمانتوانی ئەو بازە بکوژین..من و (٢٢) پاسەوانی تر وا سزادراوین!
ئەم ڕووداوە، گەر بیرکۆڵ نەبم، لە ساڵی (١٩٩٨) بوو.

## (٢٥)

## ئەو ڕۆژەی (ئـاپـۆ) ڕفێندرا، قەزافی چیکرد؟

هەواڵ و دەنگوباسەکانی ڕادیۆی (BBC) و دەنگی ئەمریکا و مۆنتیکارلۆ، تەواوی باسی و خواسی کوردستانیان پێنەبوو، بۆیە وایەرێکی درێژم لە ئەنتێنەی ڕادیۆکەمەوە و بە ئەنتێنەی تەلەفزیۆن لەسەر سەربانی ماڵەوە بەستبوو. ڕادیۆکەشم جۆری ڕووسیی(٦) پاتریی بوو، شەوانە بە باشی پەخشی ئیستگەیەکی ڕادیۆی کوردستانی وەردەگرت. دەمە و عەسری ڕۆژی (١٥)ی شوباتی (١٩٩٩) لەسەر بان خەریکی چاککردنی ئەو ئەنتێنە بووم، مامۆستا تەحسین هاتە ماڵمان، کە منی بینی لە خوارەوە بانگی کردم و گوتی:" مامۆستا فازیل، وەرە خوارەوە، دەنگوباس لە لای منە!"

کە هاتمە خوارەوە و چاکوچونیمان کرد، گوتی :"بەداخەوە، گرتیان!" من تووشی شۆک بووم، بە وردی موتابەعەی ڕاودونانەکەی بەڕێز ئاپۆم دەکرد، لە سوریاوە بۆ ڕووسیا و ئیتاڵیا و دواتر یونان و لەویش دەنگی نەما..... دوودڵبووم لە خەبەرەکەی مامۆستا تەحسین، لە دڵی خۆمدا گوتم :"ان شالله، وەکو خەبەرەکەی (مام جەلال)ە." ئەمەش حیکایەتێکە، زۆر بە کورتی: کە لە (١٩٧٥) لە شاری ڕومادی بووم، بەیانییەک مامۆستایەکی قەومەچیی بەعسی هاتە قوتابخانەوە، بە دەنگێکی بەرز گوتی، تازە بی بی سی خەبەری کوشتنی مام جەلالی پەخشکرد... ."

هەواڵەکان، خەبەری ڕفاندنی ئاپۆیان پشتڕاستکردەوە و بۆ بە بابەتی سەعات. یەکەم پەرچەکرداری قەزافی لە دەنگوباسی سەرەکی، سەعات (٨) شەو، دەنگی دایەوە. کاتێک زۆر بە پەشۆکاوی و تۆڕەییەوە بە توندی ئیدانەی ئەم گەلەکۆمەی کردوو، بە زمانێکی ڕەق و هەق، هەموو دەسەڵاتدارانی تورکیای شووشتەوە و ئەمە دەقی قسەکانی بوو :" ناکرێ بەم شێوەیە لەگەڵ سەرکردەی ئوممەتێک ڕەفتار بکرێت، ئەگەر نەیاریشت بێ. ئەوەی کرا، قەرسەنە و چەتەیی و نامەردیی بوو، چونکە دیار بوو کە عبدوڵلا ئۆجەلان بێهۆشکراوە و نمایش کردنی ئەو زاتە بەم شێوەیە لە تەلەڤزیۆن بۆ ڕووخانی ورە و ئیرادەی نەتەوەی کوردە، نەک زەلیل کردنی خودی ئاپۆ. داوا لە نەتەوە یەکگرتووەکان و

کۆمکاری عەرەبی و ڕابیتەی ئیسلامی و هەموو ڕێکخراوە جیهانییەکان دەکەم، کە دەبێ زوو هەڵویست وەرگرن و ئەم پیاوە ئازاد بکەن. داوا لە کوردەکان دەکەم لە هەموو جیهان بڕژێنە سەرشەقامەکان و ئەم ستەمە قبوڵ نەکەن."

بۆ بەیانیش ڕۆژنامەی (الزحف الاخضر) کە زمانحاڵی جەماهیرییە بوو، مانشێتە سەرەکییەکەی نووسرابوو(ئوممەی کوردی بەم زووانە سەربەخۆی خۆی وەدەستدێنێ). جا وتارەکەی قەزافی لە هەموو سەرە سەعاتێک پەخش دەکرایەوە.

هەر بۆ بەرزکردنەوەی ڕۆحی نەتەوەیی کوردان و شکاندنی پۆزیی تورکەکان، دوای سێ ڕۆژان لە تەلەڤزیۆن، قەزافی پێشوازی لە سێ نوێنەری کوردی ـ باکووری کوردستان ـ کرد، کە جلکی کوردیان پۆشی بوو، یەکێکیان وەکو هەڵگرتنی مەلۆتکەی ساوا، ئاڵایەکی قەدکراوی کوردستانی لەسەر دەستی دانابوو، قەزافی ئاڵایەکەی لێ وەرگرت و ماچی کرد و بە هەر دوو دەستی کردیە و بەرزی کردەوە و گوتی:" ئەمە ئاڵای دەوڵەتی ئوممەی کوردییە." بۆ سبەینێ ئەمە بووە مانشێتی لاپەڕەی سەرەکی هەموو ڕۆژنامەکانی لیبیا.

هەروەها گوتی: "دەستگیرکردنی عەبدوڵلا ئۆجەلان کردەوەیەکی ترسنۆکانە و غرووورانە بوو. بە پاڵپشتی و هاوکاریی ئەمریکا جێبەجێ کرا. ئەی کوردینە، دەبێ بەردەوام بن لە خەبات و تێکۆشانتان، تا وەدیهێنێ سەربەخۆی خۆتان. تا دوژمنتان پتر خوێنتان بڕێژن، پتر بەنزین بە مەشخەڵی شۆڕش کوردستانییان دادەکا.

من دەمەوێ بە برا تورکەکانم بڵێم: خۆتان هەڵمەخەڵەتێنن و دڵخۆش مەبن، ئەگەر شتی وا بکەن، ئەوە بەڵگەیە کە ئێوە هیچ لە مێژووی و نیشیتمانی خۆتان نازانن. ئێوە بە سەرکەوتنێکی پووچ و فیلاوی شانازی دەکەن، چونکە ئەستەنبوڵ پێش ئێوە، کەوتە جۆش و خرۆش کە (غومة وعبدالجليل ويحيى السويدى)[2] سەربڕی و کەلـلەسەری ئەوانی، بە دیاری برد بۆ ئەستەنبۆڵ و هاوارتان کرد چەتە و یاخیبوو و

---

[2]) لە سەدەی حەڤدەمدا لیبییەکان چەندان شۆڕش و ڕاپەڕینیان دژی داگیرکەری تورک کرد. بۆیە تورکەکان ئەو سێ شۆڕشگێرەیان گرت و سەربڕی لە سێ کاتی جیاوازدا و کەلـلەسەرەکانیان بردە ئەستەنبوڵ. ئەوانیش :(يحى السويدي و عبدالجليل بن غيث سيف النصر و غومة بن خليفة المحودي) بوون.

سەربەخۆخوازەکانتان لەناو برد و هەتا هەتایە لیبیا هیِ خۆتانە، ئیستا مێژوو گاڵتە بە ئەقڵی ئێوە دەکات. ئەو دەوڵەتانەی دەستیشیان لەو گەلەمکۆمەیەدا هەبووە، دەوڵەتی بێئەخلاق و سووک و چرووک و ترسنۆکن."

بەردەوام قەزافی بە توندترین شێوە بەرگریی لە نەتەوەی کورد دەکرد، لە وتارێکی بۆ باراک ئۆباما دەڵێ:"ئێمە لەو باوەڕە دابووین کە تۆ(واتا بارەک ئۆباما) بێیت لە پێناو سەربەخۆی و یەکێتیی ئوممەی کوردی کار بکەی. دەبێ ئەم ئوممەتە لە ڕۆژهەڵاتی ناوەندا، لە ژێر خۆر، جێگەی خۆی هەبێت. ئەم ئوممەیە پارچە پارچە کراوە و چەوسێنراوتەوە و زوڵمی لێکراوە، کراوە بە موستعمەرە. تۆ دەبوایا ببیتە پشت و پەنای ئەوان، نەک ببیتە لایەنگرانی نۆکەرەکان و چارەنووسی نەتەوەی کورد بکەیتە قوربانی. ئێستا کاتی گۆڕانە."

## (٢٦)

# بارەگای (یان سەفارەتی) (PKK)، لە تەرابلسی پایتەختی لیبیا

باوەڕناکەم لە نەوەتەکانی سەدەی ڕابردوو، کوردێکی باشوور هەبێ گەیشتبێتە شاری(تەرابلووس) و سەردانی ماڵی (د. عەبدولمەجید ڕەشید ئەحمەد)ی نەکردبێ، چونکە ماڵەکەی ئەو ببووە دیوخانی هەموو کوردان. ئەو زاتە کوردپەروەر و ڕۆشنبیر و خانەدانە، کە بە ڕەچەڵەک خەڵکی گوندی بیبانی پارێزگای کەرکووک بوو، هەڵگری بڕوانامەی دکتۆرا بوو لە (ئەدەبی بەراوردکار) کە لە یەکێک لە زانکۆکانی ئەمریکا بە پلەی بەرز وەدەستی هێنا بوو. بە هیوا و خەونێکی زۆرەوە دوای ڕاپەڕین دەگەڕێتەوە کوردستان، بەڵام زۆر بە دڵشکاوی و نائومێدییەوە هەولێر جێدەهێڵێت و قەدەر دەیگەیێنێتە پایتەخی لیبیا، ئەو لەوە زۆر دڵی شکابوو، کە نە چەکدار و نە ئەندامی پارتیی دیموکراتی کوردستان بوو، کەچی ماڵەکەیان تاڵانکرد و دەرمانخانەی هاوسەرەکەیان فەرهوود کرد، کە کەوتبووە بەرانبەر کۆڕەپانی کۆترەی سەلام لە هەولێر. ماڵی ئەم پیاوە دڵ گەورەیە هەمیشە، وەک کورد دەڵێ کوانووی پڕ لە پشکۆ و ئاگر بوو لە تەرابلووس. دەستەیەک میوان دەهات و دەستەیەک دەڕۆیشت. خۆشبەختانەش بارو گوزەرانیشیان باش بوو، بە دەست و دڵ دەوڵەمەند بوو. نەناسیاوەکانی گەرم و گوڕتر لە دۆست و ئەحباب بەخێر هاتن و پێشوازی دەکرد.

با بۆ بەرچاوڕوونی خوێنەر، ئەم دوو دێڕە بنووسم: ڕاپەڕین دوای ڕۆژگارێکی زۆر سەخت و گران و بەسۆ بەرپا بوو، هەبوو لەبرسان منداڵی خۆی دەفرۆشت ـ وەک لە کەرکووک ڕوویدا ـ بۆیە شەڕی ناوخۆی کوردستانی باشوور، دوای یەکەم هەڵبژاردنی پەرلەمان، هەموو خەون و ئومێد کوردی نەک ئەنفال کرد، بەڵکو بە سەدان دکتۆر و مامۆستای زانکۆ و فەرمانبەر و کاسبکاری ئاوارەی شار و وڵاتان کرد. ئەو کات تەنها جەماهیرییەی لیبیا بەبێ ڤیزە هاووڵاتی عێراقی وەردەگرت. جا بەناشکوری ناڵێم. دکتۆری زانکۆ کە دەگەیشتە ئێرە، خەرجی هوتێل وخواردن و هاتووچۆی بەزەحمەت بۆمەیسەر دەبوو. دیوەخانی دکتۆر مەجید وا ناوی دەرکردبوو، دۆزینەوەی زەحمەت نەبوو

ئەگەرچی ئەو کات مۆبایل و ئینتەرنێت نەبوو. ئەم پیاوە جگە لە پێشکەشکردنی نان وجێگە بە میوانەکانی دەبوایا دەستیشیان بگرێ بۆ فەرمانگە و زانکۆ و دامودەزگاکان بە مەبەستی کاردۆزینەوە بۆ ئەو کوردە پەرتەوازبووانە.

پاشنیوەڕۆیەک، لە دیوەخانە جەمەلۆنەکەی دکتۆر عەبدولمەجید دا، لەگەڵ چەند میوانێکی دیکەی ناسیاو و نەناسیاو، نەختێ باسی ئەدەب و زمانی کوردیمان کرد، لە میانەی گفتوگۆکانماندا نیگەرانیی خۆمان لە بێ بەشبوون لە کتێب و بڵاوکراوەی کوردی نیشاندا، من بەش بەحاڵی خۆم هەر (٦) کتێبی ئەم ئەدیبانەم لەگەڵ خۆم هێنابوو کە زۆر بە ڕۆحم ئاشنان. کاتێک ماڵاویم کرد و چوومە دەرەوە، یەکێک لە میوانەکان، کە بە (شاهۆ) خۆی پێناساندم، خۆشحاڵیی خۆی نیشاندا، کە ئەو دەتوانێ زۆر کتێبی کوردیم پێشکەش بکات. بە کوری وکرمانجی گوتی ئێمە لە بارەگای (PKK) هەموو ئەو شتانەمان هەیە کە تۆ حەز بە خوێندنەوەی دەکەی. بەڕاستی بۆمن خەبەرێکی خۆش بوو، نەشمزانی بۆ لە مەجلیسەکە ئەم قسەیەی نەکرد! زانیاریمان گۆڕییەوە و گفتی سەردانی بارەگاکەم پێدا.

لە (تەرابلووس) سەردانی قونسلخانە یان سەفارەتی(تورکیا وعێراق و ئێران و سوریا)م کردبوو، بەدەر لە سۆز و دەمارگیریی نەتەوەیی، هیچیان بە قەد بارەگای (PKK) لەم شارە خۆش و دڵگیر و بە نیزام و ڕێکوپێک وبە بەرنامە نەبوون. خۆ ئەگەر لەگەڵ بارەگا و مەڵبەند و ناوچە و مەکۆییەکانی کوردستانی باشوور بەراوردیان پێ بکەین، ئەوانی خۆمانم وەک دیوەخانی ئاغایەک دێنەبەرچاو، کە دەمێکە کۆچی کردووە و کوڕەکانیشی گیرفان بەتاڵن و لە چای تاڵ و قسەی ساردی ڕۆژانە بەولاوە هیچی تریان تێدا چەنگ ناکەوێ، لە خەمی دیوەخانی باوکیان دانین، ناشزانن ڕۆژانە کێ دێ و کێ دەڕوا!

لە سەربانی تەلاری بارەگایەکە، ئاڵای کوردستان و ئاڵای(PKK) لە تەنیشت ئاڵای سەوزی لیبیا دەشەکایەوە، هەر کە پێشت دەنایە ناو دەرگا، ئەوا بە خەندە و بەخێرهاتن پێشوازیت لێدەکرا، لە نووسینگەیەکی قشتیلەی پاک و خاوێن، چەند زانیارییەکیان لای خۆیان تۆمار دەکرد. بۆ مێژوو، هەرگیز بە کەسیان نەدەگوت بیروباوەڕت چییە و لایەنگرێ یان ئەندامی چ حیزبێکی، مەگەر کەسەکە بۆخۆی حەزی کردبێ ناسنامەی حیزبی خۆی ئاشکرا بکات. ئەوەی کە ویستی ئەوان بوو، ئەوە بوو زۆرترین کورد سەردانیان بکەن.

لە ناو تەلارەکە هۆڵێکی ڕێکوپێکی دانیشتن هەبوو، چوار پێنج ژووریش، دیار بوو نووسینگەی خۆیان بوو، ژوورەکان پڕ کەرەستەبوون وەک ئامێری چاپکردن و کۆپیکردن و فاکس و تەلەفۆن، دارودیوارش هەمووی وێنە و پۆستەر و ئاڵا و لۆگۆی ئاپۆ وچالاکییەکانی خۆیان بوو. ئەوا جگە لە دەیان نامیلکە وبلاوکراوە و لفلیت بە چەندین زمانی جیاواز. ئەوەی کە جێگەی سەرنج بووو چەند ژوورێکیان بە چەندین تەخت و نوینەوە ئامادە بوو بۆ ئەو میوانانەی کە جێگەیان نییە و حەزدەکەن لەوێ بمێننەوە. لە هەمووشیان بۆ من گرنگتر ئەو کتێبخانە ژیکەلە بوو کە سەدان کتێبی بایەخداری تێدا بوو. لە چێشتخانەکەیاندا، هەموو کەرەستە و پێویستییەکانی نانخواردن و چێشت ئامادەکردن هەبوو. بەڵام دەبوایا میوانەکان خۆیان خزمەتی خۆیان بکەن. تەنانەت لەناو سەلاجەکەیان هەنگوین و گوێز و ماست وپەنیریش هەبوو.

زۆر سەیر بوو، هەر کوردێک بچووبایە ئەم بارەگایە وا هەست دەکرد ڕۆحی لە کوردستانە و لە باوەشی کەسانێکە کە بە دڵ خۆشیان دەوێ.

دیوە میدیایەکانی وڵاتە زلهێزەکان، بە چەواشەکاری کە باسی ئابلوقەی سەر لیبیایان دەکرد، هەر باسی قەدەغەکردنی فڕینی فڕۆکەکەنیان دەکرد، وەلێ ڕاستییەکەی وانەبوو. بڕیارەکانی(UN) ئەم وڵاتەیان تەواو خنکاندبوو، بۆ شووشە دەرمانێک دەبوایا بنێریتە میسر و بۆ قەترەیەکی چاوان بچیتە تونس. لە هەمووشیان قورستر، بەرتەسککردنەوەی پەیوندییەکان بۆ لەگەڵ دەرەوە. هەر بۆنموونە، بەندە لە شاری (سرت)ە وە (٤٧٤) کم دەبڕی تا دەگەیشتە پۆستەخانەی ناوەندی تەرابلووس، لەوێ دە دوانزدە کشکی تەلەفۆن هەبوو، جار هەبوو (٤٠) کەس سرەیان بۆ (٣) دەقیقە قسەکردن گرتبوو، جا دوای چاوەڕوانکردنی چوار پێنج سەعاتی (٣) جاران لە بەدالەکە ژمارەکەی تۆیان لێدەدا، گەر وەرنەگیرا بووایا دەبوایا ڕۆژێکی تر بچیتەوە، دووریش نەبوو هەمان فلیم دووبارە و سێ بارە ببیتەوە. ئەوە جگە لەوەی گەر نسیبی تەلەفۆنکردنەکەت هەڵسابووایا، ئەوا (١٥) (٢٠) دولارێکیان لێ دەستاندی بۆ (٣) دەقیقە قسە کردن.

لەهۆڵی دانیشتن، لە بارەگای (PKK)ە لە تەرابلووس، تەلەفۆنێکی خەتکراوە بۆ هەموو جیهان داندرابوو، وەک لە ماڵی خۆت بێ، دەتوانی پەیوەندی بکەی بۆ هەر شوێنێک کە مەبەستت بێ و کاتەکەش کراوە بوو، چای و قاوەشت لەبەردەم بوو، گەر شەویش

مابایتەوە تەخت و نوێنی پاک و ژووری پۆشتە و پەرداغ بۆ نزیکەی (٢٠) کەس ئامادەکرابوو، خواردن و خواردنەوەش، خۆت خانەخۆێ بووی، بەڵام دەبوایا خۆت خزمەتی خۆت بکەی. هەبوو چەند شەو لەوێ دەمایەوە.

کارگێڕانی ئەم بارەگەیە دەلیلی کەسی نەشارەزا بوون و ئامادە بوون ببنە یاوەرت بۆ بازاڕ و نەخۆشخانە و بانک و نۆڕینگە، بەڵام بەهیچ شێوەیەک پەیوەندییان بە کاروباری حکوومەتەوە نەبوو، وەک دامەزراندن و گواستنەوە و ...تاد.

دەبێ ئەمەش بڵێم هەموو ئەو خزمەتگوزارییانە بێ بەرانبەر بوو، تەنانەت تەلەفۆنکردنەکەش، بەڵام سندووقی کۆمەکیان دانابوو، ئەلهەقی، کوردانی باشوور، بە گوێرەی دەست و گیرفانیان، شتێکیان لەم سندووقە دەکرد کە ئەویان بەجێدەهێشت.

لەسەرتا، کوردەکانی باشوور، نەختێک بەترسەوە سەردانی بارەگایی(PKK)یان دەکرد، هەبوو لەوە دەترسا وابزانن بیروباوەڕی خۆی گۆڕییوە و بۆوەتە پەکەکە، هەشبوو لەوە دەترسا لە کاتی ڤیزە وەرگرتن، تورکەکان لە قونسڵخانەدا ئەزیەتی بدەن. کە زانیان ئەم دوو مەترسییە هەر وەهمە، بارەگە ڕۆژێ مۆنجەی دەهات، زۆربەی کوردەکانی لیبیا ڕوویان تێدەکرد.

ئایا شەرڤانانی (PKK)، لە لیبیا مەشقی سەربازییان پێدەکرا؟ بەندە نە لە نامیلکە و بڵاوکراوەکان و نە لە پۆستەر و وێنەکانی ئەوێ، هیچ شتێکم نەدیت، ئاماژە بە بوونی ئەم شتە بە ئاشکرا بکات. بە بۆچوونی من ئەوان پێویستیان بە مەشقی ئەفسەرەکانی لیبی نەبوو، چونکە خۆیان شارەزا و کارامەتر بوون لەوان، بەڵام بۆ کارکردن و فێربوونی چەکی تازە ڕەنگ بێ خراپ نەبوو بێ. یەکجار زمانی کادیرێکی (PKK) زەلەیەکی کرد، وەک بڵێی ئاماژە بوو، کە ئەفسەرانی لیبیا مەشقی سەربازی بە هێندێک لە شەڕڤانەکان ئەوان دەکەن، کە گوتی:" زۆر جار شەرڤانەکانمان داوایەکانی ئەفسەرەکانی لیبیا ڕەفزدەکەنەوە، چونکە ئێمە خاوەن فەلسەفە و ڕێبازی خۆمانین." والله اعلم!

نەمزانی کە (PKK) لە شارەکانی دیکەی لیبیا، وەکو بەنغازی و موسراتە و سرت بارەگای هەبێ. نەمشزانی ژمارەی کادیرانیان لەوێ چەندە و چۆن هاتووچۆ دەکەن. بەڵام ئەوەی کە بە زەقی دیار بوو ئەوە بوو، حکوومەتی لیبیا لە چاودێریکردن و پاسەوانیکردن، هیچ جیاوازییەکی لە نیوان ئەم بارەگایە و سەفارەتخانەی وڵاتەکان لە تەرابلووس

نەدەکرد. پاسەوانە لیبییەکان بە جلکی مەدەنی پاسەوانییان دەکرد، بەڵام هەمیشە ئۆتۆمبیلیان لێ نزیک بوو. کە دیارە چەک و شتوومەکی خۆیانی تێدابووە.

## (٢٧)

# دەزگای هەواڵگری(ئیستیخبارات)ی لیبیا، لە کوردستانی باشووردا

ڕەنگ بێ زۆربەتان ـ جگە لەوانەی خۆیان لە لیبیا ژیاون ـ باوەڕ بەم قسەم نەکەن، یان نیشانەی پرسیارێکی بۆ دانێن! ئاخر کێ مەزەندەی ئەوە دەکات، کە وڵاتێک سێ لەسەر چواری خاکەکەی کەوتبێتە ژێر خۆڵ و لمی گەورەترین بیابانی جیهان (سارای گەورەی ئەفریقیا)، کە هەزاران ساڵە پشکە بارانێکی لێ نەباریووە، مۆڵە (دنکە) تریی میوەکانی لە دنکە قەسپی بەسرا هەراشتر و شیرینتربێ. یان پتر لە (١٦) جۆر لیمۆ و پرتەقاڵی هەبێ. سەوزە و میوە جوان و بەتامەکانی ئەم وڵاتە، خوا هێندە خێر و بەرەکەتی بەسەردا باراندووە. نە تەماتە نە پەتاتە نە سێو نە پرتەقاڵ بە کیلۆ و تەرازوو نەبوو، هەمووی بە سندووق بوو کە پێدەڵێن (گابییە). خۆ دەستت بۆ هەر شووتییەک ببردبایە، ئەوا دەبوو بەبێ کێشان و بە خۆڕایی بۆخۆتی ببەی. بۆ؟ چونکە شووتی یان دەبێ بە پیکاب بکڕی یان بە کۆمەڵ.[3]

دەمەو عەسرێک، لەگەڵ هاوڕێ و هاوپیشەکەم مامۆستا تەحسین فەلووجەیی، وەک زۆربەی ڕۆژانی دیکەی حەفتە، بەیەکەوە چووینە بازاڕی سەوزەفرۆشان لە (سرت)، کە گۆڕەپانێکی خۆڵاوی فراون بوو. من ئاماژەم بە کۆمەڵە شووتییەک کرد و ئەوەیش دەستی لەسەر کۆمەڵێکی دیکە دانا. من گوتم:" مامۆستا، ئەم کۆمەڵەی من لە هی تۆ گەورەتر و جوانترە." ئەو گوتی:"باوەڕناکەم".

منیش ئەم چرکە ساتە، خۆم لەبیر کرد، بەبێ ئەوەی پێبزانم، بە دەنگێکی بیستراو، بە کوردی کەوتمە ژماردنی کۆمەڵە شووتییەکەی خۆم و گوتم:" یەک، دوو، سێ، چوار، ... " یەکسەر بەبێ پسانەوە و بە دەنگێکی بەرزتر لە دەنگی من، کاکی لیبیی شووتیفرۆش، بە کوردییەکی جوان و پاراو لەگەڵ من کەوتە تەواو کردنی ژمارەکە و گوتی:" پێنج، شەش،

---

[3] ) گێڕایانەوە، عەبدوڵڵا پەشێوی شاعیر، کە مامۆستا بوو لە زانکۆی فاتح (تەرابلوس) ١٩٨٧ ـ ١٩٩٠، جارێکیان پیکابێک شووتی، بە یەک دینار کڕی بوو، بەسەر هەموو ماڵە دراوسێیەکانی، لە باڵەخانەی مامۆستایان، دابەش کردبوو.

حەفت، هەشت، نۆ، دە، ..." یەکسەر بە عەرەبی شێوەزاری لیبی پێمگوت:" من کوردی عێراقی، کوردی ئێرانی، کوردی سوریم بیستووە، بەڵام قەت کوردی لیبیم نەبیستوە!" بە کوردی گوتی:" من (٥) ساڵ لە کوردستان ژیام و کوردی باش دەزانم" گوتم:" جا چیت دەکرد لە کوردستان؟" هەر بە کوردی وەڵامی دامەوە:" لە چێشتخانە و گازینۆیەکانی شەقلاوە و پیرمام و هەولێر ئیشم دەکرد." نەختێ حەپەسام، هەر بە کوردی پێم گوت:" سەیرە...زۆر سەیرە ... لیبییەکان لە شارەکانی خۆیان لە چێشتخانان کار ناکەن! چۆن تۆ لە کوردستان دەبیتە شاگرد چێشتخانە؟!" یەکسەر" وەک بڵێی ویستی قسەکەم پشتڕاست بکاتەوە، کە کەسێتیی ئەوان شاگردییان قبوڵ نییە، بە عەرەبی گوتی:" کان عندی مهمة هناک" پرسیم:" چۆن؟ موهیمەی وەکو چییت هەبوو لەوێ؟" گوتی:"من ئەفسەر بووم بە پلەی (ڕائید) لە سلکی هەواڵگەریی (ئیستخبارات)ی لیبی لە کوردستان کارم دەکرد."

ئەم شووتیفرۆشە ڕەنگ ئە سمەرە، چاو ڕەشە، تەمەن نزیکەی (٤٧) ساڵە، ناوی (هادی) بوو. تازە لەگەڵ (هادی) بووین بە هاوڕێ و هەموو حەفتان دوو سێ جاران کە دەهاتینە ئەم بازاڕە، مامۆستا تەحسینی هاوڕێم دەیگوت:" یاڵلا ..استاذ فاضل نروح عند صاحبنا ـ اللیبی الکردی" من هەمووجار چەند پرسیارێکم لە هادی دەکرد. تا ڕۆژێک ئەو بە کوردی پێیگوتم:"فازیل! من ئیستخباراتی لیبی بووم لە کوردستان، دەترسم تۆش هی کوردستانی بی لێرە. ئاخر ئەتۆ پرسیاری زۆر وردم لێدەکەی".

قەناعەتم پێهێنا کە من درۆی لەگەڵ ناکەم. لە هەموو شاری (سرت) پێش هاتنی کاکە (منداو)ی برام، دوو کورد لەم شاردا هەبوون، ئەوانیش ئەگەرچی لە یەک خانوودا دژیان، لەبەرجیاوازیی بیروباوەڕی حیزبایەتی قسەیان لەگەڵ یەکدی نەدەکرد. بۆیە من زۆر موشتاقی قسە کردن بووم بە کوردی لەگەڵ (هادی)ی لیبی. لەلایەکی دیکەش پێم گوت،"خۆ من پرسیاری کوردستانت لێدەکەم . ئەگەر ئیستخبارات کوردستان بوومایا، دەبوایا پرسیاری وڵاتی لیبیات لی بکەم."

زۆرجار دۆڵمە و کفتە و شفتەی کوردەواریم بۆ (هادی) دەبرد. پوختەی ئەو زانیارییانەی کە لەم ئەفسەرە هەواڵگرە هەڵمکڕاند ئەوەیە: شەش ئەفسەرێ پلە بەرزی لیبی، بە پەساپۆرتی ساختەی میسری، لە نووسینەگەی هەناردەکردنی کرێکاران بۆ عێراق، وەکو شەش کرێکاری میسری هاتوونەتە کوردستان، ئەو دەم نزیکەی یەک ملیۆن کرێکاری

میسری لە عێراق کاریان دەکرد، چونکە زۆربەی گەنجەکانی خۆمان لەبەرەکانی جەنگ لەگەڵ ئێران، سەرباز بوون. پەساپۆرتەکانی ئەوان هەر پەساپۆرتی هاوولاتی میسری بوون، بەڵام ناوەکانیان ساختە بوو، بۆیان سازکردبوون، شێوەزاری عەرەبی میسریشیان، شار بەشار، دەزانی، بۆیە نەمیسرییەکان و نەعێراقییەکان شکیان نە دەکرد کە ئەمانە خەڵکی لیبیا بن. ئەم شەش ئەفسەر دابەش بوبوون بەسەر: کەرکوک، سلێمانی، قەڵادزێ، هەولێر، شەقلاوە، دهۆک. هەر سێ مانگ جارێک یەکێکیان دەگەڕایەوە میسر و لەوێ دەچووەوە لیبیا. خشتەی سەفەرەکانیان وا رێکخستبوو هەر (١٥) رۆژەی یەکێکیان بگەرێتەوە لیبیا. جا ئەو ئەفسەرەی نۆبەی گەڕانەوەی دەهات، دوو رۆژ پێشتر سەردانی (٥) ئەفسەرەکەی لە شارەکانی دیکە دەکردوو، زانیارییەکانی لێوەردەگرتن، هەمووشی هەر بە زارەکی بووە و هیچ شتێکیان نە نووسیوەتەوە. ئەوان بۆ کۆکردنەوەی زانیاریی لە بارەی (٤) شتەوە ناردرابوون:١) باری بژێووی خەڵک و دارایی حکوومەتی عێراقی، ٢) جموجۆڵی سەربازی و چەک و ژمارەی سەرباز و جەیشی شەعبی و جاش و پۆلیس و...تاد.، ٣) کاریگەری هێرشەکانی ئێران بۆ سەر سنوور وشارەکانی عێراق، ٤) جموجۆڵی چەکداریی گروپە کوردییەکانی شاخ.

ئەوانی هیچ پەیوەندییان بە شتی دیکەوە نەبووە و زوو زووش شوێنی کاریان گۆڕییوە نەکۆ ئاشکرا بن. لە پرسیارێکم کە ئایا کەسیان لە کوردان کردبووە (عەمیل تا کاریان بۆ بکەن)، دیار بوو پێویستیان بە یارمەتیی کوردەکان نەبووە و دەشیانزانی کە هەنە خزمەتی رژێمی بەعس دەکەن و جێگەی متمانە نین.

رۆژێک لە (هادی)م پرسی زۆر حەز دەکەم ئەم پرسیارەم بە وردی وەڵام بدەیتەوە،"کە ئێوە زانیتان هەڵەبجە کیمیاباران کرا و کورد ئەنفال کرا. چ جۆرە راپۆرتێکتان بە دەزگاکانی لیبیا دا؟" ئەو گوتی "من لە (١٩٨٦) کوردستانم بە جێهێشت بوو وگەڕابوومەوە. ئاگادار نیم، نازانم!" گوتم" بۆ قەزافی وا زوو لەسەر گرتنی عەبدوڵلا ئۆجەلان بە جواب هات، بەڵام بۆ رووداوەکانی هەڵەبجە و ئەنفال ئەو پەرچەکردارە توندەی نەبوو؟" ئەو گوتی" با.. ئەو هەمیشە، باسی کردووە، تەنانەت، جارێک رۆژنامەوانێکی ئەمەریکی پرسیاری چەکی کیمیاوی لێ کرد، قەزافی گوتی، "بۆ ئەو پرسیارە لەمن دەکەی خۆ من هەڵەبجەم کیمیاباران نەکردووە؟" (هادی) دەیگوت،"نازانم ئەگەر دەستە و تاقمی هەواڵگریی

دیکەیان هەبێ لە بەغدا و شارەکانی ناوەند و خوارووی عیراق." لە وەڵامی پرسیارێکم" تۆ وەکو لیبییەک کە کوردی دەزانی و (٥) ساڵ لەگەڵیان ژیاوی ئیتنیباعاتی تۆ چییە؟" گوتی "کورد زۆر دڵسافن بەڵام متمانەیان بە یەکتری نییە".

ئیستا تۆی خوینەری بەریز، حەقی خۆتە بپرسی"بۆ ئەفسەرێک بە پلەی ڕائید شووتی دەفرۆشێ؟" لە لیبیا من هاورێیم هەبوو فرۆکەوانی فرۆکەی جەنگی بوو، بەڵام خۆی خانەنشین کردبوو، ئیشی سەر پێی دەکرد. واتا ئەفسەر و سەربازەکانیان ئازاد بوون لە دەست لە کار کێشانەوەیان لە سلکی سەربازی. وەک عیراق نەبوو، کە ئەفسەر ئەو مافەی نەبێ.

ئیستا منیش دەڵێم ئەگەر لەسەردەمی بەعسی وا دڕندە ومرۆڤکوژ، کوردستان مۆڵگەی پیاوانی هەواڵگریی وڵاتانی دوور بووبێ. دەبێ ئیستا چ لەم وڵاتەی مندا بگوزەرێ؟ جارێک بیستم کە هەواڵگەریی پاکستان و ئەفغانستان و هیندستان لێرە هەنە... خوایە ئەوە هەر قسە بێ وانەبێ!

یەک تێبینی: لە شەڕی عیراق ـ ئیران ..لیبیا لایەنگر و پاڵپشتی ئیرانی کرد و دەیان موشەکی زەوی بە زەوی (سکۆدی ڕووسی) بۆ ئیران نارد و ئەویش لە بەغدای دەگرتن.

## (٢٨)

# پزیشکیکی کوردستانی باشووری چۆن بووه دکتۆری (قەزافی)؟

گوتمان؛ دوای شەڕی کەنداو، تا ئابلوقە ئابوورییەکەی ڕۆژاوا لە سەر خەڵکی برسی و شەپرزە و شەکەتی عێراق، توندتر و قورستر و سەختتر دەبوو، خەڵک پتر هەوڵی هەڵاتن و ڕاکردنی لەم وڵاتەدا دەدا. عەرەبە چەپڕەوەکان پتر ڕوویان لە (یەمەن) دەکرد و خەڵکی عەوامیش بەرەوە لیبیا دەچوون. لە کوردستانیش هاووڵاتی کورد هەمان موعاناتی خەڵکی بەغدا و بەسرای هەبوو سەرەڕای ترس و تۆقاندن و مەرگەساتی شەڕی ناوخۆیّ نیوان ( پ. د. ک ) و ( ی. ن. ک). حکوومەتیش هیچ ڕێگرنەبوو لەم دەرچوونەی هاووڵاتیان، چونکە ئەمەش بازاڕیکی گەرمی بۆ (زۆر لە بەرپرسەکان) کردبۆوە، من خۆم بە (١٠٠٠) دۆلار لە بازگەی ئیبراهیم خەلیل پەڕیندرامەوە. ڕۆژانە چەندان پاسی گەورە، هاووڵاتی عیراقی کە زۆربەیان خاوەن بڕوانامەی باڵا بوون، دەگەیشتنە بەنغازی و تەرابلووس، ئەمە کێشەیەکی گەورەی بۆ لیبیا دروست کرد، چونکە بەڕاستی ئەوان زۆر نیگەران بوون، کە دەیانبینی دکتۆری زانکۆ لە مزگەوت دەخەویّ و مامۆستا لەسەر موقەبا لە هەیکەلە خانووەکان دەژی!

پزیشکی عیراقی عەرەب لە هەموو نەخۆشخانەکان هەبوون و زوو ناوبانگیان دەرکرد. کوردەکان پتر مامۆستای زانکۆ و دواناوەندی بوون و پزیشکیشیان تیدا بوو.

پاشنیوەڕۆیەک، کوڕەکەم بردە نەخۆشخانەی (ابن سینا لە سرت)، کە نۆبەم هات و چوومە ژووری دکتۆر، بە کوردی قسەم لەگەڵ کوڕەم دەکرد، ویستم بە عەرەبی لەگەڵ دکتۆرەکە بدویم، ئەو بە کوردی گوتی:" بە کوردی قسە بکە." ئەو ڕۆژە (دکتۆر ج.)م ناسی و وەک دوو کوردی غەریبە پتر لیکتر نزیک بووینەوە. لەگەڵ ڕۆژگاردا باشتر یەکترمان ناسی. لەو ماوەی (١٠) ساڵە، کە لە لیبیا بووم، هەر ئەو پزیشکە کوردەم لە (سرت) بینی. (دکتۆر ج.) ئەندامی پارتیی دیموکراتی کوردستان بوو و لە بەرێز کاک مەسعود بارزانی نزیک بوو، پۆستێکی زۆر باڵای لە کۆلێژی پزیشکی هەولێر ـ زانکۆی سەلاحەدیین هەبوو ـ خوێنەری ئازیز، ئیستا بۆخۆت درک بەوە دەکەی بۆ ناوی تەواو ئەم

زاتە نانووسم ـ ئەم بەڕیزە تا بڵێت ڕۆشنبیری و کوردپەرەوەر و مرۆڤدۆست بوو، تا بڵێی هیمن و کەمدوو بوو، بەڵام سرڕی زۆر قایم بوو، متمانەشی پیبکردبای، جیق جیق، زانیاری پیدەدای یان هەر نەیدەدا. من لەم سۆنگەوە زۆر ڕیزم لیدەگرد و هەرگیز پرسیاری شتێکم لینەدەکرد، کە بەلای ئەوەوە، نهێنی یان تایبەت بێ، ڕەنگ بێ هەر ئەمەش هاندەری بوو بێ، بەردەوامی بە هاوڕییەتییەکەی لەگەڵ من بدات. چونکە ئەو کەس کەسی برادەر نەبوو. بۆ مێژوو، لە نێو هەموو ئەو کوردانەی لە لیبیا من ئاشنایەتیم لەگەڵ پەیدا کردن، کەسم نەدیٚ وەکو(دکتۆر ج.) خەم لەو شەڕە برا کوژییەی کورد بخوات، هەمیشە پەنجەکانی وەکو شوولی قەفەز تێکدەپەڕاند و دوو دەستی دەخستە پشتی سەری و تەماشای ئاسمانی دەکرد و بیری دەکردەوە. تا ئەو ڕادەیە من دەترسام کە ئەو تووشی نەخۆشی دەروونی بووبێ. ئەو هیچ خەبەرێکی ماڵ ومناڵی خۆی نەدەزانی، ئەوەندە نەبێ کە ئەوان ئاواربووین، ماڵەکەشی لە هەولێر تاڵان کراوە و خانووەکەشی داگیرکراوە. خەڵکی تر تێیدا نیشتەجی بوون ـ بەداخەوە لە شەڕی براکوژی نەوەتەکانی سەدەی ڕابردوو، زۆر ڕەفتار و کرداری قێزەوەن کران کە مرۆڤ لەخۆی تەریق دەبێتەوە، هیچیان تەقسیریان بەیەکدی نەدەکرد. بە قەرەوێڵەوە لە نەخۆشخانە، نەخۆشیان فڕێدایە سەر شەقام!

ڕۆژێک بە دکتۆرم گوت" ئارام بگرە، ئەم شەڕەش کۆتایی دێ و ئەم دووانەش ئاشت دەبنەوە"ـ ئەو وای لە دەمیدامەوە و گوتی" مامۆستا فازیل، من لەوە تێدەگەم، بەڵام من لەوە تێناگەم، چۆن برا، برای خۆی بە دوژمنێک دەزانێ زۆر گەورەتر و ترسناکتربێ لە دۆژمنی حەقیقیی خۆی! ئێمە نەک سەرباز، ئەفسەری پلە بەرزیشمان بە دیل گرتووە و ڕیزیشمان لیگرتوون و بەڵکوو ئازادیشمان کردوون. ئەوانە، نەک هەر دیلی یەکتری دەکوژن! شانازیش بە کوشتنی دیلەکان دەکەن! "

(دکتۆر ج.) لە هەموو لیبیا، هەر ڕادیۆیەکی بچووکی هەبوو، چونکە سەڵتیش بوو، ناوە ناوە من بە ئۆتۆمبیلی خۆم دەمبردە گوندی(غەربیات) و سفرەی خواردنی کوردەواریمان بۆ ڕادەخست. ڕۆژێک دوای نانخواردن، قەزافی، بووە بابەتی قسە و باس. ئەو گوتی "ئەم پیاوە زۆر لەوە خاکیترە کە لە تیڤی دەیبینین، ئەو لەگەڵ جوتیاران جوتیارە، لەگەڵ خوێندکاران خوێندکارە و لەگەڵ سیاسییان سیاسییە" منیش گوتم:"بۆ؟ ئەوت لە نزیکەوە،

دیوە؟" زەردەخەنەیەکی هاتێ و بە ئەسپایی بە شێوەزاری هەولێریان گوتی:" ئەدی کوو ئەمن دکتۆری ویم".

بەندە کەسێکی پرسن نییە و هەرگیز بەدوای قسەوقسەڵۆکاندا ناگەڕێم. لەلایەکی دیکەشەوە، دەزانم سروشتی هێندێک پۆست و وەزیفە، ئەوە دەخوازێ، یان مەرجە، کە نهێنی و سرڕی ئەو پۆست و وەزیفە بپارێزرێت. دەنا پێچەوانەکە، لەوانەیە سەری هەردوولا بخوات. جوو نەیتوانی زەفەر بە (جەمال عەبدولناسر)، یەکەم سەرککۆماری میسر، ببات، تا ناوی ئەو مەرهەمەی بۆ ئاشکرا نەبوو، کە حەفتانە ئەو سەرۆکە لەکاتی مەساژکردندا لە لەشی خۆی هەڵدەسووی. جوو مەرهەمی ژەهراوی بۆ ناردوو. دوای چەند مانگێک بەوە ژەهرە مرد. کە (یاسیر عەرەفاتی)یش، لە (غەزە) چەند مانگێک بوو لە خانویەکدا گەمارۆدرا بوو و نەخۆشیش بوو، لە ڕێی کەسی یەکەمی ڕێکخراوەکەی خۆیەوە، دەرمانی ژەهراوی بۆچوو، ستافی تاقیگەی پزیشکی فەرەنسا، ڕاپۆرتی هۆکاریی مردنەکەی ئەوەی بە هاوسەرەکەی دا، ئەو ژنە ناوەرۆکی ئەو ڕاپۆرتەی نیشانی کەس نەداوە (دوریش نییە کە ئەمەشاردنەوەیەش لەژێر گەڤ و هەڕەشەی جوو بێ، کە خۆیان یاسیر عەرەفاتیان دەرمان خوارد کرد). بۆیە من هەرگیز نە بەدوای نهێنییەکانی (د. ج.) دا دەگەڕام و نە گلەیشم لیدەکرد کە نایەوێ شتەکان بدرکێنێ. جا ئەوەی لێرەدا دەیخوێننیتەوە، پووختەی ئەو زانیارییانەیە کە خۆی باسی کردوون (دیارە زۆر سرڕی گرنگ نین، دەنا ئەوانەشی نەدەدرکاند). داواکارم لە خودای میهرەبان بە گوناحکارم دادەنێ و (د. ج.) میش بە خاین لەقەڵەم نەدا، کە قسەکانی دەگێرمەوە:

شەوێک بەڕێوەبەری نەخۆشخانەی سەرەکی لە (سرت) پەیوەندی بە (د.ج.)ەوە دەکات کە ئێشکگرِ بووە ئەوە شەوە، بچێتە سەردانی نەخۆشێک، کە ئەو ناتوانێ بێتە نەخۆشخانەکە. چوار گەنج دێن بە ئۆتۆمبیلێکی تایبەت، ئەو دەبنە کۆشک و تەلاڕێکی خۆش لە گوندی (بۆهادی)، کە هەر (٦) کم لە سرت دوورە و ئەویش وەکو گوندی (غەربیات) هەر هەموو دانیشتوانەکانی لە خێڵی قەزافین. کە دکتۆر دەبەنە لای نەخۆشەکە، دەبینی (موعەمەر قەزافی) لەسەر تەخت و نووینێکی پاکوخاوێن ڕاکشاوە و بێحاڵە، هێندە نەخۆشە وڕێنە دەکات. کە دکتۆر دەستدەکات بە پشکنینی، ڕوو لە یاوەرەکانی (قەزافی) دەکات و پێیان دەڵێ." ئەوا بۆ وا درەنگ وەخت بەخۆ کەوتوون، خۆ

پلەی گەرمایی لەشی ئەو پیاوە، چەند (پۆینتیکی) ماوە بگاتە (٤٠) پلەی سەدەی، یەک پلەی تر گەرمایی بەرزبێتەوە، بەو تەمەن و بەو حاڵە ئەو پیاوە لەوانەیە گیان لەدەست بدات. ئەدی ستافی دکتۆرەکانی (قائد) چیان بۆکردووە چ داودەرمانێکیان داوەتێ؟"

لە کۆنەوە سەرکردە و سەرۆک و میر و پاشا، حەکیم و دکتۆری خۆیان هەر هەبووە. لەم سەردەمی ئێستادا ئەوان بچنە هەر شوێنێک، وەکو سیبەر، ستافێک لە باشترین دکتۆر و چەند ئیسعاف و ئۆتۆمبیلێک لە کەرەستە و پێویستییەکانی پزیشکیی و داودەرمانیان لەگەڵە، تەنانەت هەمیشە چەند (کیسە یان لیترە خوێنی هەمان گرووپی ئەو سەرۆک و سەرکردەیان) ) پێیە و ئامادەیە بۆ کاتی پێویست.

لە میانەی گفتوگۆکردنەکە، (د. ج.) تێدەگات کە ئەو سەرکردە، نەک ستافێکی پزیشکیی باش، یاوەری نییە، بەڵکو دکتۆرێکی (ئاسایی)شی لەگەڵدا نییە و کەس حەبێکی نەداوەتێ. زۆر گوتن قورئان خۆشە! ئەو شەوە، (قەزافی) تووشی ئینفلۆوەنزایەکی زۆر قورس بوو بوو زۆر بێحاڵ بووە، بۆیە (د. ج.) بەدیارییەوە دەمێنێتە وتا پلەی گەرمایی دادەبەزێ و چارەسەری پێویستی بۆ دەکات و تا (٣) ڕۆژان هەر لە دەوری دەبێ، چونکە ئاگاداریان دەکاتەوە، کە دەبێ ئەو نەخۆشە ئیسراحەت بکات و خۆی ماندوو نەکات. دیارە کە (قەزافی) دوای چاکبوونەوەی، سوپاسی (د. ج) دەکات، بەتایبەتی کە پێیدەڵێن ئەو دکتۆرە ژیانی ئەوەی ڕزگارکردووە. بەم شێوەیە پەیوەندیی (ئاشنایەتی) لە نێوان ئەم دووانە دروست دەبێ وبەردەوام دکتۆر سەردانی (قەزافی) دەکات. لێرەدا دەمەوێ کەوانەیەک بکەمەوە. (د. ج.) ناڕاستەوخۆیانە، هەمیشە دەیگوت، هەرگیز (قەزافی) لەگەڵ مندا نەباسی کورد دەکات و نەباسی سیاسەتیش، ڕەنگ بێ، هەروا بوو بێ، بەڵام من بۆخۆم شیکردنەوەیەکی دیکەم هەبووە: ئەو کاتەی کە دکتۆر ئاشنایەتی لەگەڵ قەزافی پەیداکرد، شەڕی براکوژی یەکجار گەرم و توووند بوو لە کوردستانی باشووردا. ڕەنگ بێ (قەزافی) سەرکۆنەی سەرکردەکانی کوردی کردبێ، بەڵام دکتۆر نەیویستووە لە زاری ئەوەوە ئەم دەنگۆیە بڵاوبێتەوە، یان دکتۆر نەیویستووە بە شێوەیەک باسی کەسانێک بکرێت کە ئەو خۆشی دەوێن و حەزناکات کەس خراپ ناویان ببات.... والله اعلم!

(د. ج) زۆر لە شاری (سرت) نەمایەوە، دەمێک بوو خەبەری نەبوو، کە چوومە نەخۆشخانە بۆ سەردانیکردنی، گوتیان لێرە نەماوە. ئەو هیچ برادەری نەبوو تا سۆراغێکی

بپرسم و نەشمتوانی هیچ زانیارییەک لە نەخۆشخانەکە وەرگرم. بۆیە بە مەزەندەی من یەکێک لەو (٣) شتە ڕوویدا بوو ( والله اعلم): ١) (قەزافی) دکتۆری لەگەڵ خۆی بردبێ بۆ شاری تەرابلووس چونکە پایتەخت بوو زۆرترن کاتیش لەوێ بوو، ٢) لە ڕێگەی نووسینگەکانی ئەو سەرۆکە، پلیتی سەفەرکردنی لە ڕێی فڕۆکەخانەی تونس و میسر وەدەستکەوتبێ و سەفەرێ ئەورووپای کردبێ، چونکە چەند جارێک دەیپرسی :چۆن دەکرێ لە لیبیاوە بچیتە ئەورووپا؟ ٣) ڕەنگ بێ گەڕابێتەوە کوردستان بۆ لای ماڵ ومنداڵەکانی یان لەسەر داخوازیی (حیزبەکەی).

لەو ڕۆژەوە من هیچ خەبەرێکی(د. ج.) نازانم. دڵنیام کە دکتۆر، چونکە لە (قەزافی) نزیک بووە زۆر شتی بینیوە یان بیستووە، کە پێویستە بە ئەرشیڤ بکرێن، خۆزیا، ئەو پیاوە سرڕقایمە، ئەوەی دەکردا!

## (٢٩)

## مواسەفاتی سەیارە زرێپۆشەکەی (قەزافی)م زانی

خێڵی (فرجان) کە ئێستا سەنگێکی قورسی لەسەر گۆڕەپانی سەربازیی و سیاسیی لیبیا هەیە، بە درێژایی (٤٢) ساڵ حکومڕانی (قەزافی)، غەنیم و ئەغیارێکی سەرسەختی خێڵی (قەزافی)بوو، جا لەبەد بەختیشدا، چونکە هەردوو خێڵەکە لەهەمان پێگەی جوگرافی دادەنیشتن، لە زۆر شوێن تەیمانیشیان لە نێواندا نەبوو، مەگەر ڕێگای ئۆتۆمبیل زەوییەکانی دابەشکردبن. ئەوەی هاوسەنگیی بارودوخەکەی نێوانی ڕاگرتبوو، خودی کەسێتیی (قەزافی)بوو. ئەو زیرەکانە لەگەڵ سەرۆک خێڵ و هۆزەکان، پەیوەندیی باشی پەیدا کردبوو و ئەوانی لە خۆی نزیک کردبۆوە، لە کەلتووری خێڵیشدا، قسە و فرمانی شێخی خێڵەکە یان هۆزەکە دەخوا.(ع. ز.) کە لە تیرەیەکی خێڵی (فرجان) بوو، لە بەژن و باڵا کەڵەگەت و تێکچەقیوو بوو، هەڵگری بڕوانامەی بەکەلۆریۆس بۆ لە زمانی عەرەبی و ناوی لە لیستی مامۆستاکانی قوتابخانەکەی مندا هەبوو، بەڵام قەت یەک دەرسی نە گوتوتەوە و یەک ڕۆژیش دەوامی نەکرد، چونکە ئەو لە لیژنەکانی شۆڕشگێران کاری دەکرد. ئەو زوو بووە هاوڕێم، هەر دە ڕۆژ جارێک یەکترمان دەدیت و هامووشۆی یەکتریمان دەکرد. ئەو زۆر ڕۆشنبیر و کارامە نەبوو، بەڵام خۆی وانیشاندەدا کە وایە، بە ناوی(Bussiness)ەوە، مانگی سەفەرێکی بۆ دەرەوە دەکرد، کە ڕاستییەکەی پتر بۆ کاروباری لیژنەکانی خۆیان بوو. مامۆستا (ع. ز.) منی لە دڵەوە خۆشدەویست و هەمیشە لە لای هاوڕێیەکانی دەیگوت (م. فازیل لە تیرەی خۆمانە، زەرگەیە).

ڕۆژێک (ع. ز.) بانهگێشتی کردم بۆ نانخواردنی ئێوارە لە ماڵەکەی خۆی و داواشی کرد کە کەس لەگەڵ خۆم نەهێنم، چونکە لە کەلتووری لیبیا زۆر ئاساییە هاوڕێ و برادەران لەگەڵ خۆت ببەی ئەگەر ئەوان دەعوەتیش نەکرا بن، ئەوان حەزیان لە قەڵەباڵغییە. دوای نانخواردن و چایی خواردنەوە، ئەو گوتی:"ببورە کە حەزم کرد بە تەنیا بێت بۆ لام، چونکە کارێکی زۆر پڕ نهێنیم پێ سپێردراوە و لێرە کەس شک نابەم لەتو زیاتر جێگەی متمانە و بە قا بێ، تۆش دەبێ دڵم نەشکێ و ئەم سرڕەش بپارێزی، دەنا خوانەخواستە ئاکامی باش

نابی." منیش بەڵێنم پێدا کە ئەوەی لە توانام دابێت بۆی بکەم. بە کورتی، نامیلکەیەکی (برۆشەری) نزیکەی (٤٠) لاپەڕەیی، هێنا کە بە زمانی ئینگلیزی بوو، داوای کرد کە هەر ئەم شەوە، بۆی وەرگێڕمە سەر زمانی عەرەبی، گوتیشی "هیچ کەسێک لەم لیبیایە چاوی بەمە نەکەوتووە، چونکە منیش زمانی ئینگلیزی نازانم، ناوەڕۆکەکەی تێناگەم." ئەم (برۆشەرە) دەربارەی (٣) ئۆتۆمبیلی زرێپۆشی سویدی و ئەڵمانی و ژاپۆنی بوو، کە دیارە نیازیانە بووە یەکێکیان بۆ (قەزافی) هاوردەکەن. بەم شێوەیە زۆر زانیاریم دەربارەی ئۆتۆمبیلە زرێپۆشەکەی (قەزافی)زانی. ئێستاش ئەوە یەکەم جارە باسی دەکەم، بە گێڕانەوەش لەلای هیچ کەسێک حەرفێکم پێشتر نەدرکاندووە:

هەر(٣) ئۆتۆمبیلەکە زۆر مواسەفاتی وێکچوویان تێدا بوو، بەڵام ژاپۆنییەکە یەکجار پڕ نهێنی و تۆکمە وبەهێز و خۆڕاگر بوو، هەر واشمەزەندە دەکەم، کە ئەویان هەڵبژاردبێ! زانیارییەکان چەند جور بوون، بۆنموونە: توانا و هێزی مەکینەکانی ئۆتۆمبیلەکان، کە هەریەکێکیان دوو تانکی بەنزین و دوو پاتری هەبوو، تەنانەت دەکرێ بۆداوەوە بڕوا، واتا هیچ جیاوازی لەنێوان ڕۆیشتن بۆ پێشەوە و بۆ دواوە نەبوو. دەربارەی تۆکمەی و خۆڕاگری. ئەم ئۆتۆمبیلانە وەک سندووق بوون، سندووق شەش لای هەیە، جا مواسەفاتی هەر شەش لایەکە بە وردی باس کرابوو. دەربارەی دژە چەک. ناوی هەموو ئەو جۆرە تفەنگ و فیشەکانەی تێدا بوو کە ئەم زرێپۆشە نابڕن و ئەوانەی کە کاری تێدەکەن. یان یەک جۆرە تفەنگ و گوللە، کار لە شوێنێک دەکات و لە شوێنێکی دیکە ناکات، بۆ نموونە چرای پشتەوە کون دەکات، بەڵام جامی پێشەوە نابڕێ. ناوی هەموو ئەو ڕۆکێت و موشەکانە تۆمار کرابوون کە دەتوان ئۆتۆمبیلەکە تێکبشکێنن یان ئەوانەی کە ناتوانن. ئەوەی کە زۆر جێگەی سەرنج بوو، ئۆتۆمبیلە ژاپۆنییەکە، بەرگەی زۆر جۆرە مینی دەگرت کە تایبەتن بە تانک. بەڵام لە هەموویان گرنگتر کە لە دوو ئۆتۆمبیلە سویدی و ئەڵمانییەکەدا نەبوو، ئەوە بوو، ئەم زرێپۆشە ژاپۆنییە بەرگەی چەکی کیمیاوی دەگرت، لە هەمووشیان سەیر تر، لە کاتی تەنگانە، لەسەر سەقفەکەی قولابەیەک قیت دەبۆوە و دەکرا بە هەلیکۆپتەر ئەم ئۆتۆمبیلە بە سەرنشینەکانییەوە بەرزکەنەوە و ڕزگاری کەن. ئەوە جگە لەوەی کە توانای ڕۆیشتنی نزیکەی (٦٠)کم، لەسەر ویل، هەر بە خشین لە سەر زەوی هەبوو.

نرخەکان لە نێوان (٥٠) بۆ (١٥٥) ملیۆن دۆلار بوون.

ئێستا حەقی خۆتە بپرسی.. قسەکانی من لە هێندێک شوێن یەک ناگرنەوە...: لە زنجیرەی پێشوو نووسیبووم(قەزافی) دکتۆرێکی ئاسایی بۆ خۆی نەبوو. کەواتە یانی چی ئۆتۆمبیلی زرێپۆش بە (١٥٥) ملیۆن دۆلار دەکرێ؟ دوور نییە ئێستاش ئەو پیاوە نەیزانیبی، گەندەڵکاران ئەم پارە زۆرەیان بە سەیارەکەی ئەوە داوە.

## (٣٠)

## تەختەڕەشـەکەی قەزافی

لیبییەکان بۆخۆیان دەیانگوت:" هەتا ئێمە، موعەممەرمان کردبووە کوڕی خۆمان، هەر خێرو بەرەکەتمان بەسەردا دەباری، بەڵام کە موعەممەر ئێمە بە کوڕەکانی خۆی دا و پشتی تێکردین، هەر گوومان بەسەردا دەباری."

خۆ ناحەقیشیان نەبوو، ئەگەر ئەوانی صەددامی (دوو) بوون، ئەوا ئەوانی موعەممەری (هەشت) بوون:

محەممەدی، کوڕی گەورەی، هەموو ـ کۆمپانیاکانی پەیوەندیی مۆبایل و تەلەفۆنی لیبیای لەبن دەست بوو. سەیف ئەل ئیسلام، کە دکتۆرای فەلسەفەی هەبوو، هەر سوڕە سوڕی بوو لە دەوری کورسییەکەی بابی. خەمیس، کە دەرچووی دانیشگای سەربازیی ڕووسیا بوو، بەرپرسی قوات الخاصة بوو. سەیف ئەل عەرەب، هەر بەوە ڕادەگەیی ئۆتۆمبیلی فیراری بکڕێ و لە شەقامەکانی ئەوروپا سەرپێچیان پێ بکا.عائشەی کچی، هەموو دەزگا خێرخوازییەکانی کردبووە هی خۆی. هانیبال، بە نوێژی نیوەڕۆیە کراسی کچەکانی سویسرای هەڵدەدایەوە و تەشقەڵەی پێدەکردن. موعتەصم بیللا، لە لایەک بەرپرسی ئاسایشی لیبیا بوو، لەلایەک خەریکی ئینقلاب کردن بوو لەسەر باوکی. ساعدی، بە ملیۆنان دۆلار، یاریزانی دەکڕێ و خرواره دۆلارەکی بە تۆپێکی فوتبۆلانی دەدا.

ئێ هەموو داهاتی لیبیاش، هەر بەشی ئەو مەسرەفە قورسەی منداڵەکانی موعەممەری دەکرد.

کە لە ساڵی (١٩٦٩) موعەممەر هاتە سەر حوکم، (٨) ساڵ بوو بڕەکی کەم نەفتیان دۆزیبۆوە، وڵات کاول بوو، لە (٩٩٪)ی خەڵکەکەی نەخوێندەوار بوون، پتر لە نیوەی خەڵکەکە هەر کۆچەری سەحرایان بوون، ئاوی خواردنەوەشیان نەبوو. ئەلهەقی ئەوەی ئەو زاتە بۆ لیبیای کرد شۆڕش بوو. بە هەزاران خانوو و مەکتەب و نەخۆشخانە و دامودەزگای و کارگە و شار و گوندی سەردەمیانەی بۆ دروست کردن. لە (٢٥) بۆ (٣٠)

ساڵەکەی سەرەتای حوکمی ئەو (سەردەمی زێڕینی لیبیا بوو) سەرەڕای هەموو کەموکوڕییەکان.

جا، لە ڕۆژ و مانگێکی دیاری کراو، هەموو ساڵێ، موعەمەر، تەختەڕەشێکی مەکتەبی هەڵدەواسی، هەموو وەزیرەکانی لەبەر چاوی ئەو خەڵکە ڕیز دەکرد، هەر وەزیرەی داهات و مەسرەفی وەزارەتەکەی خۆی دەخوێندەوە، لەسەر تەختەڕەشەکە تۆماریان دەکرد. هەتا یەک یەک هەموو وەزیرەکان لێدەبوونەوە. ئەوجا لە کۆتایی، دەیان گوت، "هۆ خەڵکینە، ئەمساڵ، داهاتمان ئەوەندە دینار و ئەوەندە قرشە بووە و ئەوەش مەسرەفامان بووە، ئەوەندەشمان بۆ ماوەتەوە."

ئەوجا موعەمەر دەیگوت،" ئەوەی ماوەتەوە بەسەر ژمارەی خێزانەکانی لیبیا بەیەکسانی دابەش بکەن."

ساڵ هەبوو، هەر خێزانەی چەند هەزار دۆلارێکی بەردەکەوت.

جا بەرە بەرە، کە منداڵەکانی پێگەیشتن، موعەمەر ئەوەندەی بەخۆی زانی، دەسەڵاتی بەسەریاندا نەماوە، تەنانەت یەکێکیان هەوڵی کودەتاشی داو دووانیش لەسەر کورسییەکەی ئەو شەڕیان بوو. جا گەنجینەی وڵات لە بن هات. هەموو ساڵێ کە موعەمەر تەختەڕەشەکەی هەڵدەواسی و ئەو خەڵکە چاوە چاوی بوو دوو قرشیان بۆ بکەن دیاری وەک ساڵەکانی زوو. دەیان بینی، لە خیتامدا دەڵێن:

(بووجەی ئەمساڵیش کوورتی هینا....!)

بۆخۆم، ڕۆژێک، لە دیوەخانێک گوێم لێبوو ڕیش سپییەک بە ئامادە بووانی گوت:" خەڵکینە، بیستووتانە دەڵێن، ئەمساڵ، هەر خێزانەی (١٣) هەزار دۆلاری دەدەنێ، من ئەمشەو، پارەکەم خۆم وەرگرت و هەمووم خستە گونییەک و بە پشتی خۆم داداو، خێر خێرا بەرەو ماڵ بوومەوە، بەڵام... بینیم، بنی گونیەکە کون بووە، دۆلاری لێ دەکەوێتە خوارێ. جا منیش دەستم خستە کونی گونییەکە... وەڵڵا، کە ڕاپەڕیم، دیتم ئەوە، خەونە، دەستم لەناو (کۆمی) خۆم ناوە!"

لە لیبیا، خەڵک، بێ ترس ڕەخنەیان لە موعەمەر دەگرت، ڕووبەڕوو قسەی دڵی خۆیان پێدەگوت. ئەو دڵگران دەبوو بەڵام توڕەیی و گرژی نیشان نەدەدا.

(دەبووایا دوای (٢٠١١)، ئەو تەختەڕەشە و هەموو میراتەکەی موعەمەری بپاریزن، لە مۆزەخانەی دانێن و پارەی پێ پەیداکەن، شێوەی قەسرەکەی شای ئێرانی.).

## (٣١)

# ژنهێنــان لە کەلتــووری لیبییەکاندا

بە گشتی ژنی لیبی خوێن شیرین و گەنم ڕەنگن، ئەوانەی خوارووی وڵات ئەسمەرن، واتا ڕەشتاڵەن، ئەوانەی لای موسراتەش سپی سادەیان زۆرە. چاو و برۆ پرچیان ڕەشی قەترانییە، دەم بە خەندەن و قسەخۆشن. کە دەچیتەماڵیان یەک یەک دێن تۆقەت لەگەڵ دەکەن، بەڵام لە دیوەخان لەگەڵت دانانیشن. لە قوتابخانەش ئاساییە هەموو بەیانیان تۆقە لەگەڵ مامۆستا ژنەکان بکەیت. دیارە ئەوە کەلتووری خێلەکی عەرەبە، چونکە لە ڕومادیش(کە ساڵانێک لەوێش مامۆستا بووم)، ژنەکان تۆقەیان لەگەڵ پیاوان دەکرد کە دەچوویتە ماڵیان. ئامادەشن، زوو دەردە دڵی خۆیان، بەبێ پەروا باس بکەن.

ژن و کچیان زۆر حەز بە خەنە دەکەن، ساڵ دوانزدە مانگ دەست و پەنجە و قاچ وقولیان بەخەنەیە. دوکانی خەنەفرۆش و ڕەسم و لەزگەیان زۆرە.

لەم وڵاتە وەکو زۆربەی وڵاتەکانی ئەفریقیا باوەڕیان بە نووشتە و کشتەک و سیحر هەیە و پارەشی بۆ خەرج دەکەن. زۆرم لێ دیتینە.

ئاهەنگی بووک گواستنەوە، لە نێوان حەوت ڕۆژ بۆ مانگێک دەخایەنێ، هەموو هات و باتەکانیش لە ژێر دەواری گەورە گەورەدا بەڕێوەدەچن. ڕەشماڵەکان سەردەمیانەن و بە چرا و چڵچرا دەرازێندرێنەوە، چاو و قاوە و قاوەخانەی شەو و ڕۆژ پشکۆیان ناکوژێتەوە. بۆ داوەت و زەحفەتیش ئەگەر وشتر سەرنەبڕن ئەوا چواردە پانزدە سەرمەڕ زۆر ئاساییە. چێشت و خواردنی فۆلکلۆری خۆیان لەماڵەوە لێدەنێن، سفرەشیان لەسەر عاردییەوە چوار چوار یان پێنج پێنج لە دەوری لەگەنێک یان بەلەمێک وەردێن و هەموویان بەدەستی نان دەخۆن. پێش نان خواردن و دوای نانخواردن، دەستە دەستە دەستشۆر و مەسینە بۆ دەست شووشتن دێنە بەردەمت. بە(DJ) گۆرانی میللیی خۆیان لێدەدەن، درەنگانی شەوانیش، گەنجەکان لە بن ئەو ڕەشماڵانە، جار هەیە تا بەیانی بۆخۆیان پۆکەر و یاری دەکەن.

ڕۆژی بووک گواستنەوە، لە تەنیشت ماڵی زاوا، ماڵی بووکیش ڕەشماڵی خۆیانی لێ هەڵدەدەن.

جا ئەو گێڕانەوەم، بۆ ئەم دیمەنەی خوارەوەیە، فەرموون سەیری کەن:

دۆست و ئەحبابی ماڵی زاوا بۆ نان خواردنی نیوەڕۆ دەچنە ژێر خیوەتی ماڵی زاوا، ئەوانەی ماڵی بووکیش بانگهیشتی کردوون، دەچنە نێو خیوەتی ماڵی بووکێ. بۆ مەمانان زۆر ناخۆش بوو، هەموو جارێ هەردوو لا داوەتیان دەکردین، نەمان دەزانی چۆن دڵیان ڕابگرین و بچینە لای کام ڕەشماڵ.

دوای نانخواردن، دەبێ هاتوباتی بووک گواستنەوە دەست پێبکات، جا دەبێ زاواش بچی دەستی بووەکەخانێ بگرێ، هەموو جارێ لە هەموو بۆنەیەکی بووک گواستنەوەدا، کە زاوا لە ژێر خیوەت دیتە دەرێ و دەیەوێ بڕوا، دەبینێ تاکێک یان هەر دوو تاک پێلاوی دزراون. ئێ خۆ بە پێخواستیش ناچێتە دیار بووکێ.

نەریتی ئەو لیبیانەوە ئاوایە، دەبێ یەکێک لە ماڵی بووکێ بچێ بە دزییەوە پێلاوی زاوا بدزێ. هەرچەندە ماڵی زاوا ئاگاداری خۆیان دەبن و هەر چاویکیان لەسەر پێلاوی زاوایە، بەڵام هەر دەبێ بیدزن. چۆن؟

فرت و فێل و تەگبیر و پیلانی زۆر سەیر دادەڕێژن. بۆ نموونە، پیرێژنیک یان منداڵێک یان پیرەمێردیک، بە فێڵێک دەنێرنە لای ئەو ڕەشماڵە و ئەویش هەر فورسەت وەرگرێ، پەلاماری پێلاوی زاوا دەدا، جا لە دەرەوە، کوڕی جحێڵ و لاوی ماڵی بووکێ وەک پشیلە خۆیان مات کردووە، چاوەڕوانی پێلاوەکە دەکەن، هەر کە پیرێژن یان منداڵەکە کەوشەکەی بۆی هەڵدان، ئەوا دەیرفێنن و هەڵدێن و خۆیان دەشارنەوە، ئێستا ئەوەی داوەتی ماڵی زاوایە، دەبێ بچێ شەڕی ئەو پێلاوە بکات و وەریگرێتەوە، زاوای بەستەزمان بە پێخواستی نابێ لە ڕەشماڵ بێتە دەرێ و بەربووک و دەستەخوشکانی بووکیش هەر تاوان دەینن و بە زاوا دەڵێن، "ئێستا بۆنایەیی بووکێ ببەی، ئەوە چاوەڕێتە، ئاخر عەیب نییە بووک چاوەڕێت بکا؟"

ئێستا دوو بەرە، بەرامبەر یەک ڕاوەستاون، وەک دوو تیپی تۆپی دەستی، تیپی ماڵی بووکێ، هەموو ئەوانی داوەت کرابوون، وە تیپی ماڵی زاوی، جا پەلاماردان و فڕان فڕان و کەس پێلاوی لە پێ نامێنی هەمووی تێک دەگرن. دەبێ بە هەر شێوەیەک بێ پێلاوی زاوا

لە ماڵی بووکی بستیننەوە بۆ بهیننەوە. جار هەیە ئەو بەزم و ڕەزمە سەعاتێک دەخایەنێ. لە ناو ئەو لم و خۆڵە یەکتر دەگەوزێنن.

پێلاو دز لە لایەن ماڵی بووکی خەلات دەکرێ، ئەوەی پێلاوەکەش بۆ زاوا دەهێنیتەوە ئەویش هەر خەلاتی دەکرێ.

جا لەو بەزم و هەرایە، ڕۆژ ڕۆژی چاوباز و ئاشق و ڕاوچییانە، هەرچی کیژ و کچی جوان هەیە هێ هەردوو لا، بە ئاریشت و پۆشاکی جوانەوە دێنە سەیری ئەو بەزمە، کوڕی جحێل و گەنجەکانیش چاوبازیان لەگەڵ دەکەن و خەندە و غەمزان دەگۆڕنەوە.

حونەری ئەو شەڕە پێلاوە، کە نەریتێکی کۆنە، هەر بۆ ئەوەیە کە کوڕ و کچەکانیان یەکتر ببینن و دڵیان بچێتە یەکتری، تا بەم شێوەیە، زەماوەند و بووک گواستنەوە هەر بەردەوام بێ و ژیان نەوەستێ.

هەشە لەم بۆنەیەدا، چ کوڕ، چ کچ، ڕاوی خۆی دەکا.

لە بووک گواستنەوە وەکو لای خۆمان وێنە و ڤیدیۆ دەگیرێ و کاروانی ئۆتۆمبیلان بەدوای یەکدی دەکەون. ئەوانیش فیربوون. هەیە بۆ بەسەر بردنی مانگی هەنگوین، دەچنە هوتێل و ولاتان.

جاران، موعەمەری پێشینەی ژنهێنانی دەبەخشییە گەنجەکان، زەوی و خانووشی لەگەڵ بوو، دواتر وەردە وردە ئەمە کز بوو. گەورەترین کێشەی کۆمەڵایەتی لە لیبیا، ئەو مارەییە قورس و زۆرەیە، کە بارەکەی بە هەموو گەنجێک هەڵناگیرێ. بۆیە کچی قەیرەیان زۆرە. جا لەو ولاتە هەر بۆخۆیان ئاماری کچیان زۆرترە لەچاو هی کوڕان.

ژن و ژنخوازی و ژن هێنان لە لیبیا، دیارە کەلتووری خۆیان هەیە. بەگشتی ئەوان خێڵەکین، دەبێ بۆ ژنهێنان و شووکردن شێخی عەشرەت ڕازی بێ. تا ئەو دواییەش لە دەرەوەی عەشرەتی خۆیان ژن هێنانیان زۆر کەم بوو دواتر لە دەرەوەی عەشرەتی خۆشیان دەیانهێنا.

ئەوەندەی ئەمن لەوێ بووم و لەگەڵیان تێکەڵ بووم، هەر یەک یان دوو کەسم دەزانی کە دوو ژنی هەبێ. دەنا دووژن و سێ ژن و چوار ژنیان نییە. دیارە ئەوەش لەبەر هێز و دەسەلاتی خێڵە کە مافی ژنی پاراستووە. قەزافیشی لە پەیام و وتەکانیدا باوەڕی بە فرەژنی نەبوو.

بەڵام.....!

لەبەر ئەوەی شاری سرت وەکو تکریت و عۆجەی عێراق بوو، دەتوانم بڵێم خەڵکی ئەو شارە حوکمڕانی هەموو لیبیایان دەکرد. جا دامودەزگا و فەرمانگە گرنگەکان لەدەست وان دابوون. بۆ نموونە، زۆربەی دائیرە و شەریکە و دامودەزگاکانی تەرابلس بەدەست خەڵکی سرتەوە بوون. بۆیە زۆر لەوان لە پایتەخت کاریان دەکرد و دەژیان بەڵام ژن وماڵیان لە سرت بوو، حەفتانە یان، مانگێ دوو سێجار بەسەردان دەهاتنەوە. دەیانگوت: هێندێک لەو کەسانەی لە پایتەخت کار دەکەن، بە دزییەوە ژنیان هێناوە. ژنەکانی خۆیان دەزانن، بەڵام لەترسی ئەوەی نەکۆ پیاوەکەیان بەیەکجارەکی دەستبەرداریان بن و لێکبترازێن خۆیان کڕ و بێدەنگ دەکرد. دراوسێمان هەبوو پۆستی گەورەیان هەبوو لە پایتەخت هەر بەسەردان داهاتنەوە سرت، خێزانەکانیان دەیانگوت، کە شک دەکەن مێردەکانیان ژنی قاچاغیان هەبێ.

پیاوی لیبی لە بێگانە ژن ناهێنن، بە دەگمەن، هەیە ژنەکەی میسرییە. ژنیش نادەنە بێگانە. چەند مامۆستای کورد و عێراقی و میسری، خوازبێنی کچە خوێندکارەکانی خۆیانیان دەکرد، بەڵام قبوڵیان نەدەکرد. ئەگەر هەستیشیان بکردبا، پەیوەندیی خۆشەویستی لە نێوان کچەکانیان و کەسێکی غەریبە هەیە، زوو غەریبەکەیان نەقڵی شارێکی دیکە دەکرد. جار بووە ناخۆشیشی تێکەوتووە.

بووک (ئەو کات من لەوێ بووم ) بە کیلۆ زێڕێ بۆ دەکرا، هەبوو تا دوو یان سێ کیلۆ. دەبوویا زاوا بۆ خەسووشی یەکدوو پارچە زێڕ بکاتە دیاریی. پارچە زێڕەکانی ئەوان گەورە و قورسە، وەکو لای خۆمان جوان و بە نەقش و نیگار نیین. بازنیان دەڵێ کوورتە لوولەی سەماوارە، گەورە و ئەستورە، چوار پەنجە پان دەبێ... دەبێ زاوا خانووی ماڵی خۆی و ماڵی خەزووری نۆژەن بکاتەوە، ئەگەر خانووەکانیان کۆن بێ.

ژووری نوستنی (ژن و پیاو) هەمیشە قوفڵدراوە، نابێ کەس کەس بچێتە ئەو ژوورە و بیبینی. منداڵەکانی خۆشیان نابێ سەری پێدابگرن. شەوان لەو ژوورەدا، بۆن و بخورێکی زۆر بڵاودەکەنەوە. بخووری گرانبەها هەیە تایبەتە بە ژووری نووستن. شەوانە بووک (یان ژن)، لە پشت دەرگای قوفڵدراو، دەبێ کراسی سەماکردن لەبەرکات و دەفە و دمبک

لە دەست بۆ میردەکەی بڕەقسێ و سەما بکا. ئەمە کەلتووری وانە. بەم بەزم و ڕەزمە کەیفی شەوانەی خۆیان دەکەن.

تا ئیستا هیچ کەسم نەدی، بەقەد خەڵکی لیبیا حەزیان لە بۆن و گوڵاو و عەتری خۆش بێ. پارەی باشی پیدەدەن. ژنەکانیان، هەر حەز دەکەی هەناسەیان لەکن هەڵمژی. پیاوەکانیان پتر لە ژنەکان حەز لە بۆن دەکەن. قەت ئۆتۆمبیلیان بێ شووشە عەتر نییە، زۆربەی جار پیش ئەوەی لە ئۆتۆمبیل دابەزن، خۆیان و ئەوانەی لەگەڵیانن عەتر پژین دەکەن. تەنانەت کە منداڵەکانیشیان دەنیرنە مەکتەب بۆنیان پیدادەکەن. ناو پۆلەکانیان بۆنی خۆشی لیدێ، ناوماڵەکانیشیان.

ئەوان چارۆگەیەکی تایبەتی خۆیان هەیە ژنە بەتەمەنەکان بەسەر سەری خۆیان دادەدەن پی دەڵین (فەڕاشییە)، بەڵام جحیلەکان نا. کچەکان زۆریان لەچکپۆشن. وەک ئەوانەی لای خۆمان زۆر بە توخی میکیاژ ناکەن، بەڵام کە بۆنەی خۆشی، دەبێ و ئاهەنگ لە ماڵەوە دەگیرن، لەگەڵ ژنانی دیکە، نیمچە ڕووت وبە تەنوورە کورت، سەما و ڕەقسی خۆیان دەکەن و دمبگ دەکوتن و گۆرانی میللیی دەچڕن.

زۆربەیان کە کچیان، چووە زانکۆ دەبێ ئۆتۆمبیلیان بۆ بکڕن. لەوەێ ژنیش ئۆتۆمبیل دەئاژووێ.

لە لیبیا ئەگەر کوڕ یان کچ زمان بۆ یەکدی دەربینن، ئەوا زۆر بێ ئەدەبییەوە، جا چ وەک جنیودان یان چ وەک مەیلی یەکدی کردن!

## (٣٢)

# ماڵپەڕەکەی قەزافی بە زمانی کوردی

قسەکردن لەسەر کەسێتیی موعەمەر قەزافی، هەروەک ئەوە وایە، لەگەڵ هاوڕێیەکت لە کەنار گۆمێکی قول و مەنگ دانیشتبی و باسی جیهانی ژێر ئەو گۆمەی بۆ بکەی کە هیچ کامتان بناوتان بەناویدا لینەدابێ. قەزافی پیاوی خاوەن هەزار و یەک خەون بوو، بەڵام خەونی بەدەر لە عالەمی وڵاتەکەی خۆی، بۆیە ئەو هەمیشە وەک مرۆڤێکی نامۆ و غەریب، لە چاوی دۆست و ئەغیار سەیر دەکرا. قەزافی ئەو سەرکردە بوو کە دەوروپشتەکەی، ئێستاشی لەگەڵ بێ، لە زمانەکەی ئەو حاڵی نەبوون! ئەوەی دەینووسم ستایشی ئەو (قارەمانە یان دیکتاتۆرە) نییە، بەقەد ئەوەی داتەکاندنی تەپۆتۆزی ڕۆژگار و قەدەر و دەستەکانە لەسەر ڕووی تەپۆتۆزاویی ئەو(مەسیحە یان شەیتانە). ئەو کەسێکی ڕۆشنبیر و بەئاگای جیهانی ئایین و فەلسەفە و مێژوو بوو. قورئانی پیرۆزی لە بەرگە و بۆ بەرگ ئەزبەر بوو. جارێک کە (موزەفەر نەواب)ی شاعیری عێراقی، لە حزووری ئەودا شیعر دەخوێنێتەوە و(قەزافی) قامتێک ڕەخنە لە کۆبەرهەمەکانی دەگرێ، ئەو گەشکە دەیگرێ و دەڵێ تا ئێستا ڕەخنەگرە عێراقییەکان سەرنجی وا وردیان لە سەر شیعرەکانی من نەداوە، جا بۆ زانیاریتان لەو کۆڕەدا (موزەفەر نەواب) قەسیدە بەناوبانگەکەی دەخوێنێتەوە، کە جنێو بە هەموو پاشا و مەلیک و حاکمەکانی عەرەب دەدا و ناونیشانی قەسیدەکە ( یا اولاد الگحبە) یە.[٤]

(قەزافی) خاوەن (١٠) کتێبی چاپکراوە، بابەتەکانیان فکری و سیاسی و ئەدەبی و چیرۆکی کورتن. چیرۆکەکان باشتر هزر و بیروباوەڕی ئەو پیاوە نمایشدەکەن، ئەوەی کە من لە چیرۆکەکانیم هەڵهێنجاوە ئەوەیە: چونکە قەزافی کوڕی بادیە و بیابانە، حەزدەکات یان خەون دەبینی، کە خەڵک بۆ گوند و لادێ و باوەش سروشت بگەڕێنەوە. ئەو حەز بە

4 ) موزەفەر نەوابی شاعیری عیراقی ( ١٩٣٤- ٢٠٢٢)، دوای ئەوەی بەشار ئەسەد، لە دیمەشق دەریدەکا، دەچێتە لیبیا، لە ساڵانی (١٩٧٨ – ١٩٩٠)، قەزافی خزمەتێکی زۆری دەکا و پاسەوان و جێگە و گوزەرانی باشی بۆ دابین دەکات و پەساپۆرتی لیبیی پێدەبەخشێ.

ژیانی خاکی و ساده و ساکار دەکا. زۆر لە ژیانی شارستانییەتی سەردەم پەستەو خەمی پێدەخوا. ئەو لەو باوەڕەدایە کە سەرزەوی بەرەو بۆگەن بوون و پیس بوون دەچێ، بۆیە تەمەنا دەکات بتوانی سەرزەوی بەجێبهێڵێ یان ئەوانەی لە ئاسمانن بێنە خوارەوە و ببنە فریادڕەس!

بێگومان ئەو جگە لەم (١٠) کتێبە، خاوەن سەدان وتار و گوتاری دیکەیە. ئەوەی کە کرۆکی باسەکەی ئێمەیە، ئەو بابەتانەن کە پەیوەست بە کورد. ئەو لە سەرەتای نەوەتەکانی سەدەی ڕابردوو، ماڵپەڕێکی لە ئینتەرنێت هەبوو بە ناوی (قذافی یتحدث)، لەسەرەتا هەر بە زمانی عەرەبی و ئینگلیزی و فەرەنسی بوو، دواتر بە چەندان زمانی دیکەش بابەتەکانی بڵاودەکردەوە. دوو خاڵی گرنگ لە بەشە کوردییەکەی ئەو ماڵپەڕە سەرنجی ڕاکێشام: خاڵی یەکەم: (قەزافی) دوو وتاری تایبەتی بۆ کورد نووسی و لەوێ بڵاوی کردەوە، ئەو لە هەر دوو وتارەکە ڕووی دەمی لە کوردەکانی کوردستانی باشوور بوو. وتاری یەکەمی، دوای ڕاپەڕینی (١٩٩١) بوو. تێیدا نمایشێکی مێژووی بزوتنەوەی ئازادیخوازی کوردستان دەکات لە سەردەمی شێخ سەعیدی نەمرەوە تا ڕۆژی ڕاپەڕین. بە کوردی و کرمانجی، پێیان دەڵێ شانازی بە دەسکەوتەکانتان مەکەن، چونکە لە سەردەمی نوری سەعید ئێوە خاوەی سێ هێندە ئیمتیازات و دەستکەوت بوون لە عێراق. ئەوەی ئێوە دەیکەن فرۆشتنی خوێنی شەهیدەکانتانە. وتاری دووەمی، ڕێک لەگەڵ هێنانە خوارەوەی پەیکەرەکەی سەددام بوو لە گۆڕەپانی ئەندەلووس (٢٠٠٣). ئەم وتارەی بە زمانێکی زۆر توند، زۆر توڕە، زۆر پڕ گلەیی نووسیوە، ناونیشانی وتارەکەی، پەندێکی میسری بوو، کە بەرانبەرەکەی بە کوردی دەبێتە: (جا دیسان کوردەکان دەستیان لە بنی هەمبانەکە دەرچوو!)

(قەزافی) لەم وتارەدا خۆی بە براگەورە دادەنێ و تکا و ڕجا لە سەرکردەکانی کورد دەکات، کە ئەم هەلە زێڕینە لە قیس خۆیان نەدەن، تا زووە دەوڵەتی سەربەخۆیی کوردیی خۆیان ڕابگەیەنن، دەنا تا سەدەیەکی دیکە ئەم هەلە بۆ کورد هەڵناکەوێتەوە. ئەو دەڵێ، ئێوە بۆچی ئەم ڕووبارە خوێنەی ڕۆڵەکانی خۆتان بەخشی؟ بۆچی ئەو هەموو مەرگەسات و نکبەتییەتان بەسەر خۆتان هێنا؟ بۆ ئەوە نەبووە تا ئازاد و سەربەخۆ بن؟ بۆ ئەوە نەبووە تا

دوژمنەکەتان لاواز بکەن و چۆکی پێدابدەن؟ ئێ! ئەوە بەغدا ڕوخا... سەددام نەما... خۆتان هێز و دەسەلاتن. پێم نالێن چاوەڕوانی چی دەکەن!

وەک بڵێی ئەو پیاوە لە ناو دڵی سەرکردەکانی کوردە بووە، بۆیە زۆر لێیان نائومێدە و پێشبینی ئەوە دەکات، کە ئەوان ئەو بڕیارەیان نەبێ کە ئەو سەربەخۆییە ڕابگەیێنن (دەکرێ ئێوەش بگەڕێنەوە سەر یاداشتەکانی برێمەرکە حاکمی عێراق بوو، جا دەزانن کە بۆچوونەکانی قەزافی و برێمەر، لەمەڕ ئەم مەسەلەیە چەند لێک نزیکن و چەند زیرەکانە کەسێتیی ئێمەیان خوێندبۆوە.) بۆیە (قەزافی) ئەو ناونیشانەشی بۆ وتارەکەی هەڵبژاردووە. پێشبینییەکەشی ڕاست دەرچوو، ئەوە (٢٠٢٣) وە سەربەخۆ نیین.

خاڵی دووەم، کە لەو ماڵپەرەی (قەزافی) جێگەی هەڵوەستەیە، زمانی ماڵپەڕەکەیە. کە بەشێوەزاری سۆرانی (موکریانی) دەنووسرا. لێرەش دوو (پنت) قسە هەڵدەگرێ. یەکەم: کێ بەم کوردییە پاراو و جوان و بەپێزە ئەو بابەتانەی دارشتۆتەوە؟ ئەو کەسە وا پێدەچێ قەڵەمێکی بەتوانا بێ. تەنانەت پەندەکانی عەرەبیشی گۆڕیوە بۆ پەندی کوردی کە هەمان واتا و ئاماژە دەدەن. پنتی دووەم: ئایا (قەزافی) ڕاوێژپێکرای کوردی هەبووە، دەنا چۆن ئەو هەموو زانیارییە وردەی دەربارەی کورد زانیووە؟ ئەو لە وتاری یەکەمی دا، باسی بەڕێز (عەزیز محەممەدی) سکرتێری پێشووی حیزبی شیوعی دەکات، هەر دەڵێی لە دەشتی قەراج نان و پیوازی لەگەڵ خواردووە، کێ ئەو زانیارییە تایبەتیانەی گەیاندۆتە سەرکردەیەکی وەکو (ئەو)؟ ئەمانە بۆمن جێگەی پرسیارن.

ئەمەش، دەقی یەکێک لە بابەتەکانە کە لە ماڵپەڕەکەی قەزافی بلاوکراوەتەوە:

(جا دیسان کوردەکان دەستیان لە بنی هەمبانەکە دەرچووا!)

بە قەڵەمی: موعەمەڕ قەزافی

(لە وڵاتی میسردا، وا بە کەسێک دەڵێن کە دەدۆڕێت.

وا کوردەکانیش دۆڕان و دەستییان لە بنی هەمبانەکە دەرچوو.

باشە، دەستکەوتی کوردەکان چی بوو لە گرێبەستەکەیاندا لەگەڵ عێراق؟ هیچ! تەنها لە ئامێزیگرتنی سەربازانی داگیرکەر و ماچ و مرچی ڕوومەتی داگیرکەرە نوێیەکان و تاوانبارکردنییان بە خیانەتی مەزن و خۆهەڵواسینیان بە داگیرکەر.

بەڵام بارودۆخی کوردەکان هیچ نەگۆڕا، بەڵکوو دژووارتر و ناخۆشتر بوو، هەرنەبێ لە ڕووی ڕووخسار و ئەدگاردا خراپتربوون.

ئیمە واپێشبینیمان دەکرد، لەو هەل و مەرجە مێژووییە دڕاماتیکییەدا، کە دەرفەتێکی مێژوویی بۆ کورد هەڵکەوتووە، بۆ خۆیان دەیقۆزنەوە ـــ وەک چۆن جووەکان ساتەوەختی ڕووخانی بەرلین و شکانی دەوڵەتانی میحوەر و سەرکەوتنی هاوپەیمانەکانیان لە جەنگی دووەمی جیهانیدایان قۆزتەوە، کوردانیش ئیعلانی ئەو دەوڵەتە کوردییە دەکەن کە خەون و هیوای لە مێژینەی ئوممەی کوردیی چەوساوە و لەتلەتکراوە. هیچ، هیچیان نەکرد، هەر وەک ڕەعییە لەو دەوڵەتانە مانەوە کە لێبوون. کوا چی نوێتان وەدەستهێنا؟ دەستکەوتتان چی بوو؟ هیچ! کوردەکە، هەر هاوولاتییە نمرە دووەکە و سێیەکەی جارانە لە هەموو خۆرهەلاتی ناوەندا.

گاڵتەتان پێدەکەن، کە هۆشیار زێباریتان بۆ دەکەنە وەزیری دەرەوەی عێراقی ئێستا. سەرهەنگ نورەدین محەممەد و ئەحمەد بابان سەرۆک وەزیران بوون، هەردووکیان کورد بوون، تەنانەت وەزیری ئەشغال و ڕێگاوبان و ناوخۆ و داد و دارایی و بەرگریش کوردبوون. سەرۆکایەتیی ئەرکانی سوپای عێراقی هەر سێکیان کورد بوون: فەریق بەکر سدقی و فەریق حوسێن فەوزی و فەریق ئەمین زەکی. ڕێژەی فەرمانبەران لە دەوڵەتی عێراقیدا (٢٥٪) و لە ناوچە کوردنشینەکاندا (٩١٪) بوون. ئەوان لە گوند و شارەدێ و ناحییە و قەزا و پارێزگاکاندا ئەنجومەنی خۆیان هەبوو.

هەردوو زمان، کوردی و عەرەبی، زمانی فەرمی بوون لە هێندێ پارێزگادا، وەکو پارێزگای سلێمانی. زمانی خوێندن بوون لە قۆناغەکانی بنەڕەتی و ناوندەی لە دەڤەرە کوردییەکاندا. لە شەستەکانی سەدەی ڕابردوودا، زمانی عەرەبی زمانی دووەم بوو بۆ کوردەکان.

پێشبینی دەکرا لەو ڕووداوە مەترسیدارەی ناوچەکەدا، لە نێو چڕەدوکەڵی ئەو تەقینەوە گەورەیەدا، دەوڵەتی کوردی لە دایک ببێت و کوردان لە چەوسانە و کۆت و سندم و کووشتن و بڕینە ڕزگار بکات، کە بە درێژایی مێژوو تالاوی مەرگەساتی دەنۆشن.

دەبێ دیسان، بگەڕێنەوە بۆ سەردولکە بە ئازارەکان: بەختی کوردان، هەر بەختی حەسرەت و ئاخ هەڵکێشان و لەدەستدانی دەرفەتیی مێژووییە، سەرەڕای شۆڕشەکان و قوربانییەکان و ڕاپەڕینەکان.

چی نوێی هاتە کایەوە؟ کوردەکان هەر هاوونیشتیمانی عێراقین وەکو جاری جاران. کەواتە، کورد قازانجی چی کرد لەو ئاهەنگەی لەدایکبوونی عێراق، کە ولاتەکەی کاول و وێران کرد؟ لەمەش پتر، کورد، هەر ئەوانەن کە لە عێراقن؟ یان ئەو زۆرینەشن کە لە دەرەوەی عێراق دەژین؟ چۆن، بە چ حەقێک ئێوە دەتوانن بریار لە چارەنووسی زۆرینەی کوردی دەرەوەی عێراق بدەن، بە پشتبەستن بە کەمینەی ناخۆ؟

ئاخۆ، کێن ئەوانەی بازرگانیی بە خوێنی قەزیە پیرۆزەکەی کوردان دەکەن؟ کێن ئەوانەی خوێنی هەزاران شەهیدی کورد نۆش دەکەن؟ باشە، دەستکەوتی فرۆشیار و کڕیار چییە؟!

ئەمە بەری خوێنی گەشی ڕژاوی کوردەکانە لە شۆڕش و ڕاپەڕینەکانی عەبدوڵلا نەهری و بەدرخان و بۆتان و نەقشبەندی و شەهابەدین و شێخ سەعید و شکاک و حەفید و ئیحسان نووری و ئەحمەد بارزانی و ڕەزا و مستەفا بارزانی؟!

ئەگەر ئێمە، لە چرکەساتێکی مێژوویدابین، لەم ئان و ساتەدا و بانگەشەیی ئازادیی گەلانی ژێردەستە بکەین، ئەوا قەت هیچ گەلێک، لە هیچ شوێنێک نییە لە گەلی کورد چەوساوەتر و ژێردەستەتر. گەلێک نییە لە کوردان مەزلومتر. ئەو ڕیپاکارییە چییە لە مەسەلەی چارەنووسەکاندا؟ بۆ هەمووان پشتی ئوممەی کوردی ناگرنن؟ بۆ ئیعلانی سەربەخۆی و یەکێتیی وان ناکەن و شمشێری جەور و ستەمیان لەسەر گەردن هەڵناگرن؟ جێی تیدایە با ببنە دراوسێ و برای شیریی ئوممەی عەرەبی و فارسی و تورکی، بۆ نابێ؟! کێ کوردی هەڵخەڵەتاند؟ کێ مامەڵەی بە قەزیەکەیانەوە کرد؟ کێ ئەوانی فرۆشـت؟)

/http://www.arabic.algaddafi.org

## (٣٣)

# قەزافی و کورد

ئەو ناونیشانە پەرێکی زۆر پردەکاتەوە، بۆیە هەر چەند سەرە قەڵەمێک دەخەینە بەرچاو. هەرچەندە باسەکە باسێکی مێژوویی هێندە دێرین نییە کە دەستمان نەگاتە بەڵگەنامە و ژێدەرەکانی.

مامۆستا ئەحمەد سالاری هونەرمەند، لە چاوپێکەوتنێکی تۆمارکراودا، دەڵێ:"لە ڕۆژنامەیەکی کوردی، دژ بە قەزافی، وێنەیەکی بچووکی ژنێک بڵاوکرابۆوە، کە گۆیا جوولەکەیە و دایکی قەزافییە، منیش بینیم و گوتم، ئەوە ژنە هەمەوەندە، وەک ئەوانەی لای خۆمان خاڵ و میلیی لەسەر ڕوو بوو، پاشان فەلەکەدین کاکەیشی، پشتڕاستی کردەوە کە ئەو دایکی قەزافییە و بە ڕەچەڵەک هەمەوەندە".

سەربوردەی پەرتەوازبوون و نەفی کردنی هەمەوەندەکان بۆ لیبیا، بەم شێوەیە: لە سەردەمی سوڵتان عەبدول حەمیدی دووەم(١٨٧٦ - ١٨٧٨)، چەکدارانی هۆزی هەمەوەند، هەمیشە کاروانەکانی نێوان بەغدا و مووسڵ و سلێمانییان، لە ناوچەی چیای حەمرین ڕووت دەکرد و دەستکەوتی باشیان دەبوو. سوڵتان هێزێکی گەورە نارده سەریان و لە دوو شەڕی خوێناویدا چەکدارەکانی هۆزی هەمەوەند، بە سەرۆکایەتیی حوسێن ئاغا، دەشکێن و زۆربەیان هەڵدێن بۆ تارانێ. دواتر بابی عالی، لە ئەستەمبوڵ فرمانی لێخۆشبوونیان بۆ دەردەکات و ژمارەیەکی زۆریان دەچنە ئەستەمبوڵ، چونکە ئەوان زۆر ئازا و بە جەوهەر دەبن، سوڵتان دەیەوێ بیان کاتە پاسەوانی خۆی، بەڵام لە ترسی ئەوەی ڕەنگ بێ ئاژاوە بنێنەوە، لە سەر داوای والی عوسمانی ئەحمەد ڕاسم پاشا(١٨٨١ - ١٨٩٦)، لە تەرابلووس، لە (١٨٨٧/٩/١٢)، (٢٢٣) خێزانی هەمەوەند نەفی دەکرێن بۆ بەنغازی و دەوروپشتی تەرابلووس. بەڵام لەویش، کوردەکان شۆڕش بەرپادەکەنەوە و حوسێن ئاغا دەکوژرێ و زۆریان بەرەوە مەفتەنی خۆیان، بە عەزاب و مەشەقەتێکی زۆر دەگەڕێنەوە. جا تاکو ئێستاش، نەوەکانی هێندێ لەو هەمەوەندانە لەو شارانەی لیبیا دەژین و گەڕەکیان بە ناوی گەڕەکی کوردان هەیە.

لە بڕگەکانی پێشتردا، باسی ژیاننامەی قەزافیمان کرد، گوتمان هۆزەکەی ئەو سەدان ساڵە لە لیبیا ژیاون و چەندان بەرە بابیان لێکەوتووەتەوە، بۆیە، گەڕاندنەوەی ڕەچەڵەکی قەزافی بۆ هۆزی هەمەوەند، ڕێی تێناچێ و لە شەجەرەی ئەو خانەوادە شتێوا ئاماژەی پێنەکراوە.

کاک بێستوون عوسمان مام یەحیاش، لە نامەیەکیدا بۆی نووسیووم:" ڕۆژێک مێوانی کەریم ئاغای هەمەوەندی بووم و باسی قەزافی کرا، پرسیم: ڕاستە دەڵێن ئەسڵی کوردە؟ گوتی: بەڵێ، ئەسڵی کوردی هەمەوەندە. گوتم: باشە بۆ ئیعلانی خۆی ناکات؟ گوتی: پێم گوتوە، بەلام گوتویەتی من بەم هەموو عروبەی خۆمەوە عەرەب و دونیا دوژمنمە، جا چ جای ئەگەر بڵێم ئەسڵم کوردی هەمەوەندە! دانیشتن و وێنە و قسەکانم لا ماوە بۆ مێژوو. کەریم ئاغای هەمەوەندیش ڕۆحی شاد".

دەکرێ لە ڕێی پشکنینی(DNA) ئەو ساغ بکرێتەوە، منداڵی قەزافی ماون و نەوەی هەمەوەندیش لێرەن. بەلام لەبیرمان نەچێ، لە نێوان مێژووی نەفیکردنی هەمەوەندەکان بۆ لیبیا و لەدایکبوونی قەزافی، هەر (٥٥) ساڵە. ئەمە یەکناگرێتەوە لەگەڵ ئەو بۆچوونە.

لە (٢٨)ی ئایاری (١٩٩٠)، کۆبونەوەی لوتکەی کۆمکاری عەرەبی لە بەغدا بەسترا، کە ژمارەیەکی زۆر لە مەلیک و حاکم و سەرکردەکانی وڵاتانی عەرەبی تێیدا بەشدار بوون، قەزافیش بانگێشت کرابوو، ئەوکاتەی سەددام و یاوەرەکانی چاوەڕێی گەیشتنی ئەو دەکەن، دەبینن، تەواوەک دوا دەکەوێ، دواتر کە دەگاتە لایان پێیان دەڵێ:"من چوومە زیارەتی گلکۆی باپیرە گەورەمن، ئیمام مووسای کاظم و نوێژم لەوێ کرد." قەزافی لە بۆنەیەکی دیکەشدا، هەمان زانیاری دووبارە دەکاتەوە کە ئیمام مووسای کاظم باپیرە گەورەیانە. خودی مامی قەزافیش، ئەوەی بە من گوت. بەلام ئەو زانیارییەش، قەزافی بە کورد نابەستێتەوە، چونکە ئیمام موسای کاظمی( ١٢٨– ١٨٣ ک.) نە کورد بووە و نە لە کوردستانیش لەدایک بووە.

لە (١٦)ی ئاداری (٢٠١٧)، کەناڵی تەلەڤزیۆنی ڕووداو چاوپێکەوتنێکی لەگەڵ ئەفسەرێکی دێرینی سوپای عێراقی کرد بە ناوی محەممەد کەریم زاخۆیی، کە لە ساڵی (١٩٥٦) لە کۆلێژی ڕۆستەمییە، لە بەغدا، ڕاهێنەری سەربازیی ئەو گرووپە قوتابییە لیبییانە بووە کە هاتوون بۆ مەشق و ڕاهێنان و خوێندنی سەربازیی. بە قەولی ئەو، قەزافی یەکێک لەو قوتابییانە بووە.

بەڵام قەزافی لە ساڵی (١٩٦٣) چووەتە ئەکادیمیای شانشینی سەربازیی لە بەنغازی، واتا (٧) ساڵ دوای خولی قوتابییە لیبییەکان ــ مەگەر ئەو زاتە (لەدایکبووی ١٩٢٧)، ساڵەکەیٰ لێتێکچووبێ و هیچ سەرچاوەیەکیش ئاماژە بە خوێندنی قەزافی لە عێراق ناکات.

کەواتە، هاوسۆزی و پشتیوانیی ئەو سەرکردەیە بۆ کورد و بۆ قەزییەکەی، پەیوەست نییە بە هاوخوێنی و ڕەچەڵەکەوە، بەڵکوو ڕەنگدانەوەی باوەڕ و فەلسەفە و تێگەیشتنی هزریی خۆیەتی. ئەو پاشخانێکی فەرهەنگیی دەوڵەمەندی هەبوو دەربارەی شۆڕشی فەڕەنسی و مێژوو و جۆگرافیا و مێژووی سیاسیی نەتەوەکانی عەرەب و تورک و کورد و فارس. دەیان کتێبی دەربارەی سەرکردە ناودار و زانا مەزنەکان خوێندبۆوە، زۆریش لە ژێر کاریگەریی بیروباوەڕی نەتەوایەتیی جەمال عەبدولناصر بوو. تۆفیق ئەل منستیری، کە هاوڕێی تەمەنی قەزافی بوو، دەڵێ:"فەلسەفە و بیروبۆچوونەکانی ژۆن ژاک ڕۆسۆ، زۆر گاریگەریان لەسەر کەسێتیی ئەو زاتە هەبوو، یەکێک لە هاوڕێیەکانی، کە فەرەنسی و عەرەبی دەزانی، بەند بەند کتێبەکانی ڕۆسۆی بۆ تەرجەمە دەکرد. زۆر سەرسام بوو بە بیروبۆچوونە سیاسییەکانی و حوکمی سرووشت و دەسەڵاتی گەل و جوانی سرووشت. قەزافی زۆر شتەکانی ئەوەی بە ژیان و گوزەرانی خانەواداە دەشتەکییەکەی خۆی دەبەستەوە ".

بە چاوخشاندنێکی خێرا بە مێژووی ئەو (٨٠) ساڵەی دوایی، ڕۆژهەڵاتی ناوەند بە تایبەتی و جیهان بە گشتی، دەبینین، سەرەڕای ئەو هەموو شەڕ و پێکدادانە خوێناوییەی نێوان کوردانی باشوور و حکوومەتەکانی بەغدا، قەت سەرکردەیەک، مەلیکێک، حاکمێک لەو دەوڵەتانەی نزیک یان دوور، نەهاتن ناوبژیوانییەکی مرۆڤدۆستانە لە نێوان ئەو دوو بەرە دا بکەن و ئاوێک بەو ئاگرەدا بکەن. دەنا کێشە و داواکارییەکانی کورد، هێندە قورس و گران نەبوون کە لە کەش و هەوایەکی برایانە و ئاشتیانەدا، جێبەجێکردنیان ئەستەم بێ. بە پێچەوانەوە، چەندان جار، ئەگەر لێک نزیکبوونەوەیەکیش لە ئارادابووبێت، دەستی دەرەکی هاتووە و ویستوویەتی تێکیبدا و ئاشتی و ئاسایش نەگەڕێتەوە ناوچەکە، بە تایبەتی تورک و فارس، زەبری کووشندەیان لە ئێمە داوە! هەمیشە ئەو شەڕوشۆڕانە لە قازنجی بازرگانانی شەڕ بووە.

لە نێو ئەو سەدان مەلیک و سەرکردە و بیرمەند و چالاکوانی دونیا هەر دوو سێ قارەمان، ئازایانە و بوێرانە داکۆکیان لە نەتەوەی کورد کردووە و داوای پشتیوانی و هەماهەنگییان کردووە بۆ وەدەست هێنانی مافی چارەنووس. خەباتگێری ناوداری ئەفریقیایی، نیلسۆن ماندێلا (١٩١٨ – ٢٠١٣)، خاتوو دانیال میێترانی دایکی کوردان (١٩٢٤ – ٢٠١١)، وە موعەمەر قەزافی، ناویان لەسەر زارانە.

لە دیدیی قەزافیدا، ڕیاییکارێکی زۆر زەق و ناشیریین لە پەیام و گوتاری سەرکردە و ڕەهبەرەکانی عەرەبی و غەیرە عەرەبیدا هەیە، ئەوان هەر زار بکەنەوە، زاراوەی دیموکراسی و مافی مرۆڤ و ئاشتی و ئازادی و یەکسانی و دادپەروەرییان لێ دەبارێ، بەڵام لەسەر ئەرزی واقیعدا، دیکتاتۆر و شەڕخواز و دژی مرۆڤایەتی و ئازادی و یەکسانین و لە لوتکەی نادادپەروەردیی و کۆیلایەتی و خۆپەرستییدان. هەرگیز وگوتار و ڕەفتاریان یەک نەگرنەوە!

قەزافی لە چەندان بۆنەدا، بە زمانێکی ساکار و ڕەوان دیدی خۆی بۆ مەسەلەی کورد، لە کۆبوونەوە و گۆنگرە و بۆنەکاندا، بە بەرچاوی دونیا ڕوونکردۆتەوە، ئەو جارێک گوتی:

"هاوسۆزی من بۆ کورد، دژایەتیکردنی تورکیا یان ئێران یان وڵاتانی عەرەبی نییە، بەڵکوو لەبەر ئەوەیە کە کورد نەتەوەیەک پێکدێنن، خاکی خۆیان هەیە و دەبێ ئەو جۆرە نەتەوە، هاوپەیمانیی وڵاتانی عەرەب و ئێران و تورکیا بن. پێویستە ئێمە دەرفەت بدەینە کوردەکان بۆ خۆیان دەوڵەتی خۆیان لەسەر خاکی خۆیان دروست بکەن و دەرفەتیان پێ بدەین تا خۆیان کۆکەنەوە و یەکبگرنەوە. کوردەکان ناچارکراون کە بەربەرەکانیی هەموو ئەو وڵاتانە بکەن کە ئینکاریی بوونیان دەکەن و ئەوانیش دەیانەوی وجودی خۆیان بسەلمێنن ".

لە وتارێکی جەماهیریدا لە کانوونی یەکەمی (١٩٨٠)، ئەو گوتی:"کێشەی کورد، تەنها بە دامەزراندنی دەوڵەتی کوردی، چارەسەر دەکرێت".

لە (٢٩)ی ئاداری (١٩٨٥)، لە تەرابلووس، پێداگری کرد و هاواری کرد،"کورد حەقی دەوڵەتی خۆی هەیە".

کاتێک، نەجمەدین ئەربەکان(١٩٢٦ – ٢٠١١) سەرۆک وەزیرانی تورکیا و سەرۆکی حیزبی (ڕەفا)، لە ساڵی (١٩٩٧) بۆ پتەوکردنی پەیوەندیی ئابووری و بازرگانی و سیاسیی

نیوان تورکیا و لیبیا، لەگەڵ دەیان لە بازرگان و خاوەن کۆمپانیاکانی تورکیا، سەردانی تەرابلسیان کرد، ڕوو بە ڕوو، قەزافی، بە بەرچاوی میدیاکانەوە پێیگوت:"بارودۆخی کوردانی تورکیا دژوار و پڕ زەحمەتە، مافی ئەو کوردانە بدەن، ئەوان پتر لە (١٠) ملیۆن کەسن .ئێوە ئەوانتان لە هەموو مافێک مەحروم کردووە. کەمترین مافیان نییە. ئەوانیش وەکو ئێوە نەتەوەیەکی سەر ئەم زەمیینەن و مافی خۆیانە دەوڵەتی خۆیان هەبێ تا لە ژێر خۆردا بە ئازادی بژین. چۆن تۆ سەردانم دەکەیت و دەزانی من لەگەڵ مافی کوردانم؟ کە دەبێ ئازادییان بۆ فەراهەم بکرێ لە تورکیا و عێراق و ئێران، تەنانەت لە سووریاشدا."
یەکسەر، ئەربەکان و یاوەرەکانی، بەبێ واژووکردنی هیچ گرێبەستێک، ڕێ و ڕێ بە تورەیی ملیخۆیان شۆڕکرد و گەڕانەوە. ئەوا لە کاتێکدا بوو کە لیبیا قورسترین گەمارۆی ئابووری و دارایی و هاتووچۆی لەسەر بوو و وڵات تەواو پەرێشان بوو، بەڵام قەزافی ئامادە نەبوو، سازش لەسەر بیروباوەڕی خۆی بکات.
ئەو یەکەم سەرکردە بوو لە جیهان، هەر ئەو شەوەی سەرۆک عەبدوڵلا ئۆجەلان دەستگیرکرا، وتارێکی توند و هەڕەشەئامیزی خوێندەوە و داوای ئازادکردنی دەستبەجێی ئەو زاتەی کرد. ـــلێرە لە بڕگەیەکی دیکەدا ئەو بابەتە ئاماژەی پێدراوە.
ئەو، بە بەرچاوی دونیاوە، ئاڵای کوردستانی بەرزکردەوە، کە چالاکوانانی باکوور، لە تەرابلووس پێشکێشیان کرد و قەزافی گوتی:"دەبێ، ڕۆژێ ئەو ئاڵایە ببێتە ئاڵای وڵاتێکی سەربەخۆ، ئاڵای دەوڵەتی کوردی." ئەمە مانشێتی سەرەکیی هەموو ڕۆژنامەکانی لیبیا بوو بۆ بەیانی.
حەفت مانگ پێش کوژرانی، قەزافی لە (١٠ / ١٠ / ٢٠١٠)، لە وتارێکی ئاگرییندا، لە گۆنگرەی لوتکەی سرت، بەرامبەر دەیان سەرکردە و مەلیک و حاکمی عەرەبی و ئەفریقی و جیهانیدا گوتی:"کوردەکان، مافی خۆیانە لە عێراق جیا ببنەوە. ئەوان عەرەب نین. من بۆ خۆم پشتیوانی جیابوونەوەی کوردان لە عێراق دەکەم." هەر لەو وتارەدا، ئەو گوتی:"ئێوە، مەلیک و پاشا و حاکمانی عەرەب و کەنداو، ئەو خەڵکە ڕەشووڕووتەی ئەفریقیاتان کردووەتە کۆیلە و پاڵە و عەبدی خۆتان و سووکایەتییان پێدەکەن، دەیانکڕن و دەیانفرۆشن، بازرگانیان پێوە دەکەن.، من بە ناوی هەموو عەرەبێکەوە، عوزر بۆ ئەو

قەباحەتە گەورەیە دەخوازمەوە!" نوێنەرانی حکوومەتی عێراقیش لەو لوتکەیە ئامادەبوون.

دوای ئەوەی، وڵاتانی عەرەبی پشتیان لە لیبیا کرد و هاوکاریی قەزافیان نەکرد، کە ئەمریکا و وڵاتانی ئەوروپا گەمارۆی ئابووری و بازرگانی و هاتووچۆیان سەپاندە سەر لیبیا، قەزافی بە نائومێدییەکی زۆرەوە گوتی:

"من وەک هاووڵاتییەکی لیبی قسان ناکەم، چش لە لیبیا و لە گشت وڵاتانی عەرەبی. خۆزگەم دەخوازت عەرەب نەبوومایە، خۆزیا ڕەچەڵەکم غەیرە عەرەب دەبوو، کورد یان ئیسپانی بوومایە".

با ئەو زانیارەیشتان بۆ تۆمارکەم:

لەساڵی (١٩٠٨) گەورە جووی ناسراو بە (ئیسرائیل زانجویل) لە لەندەن، ڕێکخراوێکی یەهودی سازکرد و (کتێبی شینی) دەرکرد بۆ دامەزراندنی دەوڵەتێک بۆ جوو لە دەڤەری (جبل الاخضر) پایتەختەکەی شاری (برقە ـ برگە)بێ، چەندان گەشت و زیارەتیان بۆ ئەو دەڤەرە کرد و جێگەکەیان بەدڵ بوو، ئەو شارە، شەش سەدە پێشزایین گریکەکان دروستیان کردووە، هەر لەو کاتەشەوە یەکەم کۆچی جوو بۆ ئەو شارە دەستی پێکردووە(لەبەر زۆر هۆکار ئەوێیان هەڵبژارد پێویست ناکات باسیان بکەم). جا هەموو شت کۆتایی پێهات و تەحسین پاشا، لە لیبیا ڕازی بوو، هەر ئەوەمابوو بچنە لای باب و عالی تورکی عوسمانلی لە ئەستەمبۆڵ واژوو لەسەر ئەو بریارە بکەن. بەڵام ئینقلاب بەسەر سوڵتان مەحموودی دووەمدا کرا و تەحسین پاشا نەفیکرا و هێندەی پێنەچوو، لیبیا بووە موستەعمەرەی ئیتاڵیا لە ساڵی (١٩١١). بۆیە پرۆژەکەی (ئیسرائیل زانجویل) سەرینەگرت.

ئەمە یەکێک لەو هۆکارانە بوو، کە موعەمەر کوردی خۆشدەویست و ڕقی لە تورک بوو، دەیەویست بە دامەزراندنی دەوڵەتی کوردی تۆڵەی مێژووی خۆی لە تورک بکاتەوە.

پشتیوانی و پشگیریی قەزافی بۆ نەتەوەی کورد و قەزییەکەی، نکۆڵی لێ ناکرێ، جگە لە پشتیوانیی مەعنەوی، بە چەک و پارە و حەوانەوە و کۆمەکی زۆر، خزمەتی کوردانی کردووە.

بەڵام..

نازانین، بۆچی، قەت بۆ دۆزینەوەی ڕێگەچارەیەک بۆ کێشەکانی کورد، ئەو، سەردانی سەرکردەکانی ئەو وڵاتانەی نەکرد کە کوردستانیان بەسەردا دابەش بوو و ڕووبەڕوو مەسەلەکەی لەگەڵیاندا نە درووژاند تا کۆتاییەک بەو خوێنڕشتنە بێنن؟

لەلایەکی دیکە، من پتر لە یەک هاووڵاتی لیبیم بینیوە، لە نەتەوەی ئەمازیغییەکان، ئەوانیش گلەییان لە قەزافی هەبوو، کە مافە نەتەوایەتییەکانیان بۆ دەستەبەر ناکات و فەرق و جودایی دەکات!

# (٣٤)

# کورد لە لیبیا

پوختەیەکی مێژوویی:

قیسمەت و قەدەر، کچۆڵەیەکی دەشتەکیی عەرەب، هەڵدەداتە وڵاتی غەریبی، ڕۆژگارێکی درێژ لە کەس و ئازیزانی خۆی دادەبڕێ. ڕۆژێک دنکە قشپلێک دەکەوێتە بەرچاوی، پڕی دەداتێ و هەڵیدەگرێتەوە و تێر تێر بۆنی دەکات و دەڵێ: " ما احلی ریحة هلی"( وای! کە بۆنوبەرامەی کەسوکارم چەند خۆشە!). هەر ئەوانەی تاڵاوی غەریبییان نۆشیوە، دەزانن، لە مەفتەن دابڕان چەند بەسۆیە و شەو و ڕۆژی غەریبایەتی چەند دوور و درێژە وئاسمانی و زەوی ئەوێ، چەند تەڵخ و قورس و ڕەزاگرانن! ساڵێک دەبوو، گەیشتبوومە لیبیا، ڕۆژێک لە شەقامی (ڕەشید) لە تەرابلس ـ کە یەکێکە لەشەقامە جوان و بەناوبانگەکانی ئەو شارە ـ بینیم لەسەر تابلۆی کۆگایەکی دیکۆر دڵگیر و ڕازاوە بە چلچرای بریسکەدار، نووسرا بوو (محل نوروز)، وەکو کچۆڵە دەشتەکییەکەم لێهات، خۆم تێکرد و بەدەم سەیرکردنی جلوبەرگ و پۆشاکە جوانەکانییەوە، لە خاوەنەکەیم پرسی، کە گەنجێکی گەڵەگەتی ئەسمەر بوو:" بۆ ناوی نەورۆزت بۆ کۆگایەکەت هەڵبژاردووە؟" گوتی:" سەیرە، پێشتر، کەس پرسیاری وای لێنەکردووم، نەورۆز جەژنێکی ئێمەیە." یەکسەر گوتم:" تۆ کوردی؟"

ئەو گەنجە لیبییە، زۆر خۆشحاڵبوو، کە بۆ یەکەمین جار لەگەڵ کەسێک قسە دەکات کە هاوخوێنی خۆیەتی، ئەو وەکو هەموو کوردەکانی دیکەی لیبیا نە کوردی دەزانی و نە زانیاریی وردی لەسەر کورد هەبوو. ئەوان لەو وڵاتە بە(عائلة کورد) ناسراون.

باشە ئەو بنەماڵە کوردانە، لە لیبیا کێنە؟

هەموو بەڵگە مێژووییەکان، ئەوە دەسەلمێنن کە ڕۆژهەڵاتی ناوەندی دێرین، مەفتەنی ڕەسەنی کورد و ئاشوور وکلدان و ئەرمەن بووە. هەموو ئەو کوردانەی لە دەرەوەی چوارچێوەی کوردستان ژیاون و دەژین، لەو مەفتەنەوە هاتوون و بەسەر پشتی زەویدا بڵاوبوونەتەوە. لەڕاستیدا، ئەگەر بمانەوێ لە مێژووی پەرتەوازەبوونی کوردان بکۆڵینەوە، دەبێ بگەڕێنەوە بۆ سەردەمی (دەوڵەتی ئەیوبی) کە سەلاحەدینی ئەیوبی دامەزرێنەری

بوو و پێش ئەویش دەوڵەتی (ئەل نوریە) کە نوورەدینی زنگی لە میسر حوکمڕانی دەکرد. دوای ئازادکردنی (قودس)، سەلاحەدین دەستکرد بە نیشتەجێکردنی کوردەکان لە شارەکانی فەڵەستین، تەنانەت (حیسامەدینی لاجینی)، دوای ئازادکردنی نابلس لە خاچپەرستەکان، کوڕی خوشکی کردە حاکمی ئەو شارە. لە ماوەیەکی کورتدا، بنەماڵەی ئەیوبی لە هەموو شارەکانی فەڵەستین بوونە خاوەن دەسەلات و هێز، تا لە ساڵی(١٤٧٣ز) کوشتارێکی هێندە خوێناوی لە نێوان هاوپەیمانانی بنەماڵەی ئەیوبییەکان و بنەماڵەی عەرەبەکانی تەمیمی ڕوویدا، کە بە (قەسابخانەی سوڵتان قایتبای) ناسراوە و سوڵتانی مەمالیک ناوبژیەوانیی تێداکرد. ئەو کوردانەی لە فەڵەستین و میسر نیشتەجێ بوون، بە سێ قوناغ گەیشتنە ئەوێ: زۆرینەکەی لە لەشکری سەلاحەدینی ئەیوبی بوون، ئەوانی تر بۆخۆیان لە کوردستانە و بۆ (جیهاد) چوونە ئەوێ، گروپی سێیەمیش لە سەدەی شانزدەمەوە تا ڕوخانی دەوڵەتی عوسمانی بەردەوام بوو، هەر لە دەورووبەری (١٦٧١ز) بوونە خاوەن گەڕەکی خۆیان لە دیمەشق. ئێستا لە زۆر لە شارەکانی فەڵەستین (گەڕەکی کوردان) هەیە، (٢٩) بنەماڵەی گەورەی ئەم وڵاتە کوردن، ئەوە جگە لە چەندان خێڵ و هۆز.

بەڵام لە ڕاستیدا. پەرتەوازە بوونی کورد، بۆ لیبیا حیکایەتێکی جیاوازی هەیە. بەدرێژایی ئەو (٤٠٠) ساڵە حوکمڕانی دەوڵەتی عوسمانی، پێوەندیی کورد و عوسمانلییەکان هەر ناخۆش و گرژ و خوێناوی بووە. پتر لە (١٠٠) یاخی بوون و هەڵگەڕانەوی مەزنی کوردەکان بەڕووی ئەو داگیرکەرانەدا لە مێژوودا تۆمار کراون. عوسمانلییەکان بە ئاگر و ئاسن کەوتنە گیانی ئەو نەتەوە مەزلومە و زۆریان لە زێدی خۆیان ئاوارەکردن و بە زۆرەملێ بۆ دوورە وڵاتان ڕاگوێزرانەوە. لە سەدەی هەژدەمیندا، کاتی یاخی بوونەکەی هۆزی هەمەوەندە لە نزیک سلێمانی ڕوویدا، جەندەرمەی تورک لەشکرکێشی کردە سەر ناوچەکە و دوای کوشت وبڕینێکی زۆر، بە دەیانی خێزانی هەمەوەندیان ناردە تورکیا و ناچاریان کردن لەوێ نیشتەجێ بن. بەڵام لەوێندەریش کوردەکان دەستەمۆ بابن و نایانەوێ لە جوتیاری و کشتوکاڵدا کار بکەن. ئەویش هێندێکیان دەنێرێتە تەرابلووس و سرت، لەویش هەر ئۆقرە ناگرن و دەگەڕێنەوە لای کەس و کارەکانیان لە بەنغازی. دواتر بە ئۆینبازی، گەنجەکان ڕازی دەکەن لە گەمییەوانی و سەربازیی و لەشکری کار بکەن و

بەم شێوەیە، لەگەڵ ڕۆژگاردا، تێکەڵ بە دانیشتوەکانی ئەم ولاتە بوون و بەرەبەرە وەک کەمینەیەکی دووره ولات لە ناو وڵاتی لیبیا توانەوە. ئێستا بنەماڵەی (کورد) لە لیبیا بەناوبانگە و گەرەکی (کوردان) لە شاری بەنغازی هەر ماوە. ئێستا نزیکەی (٢٣٧) خێزانی بە ڕەچەڵەک کورد لەو شارەدا دەژین و باری گوزەرانیان لە سەردەمی (قەزافی)یشدا، هەر خراپ بوو، چەند جار گفتیان پێدان کە خانووبەرەیان بۆ دروست بکەن و نەخشەشیان بۆ دانا، بەڵام گەندەڵچییەکان، لەوێ ئەو پارەیان بۆخۆیان حەپەلوشکردووە و هیچیان بۆ نەکردوون.

گۆرانیبێژ(سمیر الکردی) لە لیبیا ـ کە ئەویش کوردی نازانێ ـ پایە و مەقامی وەکو (کازم ساهیر)ە عێراقییە، زۆر بەناوبانگە.

## بەکێ دەڵێن:( کوردەکانی ئەفریقا) ؟ بۆچی وایان پێدەڵێن؟

ئەگەر (نەتەوی کورد) بە سادەترین پێناسە بناسێنین، دەکرێ بڵێین،"کورد ئەو نەتەوە دێرینە، چەندەها ملیۆنەیە، کە لە جوگرافیایی پان وپەرینی دەوری چیای زاگرۆس، لە ڕۆژهەڵاتی ناوەندا، نیشتەجێی کوردستانە و خاوەن زمان و کەلتووری خۆیانن، بە درێژایی مێژوو، نەتەوە داگیرکەرەکان، بە ئاگر و ئاسن و ژەهر بەبەرەکانیان کردوون و تا ئێستا خاوەن کیانێکی سەربەخۆ نین." ئەوا دەکرێ (نەتەوی ئەمازیغییەکان ـ کە ناسراون بە کوردەکانی ئەفریقا، بەم شێوەیە بناسرێن،"ئەمازیغییەکان ئەو نەتەوە دێرینەیە، چەندەها ملیۆنەیە، کە لە جوگرافیایی پان وپەرینی دەوری "سارای ـ بیابانی ـ مەزن"، لە ناوەندی ئەفریقیا، نیشتەجێن و خاوەن زمان و کەلتووری خۆیانن، بە درێژایی مێژوو، نەتەوە داگیرکەرەکان، بە ئاگر و ئاسن و ژەهر بەبەرەکانیان کردوون و تا ئێستا خاوەن کیانێکی سەربەخۆ نین." ئەوان مێژوویەکەیان بۆ پتر لە (١٠) هەزار ساڵ پێش زایین دەگەڕێتەوە، زێدی خۆیان ناوەندی باشووری وڵاتی لیبیا و باشووری جەزائیر و مەغریب و باکووری مالی و نەیجەر و بۆرکینا فاسۆیە. واتا بەسەر شەش وڵاتدا دابەش بوون. وەک چون تاکو ئێستا ئامارێکی فەرمی پووخت بۆ ژمارە کورد لە جیهاندا نییە، ئاماری ئەمازیغییەکانیش هەمیشە شاراوە و تەمووومژاوییە، ڕەنگ بێ حەشیمەتەکەیان لە دەوری (٤) ملیون کەس بێت. ئەو ئەمازیغییانەش دوو بەرەبابن (برانس و بەتەر)، لەگەڵ ئەوانیشدا هۆزی (لیبۆ)

لەو دەڤەرە ژیاوە، تیرەیەکی فیرعەونەکانە کە (٣٠٠)ساڵ حوکمی میسرییان کردووە، لە خێڵی (مشواشی) ئەو هۆزەیە.

زمانی ئەم ئەمازیغییانە پێیدەگوترێت (تیفیناغ) یان زمانی ئەمازیغی، کە خاوەن ئەلفوبێی خۆیانن و تا ئێستا پاکترین و ڕەسەنترین زمانی هۆزەکانی ئەفریقیایە. ئەوان خاوەن کەلتوور و فۆلکلۆری خۆیانن، زۆر کراوە و سادەن، لە ئاهەنگدا ژن مۆسیقا دەژەنێ و لە لای ئەوان دەبێ نانخواردن هەر بە کەوچک بێ، پێستەشیان سپیی مەیلە و ئەسمەرە و زۆر خوێنشیرینن.

چونکە بەدرێژایی مێژوو ئەو نەتەوە، کوردئاسا، هەر زوڵمی لێکراوە، چەندین جار ناویشیان گوڕیون. جارێ پێیان دەڵێن(کرمەنتینی) کە ئیسلام هات، ناویان لێنان (دەمامکدارەکان)، دواتر پێیان دەگوتن (مورابیطون) لەو سەردەمەی ئێستاش پێیان دەڵێن (تەواریق).

کە بەندە لە لیبیا بوو، دەبوایا بە کەشتی هاتووچۆ بکەین لە نێوان (تەرابلوسی لیبیا و ئەزمیری تورکیا) جار هەبوو ئەو گەشتانە دوو تا حەوت هەشت ڕۆژی دەخایاند، بەسەر پشتی دەریای سپی ناوەندا، چونکە جار هەبوو کەشتییەکە دەچووە بەیروت و بەندەرەکانی خوارووی ئەورووپا و دەریایی ڕەش. جارێک لە سەر کەشتی، لەگەڵ خێزانێکی لیبی، تەعاروفم کرد، کە سەیرم کرد شێوەزارەکەی زۆر جیاوازە، هەستم کرد هی بیابانەکانە و پرسیم" ئێوە تەواریقن" زۆر بە نیگەرانییەوە وەڵامی دامەوە و گوتی" نەدەبوایا، تۆی کورد، وام پێ بڵێیت، چونکە ئێوەش وەک ئێمە زوڵمتان لێکراوە!" دواتر زانیم ئەوان زۆر لە بەر دڵیان گرانە بە زاراوەی (تەواریق) ناویان ببەیت. لە میانەی گفتۆگۆدا، بۆی ڕوونکردمەوە، کە هەر وڵاتەی بە شێوەیەک هەوڵدەدات مێژوو و کەلتووری ئەوان بشێوێنێت و بسڕێتەوە. ئەوان شانازی بەوە دەکەن کە یەک نەتەوەی دابەشکراون، بە خوێن هەموویان ئەمازیغین. چونکە داگیرکەرەکانیان دەترسن یەکگرن و وەک یەک نەتەوە بناسرێن. بۆیە لە هەر وڵاتەی ناوێکیان لێناون، تا وانیشان بدەن ئەوان کەمینەن و لێک دوورن!

ئەمازیغییەکان لە قەزافی بە گلەیی بوون، کە چۆن دەبێ سەرکردەیەکی ئازادیخواز، داوای سەربەخۆی بۆ کورد بکات و ئاوڕ لە هاووڵاتی غەیرە عەربی خۆی نەداتەوە؟

له مێژووی نوێدا، ئەمازیغییەکان چەندین شۆڕشیان کردووە، بە سەدان سەرکردەیان لە سێدارە دراوە و بە سەدان هاوڵاتیان لێ کوژراوە و هەزارانیان دەربەدەر و زیندانی کراون. جا داگیرکەرەکانیان، وەکو تورک و فارس و عەرەبەکانی لای خۆمان، سنووری یەکتر دەبەزێنن بۆ ڕاوکردنی شۆڕشگێرەکانیان و ڕادەستی یەکتریان دەکەنەوە و بێ دادگایی لە سێدارەیان دەدەن. ئەوان لە ساڵەکانی (١٩٦٦ تاکو ٢٠١٦) چەندین ڕاپەڕین و شۆڕشیان کردووە، بەڵام وەکو کورد، تەنانەت ئەمریکا و فرنسا و ئەلمانیا دژی ئەوان کاریان کردووە و چەندین گەلەکۆمەیان بەسەر هێناون ـ کە لێرە، کاتی باسکردنیان نییە.

ئێستا (٣) بزوتنەوی چەکداری داوای سەربەخۆیی و مافەکانی ئەمەزیغییەکان لە ئەفریقیا دەکەن، دوژمنەکانیان بە ئاگر و ئاسن ڕووبەڕوویان بوونەتەوە و رێ نادەن هەناسەی ئازادی هەڵمژن. زۆریان ئاوارەن و زۆریان لە زینداندان. دوای سەرهەڵدانی بزوتنەوی ئیسلامییە توندرەوەکان، ژیان و گوزەرانی ئەماغیزییەکان زۆر ناخۆشتر بوو، چونکە لە کەلتووری ئەوان ژن ئازادە و عەبا و سەرپۆش ناگرنەوە و شان بە شانی پیاو کاردەکەن.

## (٣٥)

## بۆچی نەمویرا کتێبەکەی ڕێزدار( مام جەلال) بخوێنمەوە لە لیبیا؟

(ئیسماعیل بیشکچی)، گەورە نووسەری تورکیا ڕاستی گوتوە کە دەڵێ:" لەنێو هەموو داگیرکەرەکانی کوردستان، هیچیان وەک تورکە قەومەچییە تۆڕانییەکان، زاڵم و چەنگ بە خوێن نین دەرهەق بە نەتەوەی کورد." جا تا لەنزیک ئەو تورکە قەومەچییە ئەتاتورکانە نەبیت و نەژیت، باش درک بەو ڕاستییە ناکەیت.

بۆ وەرگرتنی ڤیزە لە قونسولخانەی تورکیا لە پایتەختی تەرابلس، یەکەم جار لە کونی پەنجەرەیەک، پەساپۆڕتەکەت لێوەردەگرن و پەرپەڕ دەیپشکننەوە، دوایی پرسیارت لێدەکەن: بۆ دەتەوێ سەردانی تورکیا بکەی؟ ئەوجا گەر میزیان کەفی کرد فۆڕمت پێدەدەن و دوای حەوت هەشت ڕۆژێک پەساپۆڕتەکەت وەردەگریتەوە. فەرهاد مامۆستای بیرکاری بوو، لە گوندەکانی دەڤەری دهۆکەوە پەرتەوازەی شاری (زلیتن)ی لیبیا بوو بوو. بۆی گێڕامەوە، کە چووبوو ڤیزەی تورکیا لەو قونسولخانەیە وەربگریت، کە پەساپۆڕتەکەی لێوەردەگرن و لیی دەپرسن: بۆ دەتەوێ بچیتە تورکیا؟ ئەو گوتوبووی" دەمەوێ لەوێرا بگەڕێمەوە کوردستان. دوای چاوەڕوانکردنێکی زۆر، مامۆستا فەرهاد بانگ دەکەنە ژوورێک، کە نەخشەیەکی گەورەی جیهانی تێدا بووە. پێیان گوتوە، ئەو وڵاتەمان لەسەر ئەو نەخشە نیشاندە کە ناوت هێناوە. ئەویش دەڵێ"(کوردستان) لەسەر نەخشە نییە. جا بە توڕەییەوە پەساپۆڕتەکەی دەدەنەوە دەست و دەڵێن جارێکی تر سەر بەم قونسلخانەیە دانەگریتەوە. مامۆستا فەرهاد گوتی کە لەبەر دەرگا سەیری پەساپۆڕتەکەم کرد مۆری سووری لێدرابوو.

ختمی سوور لەسەر پەساپۆڕت، مانای ئەوەیە تۆ کەسێکی مەترسیداری لەسەر ئاسایشیی نەتەوەیی ئەو وڵاتەوە، نابێ تامردن سەفەری بۆ بکەی.

مامۆستایەکی عێراقی، کە لە زانکۆی تەربلس بوو، وای گێڕایەوە" لە فڕۆکەخانەی ئەتاتورک لە ئەستەنبۆڵ، گوێم لێبوو کوڕێکی کورد، کە پەساپۆڕتە ختمکراوەکەی

وەردەگرتەوە، کە لە ئەوروپاوە هاتبۆوە، چونکە بە کوردی بە ئەفسەرەکەی گوتوبوو(سوپاس)، ختمی سووریان بۆ لە پەساپۆرتەکەی دابوو.

بۆخۆشم جارێک هەر لەو قونسولخانەیە، زۆر سین و جیمیان لەگەڵ کردم، تا ناوی ئەو سێ کەسەیان بدەمێ کە ئاڵای کوردستانیان پێشکەش بە (قەزافی) کردبوو، لێ من سووربووم لەسەر ئەوەی کە هیچ عیلم و خەبەرێکم نییە، چونکە لە قوتابخانەیەکی لادەست لە بیابانەکانی (سرت) بە تەنیا دەژیم و ڕادیۆ و تیڤیم نییە.

گەر زاکیرەم فیلم لینەکات، ساڵی (١٩٩٨) بوو. سەردانی ئەو قونسولخانەیەم کرد، بینیم لە سەر مێزێک لە (هۆڵی چاوەڕوانی)، یەک سەفتە کتێبەکە تەرجەمەکراوەکەی (قەزافی ـ کتاب الاخضر) بەزمانی کوردی لەوێ قەڵاچنکراوە. پڕ بەدڵ حەزم دەکرد دەست بۆ دانەیەکیان ببەم و بۆخۆمی هەڵگرم، بەڵام چونکە هەموو گۆشەیەکی ئەم جێگەیە لەژێر چاودێری کامێرایە ـ وەک هەموو قونسوڵخانەیەکی دیکە ـ خۆم تێنەگەیاند و دەمزانی سەرئێشەی زۆری بەدواوەیە.

دیارە حکوومەتی لیبیا. ئەم کتێبەی، وەکو هەموو چاپکراوەکانی خۆی، بەسەر سەفارەت و قونسوڵخانەکان دابەشکردبوو. بەڵام خۆ ئەوان نازانن، تورک ئەم کتێبەی بۆ ئەوە لەوێ داناوە تا (ڕاوی) کوردەکانی پێ بکات و تەشقەڵەیان پێبفرۆشن.

قەت ئەوەشم لە دڵ دەرناچێ، یەک جار سەردانی سەفارەتی ئێرانم لە تەرابلس کرد، بینیم چەندان وێنە وپرۆشەر و کەتەلۆک لەوێ داندرا بوون، لە هەموویاندا، هونەرمەندەی گەورەی کورد (بەهمەن قوبادی) بە فارس ناوزەندکرابوو، بە یەک حەرف ئاماژەیەکیان تێدا نەبوو کە ئەم هونەرمەندە کوردە.

## (٣٦)

# شیخەڵلا لە تەرابلس

لە ساڵی (١٩٨٢) بۆ یەکەمجار پەساپۆرتی عێراقیم لە کەرکووک دەرکرد. لە خوولێکی زمانی ئینگلیزی لەسەر ئاستی عێراق دووەم دەرچووم و دەزگای (بریتیش کاونسڵ) کە سەرپەرشتی ئەو خوولەی دەکرد، بریاری دابوو، یەکەمەکان بنێرێتە ئینگلتەرا بۆ خوێندنی باڵا. کاتێک هەموو مامەڵەکانم تەواوکرد، لە دائیرەی ئەمنی کۆیە بانگیان کردم، کە ئەوان ڕەزامەندی لەسەر سەفەرکردنم نیشان دەدەن، بەومەرجەی من (هاوکاری)یان بکەم. من ئەوەم قبوڵ نەکرد و ئەوانیش ڕێگریان لە سەفەرەکەم کرد.

لە ساڵی (١٩٩٤) دەبووایە پەساپۆرتم نوێ بکەمەوە. کە چوومە سەفارەتی عێراقی لە تەرابلس و پەساپۆرتەکەیان لێوەرگرتم، سەیرم کرد، تا نزیک کۆتایی دەوام هەر من مابوومەوە، کاتێک ناویان خوێندمەوە گوتیان جەنابی قونسوڵ دەیەوێ بتبینێ، منیان بردە ژووری قونسوڵ.

دوای بەخێرهاتنێکی گەرم، داوای لێکردم کە دانیشم. چای و قاوەی بانگ کرد بەڵام من ئاویشم نەخواردەوە، چونکە دەیانگوت نابێ هیچ شتێک لە سەفارەی عێراق بخوێت و بخوێتەوە، ئەوان لە ژووی چاودێری، بە کامیرا هامووشۆکەرەکان دەبینن و دۆسییەیان دەخوێننەوە.

جەنابی قونسوڵ، ئاسنگەریی، منی بە پرسیاران داگرت، لەو دەقیقەی لە کوردستان دەرچووم تا ئەو ساتەی لە ژوورەکەی ئەو دانیشتبووم. وەڵامی هیچ پرسیارێکی سیاسیی ئەوم نەدایەوە و زوو گوتم من لە گوندێکی دەستە چەپی ئەو سارایە بە تەنیا دەژیم و قەت هیچ کوردێکم لەگەڵ نییە و پەیوەندیشم لەگەڵ کەسدا نییە. زۆری کرد، باس و خواسی کوردەکان و عێراقییەکانی لیبیای بۆ بکەم، بەڵام من خۆم لە غەشیمی دەدا.

جا بەدەم هەڵدانەوەی پەڕەکانی پەساپۆرتەکەم و تەماشاکردنی، گوتی:"باشە، بەساپۆرتەکەشت هی شیخەڵلایە نییە! نەک کوردەکان هێندێ عەرەبیش پەساپۆرتی

شێخەڵلامان بۆ دێنن و دەیانەوێ بۆیان نوێبکەینەوە" من هۆبێکم لە خۆم زانی، کە قونسوڵی عێراقی لە تەرابلس ئاگاداری بازاڕی شێخەڵلایە!

پێش ئەوەی لە ژوورەکەی بێمە دەرێ، کوێخایانە پێیگوتم:"کاکە، ئەو پەڵە هەورە پاییزییەش، با دەیبات و خودا یاربێ، بەو زووانە دەگەڕێینەوە هەولێرێ!"

بەڵام، خەونەکەی ئەو نەهاتەدی و کوردەکان چوونە بەغدایە.

# (٣٧)

# ترس لە ئینقلاب و ئیسرائیل

قەزافی، چونکی بۆ خۆی بە ئینقلاب هاتبووە سەر حوکم، هەمیشە ئەو ترسەی هەبوو کە ڕۆژێک، خۆشی ئینقلابی بەسەردا بکرێ. جا بۆ ئەوە تەگبیرێکی کردبوو:

لەشاری سرت، کە زێدی خۆیەتی، هەرچی وەزارەت هەیە لە پایتەخت، (کۆپییەکی ئەو وەزارەتەی) لەوێ دروست کردبوو، هەرچی مەلەف و دۆسییە و ختم و شتی گرنگی ئەو وەزارەتانە هەیە، لە شاری سرتیش هەیە. واتا دوو وەزارەتی بەرگری هەبوو یەک لە تەرابلس یەک لە سرت. ئەمە بۆ هەموو وەزارەتەکانی دیکەش وابوو. جگە لەمە، لە سەحرای، نزیک ئەو شارە، بە (٤٠) کم، ئیستگەی ڕادیۆ و تەلەڤزیۆنی دامەزراندبوو، (٢٤) سەعات فەرمانبەری خۆیان هەبوو، گەرچی تیڤییەکە ئیشی نەدەکرد. ئەوە جگە لە فرۆکەخانەی سەربازی و گەورەترین سەربازگە و جبەخانە، ـ کە هاوپەیمانان لە (٢٠١١) قەسفیان کردن ـ. بیرۆکەکەی موعەمەری ئەوەبوو، ئەگەر خوانەخواستە، ڕۆژێک شتێک ڕووی دا و تەرابلس کەوتە دەست ناحەزان، ئەو لە پایتەختی دووەمەوە — شاری سرت — حوکمی خۆی بکات.

ئەو هەر لەو شارەش کوژرا، گەرچی بە پشت و پەنای خۆی دانابوو، زێدی خۆی بوو.

(ئەبو بەکر) کە گەنجێکی هەڵگری بڕوانامەی ماستەر بوو، لەبنەماڵەی موعەمەری بوو، برادەرێکی نزیکم بوو، ڕۆژێک پێیگوتم:

"ئێمە یەک زەڕڕە ترسمان لە ئیسرائیل و ئەمەریکا نییە، پەیوەندیشمان لەگەڵیان خراپ نییە، لەوەی گەڕێ شەڕەجنێوان دەکەین لەگەڵ یەکدی. ئەوەی کە جێگەی ترسە و ڕۆژێک هەر دەستمان لێدەوەشێنن، ئەوانەی دەرەوە نین، ئەوانەی ناوەخۆن، بە پلەی یەکەمیش ئیسلامییەکان... ." ئەوە لە ساڵی (٢٠٠٠) بوو.

قەزافی هێندێ شتی دیکەی کردبوو، کە جێگەی سەرنج بوو، بۆ نموونە لە ساڵی (١٩٨٥)، بە درێژایی کەناری دەریا کە (١٧٧٠) کیلۆمەترە، خەندەقێکی قوول قوولی لێدا بوو، گۆیا گەر دوژمن هاتن نەتوانن بێنە ناوەوەی وڵات، لەسەر هەر گردۆڵکەیەکی

نەختێ بەرزیش، گەر هەبووایا، ئەوا سەدان داری وەک بەرچیغیان چەقاندبوو. سەری دارەکان ئاسنێکی نووکتیژی تێچەقابوو، وەکو نێزە. گۆیا ئەگەر دوژمن بە پەڕەشووت دابەزێ، پەڕەشووتەکان، بکەونە سەر ئەو بەرچیغانە و نێزەکانیان تێیان ڕاچێ. جا سەیرەکەی لەوە دابوو، لە جەنگی دووەمی کەنداو، سەددامیش هەمان بەرچیغی دروستکرد بوو لە زۆر شوێنانی، لە دەوری سەربازگەکان چەقاندبوو، بۆ ڕاوکردنی پەڕەشووتەوانەکانی ئەمریکا گەر دابەزین!

## (٣٨)

# چـــاکوخۆشـــی لیبییـــەکان

چاک و خۆشیی هەر نەتەوەیەک و ناوچەیەک پەیوەستە بە کەلتووری ئەو نەتەوەیە، جوانترە، چوویتە هەر شوێنێک، ڕێز لەو کەلتوورە بگریت، گەر لەدیدی تۆ شیاویش نەبێ.

چاکوچۆنی کورەدواری لەم سەرەمەدا ـــ لە دیدی من، ڕەخنە نەبێ ـ چەند ڕستە و دەستەواژەیەکی ئەزبەرکراوە، بێئاگایانە و ڕۆبۆتانە کە دەگەینە یەکتری ڕۆژانە دووبارەیان دەکەینەوە. زۆر بە دەگمەن وەڵامی ئەو پرسیارانە دەدەینەوە، کە ئارستەمانی دەکەن! بۆیە چاکوچۆنی کوردی زۆر کەم هەست و خۆشەویستی و یادگاری لە دڵی بەرانبەرەکەی بەجێدەهێڵێ، کە دەبووایە بەجێیبهێڵێ!

هیچ ڕەخنەیەک لە چاکوچونی خوشک و برا لیبییەکان، ناگرم، کەلتووری خۆیانە و شانازی پێوەدەکەن.

چاکوخۆشی وان بەم شێوەیە:

کە دەگەیتە کەسێک ژن بێ یان پیاو، کوڕ بێ یان کچ، پیرێژن بێ یان پیرەمێرد، ناسیاو بێ یان نەناسیاو، دەبێ بەڕووخۆشییەوە بەرەوپیری بچیت و بە هەردوو دەستان تۆقەی لەگەڵ بکەی، جار هەیە، پیاوەکان شانی ڕاستەشیان لێک دەدەن و ژنەکان یەکدی ماچ دەکەن.

ئەگەر لە ڕۆژێکدا حەوت جار تووشی یەکدی بن، دەبێ هەر حەوت جارەکە تۆقە بکەن. ئەگەر چوویتە شوێنێک دەبێ تەوقە لەگەڵ هەر هەمووان بکەیت و لە دەستە ڕاستیشە دەست پێبکەی. (جار بووە لە پرسەیەکدا توقەم لەگەڵ (٢٠٠) کەس کردووە).

با وا دانێنن دوو کەسی تەمەن (٤٠ ـــ ٥٠) ساڵان دەگەنە یەک و حەفتەیەکە یەکتریان نەدیووە، چاکوخۆشی لێکدەکەن، کە دەستیان لە ناو دەستی یەکە، دەڵێن:

ـ السلام علیکم، کیف حالکم...شن الجو؟

کەسی دووەم: بەجوانی ئەرزوحاڵی خۆی بۆ بەیان دەکات، نەخۆشی بێ، گرفتێکی هەبێ، خەمێکی لە دڵ بێ، بەیانی دەکات، ئەوجا ئەویش بە هەمان شێوە ئەحواڵی کەسی یەکەم دەپرسێت و ئەویش کتومت چۆنە، بۆی بەیان دەکات.

ئەوجا، کەسی یەکەم لە هەواڵی باپیرە یان براگەورە یان داپیرەیان دەپرسێت و ئەویش بە ڕاستی خەبەرەکانی پێ دەڵێ. ئەوجا کەسی دووەم هەمان شت دەپرسێ و وەڵام وەردەگرێتەوە.

ئێستا نوبەی هەواڵی پرسینی ژنەکانیانە، و بە پیرێژن ناویان دێنن و دەپرسن (و کیف حال العجوز؟). هەردووکیان بەجوانی هەواڵ و ئەحواڵی ژنەکانیان باس دەکەن.

ئێستا دەگەنە، پرسیارکردن لە منداڵەکانیان، بە کوڕ و کچەوە. دەبێ چیان هەیە خۆشی و ناخۆشی بۆ یەکتری باس بکەن. ئەگەر شوانکارە و وشترەوان و پاڵەشیان هەبێ، لەوانیش دەپرسن.

ئێستا دەگەنە باس کردنی باغ و باغچە و بێستانەکانیان. ئەوان بە مەزرەعەی دەڵێن (حوازە). بە وردی ئەویش بۆ یەکتری باس دەکەن.

ئەوجا لە مەڕومالاَت دەپرسن، لە وشتر و مەر و بزن و گاوگۆلک، چەندیان کڕیوە و فرۆشتوە و زاوزێیان کردووە و ساغ و نەساغن، لەگەڵ ئەم پرسە، باسی ئەلەفیش زۆرجار دێتە گۆڕێ.

ئێستا دەگەنە دوا پرسیار لێکدی، دەپرسن:" و کیف حال الکربە؟" واتا ئۆتۆمبیلەکەتان چۆنە؟

بۆ لە حاڵی ئۆتۆمبیلش دەپرسن؟

جگە لە شارە گەورەکان، لە لیبیا تەکسی نییە، بۆیە هەمیشە قەزافی دەیگوت: "خانوو و ماڵ و حاڵ و ئۆتۆمبیل لە شتە هەرە زەرورییەکانی ژیانن." جا زۆربەی خانوو و گوندەکانیان لێک دوورن، بەبێ ئۆتۆمبیل منداڵ ناگاتە قوتابخانە و کاری بازاڕ مەیسەر نابێ و ئیشی مەزرا ڕاهی نابێ. خۆ ئەگەر ئۆتۆمبیل عاتڵ بێ، ئەوا نزیکترین دروایسێ دەبێ هەموو کارەکانت بۆ بکات، بۆیە لە ژیانی وان ئۆتۆمبیل بەشێکە لە خۆشی و ناخۆشی ڕۆژانەیان.

قسە قسە دێنێ. لە لیبیا، گەر ژن و کچت لەناو سەیارەکەت لەگەڵ نەبێ، لە هەر جێگایەک ڕێبوارێک ڕاوەستابێ، چاوەڕوانی ئۆتۆمبیل بکات، نەشیناسیت، دەبێ بۆی ڕاوەستی و بیگەێنیتە جێ، گەر لەسەر ڕێ تۆ بێ. ڕێبوارەکەش دەست هەڵنابڕێت، دەبێ خۆت لە ڕاوەستانەکەی تێبگەی. بە لایدا تێپەڕیت و هەڵێنەگری ــ زۆر عەیبە. گەر بۆشت نەکرێ

هەڵی بگری هەر دەبێ بۆی ڕاوەستی وعوزربخوازیتەوە، کە لەبەر چی ناتوانی هەڵی بگری.

ـــ تا ساڵی (٢٠٠٥) وابوو، ڕەنگبێ دوایی ڕووداوەکانی ساڵی (٢٠١١) زۆر شت گۆڕا بێت.

هەمیشە شەڕ و ئاژاوە، کەلتووری خراپ دێنێتە ئاراوە.

## (٣٩)

# ناوی کچەکانی مامۆستا عومەری فەڵەستینی

مامۆستا عومەرــ ڕۆحی شاد، کەسێکی قورس و قسەخۆش و غەریبدۆست بوو، جا پاشان کە بووین بە دراوسێی ماڵی ئەوان، پتر یەکترمان ناسی و شەو و ڕۆژ، لەگەڵ باقی حەوت ماڵە فەڵەستینی دیکە، کە لە ئاوایییەکەدا بوون، کاتمان بەسەر دەبرد و زۆر هاریکاریی یەکترمان دەکرد. وەکو (امرؤ القیس)یش گوتەنی:

**أَجَارَتَنَا إِنَّا غَرِيبَانِ هَاهُنَا / وَكُلُّ غَرِيبٍ لِلغَرِيبِ نَسِيب**

کە مامۆستا، ناوی شەش کچە ژیکەڵ و ڕۆحسووکەکانی خۆی پێگوتم، کە برایان نەبوو، یەکسەر پێمگوت:

ــ مامۆستا عومەر، ناوی کیژەکانت زۆر لە ناوی کوردەواری نزیکن، هەر ناوێک و نیویان، عەرەبییە، باقییەکەی دیکەیان، بە هی لای خۆمان دەچن.

بە خەندەیەکەوە گوتی:

ــ جا کێ دەڵێ، ئەگەر ئەمنیش بەدوای شەجەرەی خۆماندا بگەڕێم، کورد دەرناچم، خۆ نیوەی دانیشتوانی فەڵەستین کوردن!

کچەکانی مامۆستا ناویان: لارە و دیالە و ڕیهام و شۆهەندە و ئالا و میرام بوو(ڕیهام واتا ڕێژنە، ئالاش بە مانای نیعمەت و خێرو بێر دێ ـ وشەکە زۆر لە قورئانی پیرۆزدا دووبارە کراوەتەوە.)

جا کاتێک ڕیهام شووی بە ماهر کوردەی فەڵەستینی کرد (ماهر الکرد)، کە ئەویش بووە دراوسێمان، ئەوا زانیاریی پترم دەربارەی کورد لە فەڵەستین وەدەست کەوت. ماشاڵڵا، وەک دەڵێن، خوێن دەبزووێ، هەر زوو ماهیر هێندە لەگەڵمان تێکەڵ بوو، وەک بڵێی نان و پیوازمان پێکەوە خواردبێ، خۆی بە کوردی عەیار (٢٤) لە قەڵەم دەدا، ئەگەرچی ئەو هیچ کوردی نەدەزانی.

پێشتریش، له شەقامی ڕەشید، له تەرابلس، تابلۆی دوکانێکم بینی، نووسراوبوو (نەورۆز)، که قسەم لەگەڵ کرد، ئەویش هەر کورد دەرچوو، بەڵام کوردی نەدەزانی و وەک شانازییەک، دوکانەکەی، له باکووری ئەفریقیا بەو ناوە کوردەییە، ناساندبوو.

مێژووی کورد له فەڵەستین دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی (نوورالدینی کوڕی عمادِ الدینی زنگی)که دەسەڵاتداری و قەڵەمڕەویی فەرمانڕەوایەتی گەیشتە شام و میسر و فەڵەستین له ساڵی (١١١٨ بۆ ١١٧٤)، کوردەکان بۆ پشتیوانیی ئەو له ژێر کاریگەریی باوەڕ و عەقیدەی ئیسلامی، له هەموو لایەکەوە ڕوویان له دەوڵەتی نووری کرد و زۆریان له فەڵەستین، له شارەکانی قودس و خەلیل و نابلوس و غەززە...هتد، نیشتەجێ بوون، جا که پاشانیش سەلاحەدینی ئەیوبی هات، له خەلیل دانیشت و فەرمەنڕەوایی شاری نابلوسیشی ڕادەستی(حسام الدین)، کوڕی خۆشکەکەی کرد. تا لەگەڵ ڕۆژگار وای لێ هات له زۆربەی شارەکان گەڕەک به ناوی(حارة الأكراد) درووست بوو. تا ئێستا گەڕەکەکان ناویان نەگۆڕاوە. تەنانەت له گۆڕەپانی حەرەمی قودسی شەریف گومبەزێک هەیە به ناوی (القبة القيمرية)، که به ناوی (قەڵای قیمر)ی کراوە، که له چیای نزیک موسڵە و چەند میرێکی کوردیش گلکۆکەیان لەو گومبەزە دایە.

بێگومان، له مێژووی درێژی (٨٠٠ ــ ٩٠٠) ساڵ، گۆڕانکاریی گەورە ڕوودەدات، له ڕێی ژن و ژنخوازی و بازرگانی و تێکەڵبوون و تووانەوە، وردە وردە، نەوە دوای نەوە، له زمانی باپیرە گەورەیان دووركەوتنەوە، تا وای لیهات، زمانی عەرەبی بووە زمانی دایک بۆ ئەوان. ئەمەش شتێکی ئاساییە له نێو هەموو نەتەوەکاندا.

مامۆستا(حنا عيسا)، ناوی دەیان ئێڵ و خانەوادەی گەورەی فەڵەستینی، تۆمار دەکات، که ئەسڵ و فەسڵیان کوردن وەک: ئەیوبییەکان، أبو خلف، صلاح، الهشلمون، طبلت، جويلس، البيطار، حمور، زلوم، حريز، الربيحية، البرادعي، احمرو، الجبريني، امحيسن، أبو زعرور، عرعر، الحزين، برقان، سدر، فخذ أبو سالم/مرقه، المهلوس، رويشد، أبو الحلاوة، الحشيم، متعب، قفيشه، ئەما، که نزیکەی نیوەی دانیشتووانی شاری نابلسن.

هەروەها بنەماڵەی (الامام)، که له قودس دادەنیشن و ئەوانە بۆ چەندان ساڵ ئیمامەتی حەرەمی (مسجد الأقصى)یان کردووە. وە خانەوادەی آل زعرور که له قودس و خەلیل دەژین. له شاری (الناصرة)ش، ماڵباتی دار الملا هەنە. وە آل سيف و آل موسى وآل عيسى

له گوندی  شوفه وكفر اللبد دەژین. ئەوانە هەموویان بە ڕەچەڵەک کوردن.
آل القیمری، عائلة أبی اللطف، الكرد، الكردی، البسطامی، علیكو، السائح، أبو غلیون، عكه، قفیشه، غراب، أبو حمید، الأیوبی، الحزین، سدر، مرقه، علوش، الجبرینی، البرادعی، فراح، امحیسن، متعب، الأیوبی، زلوم، حریز، اعسیلة، هەموو لە قودسن.
زۆریش لەو خێزانانە فەڵەستینیان بەجێهێشتووە چوونەتە شام و لوبنان و ئوردن.
ڕیزبەندیی ناوەکان دوورودرێژە ـــ ڕەنگ بێ هەبێ باوەڕیش نەکات، ئەو هەموو خێڵ و تیرە و بەرەبابە کوردە، لەو وڵاتە هەبن، وەک بەرەبابی الآغا والكردی والكنفانی الناجی، باكیر، علوە، آل مراد الكردی، والظاظا، وأبو زهرة، وأكراد البقارة والغنامة والسعدیة وآل أبو الهیجاو .عشیرتی الایزولی الكردیة و خانەوادەی خلیل الكردی و بكر آغا (ازولی)

جا لە ئاكامی ئەو هەموو شەڕ و شۆڕەش، لە نێوان جوو و عەرەب، زۆر لە خانەوادە فەڵەستینییانەی، بە ڕەچەڵەک کوردن، پەرتەوازەی هەر چوار ئیقلیمی دونیا بوون و ناوەکانیشیان لەگەڵ خۆیان بردووە.
ئەمە کورتەیەکی ئەو باسە بوو، کە مێژوو بۆی بەجێهێشتووین و ئێمە هیچ دەستێکمان تێدا نییە و کەسیش ناتوانێ، ڕابردوو بگۆڕێت. هەڵسەنگاندن و نرخاندنی مێژووش، بە ڕێبە و تەراوزووی ئەم سەردەمی ئێستا، شتێکی نەشیاوە و پەسند نییە، چونکە هەنووکە هەنووکەیە و ڕابرووش ڕابردووە.

## (٤٠)

# ناو و نازناو لەکن لیبییەکان

هەر ڕۆژێک بوو، گەیشتبوومە ئەو قوتابخانەی تێیدا دەست بەکاربووم، منداڵێکی ژیکەڵەی قژبەلوولی نەختێ ئەسمەر، لێم بەژووریٚ کەوت و پێیگوتم:

ــ فاضل وەرە عەبدولناصر ئەتوی دەویٚ.

گوتم: عەبدولناصر کێیە؟

گوتی: عەبدولناصر، عەبدولناصرە! ئەوەتا لە ژوورەکەی خۆی دانیشتییە. (دەستیشی بۆ ژووری بەڕێوەبەر درێژ کرد).

یەکسەر تێمخوڕی:

ــ ئەتوو، خوێندکاری؟ ئیٚ بۆ ناڵێی: مامۆستا فاضل .... مامۆستا عەبدولناصر؟

یەکسەر، وەک فیشەکەشێتە بەڕوومدا تەقییەوە و گوتی:

ــ جا بۆ وا بڵێم!؟

چونکە وراتی لیبیا بۆخۆی گۆمەڵگەیەکی خێڵەکییە و ئەو پیاوەش، موعەمەر قەزافی، هێندەی لە بن گویٚ خوێندبوون: کە کەس لە کەس گەورەتر نییە و هەمووان خوشک و برای یەکدین، لەو وراتە نازناوی فەرمی و شوهرەت و لەقەب، لەگەڵ ناوهێنانی کەسەکان بەکار نەدەهات.

نەدەگوترا مامۆستا فلان و بەڕێوەبەر فلان و سەرپەرشتیار فیسار و ئەندازیار کاک ...... هەر کەسە بەناوی خۆی، بەبیٚ هیچ پێشگرێک ناوی دەهێنرا، تەنانەت لەناوهێنانی موعومەر قەزافیش، هەر دەیان گوت: موعەمەر... ئەگەر یەکێک زۆری خۆشویستبا، ئەوا دەیگۆ: زەعیم.... دەنا لەبۆ عەبدی بەشەری، نازناویان بەکار نەدەهێنا.. تەنیا بە مامۆستای ژنیان دەگوت ( ابلە) واتا ( پلە / پوور).

ئەوەش دیوەکی دیکەی کەلتووری ئەو وڵاتە بوو.

## (٤١)

# قەزافی و وەحدەی عەرەبی

کەس بەقەد موعەمەر بانگەوازی (الوحدة العربية)ی نەکرد، ئەدی بۆ (٨) ساڵان بەغدا دایەبەر موشەکی زەمین بە زەمین؟

ئەوەندەی موعەمەرلە یەکەمین بەیانیدا لە ڕۆژی کودەتایەکەیدا لە (١)ی ئەیلولی (١٩٦٩) قسەی لەسەر (الوحدة العربية) دەکا، نیو ئەوەندە قسەی لەسەر بەرنامە و پرۆگرامی کودەتایەکەی ناکات. جا کە لەیەکەمین ساڵیادی ئەو کودەتایە، جەمال عەبدولناصر، دەبێتە میوانی لە بەنغازی و پشتگیریی خۆی نیشاندەدا و لە وتارەکەیدا دەڵێ: "معمر القذافي هو الأمين على القومية العربية وعلى الثورة العربية وعلى الوحدة العربية." ئەوا، موعەمەری شێتوشەیدای کەسیەتیی جمال عەبدولناسر، هێندەی دی ئەو (الوحدة العربية)یە دەبێتە مەراق و حەز و خولیا، بە کرداریش زۆر هەوڵی بۆدەدا، بەڵام هەموویان هەر هێلکەی پیس دەردەچن. لە (١٩٧١)، لەگەڵ سوریا و میسر، لە (١٩٧٤) لەگەڵ تونس، لە (١٩٨٤) لەگەڵ مەغریب، لە (١٩٨٩) دیسان لەگەڵ سوریا، لە (١٩٨٩) لەگەڵ (٥) وڵاتی عەرەبی و ئەفریقی. تا لەساڵی (١٩٩٩)، وای لێهات، فەرمانی کرد کە جەماوەری لیبیا بە شاڵاو و بەپیادە هێرشکەنە سەر میسر و دەروازەکان بشکێنن و ئیعلانی وەحدەی عەرەبی بکەن. جا کە ئەوەشیان فەشلی هێنا بەرەو ناوە و خوارووی کیشوەری ئەفریقیا شۆربۆوە، لەوەیش هەر دەست بەتاڵ گەڕایەوە.

سەیرەکە لەوەدابوو، کە ئەو سەرکردە هەموو خەبات و ژیانی خۆی بۆ هێنانەدی ئەو خەونە تەرخانکرد، خەونی یەکگرتنەوەی کۆی نەتەوەی عەرەب (الوحدة العربية)، کەچی کە لەساڵی (١٩٨٠) شەڕی نێوان عێراق و ئێران هەڵگیرسا، جگە لە سوریا، تاقە وڵاتی عەرەبی کە پشتی ئێرانی شیعەمەزهەبی گرت لە دژی سەددام حوسێن، موعەمەر قەزافی بوو. جا ئێران ئابلوقەیەکی هێندە قورسی لەسەر بوو، کەس نەیدەتوانی فیشەکێکی پێبفرۆشی، کەچی موعەمەری مووشەکی سکۆدی لە ڕووسیا و چین و کۆریای باشوور دەکڕی بۆ ئێرانی دەنارد، ئەویش بەغدای پێ مووشەکباران دەکرد.

ئەوە چەندی بەچەندی، کەی لەگەڵ دروشمی (الوحدة العربیة) یەک دەگرتەوە؟ سرپەکەی لە چ دابوو؟

بابەتێکی ئەو کتێبەی کە شەوان، لە قوتابخانەکەمدا، بەدزی دەمخوێندەوە، ئەو لوغزەمان بۆ دەکاتەوە. فەرموون ئەمە پووختەکەیەتی:

موعەممەر، کادیرەکانی لیژنەی شۆڕشگێڕیی هۆشیار دەکاتەوە و هانیاندەدا کە دەست لە دوژمنی بابەگەورەی ئومەی عەرەبی بوەشێنن و تەفروتوونایان بکەن.

ئەو دەڵێ:

"کە دەڵێین ڕزگارکردنی فەڵەستین قەزییەی سەرکی و بنەڕەتی ئێمەیە، ئەمە هەر لە قسەی منداڵ و پاران دەچێ، ئێمە دوژمنێکمان هەیە لە جوو ترسناکتر و گەورەترە، کە مەحاڵ بتوانین. جوولەکە ببەزێنین، بەبێ پشت لەعاردی دانی ئەودوژمنە پیسە. ئەویش مەملەکەتی عەرەبی سعودی و هەموو کیانەکانی کەنداوە. ئەوان گەورەترین پادگانی ئەمەریکا و ئینگلیزیان لەخۆ گرتووە، با هەر لە لیبیا دەریان کەین، کە ئەوان سعودیە و کەنداویان هەبێ، هەر لەسەر ڕۆحی ئێمەن. گەورەترین سەروەت و سامانی نەتەوەی عەرەب لە مست ئەو مەلیکە کۆنەپەرستە نوکەرانە دایە، دەبێ ئەو سامانە لە چەنگیان دەربێنین و بەسەر تاکی عەرەب دابەشی بکەین.

مەلیک و ئەمیرەکانی سعودیەی خۆیان بە زەعیمی نەتەوەی عەرەب داناوە، کە نابێ ئەمەمان قبوڵ بێ، جاش و چەتە و دز بینە زەعیمی ئەم نەتەوەیە.

ئەوان زۆر ترسنۆکن، دەبێ بە هەموو چەکێک لییان دەین، دەبێ بیانتەقێنینەوە، دەبێ نەهێڵین بخەون، هەر یەکێک لە ئێوە لە هەر جێگەیەک بەچکە سعودییەیەک، یان کەنداوییەکتان دیت، یەک فیشەکی بە نێو چەوانیەوە نێن، ئەگەر چەکتان پێ نەبوو، بە بلۆک و بەرد، ئەگەر هەر نەبوو بە نینۆکان و بە ددانان بیان خنکێنن".

کەواتە موعەممەری، لە بۆ چاوی ڕەشی خومەینی نەبووە کە یارمەتی ئێرانی داوە، لە دژی سەددامیش نەبوو، بەڵکوو لە دژی سعودییە بوو، چونکە ئەو دەیزانی ئەو شەڕە بە فیتی سعودییە و سەرکەوتنی سەددام، سەرکەوتنی مەلیک و ئەمیرەکانی سعودیەیە بۆیە دەبێ، کاربکات بۆ تێکشکاندنی ئەو هاوپەیمانییەی کەنداو.

ئەوەشمان لەبیر نەچێ، قەزافی، خەونی بەوەشەوە دەدیت کە ببێتە زەعیمی ئوممەی عەرەبی، هەروەک جمال عەبدولناصر و مەلیکەکانی سعودیە و مەلیکی مەغریب خەونیان بەو تاجەوە دەبینی.

چەندان جار سعودیە هەوڵی ڕەشەکوژی موعەمەری داوە و زۆرجاریش لیبیا هەوڵی تیرۆرکردنی سەرانی سعودیەیان داوە و بە پیلانگێریی بۆ نانەوەی کودەتا تاونبار دەکرا.

شەڕەدەمییەکەی کۆمکاری عەرەبی لە قاهیرە، لە (٢٠٠٣) لە نێوان موعەمەر و مەلیک عەبدوڵلا هەر درێژەپێدەری ئەو پەیامە بوو کە لە کتێبەکەدا، من زووتر خوێندبوومەوە.

## (٤٢)

## ئیمام موسا ئەلصەدر، لە لیبیا گومکرا؟ لەسەر چی؟

ئەوەندەی گەشتەکەی ئیمام مۆسای ئەلصەدر، سەرۆکی (المجلس الإسلامي الشيعي الأعلى) لە لوبنان، بۆ لیبیا لە(٢٥)ی ئۆکستی(١٩٧٨)، لە ئەفسانە دەچێ، هێندە بەسەفەرێک ناچێ کە داوتنامەکەی بەدەست و قەڵەمی سەرکردەیەکی وەک موعەمەر قەزافی نووسرابێ. قەولوابوو، بەیەکەوە کۆببنەوە و ئاهەنگی ساڵیادی شۆڕشی (فاتیحی مەزنیش)، لە یەکی ئەیلول بەو میوانە شیعە مەزهەبە بەجۆش و خروشتر بکەن. بەڵام نەک ئیمام لە ڕۆژی ئاهەنگەکە دیارنەبوو، بەڵکوو لە پاشنیوەڕۆی (٣١)ی ئۆگستەوە هیچ سۆراغێکی نەما و ئێستاشی لەگەڵ بێ هەر گومە!

سەفەرەکە لە ئەفسانە دەچێ، ئاخر ئەو ئیمامە مەزنەی کە کەسی دووەم بۆ لەدوای ئایەتوڵلا خومەینی، ئەنگوستلیە نەبوو بزربێ، چۆلەکە نەبوو بفڕێ، پەنجەماسیی نەبوو لەدەست بخلیسکێ و بچێتەوە نێو زەریا. هەمیسان موعەمەریش ئەوەندە نەبان نەبوو، نەتوانێ بە فڕە شەربەتێک، یان بە دنکە حەبێک، یان بە پێکدادانی مۆتۆرسکلێک، ئەو زاتە بەمردنی خودا بمرێنێ!

لەو ڕۆژەوەی، ئیمامی موسا گومبووە لە لیبیا، (٤) سیناریۆ و زۆر قسەیان لەسەر دەکرێ، بەڵام ئەگەر جوان خووردیان بکەیتەوە، درک بەوە دەکەی کە ئەوەندەی سیناریۆیەکان لە هەڵبەستن و فلیمسازی دەچن، هێندە لە واقیعەوە نزیک نین.

من بۆخۆم، هەر یەک سیناریۆیان بە ڕاست دەزانم، چونکە لەزاری شایەتحاڵی متمانە پێکراوەوە، باسکراوە، ئەمەش کاکڵەکەیەتی:

"عەبدول سەلام جەلود، کە هاوسەرکردە بوو لەگەڵ موعەمەر و سەرۆک وەزیرانی لیبیا بوو(١٩٧٢ ـ ١٩٧٧) هەروەها چەندان پۆستی بایەخداریشی هەبوو، لە دیدارێکیدا، دوای نەمانی موعەمەر، لە بەرنامەی(الذاكرة السياسية) لە تەلەفزیۆنی (العربية)، گوتی: موعەمەر فرمانی دا کە ئیمام لەگەڵ دوو یاوەرەکەی، شێخ محەمەد یەعقوب و عەباس بەدری ڕۆژنامەوان، بەچاوبەستەکی ببەنە خوارووی سارای لیبیا و شوونبزریان کەن، جا ئەو دوو

ئەفسەرەی ئەو فرمانەیان جێبەجێکرد، نەگەڕێندرانەوە، تەرابلس، چوونە شارێک لە ڕۆژهەڵات، یەکسەر لەوەێ، ئەوانیشیان لەچاڵنا و شوێنبزرکران، بەم شێوەیە، ئەو ئەلقەیە بزر بوو، کە بزانرێ، ئیمام و یاوەرەکانی چارەنووسیان چیبوو"!

محەممەد حوسنی موبارەکیش، سەرۆکی پێشوی میسر لە بیرەوەرییەکانی خۆی نووسیویەتی:

"بە موعەممەرم گوت، ئیمام چی لێهات؟ یەکسەر تۆمارێکی دەنگی بۆ لێدام، کە ئیمام موسا بە تەلەفۆن بە ئەنوەر سادات دەڵێ: گەورەم، خەمت نەبێ، لیبیاشت، بۆ وەکو لوبنان لێدەکەم".

دەکرێ ئەو تۆمارە دەنگییە ساختە و هەڵبەستراو بێ، دەکرێ ڕاستیش بێ. بەڵام ئەوەی کە من لە کتێبەکەی ئەو شەوە خوێندمەوە، نهێنیی گەورەتی شاردۆتەوە.

چۆن؟

کەم نین، ئەو ناحەزانەی، کە دایەگەورەی (غەزاڵ)ی دایکی موعەممەری، بە بنجوو دەزانن. بۆخۆشم گوێبیستی شتێکی وابووم. لێ، خۆفی موعەممەر لە جوو هێندە گەورەبوو، کە هەمیشە لەفکری ئەوەدابوو چۆن بنبڕیان بکات. لەگەڵ دامەزراندنی ئیسرائیل، ئەو (٤٠) هەزار جووەی لە لیبیا بوون، هەرەزۆریان کۆچیان کرد و لیبیایان بەجێهێشت، بەڵام کە موعەممەر هاتە سەرحوکم، چوو یەک یەک ئیسکوپروسکی جووەکانی لە گۆڕستانی جوولەکەکان دەرهێنا و لە تورەگەی کردن و ناردنیەوە ئیسرائیل، بەوەش نەوەستا، قەرەبووێکی باشی بۆ ئەو جووانە نارد کە زەوەیوزار و خانوویان بەجێهێشتبوو. دوایین شتێش کە کردی، ئەو جووە تاقولۆقانەی لە لیبیا مابوونەوە سواری پاپۆڕی کردن و ناردنیەوە ئیسرائیل و پارەی باشیشی دانێ و پێیگوتن، ئەو برە پارەشم لێوەرگرن، بۆخۆتان ڕێکخراوێک سازکەن بەناوی (کۆمەڵەی جووکانی لیبیا).

خەوفی موعەممەر لەو جووانە لەچیبوو؟

ئێوە دەزانن، کە یەکەمین جار قەولوابوو دەوڵەتی ئیسرائیل لەسەر خاکی لیبیا دابمەزرێتن، نەک لە فەڵەستین!

لەساڵی (١٩٠٨) گەورە جووی ناسراو بە (ئیسرائیل زانجویل) لە لەندەن، ڕێکخراوێکی یەهودی سازکرد و (کتێبی شینی) دەرکرد بۆ دامەزراندنی دەوڵەتێک بۆ جوو لە دەڤەری

(جبل الاخضر) پایتەختەکەی شاری (برقە ـ برگە)بێ، چەندان گەشت و زیارەتیان بۆ ئەو دەڤەرەکرد و جێگەکەیان بەدڵ بوو. پێشتریش ئاماژەمان پێدا کە ئەو شارە، شەش سەدە پێشزایین گریکەکان دروستیان کردووە، هەر لەو کاتەشەوە یەکەم کۆچی جوو بۆ ئەو شارە دەستی پێکردووە(لەبەر زۆر هۆکار ئەوییان هەڵبژارد پێویست ناکات باسیان بکەم).
جا هەموو شت کۆتایی پێهات و تەحسین پاشا، لە لیبیا ڕازی بوو، هەر ئەوەمابوو بچنە لای باب و عالی تورکی عوسمانلی لە ئەستەمبوڵ واژوو لەسەر ئەو بڕیارە بکەن. بەڵام ئینقلاب بەسەر سوڵتان مەحموودی دووەمدا کراو. تەحسین پاشا نەفیکراو هێندەی پێنەچوو، لیبیا بووە موستەعمەرەی ئیتاڵیا لە ساڵی (١٩١١). بۆیە پڕۆژەکەی (ئیسرائیل زانجویل) سەرینەگرت.
جا ئەمە پەیوەندی بە ئیمام موسا ئەلصەدرەوە چییە؟
لە دیدی موعەمەرەوە پەیوەندی هەیە... چۆن؟
لە کتێبەکەدا، موعەمەر هۆشداری دەداتە ئەندامانی لیژنەی شۆڕشگێڕی و ئاگاداریان دەکاتەوە، کە دەبێ زۆر وریا بن، ڕێ نەدەن شیعەکان، دەست لەکاروباری لیبیا وەردەن، چونکە ئەوان بۆیان هەڵکەوێ دەستی خۆیان لە عێراق و سوریا و لوبنان و میسرو لیبیا دەوەشێنن.
لەبەرچی؟
موعەمەر دەڵێ:"دەوڵەتی گەورەی ئیسلامی هێندە دەسەڵاتدار و باڵا دەست بوو پشتی دوو ئیمپراتۆرە گەورەکەی ساسانی وبیزەنتی لە عاردی.دا. لەو ڕۆژەوە بلیمەت و زانایانی جوو لە فکر و تەگبیری ئەوەدابوون چیبکەن بۆ ئەوەی ئەو هێزە ئیسلامییە مەزنە لاواز بکەن. بێگومان ئەوکاتە ئەوەیان پێدەکرێ کە پوازێک لە جەستەی موسڵمانن بدەن. ئەو پوازەشیان چەقاندە نێو جەستە و ڕۆحی ئیسلام. ئەویش بە قۆزتنەوە کوشتنی (حەسەن و حوسێن بوو لە کەربەلا).
موعەمەر ناوی زۆر حاخام و بیرمەندی مێژووی جووی نووسیوە، کە ئەوان شەو و ڕۆژ کاریان کردووە تا لە پیلانەکەیان سەرکەون. ئەو دەڵێ، ڕۆژ نییە لە جیهانی ئیسلامی چەندانی وەکو حەسن و حوسێن سەرنەبڕێن، ئێ، خێرە کەس نەیتوانیوە جێگەی وان بگرێتەوە ئایینزایەک بۆخۆیان دابهێنن؟

له وته‌كانی، موعه‌مه‌ر به‌دیار ده‌كه‌وێ، كه‌ ئه‌و، تێڕوانینی بۆ (شیعه‌) هه‌مان تێڕوانینه‌ بو (جووه‌)، هه‌ولێشیداوه‌، كه‌ ئه‌مه‌ بخاته‌ مێشكی ئه‌ندام و جه‌ماوه‌ره‌كه‌ی خۆی.

كه‌واته‌، له‌ ساڵیادی شۆڕشی (فاتیح) موعه‌مه‌ر، ئیمام موسا ئه‌ل صه‌در داوه‌ت ده‌كاو له‌ ئێواره‌ی (١)ی ئه‌یلول بزری ده‌كات، تا به‌ شیعه‌كان بڵێ، پێش ئه‌وه‌ی لیبیا وه‌ك (لوبنان) لێبكه‌ن، من ده‌ستی خۆم ده‌وه‌شێنم، چونكه‌ هه‌میشه‌ له‌ جوو و (هاوجووه‌كان) ده‌ترسێم.

من ته‌نها زانیارییه‌كانتان بۆ ده‌گێرمه‌وه‌، موعه‌مه‌ر چۆن بیرده‌كاته‌وه‌ چۆن ڕه‌فتار ده‌كا، من لێی به‌رپرس نیم و بۆ خۆم ریز له‌ هه‌موو ئایین و ئایینزایه‌ك ده‌گرم، به‌ ئایینزای شیعه‌شه‌وه‌.

دوو تێبینی:

یه‌ك: له‌ دیوه‌خانێك، لێیان پرسیم فلان مامۆستاش هی لای ئێوه‌یه‌؟ منیش گوتم، نا، ئه‌و خه‌ڵكی لای نه‌جه‌ف و كه‌ربه‌لایه‌. كابرا له‌ به‌ره‌خۆیه‌وه‌ گوتی:

"ئێ، ئێ، بڵێ: یه‌هودییه‌"!

دوو: هه‌رچی شیعه‌م دیوه‌ له‌ لیبیا، به‌ ئاشكراو ممارِه‌سه‌ی تقوسه‌كانی خۆیانیان نه‌ده‌كرد، له‌ ڕه‌شپۆشی و گریان و به‌كارهێنانی به‌رده‌مۆڕه‌، دیاره‌ ده‌یانزانی كه‌ لیبییه‌كان نایانحوێنن بۆیه‌ قه‌ت ئاماژه‌شیان به‌ ئایینزاكه‌ی خۆیان نه‌ده‌كرد و متمانه‌شیان پێكردبای زه‌نبی موعه‌مه‌ریان ده‌كرد و ده‌یانشكانده‌وه‌.

## (٤٣)

# وشـــترەکانی لیبیـــــا

لیبییەکان، بە ڕەچەڵەک هەموویان بەدوون (دەشتەکیی کۆچەرن)، وڵاتەکەشیان گەورەترین سارای جیهانی، بە ناوەڕاست و باشووریدا درێژدەبێتەوە لە ڕۆژهەڵاتەوە بۆ ڕۆژئاوا و سینگی کیشوەری ئەفریقیا دادەپۆشێ.

ئەوان هەر دووسێ شاری گەورەی وەکو تەرابلس و بەنغازی و مەسراتەیان، ئاوەدانی زۆری تێدابووە، شارەکانی دیکە زۆربەی زۆری، لەسەر دەستی قەزافی ئاوەدان کرانەوە، ئەو چوو لەو بیابانانە، کۆچەرییەکانی هێناو لە خانووی سەردەمییانە نیشتەجێ کردن و مەزرا و کێڵگە و بیرئاو و ئامێر و کەرەستەی کشتوکاڵی بۆ دابینکردن. لیبییەکانی دەرەوەی وڵاتیشی هێناوە، ئەوانە لە میسر و مالی و سودان دەژیان.

جا چونکە، ئەوان کۆچەری و دەشتەکی بوون، کە هاتنە شاریش، مەیلی وشتر و گا و گۆلک و مەڕ و بزنیان هەر مابوو، بۆیە زۆربەیان لە دەرەوەی شارەکان، باغی خۆیان هەیە، تەنانەت زۆر لە خەکی تەرابلسیش، ئەوان بەو باغە دەڵێن (حەوازە)، جگە لە ڕەز و باغ و باغات، ئاژەڵیش بەخێودەکەن.

لیبیا، بە وشتر بەناوبانگە، ئەوان، داغێک لە ملی یان لە ڕانی وشترەکەیان دەدەن و لەو چۆل و بیابانە، بەڕلایان دەکەن، ـ کە من لەوێ بووم دونیا شامێ شەریف بوو، کەس دەخڵی نەدەکردن، مانگێ جارێک وشترەوانەکان دەچوون لەو سارایە بەسەریان دەکردنەوە.

جگەلەوەی لیبییەکان زۆر حەز لە شیر و گۆشتی وشتر دەکەن، زۆریش وشتریان خۆش دەوێ و لەلایان گیاندارێکی ڕۆحسووکە.

من دوو شتم لە وشتر بینی، لەوێ:

یەک، وشترێک چەندان ساڵ بوو، لە گوندەکەمان، یەک خاوەنی هەبوو، ڕۆژانە ئەو پیرەمێردە بۆخۆی ئەلەف و ئاوی دەبردە بەردەمی و خزمەتی دەکرد، کە پیرەمێرد مرد، ئەو وشترە مانی لە خواردن و خواردنەوە گرت. بەدەستی کەس قبوڵی نەبوو هیچ بخوا و

بخواتەوە تا وای لیهات لە برسان و لە تینان مردار بۆوە. ئەوان دەڵین، وشتر لە سەگ بە وەفاترە.

دوو، بەڕیوەبەرەکەم وای بۆ گیڕامەوە: جاریک وشترەوانیک، زۆر خراپ وشتریک دارکاری دەکا و ئازاری دەدا، دوای چەندان ساڵ، ڕۆژیک، وشترەوان، لە بن سیبەری داریک خەوتبوو، وشتر هات و خۆی خستە سەر سینگی، هەتا هەناسەی لینەبڕی لەسەری هەڵنەستا. لە بن پیستی سینگی وشتر، شاخیکی زۆر ڕەق هەیە، لە شیوەی دەمە چەپچاغە، لەهەر کەسیکی بدا دەیکوژێ، خودا لە جیاتی قۆچ ئەو شاخەی بن سینگی پیداوە. ئەوان دەڵین وشترڕقهەڵگرە، تۆڵەی خۆی هەر دەکاتەوە.

نرخی گۆشتی وشتر، نەختێ هەرزانترە لەچاو ئەوانی دیکە. ئەو کەسەی یەکمجار دەیخوا تووشی سکچوون دەبێ، دواتر دەبیتە خواردنیکی ئاسایی. لیبییەکان شیریی وشتریان پێ باشتر بوو لە دەنکە خورما و قەسپ بۆ فتارکردنەوە، بەیانیان زووش، زۆر حەزی لیدەکەن، ئیختیارەکانیان هەروا بە ساردی و بیکوڵاندن فڕی دەکەن.

نیرە وشتر دوای ئەوەی تەمەنی دەبیتە (٦) ساڵان دەپەڕێ، دەتوانی لەگەڵ (٥٠) مییە وشتری میگەلیک بپەڕێ. وشتر یەک بیچووی دەبێ دوای (١٢) مانگ. بەدەگمەن جمکی دەبێ.

بۆ پاراستنی چاوەکانی لە تۆزوخۆڵی بیابان، خودا پەردەیەکی وەک مینای درووست کردوە، هەم دەتوانی ببینێ و هەم چاویشی لە تۆزوخۆڵ دەپاریزێ. دەتوانی کوونە لوتەکانیشی داخات و بیانکاتەوە. ئاساییە دوو حەفتە ئاو نەخواتەوە و یەک مانگ خواردن نەخوا. ئاوی سویری دەریاش دەخواتەوە وئاویش تیکەڵ خوینی خۆی دەکا و هەڵیدەگرێ. لە بنی پیی وشتر، سمیکی ئەستوور هەیە، قاچەکانی لە لمی داغکراوی بیابان دەپاریزی و هەستی پیناکات. بەرگەی سەرما و گەرماش دەگرێ. پیکهاتەی خووریەکەشی جیاوازە، خوداکردە، لەشی لە تیشکی خۆری سووتینەر دەپاریزێ.

لە فەرهەنگی هیچ زمانیکدا، بە قەد فەرهەنگی زمانی عەرەبی (وشە و زارەوە)ی تایبەت بە وشتر نییە، هەر بۆ ناو و جۆرەکانی، نزیکەی (١١٧) وشە و زاراوەیان هەیە. ئەو گیاندارە زۆر بە زەینە، دەتوانی پاش (١٠) ساڵ، کەسیک بناسیتەوە، وەک خاوەنی یان وشترەوانی.

وشتر (٣٠) ساڵ بۆ (٥٠) دەژی. وشتری سپی نرخی گرانترە لە ئەوانی دیکە و کەمیش سەری دەبڕن، دەڵێن، پێغەمبەر سواری وشتری سپی بووە!
کە باسەکەمان وشترە، با ئەوەشتان بۆ باس بکەم:
ئامۆزایەکی قەزافی کە هاوتەمەن و هاونشینیی قەزافی دەبێ لەو سارا و بیابانە، ئەم بیرەوەرییەی تۆمارکردووە:
"کە هەرزەکار بووین و لە ژێر ڕەشماڵ و لەو سارابیەدا ژیانمان بەسەر دەبرد، دەمبینی قەزافی هێندە بە دەیقت دەیڕوانیە وشترەکان، کاتێ ئەو دڕک ودالەیان دەخوارد، وەک بڵێی قەت شتی وای نە دیتبێ. جوان جوان لێیان ورد دەبۆوە، دیقەتی دەدایە ئەو گیاندارە چۆن بەو لمووز و لێوانە، قەپ لەو وشترالووکانە گیر دەکا و ڕایان دەتەکێنێ و دەیان پچڕێنێ، جا ئەو هەموو دڕکە نووک تیژ تیژانە بادەدا و دەخاتە نێو زاری، ئینجا ملی بۆ ئاسمان بەرز دەکاتەوە و چاوەکانی دەچووقێنێ و ڕوو لە خۆر دەکا، لەسەرەخۆ، ئەو وشترالووکە دەجوێ و قووتی دەدا.
دوای نزیکەی (٣٠) ساڵ، کە قەزافی، زەعیم بوو، لە وتارێکیدا، ڕوو لە جەماوەر، گوتی: دەبێ، ئێمە وەک ئەو وشترەبین، کە قەپ لە وشترالووکی دڕکاوی دەگرێ و ملی بەرزدەکاتەوە و ڕووو لە خۆر دەیجوێت و دەیخوا... ئەو وشترالووکانە، ژان و ئازار و موعاناتی ئێمەن، دەبێ ڕوو لە خۆر بکەین، خۆری ئازادی و شکۆ و کەرامەت، تا بتوانین، بەرگەی ئەو ئازارانە بگرین و هاوڕێی خۆریش بین!
باوکی قەزافی وشترەوان و شوان بوو.

***

لە بیرمە، تەمەنم حەوت هەشت ساڵان بوو، قەتاری وشتران دەهاتنە کۆیە، لە نزیک مزگەوتی سەید وەلی، کە ئەوکات چۆلەوانی بوو پێیان دەگوت خانەقا، باریان دەخست، پتر ئەوان خوێ و خەنەیان پێبوو، بە تووتن دەیان گۆڕییەوە، خەڵکی شار، دەهاتنە سەیریان، کە دەڕۆیشتن، خەڵکەکە قشپلەکانیان کۆ دەکردە و وشک دەکردەوە و وەک دار و چیلکە بۆ سووتان بەکاریان دەهێنا.
لە کۆیە هەر مستەفا عەرەب ــ گیانی شاد، زستانان، عەبایەکەی کەوڵی وشتر هەبوو، بە خۆی دادەدا. ئەو کەوڵە بە سیمی زێڕین دەورەکانی و سەر قۆڵەکانی نەخشێنرا بوون.

## (٤٤)

# خبز بالجمر (یان) نانی پشکۆ

دوای کوژرانی موعەمەر قەزافی و نەختێ هێور بوونەوەی بارودۆخی شاری(سرت) و دەوروبەرەکەی لە لیبیا، بۆ هەواڵ پرسین و سۆراغیان، پەیوەندیم بە دۆست و برادەرەکانی ئەوێ کرد. بەداخەوە، ژمارەی ئەو برادەر و خوێندکار و مامۆستا و پرۆفیسۆرانەی کە دەمناسین وبوون بە قوربانی ڕووداوە خوێناوییەکانی (بەهاری عەرەبی) لەوێ کەم نەبوون. (ئیبراهیم عەلی مەبروک) ی خوێندکارم، ساڵێک بوو لە کۆلێژی پزیشکی دەرچوو بوو، کوژرا. (مسباح زەرگە)ش، کە ئەویش هەر خوێندکاری خۆم بوو، بووە سەرکردەیەکی دیاری چەکدارەکانی نەیاری قەزافی و بەشێکی شاری سرت لە ژێر فەرمانی ئەو دابوو.

لە برادەرە کۆژراوەکانم، زۆر سووم لە (ئەبو بەکر)بووەوە و بە دڵ بۆی پەرێشان بووم. ئەو گەنجە (٢٧) بەهارییە، کە بڕوانامەی ماستەری لە ڕشتەی کۆمەڵایەتی بەدەست هێنابوو و نەوزاوا بوو لە خوارزاییەکانی موعەمەر قەزافی بوو، لەشەڕی گرتنی شاری سرت یەخسیر دەکرێت، بەڵام شەوێک لە زینداندا دەریدەهێنن و بۆ شوێنێکی نادیاری دەبەن و تا ئێستا شونبزرە و کەس نازانێ ماوە یان کوژراوە!

(ئەبو بەکر) زۆر متمانەی بەمن دەکرد و جاروباریش، هەواڵ و باسی نهێنیی خۆیانی بۆ باس دەکردم. ئەگەرچی لەسەرتا من (٧) کیلۆمەترێک لە ئاواییەکەی ئەو دوور بووم و دوای (٣) ساڵان ماڵمان گواستەوە نزیک دێیەکەی ئەوان، کە زێدی خودی موعەمەر قەزافی بوو، بەڵام هاتووچۆمان گەرم بوو.

لە سەرتای یەکتر ناسینمان، ناوە ناوە (ئەبو بەکر) دەیگوت دەبێ ڕۆژی داوەتی منی بی و بە دەستی خۆم (خبز بالجمر) ت بۆ دروستبکەم. دەمەو عەسرێکی پاییزی، ئەو ڕۆژە ڕێککەوت و لەگەڵ دوو سێ برادەران لە نێویاندا مامۆستا (تەحسینی عێراقیش) بوو، داوەت کراین و ئۆتۆمبیل هات و بەرەو بیابانی ڕۆژاوا کەوتینە ڕێ.

دوای بیست دەقیقەیەک، لە چۆلەوانییەکی کاکی بە کاکی، لەو سارایە دابەزین و (ئەبو بەکر) دەستی کرد بە فرمان دەرکردن و دابەشکردنی ئیشەکان بەسەرماندا. ئەو هەموو شتە پێویستییەکانی ئەو زەحفەتەی هێنابوو. ئەمن چووم، بنکە خرنووک و درک ودالّ و دار و دەوەن لەو ناوە کۆکەمەوە، دیار بوو سەیرانکەران، پارچە دار و تەختە و ئەو شتانەیان لە دوای خۆیان بەجێهێشتبوو. حاجی تەحسینیش لە گەنێکی بەدەستە گرتبوو و کەرەستەی ئەو خوانەی ئامادە دەکرد.

بەدەم گۆرانی میللی خۆیانەوە، لە نەواری ئۆتۆمبیلەکەوە، ئەبوو بەکر ئاگرێکی گەورەی لەسەر خۆڵەپۆتەکە، کردەوە و چاوەڕوان بووین تا هەمووی دامرکا و دارەکان بوون بە پشکۆی گەش گەش. ئەوجا نزیکەی چوار مشت ئاردی کردە لەگەنەکەوە ئاوی تێکرد و بەبێ هەویرترش، دەستی کرد بە شێلانی تا بووە هەویرێکی نەختێ پەیت. هەموو هەویرەکەی خستە سەر دەستی و پانی کردەوە، وەک کولێرەی کوردەواریی خۆمان و خستیە سەر پشتی لەگەنەکە. ئەوجا بە سەرەدارێک هەموو پشکۆکانی لەسەر لمەکە لاداو، زەوییەکەی گەرمەکەی جوان جوان تەخت کرد و کولێرەکەی خستە سەر ئەو خۆڵە پۆتە و دیسان پشکۆکانی بەسەرداکردەوە، کولێرە، لەژێر خەلوز و پشکۆی ئاگرەکە بە جوانی داپۆشرا.

نزیکەی دوای چارێکە ساتێک کولێرەی ژێر پشکۆکانی دەرهێناو وەریگێڕا و خستییەوە ژێر پشکۆکان. لە قابلەمۆکەیەکیش، نزیکەی کیلۆیەک تەماتەیان لەت لەت کرد و خستیانە سەر لایەکی پشکۆکان و نەختێ خۆییان پێوە کرد.

دوای پێنج دەقیقەیەک، کە کولێرەکەیان لەژێر پشکۆکان دەرهێنا، بووە سەلەوات لێدان و چەپڵەڕێزان و گۆرانی گوتن، وەک ڕۆژی حەشر، لەو بیابانە ئەو دەنگ و هەرایە دوور دوور دەڕۆیشت.

کولێرە، چ کولێرە، بە قەد شەش کولێرەی خۆمان ئەستوور بوو، سەر و بنی هەموو خەلووزی ڕەش و پشکۆ و وردە زیخی و لم بوو. نەمدەزانی ئەوانە بە تەمای چین، یەکەمجارمە (خبز بالجمر) ببینم، بە دزییەوە بە هاوڕێ عێراقییەکەم گوت:" یانی ئێستا ئێمە، ئەو نانە دەخوێن؟!" بە زەرەخەنەیەکەوە، وتی "سەبرێ بگرە، براکەم، جارێ لە کێتە"!

قابلەمە تەماتەی سەر ئاگری قوڵپی دەدا، ئەوجا ئەبو بەکر گوتی، برۆن بەردێکم بۆ بێنن، بە سێ کەسان لەو سارایە بەدوای کوچکە بەردێک دەگەڕاین، بۆمان پەیدا نەدەبوو، ناچار لە پشتی پیکابەکە بەردێکمان دۆزیەوە، ئەوجا چۆن پەنیر لە ڕەندەی دەدەین، بەو شێوەیە، ئەبوو بەکر، بەو بەردە کەوتە کڕاندنی ئەو خەلووز و پشکۆ و وردە زیخ و لمە لە نانەکە، تا تەواوەک پاک بۆوە، ئەوجا دەستی کرد بە پارچە پارچە کردنی، ئەوەش هاسان نەبوو، چونکە کولێرەکە بۆ خۆی ببووە کووچکە بەرد، ناچار بە بەردی پارچە پارچەیان کرد و هێندێکیان خستە نێو قابلەمەکە و هێندی پارچەشیان هەروا، بەبێ پێخۆر خوارد.

ئەوجا گوتیان، فەرموون ئەوە سفرە و ناوی خوای لێبێنن. هەموویان دیتیان کە من زۆر بەساردیەوە، دەست درێژ دەکەم، بۆیە مامۆستا تەحسین، هەر لەتە تەماتەی دەخستە سەر پارچە نانەکە و دەیدا دەستم، دەیزانی نانەکە ناخۆم و بەدزییەوە، لە ژێر لمەکەی ڕادەکەم .

تا (خبز بالجمر) خواردرا، چای قوریە چینکۆیەکەی سەر ئاگری کولا و بۆن و بەرامەی بەو ناوە بلاو بۆوە. لیبییەکان زۆر حەز لە چا دەکەن، ئەوان چای قورس ناخۆنەوە بەڵام دەبێ فستەق یان گەڵای نەعنا بخەنە نێو ئیستکانەکە، ئەوەش بۆن بەرامەکی زۆر خۆش بە چایەکە دەدات، سێ چوار ئیستیکان چا بخۆیتەوە لێی تێر نابی.

لیبییەکان زۆر شانازی بەو نانە کەلتوورییەی خۆیانەوە دەکەن، کە دیارە ژینگە و ژیانی بیابانی، وای کردووە، لەو چۆلەوانییەوە لە نێو ئەو لمەدا، ئەو ڕێگایە دابهێنن، بۆ دروستکردنی ژەمە نانێکیان. هیچ سەیرانێکی ئەوان بەبێ دروستکردنی (خبز بالجمر) بە سەیران دانانرێت و نەوە دوای نەوەی یەکتری فێر دەکەن.

## (٤٥)

# ڕێوڕەسمی جەژنی ڕەمەزان و قوربان

دانیشتووانی وڵاتی لیبیاش، وەک هەر کۆمەڵگەیەکی موسڵمانی دی، لە ڕەمەزان و جەژنەکاندا هێندێ داب و نەریتی تایبەت بە کەلتووری خۆیان هەیە، لەو چەند سەرەقەڵەمەدا، چۆنم بینیووە، وا بۆتان دەگێرمەوە، سەردەمەکەشی، بەدیاریکراوی، لە نێوان (١٩٩٤ بۆ ٢٠٠٥)ە:

o مانگی ڕەمەزان لە لای لیبییەکان زۆر پیرۆزە، بۆیە زووتر بۆ پێشوازیکردنی خۆیان ئامادەدەکەن. ژن و پیاو و منداڵی سەرووی حەوت ساڵی، بەگشتی، هەمووی ڕۆژوو دەگرن.

o لە مانگی ڕەمەزان دەوامکردنی قوتابخانە و زانکۆکان و فەرمانگەکانی حکومی شەپرەی لێدەدا و زۆر کز دەبێ، بۆیە هەمیشە هەوڵدەدەن پشوو نیوەی ساڵ پاش و پێش بخەن، تا لەگەڵ مانگی ڕەمەزان یەکبگریتەوە، چونکە خوێندکارانی زانکۆی شارەکانی دیکە دەوام ناکەن. فەرمانگەکانیش لەکاردا زۆر سارد دەبنەوە.

o بە ڕۆژ زۆربەی ڕۆژووگران نووستوون، بەڵام شەو هەموو بازاڕ و شەقام و جێگەیەک مۆنجەی دێ و زۆر قەڵەباڵغ دەبێ تا کاتی پارشێو.

o بە چەند دنکە خورمایەک و پەرداغێک شیری وشتر فتاردەکەنەوە، ئەوجا چای و قاوە دەخۆنەوە، دواتر سفرە ڕادەخرێ و ژەمە نانێکی سووک دەخۆن. هەموویان جگە لە ژنان دەچنە نوێژی تەراویح، کە گەڕانەوە جارێکی دیکە سفرە ڕادەخرێتەوە و ژەمە نانی سەرەکی دەخۆن، تا پارشێوو ناخەون.

o لەو وڵاتە دەبێ، بۆ فتارکردنەوە، هەر نەبێ بۆ یەک جاریش بێ، کەسێکی غەریب بهێنێتەماڵەوە و فتارت لە گەڵ بکاتەوە. (من لەسەرتای مانگەوە ماڵەکانم ناونووس دەکرد، چونکە هەر هەموو ڕۆژەکان بەبەر ماڵێک دەکەوتم، نەمدەویست ببێتە ڕاکێشان و دڵشکان. بە زاری خۆم نەبێ، زۆر زۆر ڕێزیان لێ دەگرتین).

o بەدرێژایی شەوانی ڕەمەزان، ژن و پیاو و منداڵ دەچنە بازاڕەکان بۆ کڕینی پۆشاک و جلکوبەرکی نوێ بۆ جەژن. دەبێ هەموویان پۆشاکی نوێ بکڕن. لە هەموو شار و گەڕەک و شارەدێیەک (سوق شەعبی حوکمی) هەبوو، کە زۆربەی کاڵا و شتومەکەکانی هاوردەی ئیتاڵیا و کۆریا و چین بوون، هەم زۆر باش بوون و هەم نرخەکانیشیان (مەدعووم بوو) واتا، بۆ نموونە، دەستە کراسێکی کچۆڵەیەک گەر لە بازار بە (دە) دینار بوویایە لەو سوقە شەعبییە بە(چوار و پێنج) دینار بوو. جا هەر شەوە جۆرە کاڵا و شتومەکێکی نوێیان نمایش دەکرد، تا پارشێوو ئەو شوێنانە کراوە بوون و زۆر قەڵەباڵغ دەبوون.

o مەسرەفی مانگی ڕەمەزان (چوار) بەرابەری مەسرەفی مانگی ئاسایی بوو، بۆیە چینی مام ناوەند و خوارتر، زووتر پاشەکەوتییان بۆ دەکرد.

o نرخی شتومەک و خواردن لەو مانگەدا گران نەدەبوو، بەڵام لە چەند ڕۆژی پێش جەژنەکان، کە کرێکارە سودانی و میسری و بیانییەکان دەگەڕانەوە و وڵاتی خۆیان، سەوزە و میوە نەختێ نرخەکانیان هەڵدەکشا.

o بەگشتی، ئەو وڵاتە بەخێر وبێر بوو، بو نموونە دەبوایا شووتی و کاڵەک بە کەمەڵ کۆمەڵ بکڕی، بە تاک کەم هەبوون، بۆ دەسکە کەرەزوێک دەبوایا (شەدەیەک) بکڕێ. کۆمەڵە شووتی یان کاڵەک بە پێنج هەزار دیناری خۆمان بوو، ژمارەی کۆمەڵە شووتییەک هەشت بۆ دوانزدە دانە دەبوە، بە تاک نەبوو، ئەگەر بگوتبا هەر یەک دانەم دەوێ دەیگوت بەخۆرا بیبە. تەماتە و سێو و هەرمێ و هەنیجر و ترێ و پرتەقاڵ و لیمۆ و خەیار بە سندووق بوو پێیان دەگووت (گابییە) ئەوانیش هەرزان بوون. سڵق بە باوەش بوو، پیواز و قەرنابت و پەتاتە بە گوونیەی لای خۆمان بوو پێیان دەگووت( شکارە). زەیتوون بەلاش بوو، بۆ خۆت چووبایت لە ژێر دارەکان بە تەنەکە خڕت کردباوە. لە لیبیا دوانزدە جۆر پرتەقال و لیمو هەبوو.

o لەو وڵاتە هەمیشە ڕۆژی عالفە دەکرێتە یەکەم ڕۆژی جەژن، وەک لای ئێمە نییە و هەموو جەژنیکیش هەر دوو ڕۆژە بە ڕۆژی عالفەوە.

o بۆ نوێژی جەژن دەبوایا هەموو کەس، جگە لە ژنان، بەشداری تێدا بکەن. پیرۆزبایەکەشیان بەو جۆرە بوو: بە هەردوو دەست تەوقەت لەگەڵ دەکردن، ئەوانیش دەیانەویست دەستت بەرزبکەنەوە و ماچی کەن، جا تۆ نابێ بهێڵێت، بۆ کەسە دۆست و

نزیکەکان یەکتری ماچ دەکەن، بۆ کەسێک نەناسیاو بێ هەر شان ماچ دەکەن، گچکەش دەستی گەورە ماچ دەکات و گەورەش سەر بچووک. ئەگەر لەو مزگەوت (چوارسەد) نوێژکەر هاتبێ، تۆ دەبێ جەژنانە لەگەڵ هەر هەموویان بکەی. تەنانەت، ئەو کەسانەی ساردیشیان لە نێوان هەیە، دەبێ جەژنانە لێکدی بکەن، پشت تێکردن و خۆ دزینەوە لە یەک، شتێکی زۆر عەیبە و نابێ ڕووبدا.

**بۆ جەژنی قوربان:**

دەبێ هەموو خێزانێک قوربانی بکات، هەبوو سێنزدە مەڕی سەر دەبڕی. هەبوو وشتر و دوو وشتری دەکردە قوربانی. ئەوەی کە نییەتی قوربانی بکرێ، ناونووسکراوە، دوو سێ ڕۆژ زووتر دەچی لە جەمعییەی هەرەوەزیی و کشتوکاڵی حکوومی، لە ناوچەکەی خۆی، مەڕی خۆی، بە خوڕایی، وەر دەگرێ و دەیکاتە قوربانی. (لە یەکەم جەژن من هیچم نەکڕی بوو بۆ قوربانی، (عومەر عیسا)ی دراوسێکەمان، لە زاری منداڵانەوە زانی بووی کە مەڕم نەکڕیووە، هات و پرسی: "کوا مەڕی قوربانیتان؟" گوتم: "لە کەلتووری ئێمە هەموو کەس قوربانی ناکات": ڕۆیشت و هێندەی پێنەچوو هاتەوە و مەڕێکی هێنا ناو حەوشەیماڵەکەمان، منیش گوتم":" جا خۆ من نازانم سەری بڕم!" گوتی:" بەیانی خۆم دوای نوێژ، دێم بۆتان سەر دەبڕم".

o لەوێ قوربانی بەسەر خۆیاندا نابەشنەوە، چونکە کەس نییە قوربانی نەکات. بۆیە گۆشت، بۆ ئەو کەسانەی دەبەن کە غەریبن. ئێمەش هەر بە غەریب حیساب دەکراین. لەوەێ بۆ هەر ماڵێک دەبێ ڕانە مەڕێک یان (پتر) دەستی مەڕێک بێنن(وەک لای خۆمان نییە لەسەر قاپێک یان لە کیسەیەک نیو کیلۆ گۆشتت بۆ بێنن.)

o چۆن جاران لە لای خۆمان ڕستە بامیە و باینجانیان بە داوێوە دەکرد و لەسەر بان، لەبەر خۆر هەڵیان دەخست و وشکیان دەکردەوە، بەم شێوەیە، ئەوانیش، گۆشتەکانی قوربانی لەسەر ڕستە هەڵدەخەن و وشکی دەکەنەوە و دواتر هەڵیدەگرن. ئەمە پێی دەگوترێ (قەدید). ئەو گۆشتە لە لایان موتفەڕکە و تەنانەت گەر سەفەری وڵاتانیش بکەن، وەک داندۆکەکەی لای خۆمان، لەگەڵ خۆیانی دەبەن.

o رۆژانی جەژن، منداڵ هەر سەردانی خزم و کەس و کاری دەکات، هیچ ئاهەنگ و گۆرەپان و مەیدانێک نییە بۆ یاری و کات بەسەر بردن، وەک لای خۆمان، جۆلانەوە چەرخوفەلکی لێ بێ، بەڵام دوکانی ساردی وشیرنەمەنی و دوندرمە...تاد. دەکرێنەوە.

o بۆ یەکەم ڕۆژی دەوامی دوای جەژن، قوتابی و مامۆستا و فەرمانبەرەکان، دەبێ ئەو جلک و پۆشاکە بپۆشن کە یەکەم ڕۆژی جەژن لەبەریان کردبوو. بێگومان زۆربەی پۆشاکەکانیان میللی و کەلتووری خۆیان بوو. نابێ ئەو تاگەی بە سەردەست و مل و دامێنی جلکوبەرگەتەوەیە، لێی بکەیتەوە، هەردەبێ پێوە بێ. (جا یەکەم جار من نەمدەزانی، هەر مامۆستام دەگرت و پێمدەگوت، بڕوانە، تاگی کراسەکەت یان بلووزەکەت لێنەکراوەتەوە!).

o چینی مام ناوەند و هەژار، ئەگەر بۆ جەژنی ڕەمەزان جلک و بەرگیان کڕێ بێ، لە جەژنی قوربان ناکرنەوە، بەڵام ئەوەی هەیبێ، ئەوا نوییان دەکەنەوە.

## (٤٦)

# بەشە خۆراکی مانگانە و بازاڕی شەعبی

کە من گەیشتمە لیبیا، دوو ساڵی ڕەبەق بوو گەمارۆی ئابووری و بازارگانی و فرۆشتنی نەوتی بەسەریدا سەپێنرابوو و تەنانەت ڕێ لە فڕینی فڕۆکەی مەدەنیشی گیرابوو. خەڵکەکە پەرێشانیان پێوە دیار بوو. لەگەڵ ئەوەشدا، لە هەموو شارەکان بە سەدان بازاڕی تەشارووکی هەبوو، ئەوان پێیان دەگوت، بازاڕی شەعبییە. لە نێوان چەند گوندێکیش بازاڕێکی وایان بۆ کرابۆوە.

لەو بازاڕەدا، پۆشک و پێڵاو و کەلوپەلی ماڵ بە هەموو جۆرەکانی بۆ ژن و پیاو، کوڕ و کچ، هەموو تەمەنەکان، کاڵایەکی زۆر دابەشدەکرا، جۆری کاڵاکان دەرەجە یەک بوون لە باشی و نرخەکەشیان داشکانی گەورەیان بۆ کرابوو.

بۆ خواردن و خۆرک، هەر خێزانێک کۆبوونی خۆراکی هەبوو کە مانگانە هەر کەسە بەشە خۆراکی خۆت وەردەگرت. ئەمە بۆ هەموو هاوولاتییەکی لیبی بوو، جووتیار بووایە یان وەزیر.

حەق بە خۆم دەدەم گەر بڵێم، وڵاتی لیبیا یەکەمین وڵاتی ڕۆژهەڵاتی ناوەند و باکووری ئەفریقیا بوو لە باشی کوالەتی خواردن و کەلوپەل وکەرەستە پێویستییەکانی ژیان و هەمووشی بە نرخێکی ڕەمزی بوو. لە بەشە خۆراکەکە و کەلوپەلەکاندا شتی زۆر عەجیبت دەدی وەک گۆچان و دەسماڵ و فەرشی ناو پێڵاو و شەپقە و دەرزی و داو و دەرمانی مشکان و ...تاد.

خواردن و کاڵاکانیان باشترین مارکەی وڵاتە پێشکەتووەکان بوو، بۆ نموونە برنجی ئیتاڵی کە سندووقی (١٠) پاکەت بوو هەر پاکەتەی یەک کیلۆ بوو نرخەکەت (٣) دۆلار بوو. فەردە شەکری کوبی کە (٥٠) کیلۆ بوو بە (٣) دۆلار بوو، ئاردیش بە هەمان نرخ. باشترین شیرەمەنیی هۆڵەندا و مەعجوونی تەماتەی یۆنانی و مەعکەرۆنی ئیتاڵی و جلوبەرگ و یاریی منداڵانی کۆریی و ئۆتۆمبیلی ژاپۆنی ....تاد. نەوت و بەنزینی خۆیان، تانکی سەیارەت بە (٤ – ٥) دۆلار (فوول) دەکرد. بەنزینەکە لە پاڵاوگەی ئیتاڵیاوە دەهات.

دوو کەشتیی جیهانیشیان هەبوو بۆ سەفەر و گەشت و گەڕان. غەرناطە و طوڵەیطەڵە. کە نرخی پسوولەی بۆ خەڵکی لیبیا زۆر هەرزان بوو. لە تەرابلس بۆ تورکیا هەر(٥٠) دۆلاریک بوو.

قەت بۆ یەکجاریش هیچ کاڵایەکی (عەرەبی) و (ئەمەریکی)م لەم وڵاتەدا نەدی ــ جگە لە برنجە سۆری میسری. دەرمانیشیان هەموو باشترین کۆمپانیای جیهانی بوو.

منیش وەکو لیبییەکان کۆبۆنی خۆراکم هەبوو(ناویان تۆمارکردبووم) هەروەها هەموو خیزانە فەڵەستینییەکانیش.

## (٤٧)

## کابرای ڕووس، چۆن لە لیبیا بووە موسـڵمان؟

کە بەناو ئەرشیفی پاشا و سەرۆکەکاندا دەگەڕێی، قەت یەکێک نادۆزیتەوە، ڕکابەری ئەو زاتە بێ، لە تاوتوێکردن و هەڵسەنگاندندا، هیچ ئاوەڵناو و نازناوێک نەماوە، پێوەی نەلکێنن – ئەوە جگە لەو لەقەبانەی کە خۆی بۆخۆی داتاشیبوون، جا هەر نووسەرەی بە جۆرێک پێیدا هەڵگوتووە یان پێیدا ڕشاوەتەوە: سەرکردە زیرەکەکە، سەرکردی سەرکردان، کاریزمایەکە، بلیمەتەکە، بیرمەندەکە، شوڕشگێڕەکە، فریادڕەسەکە، جەنگاوەرەکە، گیانفیدایەکە، موجاهیدەکە، موئمینەکە، ئەمیرەکە، پەیامبەرەکە، شێتەکە، گەوجەگە، هەرزەکارەکە، نەرجسییەکە، خۆپەرستەکە، خۆهەڵکێشەکە، کافرەکە، زەندیقەکە، سەفاحەکە، گەندەڵەکە، پیاوخراپەکە، دزەکە، مێبازەکە، قژپژەکە...تاد.

ئەگەرچی ئەو هەر دوو ساڵ بوو کۆلێژی سەربازی تەواو کردبوو، کە کودەتادا سەربازییەکەی بەسەر مەلیک (محەممەد ئیدریس ئەل سنوسی)دا کرد لە (١) ئەیلولی (١٩٦٩)، (٢٠٠) کەسی لێگرترن، بەبێ ئەوەی کەپووی کەسیان خوێنی لێ بێ و حوکمی قورس هێندێکیان (١٥) ساڵ زیدانی بوو، پاشان لەوانیش خۆش بوو. ئەو توانی شێوازێکی حوکمڕانی تازە باو بێنێتە کایەوە کە پێش ئێستا لە مێژوودا نموونەی نەبووە. سیاسەتزانێک نووسیویەتی: "دەستووری حوکمی موعەمەر دیموکراتی، پەرلەمانی، سەرۆکایەتی، ئیشتراکی، شیوعی، ئیسلامی، میللی، خێڵەکی، سەربازی، مەدەنی، جەماوەری، دیکتاتۆری، فاشی، علمانی بووە – لە هەمان کاتیشدا هیچیان نەبووە".

دوای تاوانبارکردنی موعەمەر بە خستەخوارەوەی فڕۆکەیەکی ئینگلیزی لەسەر شاری لۆکەربێ و تەقاندنەوەی تیاترۆخانەیەک لە بەرلین و خستەخوارەوەی فڕۆکەیەکی فەرنسی لە ئاسمانی نەیجەر، نەتەوە یەکگرتووەکان لە ساڵی (١٩٩٢) ئابلوقەیەکی

خنکینەریان بە سەر لیبیا داسەپاند، فرۆکەخانەکانیشیان پێداخست. بۆیە من، لەڕێی دەریای سپییەوە بەرە ئەو ولاتە پەڕیمەوە.

جا لەو لیبیایە، کە بە شەقام و جادە و کۆلانەکانیدا دەگەڕێی، نە بە شەو و نە بەڕۆژ، قەت چاوت بە پۆلیسێک، سەربازێک، ئەمنێک، چەکدارێک ناکەوێ، قەت دامودەزگایەک نابینی، پاسەوانێکی هەبێ تەنانەت کە بە ڕۆژ دوکانە گەورەکانیشیان بۆ نوێژ و نانخواردن بەجێدەهێڵن، هەر تیرە دارێک دەخەنە سەر شتومەکەکانی پێش دەرگا و هیچی تر. کە سەر بە فەرمانگە و دامودەزگاکانیان دادەگری، نازانی کێ بەڕێوەبەرە، کێ فەرمانبەرە، کێ بەرپرسە، هەیە چوار نهۆمە و سێ کەسی تێدا نییە. بەڵام کە بە تەنیا لەسەر کورسییەک لە دەم کەناری دەریا دادەنیشی و نامەی ژنەکەت دەرێنی و دەیخوێنیتەوە، ئەوەندەی دەزانی دەگەنە سەرسەرت و دەڵێن؛ بێنە ئەوە چییە دەیخوێنیتەوە!

کە بۆیەکەمجار دەچیتە شوێنی کارەکەت، هێندە زانیارییان لەسەرت هەیە، هەر دەڵێی، حیزبی بەعس پێشتر دۆسییەکەی تۆی بۆ ناردوون.

ئەوەندە ساڵەی لەوێ بووم، هەر دوو جار، دوو سەربازم بینی چەکدار بوون، دوو مامۆستای عێراقی یەک شەو بوو لە قوتابخانەیەکی نزیکمان دامەزرابوون، بۆ دووەم شەوێ هەردووکیان پێچانەوە، ئێستاشی لەگەڵدا بێ نەمانزانی بۆ کوێیان بردن، گوتیان: ئەوانە درۆ دەکەن مامۆستا نین، ئەفسەری بەعسین بە مەبەستی گلاو نێردراون. دکتۆرێکی خەڵکی ڕومادی هەر(٥) ڕۆژێک بوو لە نەخۆشخانەی شاری (سرت) دامەزرا بوو، ئەویشیان پێچایەوە، گوتیان پزیشکی سەربازیی بووە لە عێراق!

کەس نەبوو نە بە شەو و نە بە ڕۆژ دەرگای ئۆتۆمبیلی قوفڵ بدا، چەند جار من بەهەڵە سواری ئۆتۆمبیلی خەڵکی دی بووم، لێمگۆڕابوون وامزانی بوو ئەوەکەی خۆمن. ئەسڵەن، لە دنیەکەی ئێمە هیچ ماڵێک دەرگای حەوشەشی نەبوو. لەو بیابانە ئەو وشترانە بە مێگەل بۆخۆیان دەسوڕێنەوە و هیچ وشترەوانێکیان لەکن نییە. دەیانگۆ بە مانگ دەچن بەسەریان دەکەنەوە.

وڵاتێک کە (١٨٠) جار لە وڵاتی لوبنان گەورەتر بێ و (١٤٠) خێڵ و سەرۆک عەشیرەتی لێ بێ و یەدەگی نەوتی (٤١) ملیار بەرمیل بێ وکەناری دەریایی کراوەی نزیکەی (١٧٧) هەزار کم بێ و ئەو خوارەشی بیابانی کاکی بەکاکی بێ، ئەوجا چۆلەکە نەوێرێ بەسەریدا بفرێ. کە سەرکردەکەشی دەبینی جگە لە چەند ئۆتۆمبیلێکی سەربەچەک و چەند پاسەوانێکی ژن کەسی دیکەی لەگەڵ نییە و ڕۆژی جەژن و تەراویحی و ڕمەزانانیش لە گەورەترین گۆڕەپانی پایتەخت پێشنوێژیان بۆدەکا. هەر دەبێ سەری خۆت لەم عاجباتییە بادەی.

دوای ئەوەی لە ساڵی (١٩٧٠) موعەمەر ئەوەی ئەمەریکی و ئینگلیز بوو لە وڵات دەریپەڕاندن و پێگەکانی داخستن. هەموو پەیوەندییەکی ئابووری و پیشەسازی و کشتوکاڵی و سەربازیی لەگەڵ یەکێتیی سۆڤیەت مۆر کرد. ساڵی (٢٠١٠) بای یەک ملیار و نیو دۆلار چەکی لە ڕووسیا کڕی. بڕیار بوو لە (٢٠١١) گەشتییەکی (٤)هەزار نەفەرهەڵگری نوێ بۆ لیبیا بکرێ.

جا هەرچی ئەندازیار و پسپۆڕ و ئەفسەرو کادیری بێگانە لەو وڵاتە هەبوو، هەموویان ڕووس بوون.

کرێکارێکی ڕووس، دوای ئەوەی چوار بۆ پێنج مانگ بوو هاتبووە لیبیا، دەچێتە مزگەوت و بە مەلا دەڵێ:

"چی بکەم، من دەمدەوێ ببم بە موسڵمان؟"

کە مەلا لێی دەپرسێ: چ شتێک بووە هاندەرت، ببیتە موسڵمان؟

کابراش دەڵێ:

"خودا، خودای مەزن. ئەدی ئەگەر خودا ئەو وڵاتە بەڕێوە نەبا، کێ بەڕێوەی دەبا؟ ئامەنتو بیللا!"

## (٤٨)

## حەزدەکەم حوتێکت بۆ بکڕم، مامۆستا فازیل!

هەموو جارێ وای پێدەگوتم، کە گەر ئەوجارەی چووە تەرابلس، منیش ببات و لەوێ بچینە (سوق الحوت) و حوتێکم بۆ بکڕێ. من هەمیشە، کە ئەو باسە دەهاتە گۆڕێ، نووقمم لە خۆم دەبڕی، ئاخر بۆ منی غەریب و غەوارەی وڵاتی لیبیا، خۆش نەبوو قسەیەکم لەزار دەرچی و مەجلیس بیهێنێتە پێکەنین. من بۆ خۆم هەرچەندی دەمکرد و دەمکراند، نە دەچووە ئەقڵم، ئاخر چۆن حوت لە بازاڕ دەفرۆشرێ، با وا دابنێن، حوتیش بفرۆشن، من چ لە حوتێکی بەقەد فیلەتەنێک بکەم!

لەسەفەرێکم بۆ تەرابلس کە چوومە سەردانی خوشکم، ڕۆژێ ڕێم کەوتە بازاڕێ (سوق الحوت) لە (شارع الرشید). بەراستی ئەوەندەی من بە بۆن و بەرامە و دیمەنی ئەو بازاڕە کۆنەی کەلتوورییەوە سەرسام بووم، ئاگام لە حوت و مووتان نەمابوو.

بازاڕەکە، کۆنترین بازاری ئەو شارەیە، مێژووەکەی بۆ سەدان ساڵ پێش ئێستا دەگەڕێتەوە، کە ئەو کات بە وشتران باریان دەهێنە شار و لەو مەیدانەیان دەخست، جا کە ئیتاڵیەکانیش هاتن، پتر بایەخیان بەو بازاڕە دا، تا بووە قیبلەگای گەشتیار و میوانانی ئەو شارە.

لە ڕۆژی جومعان، بۆن و بەرامەی ئەو بازاڕە تابڵێی خۆشە و قەد بەهیچ بازاڕێکی دونیا ناچێ. بازاڕەکە چوار دەرگای گەورەی هەیەوە، ناوەوەی، لە قەیسەرییەکانی لای خۆمان دەچێ و لە ناوەندی بازاڕەکە سەکۆیەکی بازنەیی گەورەی سەر بە گومبەز هەیە، باوەڕ بفەرموون، پتر لە (٤٠) جۆر ماسییان لێ داناوە.

هەر کە گەیشتینە، گوزەری ماسیفرۆشان، مامۆستا عبدولناصرم بەبیر هاتەوە کە هەموو جارێ دەیگوت:" ڕۆژێک، حوتێکت بۆ دەکڕم!"منیش هیچ بەسەرە خۆم نەدەینا، ئێستا تێگەیشتم کە لیبییەکان بە ماسی دەڵێن (حوت)، زۆر پێکەینم کە تێگەیشتم چەند لەمێژە، ئەو مێشکی من بەو (حوتەوە) مەشغول کردبوو و نەمدەوێرا بپرسم: "جا من حوتێکم بۆ چییە؟"

بەداخەوە، ئەم بازاڕە لە شەڕ و پێکدانەکانی دوایێ قەزافی زەرەری زۆری پێگەیشت.

## (٤٩)
# ژن و منداڵی قەزافی

هەمووومان، کەم تا زۆر، زانیارییمان لەسەر ژن و منداڵەکانی سەددام حوسێن (١٩٣٧ ــ ٢٠٠٣) هەبوو و دەمانزانی کە نە منداڵەکانی فیرعەون و نە هارونە ڕەشید، لەو سەڵتەنەن و خۆشی و سەفا و ڕابواردن و دەسەلاتدارییەی واندا نەژیاوون، لە هەمان کاتیشدا داڕووخانە تراژیدیاییەکەی ئەو خێزانەمان بینی. سەددام، ئەو منداڵانەی، بە کوڕ و کچەوە، بەڕەڵاکردبووە تا بە سایەی ئەوانە پتر سام و خۆف و دەسەلاتی خۆی بەسەر هاوولاتی زەبووندا بەسەپێنێ.

بەڕواڵەت، گۆیا سەددام هەر ساجیدەی کچی خێروڵلا طلفاحی ژن بووە و دوو کوڕ و سێ کچی لێی هەبووە:

عودەی، کوڕە بەڕەڵایەکەی سەددام، سەرۆکی فیدائییەکانی سەددام و لیژنەی ئۆلەمپی نیشتیمانیی عێراق و بەرپرسی کەناڵی تەلەڤزیونی (ئەل شباب) و ڕۆژنامەی بابل بوو. دەستی لە کووشتنی هاوولاتیاندا هەبوو و دەستیشی لێوەشێنردرا و شەپرەلیدراو بوو تا ڕۆژی کورژانی لە موسڵ. گەرچی چەندان ژنی هێنابوو، لە دەستدرێژیی بۆ سەر کچان ناوی دەرکردبوو. هەرچی قوصەیی بوو، کەسی دووەم بوو دوای باوکی لە سەرکرایەتیکردنی سوپا و پاسەوانی کۆماری و ئەمنی خاصە. ئەندامی قیادەی قوطری حیزبی بەعس و جێگرەوەی دوومی ئەمانەتیی سرِری مەکتەب عەسکەری بوو، کە دەسەلاتی لە وەزیری بەرگری پتر بوو. سەرپەرشتیاریی ئەنجومەنی ئاسایشیی نیشتیمانی عێراقی بوو. کەسی یەکەمی متمانە پێکراوی باوکی بوو، ئەویش لەگەڵ مستەفای کوڕی و عەودەی برا لە موسڵ، لە (٢٠٠٣) کوژرا. کچەکانی سەددام: ڕەغد و ڕەنا و حەلا، کە ئەوانیش، دوای ژیانی شاهانەیان، پەرتەواز و دەربەدەری ئەو دەرک و ئەم دەرکی وڵاتان بوون و دوای تەلاقدان و کوژرانی مێردیان.

دەڵێن، سەمیرە شابەندەریش ژنی سەددامی بووە و کوڕێکی لێی هەیە بە ناوی عەلی.

ژن و منداڵەکانی قەزافیش، حەوت بەردیان بە ئەوانەی سەددامی دادابوو. ئەوان هۆکارێکی سەرەکی بوون لەو کۆتاییە تراژیدیایەی بەسەر باوکیان و بەسەر لیبیایان داهێنا.

جیاوازییەکی جەوهەریی لە نێوان خانەوادەی سەددام و خانەوادەی قەزافیدا هەبوو: خانەوادەی سەددام، تا ڕادەیەکی زۆر داخرا و شاراوە و دوورخراوەبوون لە کۆمەڵ. گەڕەک و شاری خۆیان هەبوو، ئەگەر ناوە ناوە لە تیڤی دەرنەکەوتبان، کەس خەبەری نەدەزانین، تەنانەت ئەوانەی لێشیان نزیک بوون. بەڵام چونکە پێکهاتەی کۆمەڵی لیبی، بنەما و بنچینەکەی خێڵەکییە، خێڵ سەردار و دەسەڵاتدار و بڕیاردەرە، ئەو ژن و منداڵانەی قەزافی هەر شتێکیان بکردبایە، یەکسەر خەڵکەکە دەیزانی و زوو بابەتەکە دەکەوتە سەر زاران. کوڕێکی قەزافی، دەستی بەسەر جوانترین و بەنرخترین گێڵگە و مەزرا، لە شاری سرت، داگرت. پاش دوو ڕۆژان باسەکە بووە بنێشتەخۆشەی سەر زاران، تەنانەت ڕۆژێک، بەڕێوەبەرەکەم منی برد، ئەو باخ و بێستانەی نیشاندام و پەڕۆشی بوو، کە بۆچی ئەو کوڕە، لە تەرابلسەوە بێت و ئەو زەوی و زارە بکاتە موڵکی خۆی، با پارەشی دابێ!

قەزافی، لە ساڵی کودەتاکەیدا، فەتحیە نووری خالید هێنا، کە مامۆستای دواناوەندی بوو، بەڵام دوای شەش مانگ لێک جودا بونەوە و کوڕێکی لەو ژنە بوو بە ناوی موحەممەد.

هەر لەو ساڵەدا (١٩٧٠)، قەزافی دڵی دەچێتە سەر پەرستارێک، کاتێک لە نەخۆشخانە دەبێ، بە ناوی صەفییە فرکاش، دەیخوازێ. سەرەتا ئەو ژنە لە بۆنەکاندا بەدیار نەدەکەوت، بەڵام دواتر، لە میدیاکاندا بایەخی پێدەدرا. لە (٢٠١٠) لە ساڵیادی شۆڕشدا، لەگەڵ ژنە سەرۆککۆمار و مەلیک و حاکمەکان دانیشتبوو، کە بۆ ئەو بۆنەیە بانگهێشت کرابوون. فڕۆکەی تایبەت و ئۆتۆمبیلی گرانبەهای خۆی هەبوو. لە ساڵی (٢٠٠٨)، لە کۆبوونەوەی سەرکردەکانی یەکێتیی ئەفریقیا لە شەرم شێخ، وەک بریکاریی سەرۆکی ڕێکخراوی ژنانی ئەفریقیا هەڵبژێردرا. دوای کوژرانی قەزافی، لەگەڵ عائشەی کچی و هانیبالی کوڕی و موحەممەدی زڕکوڕی، چوونە جەزائیر. قەزافییەکان ناویان لەو ژنە نابوو (خەنسای لیبیا)، کە فڕۆکە، کوڕەکەی (سیف العرب)ی کووشت لە (باب العزیزیە). دواتر (خمیس)ی کوڕیشی کوژرا. پاشان قەزافی هاوسەر و (المعتصم باللە)ی کوڕی، پێکەوە کوژران.

ئێستا بابزانین، چۆن ئەو منداڵانە بەڕەکە لە ژێر پێی باوکیان دەردێنن و ئەو هیچ دەسەڵاتێکی بەسەریاندا نامێنێ، و نەک هەر چاوپۆشی لە عەیب و عارەکانیان دەکات بەڵکوو بەرگریشیان لێدا کات، تا سەری دەخۆن.

موحەممەدی نۆبەرەی، سەرۆکی لیژنەی ئۆلۆمپی لیبیا بوو کە بووە خاوەنی (٤٠٪) کۆمپانیایی خواردنەوە ساردەمەنییەکانی لیبیا و خاوەن ئیمتیازیی کۆمپانیای کۆکاکۆلا، سەرپەرشتیاریی لیژنەکانی پۆستە و پەیوەندییەکانی بەتەل و بێتەلی لیبیا بوو، بە هەموو لقەکانیانەوە. لەگەڵ دەستپێکی راپەڕینی بەهاری عەرەبی لە لیبیا، ئەو کوڕە، لەگەڵ باوکی ناکۆک بوو، لە بەربەرەکانیکردنی جەماوەرەکە، ئەو دەیەویست بە ئاشتییانە پێک بێن، باوکی دەرگای لەسەر داخست، تا دواتر لەگەڵ زڕدایکی ڕوودەکەنە جەزائیر.

سەیف ئەل ئیسلام، کوڕی دووەمی قەزافی بوو، باوکی پەروەردەی کردبوو بەو هیوایەی ببێتە جێگرەوەی خۆی. ئەو بڕوانامەی دکتۆرای لە کۆلێژی زانستەکانی ئابووری لە لەندەن وەدەست هێنابوو. زمانەکانی ئینگلیزی و ئەڵمانی و نەختێکیش فەرەنسی دەزانی. سەرپەرشتیی دەزگای خێرخوازیی جیهانیی قەزافی دەکرد. لە کۆڕ و کۆبوونەوەکاندا داوای گۆڕانکاری و ڕیفۆرمی سیاسی و ئابووری بۆ لیبیا دەکرد. ڕێکخراوی مافی مرۆڤی دامەزراند و داوای چاکسازیی لەو بوارەدا دەکرد، هێندێ بەندکراوای سیاسی ئازاد کرد. دەیەویست دەستووری هەمیشەی بۆ لیبیا دانێت و مەرجەعیەتێک بۆ سەرۆکایەتیی وڵات دروست بکات. لە بواری دیپلۆماسی دەرەوەر کاری دەکرد. مەیلی بۆ وڵاتانی ڕۆژاوا زۆر بوو. کەناڵی تەلەڤزیۆنی خۆی هەبوو لەگەڵ دوو ڕۆژنامە.

دوای دەستگیرکردنی لە لایەن گرووپە ڕاپەڕیوە چەکدارەکان، بە تاوانی ئەنجامدانی تاوانی دژ بە مرۆڤایەتی و هەڵگیرساندنی شەڕی ناوەخۆ و دەسترێژیکردنی بۆ سەر سەروەت و سامانی نیشتیمان و مافی هاووڵاتیان، حوکمی گوللەبارانکردنی بەسەردا دەدرێت، بەڵام دوای ساڵێک لەو حوکمە، لە (٢٠١٦) ئازاد دەکرێت و خۆی بە بەربژێر دەکا، وەک کاندید بۆ سەرۆکی وڵات، بەڵام دەواتر ئەو مافەی لێسەندرایەوە و دیسان پێیدرایەوە.

ئەل ساعدی، کوڕی سێیەمی قەزافی بوو، دەڵێن ئاڵوودەی مەشرووب و ماددەیهۆشبەر و مێبازی بووە. شەڕوگێچەڵی زۆربووە، بە تایبەتی لە دەرەوەی لیبیا. هیچ ڕێز و حورمەتی باوکی نەدەگرت. یاریزانی فۆتبۆڵن بوو، خۆی سەرۆکی یەکێتیی فۆتبۆڵێنی لیبیا بوو. پشکی شێری لە تیپی میللی لیبیدا هەبووە. گەرچی بڕوانامەی بەکەلۆریۆسی لە ئەندازیاری هەبوو، ماوەیەک وەک ئەفسەر سەرپەرشتیی یەکەیەکی هێزی تایبەتیی دەکرد. هێزی تایبەتی خۆی هەبوو، خاوەن کۆمپانیای دەرهێنانی تەلەڤزیۆنی بوو. بۆ دەرهێنانی کۆپیەک لە فلیمی ئەڵمانی (ئەزموون) بە زمانی عەرەبی (١٠٠) ملیۆن دۆلار خەرج دەکات. ئەل ساعدی لە تەرابلس دەگیرێ دواتر چەکدارە ڕاپەڕیووەکان ئازادی دەکەن و دەچێتە تورکیا.

هانیبالی کوڕی چوارەمی، بە شەڕانگێزی و دەرچوون لە یاسا و گێرەشێوێنی کردن لە ئەورووپا ناوی دەرکردبوو، چەندان جار پۆلیس زیندانی کردووە و باوکی داکۆکی لێکردوە، بە داخستنی کۆمپانیا و پارەوپۆلی لە بانکەکانی ئەو وڵاتانە، گەر ئازاد نەکرێ. ئەو کوڕە دوای کوژرانی باوکی، لە تۆڵەی بزرکردنی موسی صەدەری شیعە، لە لوبنان زیندانی دەکرێ.

ئەل معتەصم، کوڕی پێنجەم، ڕاوێژپێکراوی باوکی بوو بۆ کاروباری ئاسایشیی نەتەوەیی. لە ساڵی (٢٠٠٨)، یەک ملیار و (٢٠٠) ملیۆن دۆلاری لە دروستکردنی دەزگایەکی سەربازی و ئەمنی خەرج کرد، تا ئەویش وەکو خەمیسی برای ببێتە خاوەن پێگەی سەربازیی خۆی. چەندان دامودەزگا و کۆمپانی بازرگانی لیبیای لەژێر دەست بوو.

خەمیس، کوڕی شەشەم، سەرۆکی یەکەی هێزی تایبەتی لیوای (٣٢) و کەتیبەی خەمیس بوو. ئەو لیوایە لە ڕووسیا مەشق و ڕاهێنانی سەربازیان پێکرابوو، بەرپرسی یەکەمی پاراستنی ڕژێم بوو، لە تێکهەڵچوونی خوێناویدا لەگەڵ گرووپی چەکدارە ڕاپەڕیوەکاندا، بەخسیر دەکرێت و دواتر گوللەباران دەکرێت.

عائیشە، کچی قەزافی، هەمیشە ڕۆڵی ناوبژیوان و ئاشتکەرەوەی لە ناو خانەوادەکەی بینیوە. لە چەندان ڕێکخراوی ناحکوومی کاری دەکرد. بۆ ئاهەنگی ڕۆژی لەدایکبوونی، گۆرانیبێژی بیانی بانگێشت دەکرد. شووی بە ئەحمەد قەزافی کردبوو. لە سوپای لیبیا فەریق بوو، قەزافی ئەو کچەی بەناوی دایکییەوە دەنێ. ئەو کچە لە هەموو براکانی بوێرتر

و ئازاتر بوو. دکتۆرای لە یاسای نێو دەوڵەتی لە لیبیا وەرگرت. لەساڵی (٢٠٠٩) نەتەوە یەکگرتووەکان وەک باڵیۆزی نیازپاکی دیاری کرد. لە ژیاننامەی خۆی، (شازادەی ئاشتی)دا نووسیویەتی دەڵێ، ئامادەیە بگەڕێتەوە لیبیا دژی هێزەکانی تورکیا بجەنگێ.

سەیف ئەل عەرەب، کوڕی هەشتەم، زۆرکەم ناوی دەهات، دەڵێن لە میونخ دادەنیشت و خەریکی هێندێ کاروباری شاراوە بوو لەو وڵاتە. حەزی لە سیاسەت نەبووە و خۆی دوورەپەرێز گرتووە. ئەویش هەر لە سەرەتای ڕاپەرین کوژرا.

هەنا، ئەو کیژۆڵە بوو کە قەزافی هەڵیگرتبۆوە، گوترا لە بۆمبارانەکەی کۆشکی قەزافی لە ساڵی (١٩٨٦) کوژراوە (؟)، بەڵام دواتر وەک پزیشکێک بەدیارکەوتەوە.

جگە لە هەنا، قەزافی کوڕێکیشی هەڵگرتبۆوە بە ناوی میلاد، دەڵێن، میلاد لە ساڵی (١٩٨٦)، ئەو شەوی فڕۆکەکانی ئەمریکا هێرشیان کردە سەر کۆشکەکەی لە تەرابلس، قەزافی لە مردن ڕزگارکرد.

دوای مانەوەیان چەند مانگێک لە جەزائیر، صەفیە لەگەڵ عایشەی کچی و ئەل ساعدی کوڕی چوونە شانشینی عومان. لە هێندێ سەرچاوەوە: ئەوان حەزیان دەکرد بێنە کوردستانی باشوور و لەوێ لە هەرێم نیشتەجێ بن، بەڵام بۆیان مەیسەر نەبوو!

## (٥٠)

# قەزافی میباز بوو؟

لە دیوەخانەکانی میسر، زۆر بێ حورمەتییە، فنجانە قەهوەت بۆ بێنن کەفی لەسەر نەبێ، میسرییەکان بەو کەفەی سەری، دەڵێن (وەجهە)، بەڵام لە شێوەزاری لیبی، (وەجهە)، بە مانای ژنی سۆزانی دێ.

بۆ شۆخی، لە لیبیا دەیانگوت:

"موعەمەر میوانی حوسنی موبارەک دەبێ لە قاهیرە، کە قەهوەیان بۆ دێنن، موبارەک دەبینی قەهوەکەی، هیچ کەفی لەسەر نییە، بە نابەدڵییەوە دەڵێ:

- فین الوجە؟ واتا کوانێ کەفەکەی؟

موعەمەریش پێیدەڵێ:

- یاشێخ، تۆ جارێ قەهوەکە بخۆرەوە، دوای (الوجهت) بۆ دێنن. (واتا دوای خوارنەوەی قەهوەکەت، سۆزانیت بۆ دێنن).

دەڵێن، قەزافی میباز بووە، وابوو؟

ڕەنگبێ، ئەم ئەلقەیە ئاڵۆزترین بەندی ئەم نووسینەی من بێ، نەک لەبەر ئەوەی پێیناوێرم، بەڵکوو لەبەر ئەمانەتە مێژووییەکەی، کە یەکجار قورس و سەنگینە، ئەو کۆڵە قورسە بە پشتی خۆم دادەم و بەو ڕێیە ڕکە هەڵگەڕێم، ڕەنگبێ بچووکترین ساتمە ملم بشکێنێ.

ژەنەڕاڵێکی ئەڵمانی، لە جەنگی دووەمی جیهاندیدا، بە زامداری دەکەوێتە دەستی ڕووسەکان، ڕۆژانە هیتلەر و دەزگاکانی میدیا زەبەلاحەکەی، چەندان جار ئەو قەوانەیان بۆ خەڵکەکە دووبارە دەکردەوە کە، ژەنەڕاڵ تا گیانی دەرچوو و شەهید بوو، هەر هاواری دەکرد:

(بژی هیتلەر... بژی هیتلەر ... بژی هیتلەر).

دوای چل ساڵ، سەربازێکی ئەڵمان، کە لە گەڵ ئەو ژەنەراڵە یەخسیر بوو بوو، بۆ ڕۆژنامەیەک دەنووسێ:
(ژەنەراڵ هەتا ڕۆحی دەرچوو، هەر تووکی دەکرد و دەیگوت، پەلپەل بکرێیت هیتلەز... ماڵتکاوڵ بێ هیتلەر... خودا لەبنی گوێتدا هیتلەر).

ئەو مێژووەی، دوای چل پەنجا ساڵێ دیکە دەنووسرێتەوە، گەلەک جیاوازی دەبێ لەگەڵ ئەوەی ئێستا، کە بە پارە و پۆست و خاترو خۆتر دەنووسرێتەوە و بێحەدد ڕووداو و ڕاستییەکانی ئاوەژوو دەکرێن.

بەدرێژایی مێژوو، ژن و شەهوەتبازی و مێبازی، زۆر بە خەستی لە ژیانی سەرکردەگەلێکی زۆر گەورەی ئەم جیهانە (بە دوێنی و ئێستاشیەوە) ئاراوەکەیان ڕەنگرێژ کردوە. زۆربەی هەرزۆریش، لەو شتانەی لەو بارەیەوە دەگوترێن، بۆ شکاندنەوە و بێحورمەتکردنی سەرکردەکانە. کە ئەوانیش دەکرێ بخرێنە نێو دوو سەبەتەوە، ئەوانەی بوختانن و بۆ مەرامێکی تایبەت بۆیان هەڵبەستراوە، وە ئەوانەی بێشەرم تەقسیرییان نەکردوە لە تێرکردنی نێوگەڵی خۆیان، بگرە شانازیشیان پێوەکردووە. جا پێغەمبەرەکانیش لەو (گوتانە) پەراوێزنەخراون.

تۆ وەرە، دەقە شیعرەکانی ئەبو نەواس بخوێنەوە، سەربوردەکانی ئەو دیوی پەردەی دیوەخانەکانی هارونە ڕەشید هەڵدەوە، ئەوجا دەزانێ، کە حۆری و غیلمان و سۆزانی و شەهرەزادەکان، چ شەوێکی سووریان لەو (دار السلام)ی خەلافەی ئیسلامی بەسەربردووە.

ئەگەر، شەوانی سووری، دیوەخانەکانی هارونە ڕەشید، (ان)یەکیان تێدابێ، خۆ ئەوانی محەممەد ڕەزای شاهەنشای ئێران، دوای ڕاماڵینی تەخت و تاراجی، بە ڕەنگ و وێنە و شاهید و شهودەوە، بە دەیان ئەلقە لە گۆڤاری (الساعة)ی کوێتی بڵاوکراونەوە —خۆم هەر هەموو ژمارەکانی ئەو گۆڤارەم هەبوو. کەس ناتوانێ، بچووکترین دیفاع لە شاهەنشای مێباز بکات!

جا کە ئێوە، پرسیاری (پاکی و ناپاکی)ی موعەممەر، لەو مەسەلەیە، لێدەکەن، دەبێ ئەو لەبەرچاو بگرن، کە من (دەفرێک ئاوی سارد بە سەرسۆزی خۆم دادەکەم). ئاخر ئەگەر موعەممەر چەند کلاشنکۆف و دۆلارێکی بۆ کورد ناردبێ و ئاڵای کوردستانی لە تیڤیدا

خستبێتە سەر دەستی – کە جێگەی سوپاسی کورد بوون – دەبووایا، ئەو ڕۆژەی هەڵەبجە شەهید کرا، یەکسەر پشتیوانیی خۆی بۆ کوردی بێکەس نیشاندابووایا، خۆ دەزگای هەوڵگەریی (استخبارات)ی لیبی ئەو کات لە نێو جەرگەی شەقلاوە بوو و هەموو هەواڵەکانیان دەزانی! موعەمەر کە دەچووە ولاتێکی وەکو (تۆگۆ) لە ئەفەریقیا، وەکو نوقڵ و چوکلێت دۆلاری لە شەقامەکاندا دەبەشییەوە،( ئەوە قسەی پاسەوانەکانی خۆیەتی.) زۆر شتی دیکەش. ئەوەی داویەتی بە کورد زۆر زۆر شتێکی بچووک بووە.

من، بە شاردنەوەی ڕاستییەکان و درۆکردن لە بۆخاتری، موعەمەر، هیچم پێنابڕێ و کەس خەڵاتم ناکات، هەروەک بە پێداهەڵگوتن و پەسنکردنی کەسێتییە سەرنجڕاکێشەکەشی ئەو، هەمیسان هیچم پێنابڕێ. ناشمەوێ بۆ ڕاگرتنی سۆزی کوردێکی خاکپەروەری دڵسافی دەست بەتاڵ، کەسێتی خۆم دارووشێنم.

کە من نان و پیوازم لەگەڵ ئەم سەرکردە نە خواردبێ و لە نزیکەوە ئاشنای نەبووبم، باشتر نییە، هەر ئەو (شتانەتان) بۆ بگێڕمەوە، وەک بە چاوی خۆم بینوومن، یان بیستوومن لەوێ، یان لە ڕووداوەکاندا هەڵم هێنجاون؟ واتا باسکردنی حەقیقەتەکان، ئەوجا لە کۆتایدا، خۆتان بە ویژدانەوە وەڵامی پرسیارەکە بدەنەوە:

هەر لە دوای یەکەمین سەردانی موعەمەر بۆ مۆسکۆی یەکێتیی سۆڤیەت لە ساڵی (١٩٧٦)، ئەم زاتە هێندە بووە جێگەی تێڕامان و سەرنجڕاکێشان، تا ئاژانسی (KGB)هەواڵگەریی سەربازی وان، هۆبەیەکیان کردەوە بەناوی (قەزافییات) – بەندە زاراوەکەی وا کورداندوە – کە چەندان پسپۆڕی کارامەیی هەوڵگەری و سەربازی و سیاسی و ئابووریناس و دەروونناس و ئەقڵناس کاریان تێدادەکرد. جا کە لەساڵی (١٩٩١) ویستیان (ڤلادیمێر پۆپەڤ) وەک سەفیری ولاتەکەیان بنێرنە لیبیا، دۆسییەیەکی (٤٠٠) لاپەڕەیان دایە تا موتالای بکا و بە کەسێتیی موعەمەر و لیبییەکان ئاشنابێ. جا کە لێیان پرسی، زانیارییەکانت پێباش بوو؟ لە وەڵامدا دەڵێ:

-باوەڕبکەن، فرێ لێ تێنەگەیشتووم!

کەواتە، ئێوەی وا تینووش بۆ زانینی هەموو نهێنییەکانی ئەو زاتە و ئەو ولاتە، بەتەما مەبن، بە چەند ئەلقەیەکی من لێرە، هەموو گرێیەکانتان بۆ بکرێتەوە.

با بێینەوە سەر باسی (موعەمەر و هەوەسبازیی ئەو، وەک قسەی هێندیکان). لە هیچ ڕۆژگارێکدا، دۆشاو بۆ پاشا قات نەبووە. حەز و هەوەس و شەهوەتبازیی پیاویش، شتێکی خۆڕسکانەیە، خۆبەدەستوەدان و بەرەنگاریکردنی ئەو هەوەسە، بە کەسەکەوە بەندە، موعەمەریش پیاوێک بووە لەو(٣) ملیار و ئەوەندە پیاوەی ئەم جیهانە.

بەڵام!

موعەمەر، لەباوەشی گەورەترین سارای سەر زەوی لە دایک بووە و وەک خۆی گوتەنی" من بەدوویەکی ئەو بیابانانەم.... ." بۆیە کەلتووری بەدوویەکان و ژیانی خێڵەکییە عەرەبەکانی بیابان هێندە بە تۆخی لە ژیانیدا ڕەنگیداوەتەوە، کە لەحزەییەک نەیتوانییوە لێیان دەربازبێ. نەک هەر ئەوەندە، بەڵکوو ئەو نەریت و کەلتوورە دەشتەکییانە وا تێکەڵ و ئاوێتەی خوێنی بووە کە ئەو پیاوەی لێدەرچووە، پێیدەڵێن (موعەمەر قەزافی).

جا ئەم زاتە بووە سەرکردەی ئەم وڵاتە خێڵەکییە.

لەو ڕۆژەوەی، موعەمەر لەسەر عەرش دانیشتووە، جگە لە دەسەڵاتە سیاسی و ئابوورییەکەی وڵات، قەت هیچ دەسەڵاتێکی دیکەی نەبووە. ئەوەی بریاربەدەست و تەگبیرکەر و موشوورگێڕی، خاوەن قسە بووە لەو وڵاتە سەروک ئێڵ و خێڵەکان بوون. کۆی جومگەکانی بەڕێوەبردنی ژیان لە مست ئەو (١٤٠) سەروک خێڵەی لیبیا دابووە. قەت بەبێ ڕەزامەندی وان، موعەمەر کارێکی ئەنجام نەداوە بەدەربێ لە ژیانی کەلتووری ئەو خێڵانە. بۆیە ئەوەندەی ئەو خەریکی ڕاگرتنی دڵی وان بووە هێندە خەریکی ڕاگرتنی دڵی عەوامە ڕەش و ڕووتەکە نەبووە. ئەو یەخسیری دەستی وان بوو.

کە کەلتووری لیبییەکان دەخوێننەوە، ئەو دیمەنە لە زهنی خۆتان بسڕنەوە، کە وەک یاوەرێکی سەددام، یان خودی سەددام لە شەقامێکی بەغدا ڕێی بە کیژۆڵەیەک بگرێت و هەڵیگرێ و لاقەی بکات.

نە موعەمەر سەددام بوو و تەرابلسیش بەغدا بوو.

موعەمەر بە هەموو هێز و دەسەڵاتی خۆیەوە.، ئەگەر لە دڵڕا حەزیشی کردبێ، حەددی نەبووە، دەست بۆ کیژۆڵەیەک یان ژنێکی هاوخوێنی خۆی ببات.

لە عورف و عاداتی خێڵەکی لیبیا، ژن باڵاترین پایەی کۆمەڵایەتی هەیە، هەر هەموو سەرۆک خێڵەکانیش لەژێر فەرمان و داواکاریی ژنەکاندان. ژن نەک هەر کاروباری ناو ماڵ

و فەلاحەتی و ئاژەڵداری کردووە، ئەوان کۆڵەکە گەورەکەی دەواری ژیانی خێزانەکانیش بوون. هەر بۆیە دوو ژنی لەو نێویاندا زۆر دەگمەنە و تەلاقدانیشیان هەر یەکجار کەمە.

لە لیبیا:

0 ژن هەمیشە لەبەر چاوی پیاوە.

0 ژن موشێرگێر و بڕیاردەرە.

0 ژن بەقەرای قەتعی بێ خودان و بەرەڵلا و سەربەدەرەوە نییە.

0 ژن بێ مەحرەم یەک هەنگاو ناچێتە دەرەوەی ماڵەوە، بۆیە کە کچەکانیان دەچنە زانکۆ ئۆتۆمبیلیان بۆ دەکڕن، تا لەگەڵ بێگانە سواری باس و تاکسی نەبن.

0 کەس ناتوانێ ژن هەڵگرێ و بیرفێنێ و لاقەی بکا، مەگەر خودا.

0 ژنیان بەدەگمەن داوە بە بێگانە.

0 نەمبیستووە، ژنێک یان کچێکی لیبی دۆستی بێگانەیەک بووبێ.

0 ژن نەبووە یەکشەو نەچێتەوە ماڵێ، یان بە تەنیا سەفەر بکا.

0 هیچ ژنێکیش نییە سەر بەخێڵێک نەبێ، تەنانەت ژنانی ئەمازیغیش.

جا ڕەنگبێ، پیاوانی خێڵەکی ئەو وڵاتە بتوانن، چاوپۆشی لە هێندێ شت بکەن، بەڵام مەسەلەی ژن و دەستبردن بۆ ژن هێڵێکی سووری خوێناوییە.

موعەمەریش حەددی نەبووە دەست بۆ هیچ ژنێکی لیبی بەرێ.

ئەو کاتەی موعەمەرلە نەخۆشخانە دەبێ و دڵی دەچێتە (صفية فركاش)ی پەرستار لە ساڵی (١٩٧٠)، یەکسەر داخوازی دەکا و دەیهێنێ، چونکە دەستووری خێڵەکی قبووڵی نەبووە، لەژێر پەردەوە درێژە بە پەیوەندییەکەیان بدەن. ئەو هەر شەش مانگێک لە گەڵ (فەتحیە)ی ژنی یەکەمی دەبێ، لەگەڵیەک ناگونجێن و جیادەبنەوە.

کە قەزافی حوکمڕانی ئەو وڵاتەی گرتە دەست، هەر (٢٥٠) هەزار پیاوێک لەو (٤) ملیون حەشیمەتەی لیبیا خوێندەوار بوون. ڕێژەی ژنانی خوێندەوار یەکجار نزم بووە. ئەو هەر زوو وەک سەرکردەیەکی دیکەی عەرەب ئینقلابی نەکرد، گوتی: من شۆڕشگێڕم و خاوەن پەیام و فەلسەفەی خۆمم. یەکەم سەفیری یەکێتیی سۆڤیەت دەڵێ: کە حەفتەی یەکەم گەیشتمە تەرابلس، سەرم سووڕما چۆن ئەو زاتە، بەو دە ساڵە توانیویەتی، ئەو هەموو گۆڕانکارییە مەزنە بکات. بەبێ ڕیبایی ئەوان لە کردنەوەی قوتابخانەوە

نەخۆشخانە و گارکە و کۆمپانیا زۆر کاری گەورەیان کردبوو، مووچەی ئەفسەرەکانیان چوار پێنج هێندەی مووچەی ئێمە بوو.

موعەمەر سەیری کرد، نزیکەی هەر یەک ملیۆن و نیو ڕەگەزی نێری هەیە، لەوانیش زۆریان منداڵ و پیر و پەککەوتەن، جا ناچارە ئەو لەشکرە گەورەی (ژن) بۆ جێبەجێکردنی خەونەکانی بهێنێتە مەیدان. یەک لەو هەنگاوە سەرکەوتووانەی ئەوە بوو، نزیکترین ژنی تیرەکەی خۆی کردە یاوەری خۆی، بۆ ئەوە پێگەی بەرزی ژنان نیشانی هەمووان بدات. کتوکت وەک چۆن مەلای گەورەی کۆیە، یەکەم کەس بوو کچی خۆی ناردە بەرخوێندن.

تێگەیشتن لە شارستانیەتیی هەرنەتەوەیەک، بەبێ ئاشنا بوون بە کەلتوور و داب و نەریتی ئەو نەتەوەیە، کەلێن و درزی زۆری تێدەکەوێ. ئاخر ناکرێ منی کورد، مەست و مەدهۆش بە (ژیان و ژینگەی کوردەواری)، بە هەمان چاو شارستانییەتیی نەتەوەیەکی دیکە هەڵسەنگێنم.

پتر لە هەزار ساڵ پێش ئێمڕۆ، کیژانی یەکێک لە خێڵەکان لە پەرستگای (مەلیک کاول) لە هیندستان، لە تقوسێکی ئایینی خۆیاندا، لەگەڵ کوڕاندا جووت دەبوون و ئەو فیعلەیان بە (سۆزانی پیرۆز) ناودەهێنا. ڕەنگ بێ ئێستا وشەی (کاولی)، یەکسەر هێندێک لە خوێنەرانی ئەم بابەتە بباتەوە، ژێر دەوارەکانی دەروبەری بەغدا و چەند شارێکی دیکەی کەنار زێی فورات، کە شەو تا بەیانی ئەو کیژۆڵە ئەسمەرە چاو ڕەشانە سەمایان دەکرد و گۆرانیان دەچڕی و دواتریش، شەوەکەیان بە (تقوسی سۆزانی پیرۆز) تا بەیانی بەسەر دەبرد. خێوەتگەی ئەو کاولییانە، کە لەنێو کۆمەڵگای عێراقیدا بە ئەدەبسزز و بەدرەوشت سەیردەکران، نەک هەر بە سەرخۆش و هەرزەکار و سەرباز و هەوسبازەکان مۆنجەی دەهات، بەڵکوو پیاوە گەورەکانیش ڕوویان تێدەکرد پێش ئەوەی چەند گەڕەکێکی بەغدا، ببنە کەلـلەخانە.

تا (٢٠٠٤) ئەو کاولییانە بەردەوام بوون لە سەمەر و خۆشیی شەوانەی خۆیان، تا سوپای مەهدی شاڵاوی کردە سەریان و بەسەر شارەکاندا پەرتەوازە بوون. بەڵام (کارخانەکان) لە بەغدا، هەر لە کاری شەوانە و ڕۆژانەی خۆیان نەکەوتن. مامۆستا عەبدولکەریم شێخانی، سەربووردەی (گەوادێکی شەریف) گێڕایەوە: کە زەلامێک سواری ئۆتۆمبیلی (نەفەرات) دەبێ لە بەغدا لە شەقامێک بۆ شەقامێکی دی، دوو ژن دێن، دەیانەوەی ئەوانیش سواری

تەکسییەکە بن، کابرا بە شۆفیرەکە دەڵێ، برۆ، سوارایان مەکە من کرێی ئەوانیشت دەدەمێ.
کە دەگەنەجێ، شۆفیرەکە دەپرسێ، بۆ نەتهێشت ئەو دوو ژنە سوارین؟ کابرا، دەڵێ:
- من گەوادم، خەڵکی ئەو ناوە هەموو ئەمن دەناسن، ئێستا ئەو دوو ژنە ببینن لەگەڵ منن، وادەزانن، سۆزانین. گوناحن، ئەوان شەریفن، بۆ بەچاوی خراپ تەماشایان بکەن.
شۆفیرەکەی، پارەی لێوەرناگرێ و پێیدەڵێ، بەڕاستی تۆ گەوادێکی شەریفی!

جا نووسەری عەلامە د. عەلی وردی، لە لاپەرە (٣٥٠)ی کتێبی (دراسة فی طبیعة المجتمع العراقی) دا دەڵێ "نزیکەی لە (٤٠٪)ی پیاوانی بەغدا (ئەدەبسزز بوون.)

ئەگەر لە بەغدا بچینە بەیروت، ئەوا شەوانی سووری کۆرنیش و جبل و شارع حمرا، زۆر گەرمترو قەڵەباڵغترن، خۆ گەر لەوێشڕا، سەرێک بە قاهیرە و ئەسکەندەریە، دابگرێ، وەک ئەوە وایە، بچیتە جیهانێکی دیکە.

بەڵام،

لە لیبیا نەک لە پایتەخت، لە هیچ شارێکی ئەو وڵاتە، کارخانە و تیاترۆخانە، مەلها و سەکۆ و دەواری ڕەقس و سەماکردن نەبوو. لەوێ نە مەیخانە هەبوو، نە مەیفرۆش — ئەوەی ئاڵوودە و مەیدۆست بوو، دەبووایا بۆخۆی لەماڵەوە مەدی دروستی بکا یان بەقاچاغ پەیدای بکا، کە ئەویش گۆبەند و ترسی بەدواوە بوو.

دەکرێ، لە ڕووی کرانەوە و پابەندبوون، شارەکانی لیبیا بکەینە سێ هۆبە (ئەو دەمەی کە من لەوێ بووم، نەک ئێستا): شاری بەنغازی و خۆمس، کە زۆربەی هەرزۆریان ئیسلامی توندڕەون، ئەسڵەن موعەمەر لە (٤٢) ساڵ حوکمکردنی بۆ نیو جاریش سەری بەشاری (خومس)ی ڕکابەر دانەگرت — کتومت، وەک سەددام کە لە (٣٥) ساڵ حوکمکردنی، قەت قەت سەردانی شاری کۆیەی نەکرد.

تەرابلسی یەک ملیۆنی، کە هەموو نەتەوەیەکی تێدا بوو، بەڵام هەر لیبییەکان تێیدا سەرپاڵە بوون.

وە شاری سرت، کە پایتەختی موعەمەربوو، بە قەد شاری موسراتە کراوەبوو، هەستت دەکرد کە پتر ڕوخساری شارێکی علمانی پێوەدیارە، لەچاو شارەکانی دیکەی لیبیا.

کە کورد دەڵێ، چۆم بێ چەقەڵ نابێ، مانای وایە دەبێ منیش بنووسم. لیبیاش بێ سۆزانی نابێ، ئاخر ئەوانیش (٥) ملیۆن کەس و نەفسن.

له تەرابلس، سەربەسەر هەر لایەک دادەگری، مونجەی دێ لە کچی سۆزانی جوان جوان، هەموو ڕەنگێ، هەموو بەژنێ، هەموو تەرزێ، هەموو تەمەنێ!

ئەوان لە کافتریا و کافێی و چێشتخانە و هێندێ بوغازەی گەورە گەورە کاردەکەن، لە سەر کۆڕنیشی شاریش، زۆر موقەیەتی خۆت نەبێ، دەترفێنن، ئۆتۆمبیلت پێڕادەگن، خۆیان دەرگا دەکەنەوە و سوار دەبن، پۆشاک و ڕەنگ و شێوەزاریان هاوار دەکا، ئەوان کێن!

ئەو کچە جوان جوان و ناسکانە کێن؟ تێکڕایان خەڵکی وڵاتەکەی ڕۆژهەڵات و سێ وڵاتەکەی ڕۆژاوای لیبیان، بە تایبەتی ئەوەی ناوەندێ لەو سێیانەی ڕۆژئاوا — لەبۆ ڕێزگرتن، نامەوێ ناوێ وڵاتەکان بێنم — ئاخر ئەو وڵاتانە خەڵکی پاک و جوانڕەوشت و مرۆڤدۆستیشان زۆر تێدایە.

نە لە شارەکانی لیبیا، نە لە دەرەوەی لیبیا، نەمبیستووە، کچی لیبی سۆزانی بێ، یان لەشفرۆش.

خوێنەری بەڕێز، ئەگەر ئەم بەشە نە خوێنیتەوە، لە بەشی خوارەوە حاڵی نابی، بۆیە دەبووایە، ئەمەتان بۆ بنووسم.

لەم بەشەدا، بە خێرایی قسە لەسەر ئەو ڤیدیۆیە دەکەم کە بە ناوی (کۆماری سێکس — کۆیلە سێکسییەکانی قەزافی) باس لە کتێبێک دەکات بە ناوی (قوربانییانی حەرامسەراکەی قەزافی) لە نووسینی (ئانیک کۆژان)ی ژنە ڕۆژنامەوانی فەرەنسی.

هەر یەکێک لە ئێمە ئازادە، لەوەی بە ویست و تێگەیشتنی خۆی(شتەکان) وەرگرێ و پەسندی بکات، ڕەنگ بێ من، ئەو ئازدییە وا والاو بێسنوورەم نەبێ، چونکە ناتوانم هەرچی هاتە بەردەستم یەکسەر دەمی پێوەنێم و هەڵی دەم، دەبێ پێشوەخت لە تام و ڕەنگ وبۆنی تێبگەم. بۆیە بەندە، کۆمەڵێک تێڕاونین و پرسیارم هەیە، ڕەنگبێ وەڵامدانەوەی لۆژیکانەیان، وام لێبکات، منیش وەک خەڵکە عەوامەکە (ناوەڕۆکی ڤیدیۆ و کتێبەکە) م پێقبوڵ نەبێ.

ئەمانەش تێڕوانین و پرسیارەکانی منن:

یەک :

من ئەم کتێبەم لەساڵی (٢٠١٦) بە زمانی ئینگلیزی خوێندەوە، (٣) ساڵ دوای چاپکردنی. بڵاوکردنەوەی ئەو(ڤیدیۆیە) لەم ئانوساتەدا(٢٠٢٠)، جێگەی پرسیارە. جا خوێندنەوەی ناوەڕۆکەکە، کە پتر لە خوێندنەوەی بەیاننامەیەکی سەربازیی پڕ حەماسەت دەچێ، جێگەی سەرنجی زۆرترە. وەک ئەوەی بیانەوێ ورووژاندن و ڕاچڵەکاندن بۆ مەرامێکی دیاریکراو بێنەوە. ئەوەندەی زمانەکەشی تام و بۆنی زمانی (ئەردۆگان)نانەی پێوە دیارە نیو هێندە زمانی ئاسایی میدیایی پێوەدیار نییە، هەر دەڵێی بە چەتە کوردەکان دەڵێ "ڕاکەن، غەزایە، ئەو عەرەبە لیبییانەش بەدەردی ئەرمەنەکان بەرن!" جا بۆ هارکردنی ئەو چەتانەش، ناونیشانی سەربەرگی کتێبەکەیان شێواندوە، لە (حەریمەکانی قەزافی) کردوویانە بە (قوربانیانی حەرامسەراکەی قەزافی) و (کۆماری سێکس) یشیان بۆ زیاد کردوە و ( کۆیلە سێکسییەکانی قەزافی)شیان کردوەتە پاشکۆکەی، وەک ئەوەی قەت گەورە سەرکردەکانی کوردانی باشوور، سەردانی ئەو حەرەمسەرایانەیان نەکردبێ و قەت قەزافیان لە باوەش نەکردبێ و قەت ماچیان نەکردبێ!

پرسیار: ئەو هەموو شێواندن و حەماسەتە لە پێناوچی کراوە؟

دوو:

ڕێک (٢٢) ساڵ دوای یەکەمین پلانی کوشتنی موعەممەر و دوای پتر لە (١٣) محاوەلە، فەرەنسییەکان توانیان بە میراژەکانیان ئەو زاتە لاتەریک کەن و یارمەتی چەکدارەکان بدەن بگەنە سەری و بێدادگایکردن تیرۆری بکەن. ئەوە لەوکاتەدا بوو کە دەنگۆی ئەوە بڵاوبۆوە، ڕەنگبێ فەزیحەتەکەی (سارکۆزی) وەکو فەزیحەتی(ئیران گیتەکەی) لیبێ، چونکێ بە (١٤٠) ملیۆن دۆلارەکەی موعەممەر لە هەڵبژاردەنەکەیدا بردیەوە. جا ئەو ڕۆژەی موعەممەر بەڵێنی دا کە (٢١) هەزار دۆلار بداتە، هەر تاکێکی لیبیا، ڕۆژنامەی (تایمزی) لەندەنی، ڕاپۆرتێکی بڵاوکردەوە، گۆیا (٥) ملیار دۆلار لە حیسابی بانکی مەعەممەر ئاشکرابووە، ئەم خەبەرەش خۆپیشاندەرانی لیبیای هێندەی دی جۆشداو وەعدەکەی موعەممەریان خستە ژێرپێ. ئەو کتێبەش لە ساڵی (٢٠١٣) چاپکرا، ڕێک دوای ئەوەی کە لیبییەکان (٥١) لیژنەیان پێکهێنا بۆ ئاشکراکردنی ئەو (١٥٦) ملیار دۆلارەی کە تاکو ئێستا یەک دۆلاری دیار نییە. وەک ئەوەی بیانەوەی خەڵکەکە بە خەبەراتی (سێکسبازیی) ئەو زاتە بگەوجێنن.

راستە، خاتوو کۆژان نزیکەی (٣) ملیۆن دۆلاری بەو کتێبە دەستکەوت، بەڵام مسداقیەتی کەسێتیی خۆی خستە سەر مینێکی سەر تەلەزگە، دوور نییە ڕۆژێ کتێبەکەی هەڵسەنگاندنی بۆ بکرێ و ناوەڕۆکەکەی ئاوەژوو بێتەوە.

پرسیار: تۆ بڵێی ئەو کتێبە پڕ کەلێن و درز و بۆشاییە، خۆی نووسیبیەتی یان دەستخەتی نووسەرێکی عەرەبی هەرزەکاری پێوەدیارە، دەنا چۆن دەکەوێتە ئەو هەمووە چاڵ و ساتمەکردنە؟ (کە لە خوارەوە باسیان دەکەین).

سێ:

کتێبەکەی خاتوو(کۆژان) کە نزیکەی (١٢٠) لاپەرەی مام ناوەندییە، نیوەی بۆ سەربوردەی (صوريا)ی (١٥) ساڵان تەرخان کردوە و نیوەکەی دیکە بۆ چەندان ژنی لاقەکراو. وشەی (حەریم) کە لەزمانی فەرەنسی و ئەوروپایدا، خواستراوەیە و لە زمانی عەرەبیدا نزیکەی (٢٥) (اشتقاق)ی هەیە، لێرە بە مانای (ژنەکانی قەزافی) دێ. چونکە لە زمانەکاندا، وشەکە هیچ سووکایەتییەکی تێدا نییە. جا لە ڤیدیۆیەکەدا ئاماژە بەوەدەکا کە کتێبەکە تایبەتە بە (کۆیلەداریی و گەندەڵی و دەستدرێژی و تۆقاندن) قەزافی. لە کاتێکدا، ناوەڕۆکی کتێبەکە هەر دەستدرێژیی سێکسییە.

پرسیار: ئەو زیادکردنانە بە چ حەقێک کراوە؟

چوار:

خاتوو کۆژان. دەڵێ، چوومە تەرابلس تالەو ڕاز و نهێنییە تێبگەم، کە بۆچی ژنانی لیبیا وەک ژنانی تونس و میسر، بەهیچ شێوەیەک بەشداری خۆپێشاندان و ڕاپەڕینەکەی لیبیایان نەکرد؟ بەڵام تا دوا دێڕی کتێبەکە یەک ڕستە نییە وەڵامی ئەو پرسیارە بداتەوە، ئەسڵەن لە یەک تاکە ژنی نەپرسیوە، ئەرێ بۆچی بەشداریتان نەکرد؟ تەنها لەسەر بەرگی کتێبەکەی نووسیوە، "ژنە کۆیلە سێکسبازەکانی قەزافی" تەرجومەکەی ڤیدیۆیەکە هەڵەیە.

پرسیار: (١)؛ ماقوولە قەزافی پتر لە دوو ملیۆن ژنی لیبی لاقە کردبێ، چاوشۆڕی کردبن، بۆیە یەک تاکیان جورئەتی نەکردوە، بێتە نێو خۆپێشاندانەکان؟ (٢)، گریمان هەموو ژنەکانی لیبیای لاقە کردووە و کراوون بە کۆیلە، باشە، ئەو ڕۆژەی زاڵم و دیکتاتۆر لە خوێنی خۆی دەگەوزێ، کاتی ئەوەنییە، ئەو ژنە زوڵملێکراوانە بێنە هاوار و زوڵم و جەبەرووتی ئەو زاڵمە فەزحکەن و بێگوناحی و ڕووسووری خۆیان نیشاندەن؟ بۆ یەک

ژن دوای قەزافیش فزەی لێوە نەهات؟ دەبێ هۆکارەکەی ئەوە نەبێ، کە قەزافی ئەوانی ڕۆشنبیرکرد و خۆشەویستیی وان بۆ موعەمەر ڕێگربووە، دژی بوەستنەوە؟
چوار:
لە پتر لە (٢٠) لاپەڕەی یەکەمی کتێبەکە، (صوریا)ی دایک و داپیرە (مەغریبی) کە لەشاری (فاس) ژیاون، هەر سووکایەتی و بێحورمەتی بە لیبییەکان دەکات، دەڵێ: باوکم کە خەڵکی دەڤەری (سرت)ەو لە بەرەبابی قەزافییە، ئەو کاتەی پۆستی باڵای هەبوو لە سەفارەتی لیبیا لە مەغریب، دایکمی هەڵخەڵەتاند، کە گۆیا دەیباتە سرت، خۆشترین بەهەشتی سەر ڕۆی زەوی، دواتر دەیباتە فەرنسا، ئەگەر ئەویَ بە دڵ نەبوو. بەڵام باوکم خیانەتی لە دایکم کرد، دایکمیان کردە کۆیلە لە نێو زیندانی خێڵێکی جاهیل و دواکەوتوو و پیس و گڵاو بەندیان کرد. سرت شاری ناپیاو و حاقید و دز و درۆزن و پیاوکوژ و چەتە و ئاغای ئەدەبسززان بوو. دایکمیان بە کچەتیمیش قبوڵ نەبوو، بەوە دەیانشکاندەوە کە مەغربییە، وەک ئەوەی ژنە مەغریبی سۆزانی بن. لیبییەکان باوەڕیان نەدەکرد من لیبیایم، بە (کچە تونسی و کچە مەغریبی) منیان دەشکاندەوە، لە قوتابخانە مامۆستا و قوتابییەکان سووکایەتیان پێدەکردم و پرچیان ڕادەکێشام و ژووری مامۆستایانیان پێ خاوێن دەکردمەوە، من کرابوومە کۆیلە. هەرچی ئەو کچە بەسەر زاری دادێ، بە خراپە بە خەڵکی سرت و لیبییەکانی دەڵێ.
پرسیار: ئەو ڕقە ئەستورەی ئەو کچە بەرانبەر لیبییەکان هەیەتی، چونکە باوکی خراپ بووە لەگەل دایکی، ئاماژە نییە، کە لە لاپەڕەکانی دادێ ئەو کچە شتی خراپتریش دەخاتە پاڵ وان، بە بابە قەزافیشەوە؟ ئەمە واناکات تۆمەتەکانی ئەو کچە جێگەی گومان بن؟
پێنج:
بەقەراری قەتعی، کتێبەکە هیچ ئاماژەیەکی تێدا نییە، کە چۆن (صوریا)یی لە تەرابلس ناسی. باشە ژن نییە لەو وڵاتە یەک هەنگاو لە خێزان دوور کەویتەوە، ئەو کچە بە تاقی تەنیا چیدەکرد لە تەرابلس؟
شەش:
(صوریا) لە ساڵی (٢٠٠٦)ەوە تا (٢٠١٠) هەر لە کافتریا و کافێ و بارەکانی پاریس و ڕۆما بووە، هاسانتر نەبوو، بۆ ئەوە لەو وڵاتانەی کە بە وڵاتی ئازادی ناوبراون، بچێتە لای

ڕۆژنامەوانێکی وەکو خاتۆ (کۆژان) و باسی ئەو هەموو دەستریژیی و کۆیلەیی خۆی بکات؟ رەنگبێ خەلات و پاداشتی کرابووایا، وەک نادیە موراد؟

حەوت:

کە (صوریا)، تەمەنی (١٥) سالان بووە، موعەمەر چووەتە دواناوەندی (الثورة العربیة) لە سرت و چەپکەگوڵی لەو وەرگرتووە و دەستی خستۆتە سەرشان و ناو قژی و بەڕوویدا پێکەنیووە.

پرسیار: ئەگەر سەرۆکێک، بچێتە دواناوەندی (س)، بەڕێوەبەرەکە خوێندکارێکی قورس و سەنگین و نەجیبزادە هەڵدەبژێرێ، چەپکەگوڵ پێشکێش سەرۆک بکات، یان کچە خوێندکارێکی سووک و چرووک؟ ئەدی (صوریا) ناڵێ:"تەنانەت مامۆستاکانیش سووکایەتیان پێدەکردم و بە کچە تونسی بانگیان دەکردم. لە کاتێکدا هیچ شارێک بە قەد سرت ڕقی لە ژنە مەغریبی و تونسی نابێتەوە."

پرسیار؛ ئەوە سووکایەتی کردن نییە بە موعەمەر، کە کچێک بە چاوی سووک سەیر بکرێ، چەپکە گوڵی بداتێ و (٩٨٨) قوتابی و مامۆستا کە زۆربەیان لەبنە ماڵەی قەزافین بە زەقەی چاوان تەماشای بکەن؟

هەشت:

خاتوو (کۆژان) نووسیویەتی، کە چوومە لای مامۆستا (محەممەد عەلی) بەڕێوەبەر نوێیەکەی دواناوەندیەکە، بەسەرمدا هاواری کرد و گوتی: درۆیە، نە ئەو کچە لە لامان بووە نە قەزافی قەت هاتۆتە ئەو قوتابخانە، ئەو قەت نەدەچووە قوتابخانان. ویستی دەرمکات.

پرسیار: (من دوو ساڵێ ڕێک هاتووچۆی ئەو دواناوەندییەم دەکرد، کچەکەم لەوێ بوو) بەڕێوەبەرەکەیان، ناوی (میلاد سەعدی) بوو کە لە بنەماڵەی قەزافی بوو، ئەو زاتە هێندە ناوداربوو، کەس نەبوو ناوی نەبیستبێ، ئەو بەڕێوەبەر نەبوو، بەڵکۆ وەک ئەفسەرێکی پلەدار بوو، ئاخر زەحمەت بوو نزیکەی (هەزار) کچی هەرزەکار بێ سەرپەرشتێکی دەسەڵاتداری وەک ئەو کۆنترۆڵ بکرێ و لە گەنجە هەرزەکارە دڕەکان بیان پارێزێ. دوای نەمانی قەزافی، میلاد چووە دەرەوەی وڵات.

پرسیار: مامۆستا محەممەد عەلی، بەڕێوەبەری هەڵبژێردراوی شۆڕشگێڕە ئیسلامییە توندڕەوەکانی بوو بۆ ئەو قوتابخانەیە، ئەو ڕژێمی کۆیلەی ڕوخاند و دەستووری

خەلافەت و دادپەروەری هینا، ماقولە ئەو دیفاع لە قەزافی بکات، یان دەبێ بڵێ، فەرموو خاتوون دانیشە با باسی زوڵم و دەستدرێژیی ئەو سەرکردە ئەدەبسززت بۆ بکەم؟ بەڵێ وا بوو (صوریا) و زۆر کیژۆڵەی دیکەی لاقە کردووە؟ بۆچی ئیسلامییەکی سەلەفی سەرکەوتوو بەسەر قەزافی، دیفاع لە ڕژێمێک دەکا کە دژی ڕاپەڕیوە؟

نۆ:

ڕۆژی دوای پێشکێشکردنی چەپکەگوڵەکە بە بابە قەزافی، کە(صوریا) دێتەوە قوتابخانە، هەموو مامۆستاکان بە سەرسوڕمانەوە پێی دەڵێن: چییە، نیازتە خوێندن تەواو بکەی؟

پرسیار: جارێ پاسەوانەکانی موعەمەر ئەو کچەیان نەفڕاندووە، ئایا پێشوەخت پێیان گوتراوە کە (صوریا) بۆ قەزافی دەبەن؟ بۆچی پێیدەڵێن، نیازتە خوێندن تەواو بکەی؟ ئایا سرڕوترپی قەزافی وا لەبەردەستی ئەو خەڵکە بووە؟

دە :

(صوریا) دەڵێ: ڕۆژێک زووتر بەڕێوەبەرەکەم پێی گوتم، خۆت ئامادەکە سبەینێ بابە قەزافی دێ، دەبێ تۆ چەپکە گوڵی پێشکێش کەیت؟

پرسیار: ئەمەی خوارەوە بخوێنەوە، ئەوەجا لە خۆتت بپرسە، چۆن قەزافی ئەو هەڵە دەکات پێش وەخت کچێک ئاگادارکەنەوە کە سبەینی ئەو دەچێتە ئەو قوتابخانە، بۆ زانیاریتان، ژمارەی کچەکان نزیکەی هەزار خوێندکار دەبوو و زۆربەشیان مۆبایلیان هەبوو، واتە هەموو لیبیا زانی سبەینێ قەزافی دەچێتە کوێ.

ژەنەڕاڵ ڤالیری ڤیلجکا، گەورە بەرپرسی ئاژانسی (KGB) لە یەکێتیی سۆڤیەتدا دەڵێ: ئێمە لە زۆر بۆنەدا بەرپرسی حیمایەکردنی خودی قەزافی بووین، جار بووە لە کوشتنیش ڕزگارمان کردووە، تا ئێستا کەسمان نەدی وەک ئەو زاتە زیرەک و وردبین بێ لە خۆ پاراستن و تەمویهە کردن. وەک ئەنوەر سادات گوتەنی، ئەو جندوکە بوو، ئەگەرچی شەو و ڕۆژ بەدوای ئەو پیاوە بووین، بەڵام قەت قەت کەس نەبووە بزانێ ئەو پیاوە کەی دەردەچێ، دەچێتە کێندەرێ، لە ناو کام ئۆتۆمبیلە، لە کام جێگە دادەنیشی، باوەڕ بکەن لەساڵیادی شۆڕشی فاتیح لە ساڵی (١٩٨٩) کە (٢٠) سەرۆکی جیهانی بانگێهشت کردبوو، لە یەک کاتدا چوار سەکۆی بۆ ئاهەنگەکە ئامادەکردبوو، ئێمەش نەماندەزانی لە کامیان دادەنیشێ.

پرسیار: ماقوولە سەرکردەیەک، پاسەوانەکانی (KGB) نەزانن لە کوێیە و بۆ کوێ دەچێ، بە گیژۆڵەیەکی هەرزەکاری (١٥) ساڵان بڵێ، خۆت ئامادەکە بەیانی دێمە قوتابخانەکەتان؟

حەزدەکەم بەدیقەت لە وشەکانم وردببنەوە، من پاساو بۆ موعەمەر ناهێنمەوە کە دەستدرێژیی شەرەفی نەکردووەتە سەر ژنان، بەڵام ئەو ژنە فەرەنسییە لە کتێبەکەیدا، زەلەی ئەوتۆی کردووە، کە مەسەلەی ناوەڕۆکی کتێبەکەی، دەخاتە گومانەوە.

یانزدە:

(صوریا) دەڵێ، دایکم بەناوبانگترین ئارایشتگای ژنانی لە شاری سرت هەبوو، کەس نەبوو سەردانی نەکات.

پرسیار: دایکی ئەو کچە، ژنی پیاوێکی قەزافییە کە پۆستێکی باڵای لە سەفارەت هەیە لە دەرەوەی لیبیا. لە لیبیا، هیچ پیاوێکیان ئامادەنییە ببێتە سەرتاش، چونکە بۆ ئەوان، کە خۆیان بە (سەییدی نەتەوە) دادەنێن، سووکایەتییە دەست بۆ دوو سێ دیناری سەرتاشین پان بکەنەوە، کەواتە چۆن ئەو قەزافییە مەقام باڵایە، ڕێ بە ژنەکەی دەدات، ساڵۆنی ئارایشت بکاتەوە و خێڵەکەیان سووک بکات؟

دوانزدە:

(صوریا) دەڵێ، ژنی هەموو سەرۆک و مەلیکەکانی بیانی کە دەهاتنە لیبیا، دایکم ئارایشتی دەکردن، زۆر جار دەچوو ئارایشتی(صەفییە)ی ژنەکەی قەزفیش بکات لە ماڵەوە.

پرسیار: قەزافی دوو میوانی لە سعودیەوە هاتنە سرت، من لەوێ بووم، بۆ دوو شەوان (٩١) ملیۆن دۆلاری بۆ سەرفکردن، بە (٤٨) سەعات بە فڕۆکە لە ئیتاڵیاوە کەلوپەلی نوێیان بۆ هۆتێل (وەفا) هاورد. ماقوولە ئەو زاتە نەتوانێ ژنێکی ئارایشتکەری وەک دایکی (صوریا) بۆ خانمی یەکەمی لیبیا دابمەزرێنێ؟ یان هەر ئەو ژنە بکاتە ئارایشتکەری بنەماڵەکەی لە سرت؟

سێنزدە:

(صوریا) دەڵێ، ڕۆژێ پاسەوانەکانی قەزافی هاتن دایکم لە ئارایشتگاوە ببەن بۆ ئارایشیکردنی (صەفییە)ی ژنی قەزافی، دایکم دەریکردن، گوتی ناتوانم بێم، چونکە

زەبوونی خۆم هەیە نامەوێ ئیزنیاندەم. بۆ سبەینێ، پاسەوانەکان هێرشیان کردە سەر ئارایشتگەکە، کەلوپەلەکانیان شکاند و (٦) مانگ براکەمیان خستە زیندان.
پرسیار: ژنە نووسەری فەرەنسی دەنووسێ، قەزافی هەموو ژنانی لیبیای کردبووە کۆیلە. باشە ئەگەر ئەوان کۆیلەن، چۆن ئەو ژنە توانی پاسەوانەکان دەرکا و داخوازیی خانمی یەکەمی لیبیا ڕەتکاتەوە و ئامادە نەبێ بچێت بۆ ئارایشتکردنی؟ ئایا لە هیچ وڵاتێکی ڕۆژهەڵات و ئەفریقیا ژنە ئارایشتکەر هەیە ئامادە نەبێ خانمی یەکەمی وڵاتەکەی ئارایشت بکا؟ کەواتە ئەو مانای ئەوە نییە کە ژنانی لیبیا ئەو پەڕی ئازادی و دەسەڵاتیان هەبووە و کۆیلە نەبوون؟ بۆچێ پاسەوانەکان دەچن کەلوپەلی ئارایشتگاکەی دەشکێنن، بۆ ناچن مۆڵەتی کارکردن لە دایکی (صوریا) بستێننەوە بە پاساوی ڕێزنەگرتن لە داخوازیی خانمی یەکەمی لیبیا؟
چواردە:
(صوریا) دەڵێ، سێ ڕۆژ دوای سەردانی قەزافی بۆ قوتابخانەکەم، پاسەوانەکانی هاتنە ئارایشتگا و بە بەرچاوی دایکمەوە منیان لەگەڵ خۆیان برد؟
پرسیار: کامیان گرنگترن، ئارایشتی خانمی یەکەم، یان بردنی بەزۆرە ملێی کچێکی (١٥) ساڵان، بۆچی ئەو دایکە ئازایە ئەوجارەش پاسەوانەکانی دەرنەکرد، خۆ کچەکەی لە زەبوونەکانی سالۆنەکەی عەزیزتربووو؟ بۆچی ئەو دایکە یەکسەر مێردە پلە بەرزەکەی ئاگادار نەکردەوە؟ بۆچی ئەو ژنە پەیوەندی بە شێخ و پیرێژنەکانی خێڵی قەزافی نەکرد و ئاگاداری نەکردنەوە کە پاسەوانەکان، کچەکەیان برد، ئەو کچەی کچی کوڕی خۆیانە؟
پیرێژنەکان کە پێیان دەڵێن (عجایز)، دەسەڵاتێکی یەکجار باڵایان لەو کۆمەڵگایە هەیە، هەرچی داوابکەن دەبێ بۆیان جێبەجێ بکرێ. کە موعەمەر دەهاتە سرت، یەکەمجار پیرێژنەکان دەچوون بەخێر هاتنی بکەن، ئەویش دەستی یەکە یەکەیانی ماچ دەکرد.
پانزدە:
(صوریا) دەڵێ، پێش ئەوەی بگەینە تەرابلس، لە (زیافەیەکی) قەزافیدا منیان بردە حەمام، دوایی لە ژوورێکیان کردم، بینیم قەزافی بە ڕووتوقووتی چاوەڕوانی من دەکات و بانگی کردم (وەرە پێشێ، قەحپە!)، من نەمزانی وشەی (قەحپە) مانای چییە، پێشتر نەمبیستبوو.

پرسیار: ماقوولە قەزافییەک خۆی بە مەلیکی ملووک دابنێ، بە رووتی دانیشێ و چاوەڕوانی ئەوە بکات، سۆزانییەکەی بۆ بەرن، یان دەبوویا سۆزانییەکە دانیشێ چاوەڕوانی هاتنێ قەزافی بکات؟ ماقوولە کچێکی (١٥) ساڵانی ئەم کۆمەڵگایە، قەت گوێی لە وشەی (قەحپە) نەبوو بێ؟

شانزدە:

(صوریا) دەڵێ، ئەو دوو سێ مانگەی من لە کۆشکی (عەزیزییە) بووم، هەمیشە لەگەڵ کۆمەلە کچێکی تەمەنی خۆم بووم کە ئەوانیش وەک من تووش ببون، هەمیشە ناچاریان دەکردین تەماشای فلیمی سێکسی بکەین و دەشبووایا لاسایان بکەینەوە.

پرسیار: ئەو دووسێ مانگە، ئەو کچە نەیگوت، بمبەنەوەماڵەوە؟ یان قەت هیچ کەسێک سۆراغێکی نەکرد؟ قەد لێیان نەپرسی تۆ کچێ کێیت؟

حەڤدە:

(صوریا) دەڵێ، ناوە ناوە قەزافی داوای دەکرد، پاسەوانەکان ژنەکانی خۆیان بێنن بۆ ئاهەنگ، جا ئەو ژنەی بەدڵی بووایە، سەرجێی لەگەڵ دەکردن، ئەگەر پاسەوانەکان قبووڵیان نەکردبا، ئەوا لە دوو ئۆتۆمبیلی دەخستن، پشتییان لێک بوو، جا لێیاندەخوڕین و پاسەوانەکەیان هەڵدەزڕاند.

پرسیار: نووسەر لە (صوریا) پرسی: ئایا تۆ بەچاوی خۆت ئەوەت دیت؟ گریمان ڕاست دەکا، ئەدی ئەو پاسەوانانە کەس و کاری قەزافین، خێڵەکەیان ناڵێ، بۆچی ئەو پاسەوانانە دیار نەماون؟ ئەی ژنەکانیان چی دەکەن و چی دەڵێن؟

هەژدە:

(صوریا) دەڵێ، ڕۆژێ منیان بردەوە لای دایکم، لە ئارایشتگە، ماچی کردم و پێیگوتم لە کوێ بووی، گوتم (قەزافی....)، گوتی: خۆ جارێ تۆ زۆر منداڵی. ئەو دیدارەمان هەر چەند دەقیقەیەک بوو.

پرسیار: بۆچی دایکی ئەو کچە بە مێردەکەی و بە هۆزەکەی خۆی نەگوت، کە قەزافی کچەکەی ئەوەی هێناوە و ئێستا ژنیەتی؟ چۆن وا بەخۆشی بۆ جاری دووەم کچەکەی دایەوە دەست پاسەوانەکان؟

نۆزدە:

نووسەر دەڵێ (صوریا) ناوێکی خوازراوەیە، نامەوێ ناوی حەقیقی ئەو کچە بێنم، با ناوی نەزرێ.
پرسیار: شاری سرت بە قەد شاری کۆیەیە، هەموویان یەکتری دەناسن، کەس هەیە نەزانێ ئەو سالۆنەی ژنە مەغریبییەکە، خاوەنەکەی کێیە؟ ئەدی(صوریا) ناڵێ، ئەو سالۆنە زۆر ناسراو بوو، کەواتە ناوی کچەکە و دایکی و باوکیشی کەشف بوو، جا ناوی خوازراوەی بۆ چییە؟
بیست:
(صوریا) دەڵێ، ڕۆژێ لە (عەزیزیە) دەریان کردم و گۆتیان، ئێستا بۆخۆت برۆ ئازادی. منیش پاسەوانێکم خۆشدەویست ناوی (هیشام)بوو، ئەو کوڕێکی ژنانی بوو.
پرسیار: ماقوولە کچێک قەزافی لەگەڵی ڕابواردبێ و ئەو هەموو ئەسرڕ و نهێنییەی قەزافی لە لابێ، وا بەهاسانی بەڕەڵلای سەر جادەی کەن؟ پاسەوانەکانی قەزافی هەموویان لە فەرەنسا و لە عێراق (لە ناو مەغاویرەکاندا) مەشقی سەربازییان پێدەکرا، ماقوولە قەزافی کوڕێکی ژنانە بکاتە پاسەوانی خۆی، بۆ پیاو نەمابوو؟
بیست و یەک:
(صوریا) دەڵێ، شەو لەگەڵ هیشام چووینە شووقەکەی لە تەرابلس، پێمگوت، من کچ نیم! یەکسەر دەریکردم و پێیگوتم: برۆدەرەوە، من ژنی قەحپەم ناوێ!
پرسیار: ماقوولە هیشام کە شەو و ڕۆژ لە قەسری (عەزیزیە)یەو وەک (صوریا) باس دەکا چۆن ژنی پاسەوانەکان لاقە دەکرێن، نازانێ کە ئەو کچە، کچێنی لەدەست داوە؟ بۆچی (صوریا) داوای نەکرد یەکسەی بیبەنەوەی لای دایک و باوکی؟ ئەو کات مۆبایل هەبوو، خۆی دەڵێ پارەیان دەدامێ، بۆ تەلی بۆ دایک و باوکی نەکرد؟ دواتر کێوەچوو بەو شەوە؟
بیست و دوو:
(صوریا) دەڵێ، (٢٠٠٦) باوکم بردمییە فڕۆکەخانە، گوتی تۆ هیچ قسە مەکە با ئاشکرا نەبی، هەردووکمان چووین بۆ ڕۆما دواتر چووینە فەرەنسا و تاکو (٢٠١٠) لەوێ بووین.
پرسیار:ئەگەر ئاسایشی لیبیا تەعقیبی بازێک بکات بەسەر سەری قەزافییەوە فڕێ بێ، چۆن نازانن کە فەرمانبەرێکی پلەداری سەفارەت، لەگەڵ کچەکەی سەفەر دەکا بۆ

هەندەران؟ ئایا دایکی (صوریا) ئەو ماوەیە هەر بەتەنیا لە سرت مایەوە؟ بۆ لەگەڵ خۆیان نەیانبرد؟

بیست و سێ:

(صوریا) دەڵێ، لە پاریس باوکم چێشتخانەیەکی بچووکی کردەوە؟

پرسیار: جارێک لە سرت، دوو سەربازیان سزادا، چووبوون لەسەر جادەی ڕێی فڕۆکەخانەی سرت، سەیرانیان کردبوو، گوتبوویان، ئەو بێ حورمەتییە بە سوپا و یاسا. چۆن لیبیا قبوڵیەتی فەرمانبەرێکی پلەداری سەفارەت بچێ لە پاریس چێشتخانە بکاتەوە؟ بۆچی باوکی لە سەفارەت نەما؟

بیست و چوار:

(صوریا) دەڵێ، زۆربەی جاران بۆ خۆم دەچوومە تونس و مەغریب و شارەکانی لیبیا و هەندەران.

پرسیار: چۆن ئەو قەزافییانە، کە وەک خۆی دەڵێ موتەعەسیب و خێڵەکین، ڕێیان دەدا ئەو کچە بە ئارەزووی خۆی بە تەنیا وا سەفەران بکا و بگەڕێ؟ ئەدی ئەو ژنە نووسەرە ناڵێ، هەموو ژنی لیبیا کراون بە کۆیلە؟

بیست و پێنج:

ژنە نووسەر دەڵێ، ڕۆژێک کە لەگەڵ(صوریا) بووم لە هۆتێل، لە تەرابلس، باوکی هاتە لامان، نەمانهێشت بزانێ کە من چاوەڕوانی دەکەم (٢٠١٢).

پرسیار: ئەو کچە بەتەنیا چی دەکرد لەو هۆتێلە؟ نووسەر دەڵێ کە چوومە مەکتەبەکەی (صوریا) لە سرت، گوتیان مودیری پێشوو کە قەزافی بوو، هەڵاتووە. باشە پلەی مودیرێک بەرزترە یان قەزافییەکی فەرمانبەری سەفارەت، چۆن ئەو پیاوە نەگیراوە، نە کوژراوە یان ئەویش هەڵنەهاتووە و قیتوقنج لە تەرابلس دانیشتووە؟

بیست و شەش:

(صوریا) دەڵێ، پێش سەرجێی کردن، پەرستارێکی ئۆکرانی دەرزییەکی مەنعی منداڵبوونی لە قەزافی دەدا.

پرسیار: کامیان هاسانترە. دەنکە حەبێکی مەنعی حەمەل بدەنە کچەکە، یان لێدانی دەرزییەک لە قەزافی، کام قەزافی؟ ئەو قەزافییەی کە دەبێ خواردنەکەی سێ کەس پێش

خۆی بیخوا نەکۆ ژەهراوی کرابێ. چۆن ئەو زاتە قبوڵ دەکا ئەو جۆرە دەرزییەی لێبدرێ، گەر شتی وا هەبێ؟

بیست و حەوت:

نووسەر دەڵێ؛ کەچوومە لای (عەقید عایشە) لە زیندان، ئەو یەکێک بوو لە پاسەوانە ژنەکانی قەزافی، گوتی: ژیانی ئێمەش زۆر دژوار بوو، مووچەمان کەم بوو، گرنگ ئەوەیە بە شەرەف و سەربەرزانە ژیاوم.

پرسیار: دەستەواژەی( بە شەرەف و سەربەرزانە ژیاوم)، مانای ئەوە نییە، کە ئەو ویستوویەتی بە رۆژنامەوانەکە بڵێ من پاکیزەم و لاقە نەکراوم؟ مانای ئەوە نییە کە تەنانەت شۆڕشگێڕەکانیش، ئیسلامییەکانیش، لاقەی منیان نەکرووە، گەرچی من دیلی ئەوانم؟

بست و هەشت:

نووسەر، دەیان ناو، دەنووسێ وەک: لیلا، فاتیمە، هەنا، هودا کە لاقە کراون.

پرسیار: ئایا ئەو بە دەنگ و ڕەنگ ئەو ئیفادانەی تۆمارکردوە، ئاخر هەر نووسینی ناوی ژنێک بە تەنیا کافی نییە بۆ ئیقناع کردنی خوێنەر؟

بیست و نۆ:

نووسەر دەڵێ، کارخانچییەکان، لە لوبنان و عیراق و هەموو کەنداو و بۆسنە و سربیا و بەلجیکا و ئیسپانیا و ئیتاڵیا و فەرەنسا و ئۆکرانیا، کچیان بۆ قەزافی دەهێنا تا لەگەڵیان ڕابوێرێ.

پرسیار: گوتمان ژنانی لیبی و عەرەبی هەموو کۆیلە و ترسنۆکن، بۆچی یەک تاکە ژن لەوانەی ئەوروپایی، رۆژێک نەیانگوت، قەرەبوومان دەوێ، قەزافی دەستدرێژی کردووەتە سەرمان؟ ئەدی نابینن چۆن ژنە ئەوروپی تەشقەڵە بە سەرکردەکانی ئەورووپا دەکەن و دەیانبەنە بەردەم دادگا؟ کێ کلینتۆنی لەسەر عەرشی ئەمەریکا هێناخوار؟ دەستکەوتێکی چەندە باش دەبوو گەر ژنێک لەوانە، حەیا و نامووسی قەزافی ببردبا؟ بۆچی نووسەر هەوڵی نەداوە چاوی بە یەکێک لەو ژنە ئەوروپایانە بکەوێ کە قەزافی لاقەی کردوون؟ بۆ ئەوانیش کۆیلەن، ناوێرین وێنە و دەنگ و ڕەنگیان بەدیار کەوێ؟

سێ:

نووسەر دەڵێ، قەزافی سەرجێی لەگەڵ ژنی سەرکردەکانی وڵاتانی دراوسێش دەکرد.

پرسیار: ژنانی سەرکردەکانی وڵاتانی دراوسێ دیارن، میسر و تونس و مەغریب و مالی و سودان و شادن.... بۆ ناویان ناهێنێ؟ بەڵگەکانی چنە؟

سێ و یەک:

ژنە نووسەر دەڵێ، دکتۆرێکی قەزافی گوتی (٧) سیدییم هەبوو هەموو ڤیدیۆیی ڕووت و سێکبازیی قەزافی بوون، دواتر هەمووم شکاندن.

پرسیار: ئەو سیدیانە چۆن کەوتنە دەست ئەو دکتۆرە؟ ئایا ئەو دکتۆرە وێنەگری قەزافی بووە و لە کاتی سەرجێیی وێنەی دەگرتن؟ پەیوەندیی نێوان دکتۆر و قەزافی و سیدی سێکسی ژنەکانی لیبیا چییە؟

نامەوێ پتر قسە لەسەر ئەو باسە بکەم، تەنها ئەو دوو قسە دەکەم، کە پەیوەندییان بە کتێبیکەوە نییە.

یەک:

مامۆستا (ها. ا. ز.) ی لیبی زۆر هاوڕێم بوو، گلەیی زۆری لە قەزافی هەبوو، هەر لە لای من قسەی دەکرد و ڕەخنەی دەگرت و ناڕازی بوو. ڕۆژێک باسی زیندانی بەعسم بۆ کرد، گوتم، لە عێراق ژن و خوشکی زیندانیکراوان، جار هەیە لاقە دەکەن، تا بەندکراوەکان ناچار بکەن ئیعتراف بکەن. ئەویش گوتی؛ لەلای ئێمە شتی وا نییە، ئەگەر شتی وا ڕوویدا، دەبێ نیوەی شەعبی لیبی یەکتر سەرببڕن، ئێمە هەموومان یەکتری دەناسین و هەموومان سەر بە عەشیرەتین، مانای وایا ئەو ئەفسەرەی ئەو دەکا، دەبێ عەشیرەتەکەشی قڕ بکرێ!

دوو:

ڕژێمی قەزافی زۆر ژن و دایک و خوشکی ئەو ئیسلامییانەی زیندانی کردبوو، کە دژی ڕژێمەکەی چالاک و یاخی بوون. دوای ڕوخانی قەزافی کەناڵی ئەل جەزیرە، چاوپێکەتنی لەگەڵ چەندان لەو ژنە زیندانیکراوانە کرد، کەسیان نەیان گوت کە لە زینداندا ژن لاقە دەکران، خۆ ئەوان دوژمنی بابەگەورەی قەزافی بوون، هەرچی لە دڵیان بوو گوتیان و هیچ ترسیشیان نەبوو.

تێبینی، قەزافی لە دەرەوەی وڵات شتی وایکردووە، یان نەکردووە، من هیچ قسەم نییە. الله اعلم.

لەساڵی (٢٠٢٢) لە شاری کامبرج، کچە لیبییەکم بینی کە لەسەردەمی قەزافی باوکی سەفیر بوو، ئەو پرسیارەم لێکرد:"قەزافی مێباز بوو؟"

گوتی: ئێمە هیچ بەڵگەمان نییە و هیچمان لێ نەدیتیە. بەڵام ناحەزانی وا دەڵێن!"

## (٥١)

## ڕەشـماڵەکەی قەزافی، یان سندووقە نهێنییەکەی ڕۆژهەڵاتی ناوەند

لەگەڵ دەستپێکی وەرزی بەهار، وەرزی ڕۆشنبیریی جەماهیریی، لە سەرتاسەری ناوەندەکانی خوێندن لە لیبیا، بۆ ماوەی (١٠) ڕۆژێک، دەستی پێدەکرد، لە باخچەی منداڵانەوە تا دواین قۆناغی زانکۆکان.

(٦) مانگ بوو دەست بەکار بووم، کە بۆ یەکەمجار، چالاکییە فرە بابەتەکانی ئەو وەرزەم بینی و خۆشم بە سیمینارێک تێیدا بەشدار بووم. بەدەر لە کۆبوونەوەی ستافی قوتابخانە بۆ تەدارەک و ئامادەکاریی جوان و ڕێکوپێک بۆ جێبەجێکردن و نمایشکردنی بڕگە بە بڕەگەی بابەتەکانی ئەو وەرزە، ئەوەی کە لە هەمووان پتر بۆ من جێگەی سەرنج بوو، ئەو ڕەشماڵە ڕەنگاوڕەنگە گەورەیە بوو، کە لە ناوەندەی گۆڕەپانی قوتابخانەکە، ڕوو لە سەکۆی پۆلەکان هەڵدرا بوو، لە بەردەمیشیدا، بە قەد فراوانی گۆڕەپانکە حەسیر و بەڕەی جوان جوان ڕاخرا بوون، تا خوێندکارەکان لەسەریان دانیشن و چەند ڕیزە کورسییەکیش بۆ مامۆستا و میوانەکان.

پێشکەشکار و نمایشکار و جێبەجێکاری بەرنامەکانی ئەو وەرزە ڕۆشەنبیرییە سیاسی و ئەدەبی و فکرییە، دەبووایە، بەرنامەکانیان لەنێو ئەو ڕەشماڵەدا ئەدا بکەن.

منیش بۆ یەکەمینجار، لە نێو دەمی ئەو ڕەشماڵەدا سیمینارەکەی خۆم پێشکێش کرد. بەمجۆرە، ئەزموونی وانە لە ژێر ڕەشماڵدا، چووە سەر ئەزموونەکانی وانە گوتنەوەم، لە پۆل و هۆڵ و لە نێو چیمەن و لە دەشت و دەر و نێو ئەشکەوت و سەربانی قوتابخانە.

هەر ئەو ساتە وەختەی چاوم بەو ڕەشماڵە جوانەی نێو گۆڕەپانی قۆتابخانەکە کەوت، پرسیارێک، لە مێشکمدا چەخماخەی لێدا: "کە ئەو هەموو پۆل و هۆڵ و جێگە فراوانانەمان هەیە، ئەو ڕەشماڵەمان بۆچییە؟"

ئەو کات، هیچ وەڵامێکم وەدەست نەکەوت.

دواتر...زانیم:

چۆن لای خۆمان، پێشوازی لە نەورۆز، بەبێ ئاگرکردنەوە، نەبووە و نابێ، لە لیبیاش، ئەو ڕەشماڵە، ئاگری هەموو بۆنەکانە، بەبێ ڕەشماڵ هیچ ڕێوڕەسم و تەدارەک و بۆنەیەک بەڕێوەناچێ.

تاکو ئێستا، زانستییانە ساغ نەکراوەتەوە کە لە کەیەوە مرۆڤ ڕەشماڵی داهێناوە و یەکەم زێدیشی چ هەرێم و ناوچەیەک بووە! چونکە مادده پێکهێنەرەکانی ڕەشماڵ، تەمەنیان کورتە و لەگەڵ زەمەندا تێکدەچن و لەناودەچن، بەلام لە ناوچە سەهۆڵبەندەکانی ڕووسیا، پاشماوەی ڕەشماڵێک دۆزراوەتەوە، کە (٤٠) بۆ (٥٠) هەزار ساڵ پێش ئێستا بەکارهاتووە. لە تەوراتیشدا ناوی دەوار هاتووە. لە قورئانی پیرۆزیشدا لە سورەتی (ڕحمن) دا، باس کراوە،( حُورٌ مَقْصُورَاتٌ فِي الْخِيَامِ). زانایانی ئەنترۆپۆلۆژیی وای بۆ دەچن، کە مرۆڤ ئەشکەوتی بەجێهێشتووە، لە گەلا و چرووی دارودرەخت، کەپر و ساباتی بۆ حەوانە و تێیدا ستاربوون داهێناوە. زۆری پێچووە، تا سەردەمی شوانکاریی هاتووە و فێرە چنینەوەی ڕەشماڵ بووە.

بەهەر حاڵ، هیچ کەرەستەیەک، وەک ڕەشماڵ، بۆ کۆچەرە و بەدووەکانی سارا فراوانەکانی لیبیا بایەخدار و پێویست و بەکەلەک نەبووە. لەلایەک، بۆ دروستکردنی ئەو کەرەستە سەرەکییەی ژیانی ئەو ناوچانە، خوور و موو و مەرەزی مەڕ و مالات و تووکی وشتریان، زۆروزەوەند بووە، لە لایەکی دیکەش، گواستنەوە و هەڵدان و پێچانەوەی، کارێکی زەحمەت نییە و کەلوپەل و ئامێر و کەرەستەی زۆریشی ناوێ. ئەوا جگە لەوەی کە چەندە بەکەلکە لە ڕۆژانی باوباران و تۆف و زریانی زستانانداو لە وەرزی گەرمای پروکێنەر و تۆزاویی هاویندا.

لە فەرهەنگی زمانی عەرەبی، دوای وشە و زاراوەکانی (وشتر ـ کە نزیکەی ١١٧ دانە دەبن)، ڕەشماڵیش زۆر زاراوە و وشەی تایبەت بە خۆی هەیە. هیچ پارچە و بەش و دیو و هەودا و سەرە پەتێکی نییە، زاراوەی تایبەت بە خۆی نەبێ، لە ئەدەبیاتی زارەکی و نووسراویشیاندا، بۆ خۆی فەرهەنگێکە. دەوار و دەوارنشینی بەشێکە لە شارستانیەتی و کەلتووری خۆیان کە شانازی پێوەدەکەن. دەواری هاوینە جیاوازە لەگەڵ دەواری زستانە.

دەگوترێ، هیچ شتێک نییە پەیوەست بە قەزافی بێت و قامتێک خەسڵەت و تایبەتمەندیی جیاوازی پێنەدرابێ و نە بووبێتە جێگەی سەرنج و باس و خواس.

(خەیمەکەی قەزافی / ڕەشماڵەکەی قەزافی)، ڕەنگبێ پشکی شێری بەرکەوتبێ، لە شتە تایبەتمەندەکانی ئەو زاتە، کە قسە و باسی زۆری لەسەر کرابێ. سێیانەکەی قەزافی، بۆ هەر شوێنێک چووبێ، دەیان ڕیپۆرتاژیان لەسەر نووسراوە: پۆشاکەکەی، ژنە پاسەوانەکانی، دەوارەکەی.

قەزافیدا لە ژیانیدا، لەژێر (٦) جۆرە دەوار دانیشتووە:

یەکەم: دەواری خێڵ و خانەوادە: لەگەڵ یەکەم چاوکردنەوەی، دیمەن و شێوەی ئەو دەوارە لە هزر و مێشکی ئەو زاتەدا نمایش بووە و بووەتە (ئیمج)ێک کە تا دوا هەناسەی لە خەیاڵدانیدا زیندوو ماوەتەوە. تا دەچێتە کۆلێژی سەربازی، هەر لە ژێر ئەو دەوارە بووە، جارێک لە ساراکانی سەبها و جارێک لە دەوری سرت و جارێکی دیکە لە هەوارگە و مێرگێکی دیکەدا. جا لەو سارا و بیابانە کاکی بە کاکییە، قەت هیچ شتێک نەبووە، لە ڕەشماڵەکەی بەر چاوەی گەورەتر بێ، بۆیە ئەو شتە بە گەورەیی خۆی لە ناخیدا جێگیر بووە و دواتر، ڕەنگانەوەی فەلسەفی ژیانی کۆچەرانی لێ هەڵێنچاوە. لە حەنین و نۆستەلیژیای ئەو زاتە بۆ ژیانی بن ئەو دەوارە هەر گەڕێ!

دوو: دەواری دانیشتن: ئەوە دیوەخانی ڕۆژانەی ئەو پیاوە بووە، لە قەسر و تەلارێکی وەکو باب ئەل عەزیزیە، لە تەرابلس ـ کە وەک ناوچەی سەوزی بەغدا بوو، ئەو خیوەتگەی خۆی هەبوو، لە دەوری ئەو خیوەتگەیە چەندان وشتر و مەڕ و بزن دەبینران. واتە ئەو بادییە و سارای هێنابووە ناوەندی پایتەخت و لەوێدا دادەنیشت و دەخەوت.

سێ: دەواری کۆبونەوە سیاسی و دیپلۆماتکاری: لەگەڵ سەرۆک و سەرکردە و حاکمی گەورەترین وڵاتانی جیهان لە ژێر ئەو دەوارە کۆبونە و گفتوگۆیەکان بەڕێوەدەچوون. (دواتر ڕۆشنایی دەخەینە سەر ئەم دەوارە).

چوار: دەوارە گەڕۆکەکانی: کە لە نێو باخ و چیمەنی گەورەترین و ناودارترین هۆتێلەکانی ئەوروپا و ئاسیا و ئەفریقیادا هەڵیدەدا، کە سەفەری بۆ دەرەوە دەکرد.

پێنج: دەواری خەڵکی عەوام: قەزافی تا بڵێی کەسێکی خاکی و سادە بوو، کە دەچۆوە زێدی خۆی یان بۆ پرسە و بۆنەی کۆمەڵایەتی سەردانی خەڵکی عەوامی دەکرد، لە ژێر دەوارە ساکارەکانی ئەواندا دادەنیشت و قاچی لێ درێژ دەکرد.

شەش: دەوارە هەوارەکانی: لەو سارا بێ سنوورەی لیبیا و بە درێژایی کەناری دەریا، ئەو زاتە دەیان خیوەتگەی هەبوو، بۆ گەشتوگوزار و هەواگۆڕی. جار هەبوو چەندان شەو لە ژێر ئەو دەوارنە بە دیار ئەستێرە درەوشاوەکانی ئاسمان دەمایەوە. (ئەو لە دیدارێکیدا، لە ژێر یەکێک لەو دەوارانەی دەم دەریا، پێشوازی لە ڕێزدار مەسعوود بارزانی کرد، لە ساڵی ٢٠٠٠).

دەوارەکانیش بەگشتی (٣) جۆر بوون: ئەوانەی ڕۆژانە لە ژێریدا دادەنیشت، کتومت لە شێوەی دەواری کەلتووری لیبی دروستکرابوون، هەیان بوو چنرابوونەوە و هەشیان بوو لە کەرەستەی سەردەم، وەکو مشەما، درستکرابوون. جوری دووەم، هەر ئەو دەوارانە بوو، کە خەڵکی عەوام هەڵیاندەدا، بەڵام جۆری سێیەم، کە تایبەت بوو بە کۆبوونەوە و دانیشتن لەگەڵ پیاوە گەورەکانی جیهان، یان کە دەچووە دەرەوە، ئەوا دەواری زۆر تایبەت بوو.

ڕاپۆرت و ڕیپۆرتاژ و باسی زۆر، دەربارەی ئەو دەوارانە نووسراون. (CIA)، هەر دوای ئەنجامدانی کودەتایەکەی، بەم شێوە ڕاپۆرتی لە قەزافی دابوو:"..... لە جێگەی بەرز دەترسێ، سەفەر بە فڕۆکە ناکات لەسەر دەریا بفڕێ، هەمیشە لەژێر ڕەشماڵان دادەنیشی لەترسی داروخانی ساختومان و خانووبەرە بەسەریدا." ڕووسەکانیش، لە دەزگایەکی (KGB)ی، ژووری تایبەتیان کردۆوە، بۆ لێکۆڵینە و توێژینەوە لە گوفتار و ڕەفتاری ئەو پیاوە بە ناوی (قەزافییات). ئەوانیش، لە باسی دەوارەکە دەڵێن،" لە ترسی تەقینەوەی نێو ساختومانان، لە ژێری دادەنیشی."

من لێرە، نهێنیی حەقیقیی ئەو ڕەشماڵەی قەزافی تۆمار دەکەم:

قەزافی، وەک سەرکردە و خاوەن هزر و پەیام و ڕێبازی تایبەت بەخۆێ، زیرەکانە ـــ هەر نەبێ لە سەرەتادا، کاری کرد بۆ جێپێخۆشکردنی خۆی و مانەوەی لەسەر عەرشی حوکمڕانی.

وەک پێشتر، چەندان جار ئاماژەم پێدا، لەوەتەی لیبیا هەیە، لە سەردەمی فینیقییەکانەوە، تا ئەم ساتە وەختە (٢٠٢٣)، قەت شتێک نەبووە لەو وڵاتە بەناوی (شەعبی لیبی). قەزافی، وەکو ڕۆڵەی ئەو خاکە، ئەو حەقیقەتەی دەزانی، دەشیزانی کە لە دێرینەوە، سەدان دەوڵەت دامەزراون و دواتر پووکاوەنەتەوە و داڕووخاون، لە دەوڵەتی ئەمەوی و عەباسی و مەمالیک و عوسمانییەکانەوە بگرە، تا ئیمڕۆ، هیچیان نەیان توانیوە، دەوڵەتداری بکەن

بەبێ بوونی پشتیوانی و پشگیریی جەماوەری، بە ڕێزگرتن و پارێزگاری کردنێ لە مووقەدەسات و کەلتووری ئەو جەماوەرە.
جا یەکەم هەنگاوی، ئەو زاتە ئەوە بووە کە خێڵ و هۆزەکانی لیبیا، کە نزیکەی (١٤٠) دانەیەک دەبن، ڕامبکات و بیانهێنێتە ژێر چەتری خۆی، بەڵام ئەو دەیزانی کە مەحاڵە بتوانێ، کەلتووری چەند هەزار ساڵەی ئەو خێڵانە، بگۆڕێ، ناچار ئەو چووە ژێر چەتری ئەو خێڵ و هۆزانە. بە واتایەکی دیکە، قەزافی وایکرد کە هەر شێخێک لە سەرۆکی ئەو خێڵانە، واهەست بکات کە ئەو (کۆڕی خۆیانە). خێڵیش پشتیوانی و بەرگری لە کوڕی خۆی دەکات. قەت، بە درێژایی ئەو (٤٢) ساڵەی حوکمڕانی، ئەو زاتە هیچ هەنگاوێکی نەهاویشتووە، بە بێ ڕەزامەندی و ڕاوتەگبیری ئەو شێخانە. (لە ساڵی ١٩٧٧ هەوڵێ تیرۆرکردنی درا، تاوانبارەکە حوکمی سێدارەی بۆ دەرچوو، چونکە شێخی خێڵ، ڕازی نەبوو، قەزافی نەیتوانی لە سێدارەی بدا، وەک نموونەیەک).
جا، بۆ ئەوەی، قەزافی بۆ ئەو سەرۆک خێڵ و شێخی هۆزانە بسەلمێنێ، ئەو (هەر کوڕەکەی خۆیانە)، ڕەشماڵی کردە، ڕەمزی ئەو پەیوەندییە و وەفادارییەی بۆ خێڵ. هەر کاتێک، لە هەر شوێنێک، ئەو سەرکردە و شێخانە، چاویان بەو ڕەشماڵەی قەزافی کەوتبێ، هەستیان کردووە، قەزافی کوڕە گوێڕایەڵەکەی خۆیانە.
چما قەزافی نازانێ، بۆمب و تەقەمەنی، لە ژێر ڕەشماڵیش مرۆڤ دەکوژێ؟!
بۆیە، هەر دوای (٤٢) ساڵ، هەر ئەو ڕۆژە، ناحەزانی توانیان زەفەر بە قەزافی ببنەن، کە خێڵ هەست کرد چیتر قەزافی (کوڕی وان) نییە.
ئەوا جگە لەوەی، قەزافی، وەک مرۆڤ، هەمیشە نۆستالیژیا و حەنینی بۆ ژیانی بادیە و سارا هەبوو، ئەوەش شتێکی ئاساییە. هەموو مرۆڤێک، کەم تا زۆر، ئەو حەزەی هەیە.
خالی بایەخدار، لەم برگەیەدا، کە ڕۆشنای دەخەمە سەر، دەواری کۆبوونەوەکانی قەزافییە:
لێرەدا دەڵێم، بۆ لەناوبردن و فۆتاندنی ئەو ڕەشماڵە، دەبووایا، قەزافی لەناو بچێت.
بۆچی؟
چونکە، ئەو ڕەشماڵە، سندووقی سەدان نهێنیی یەکجار بایەخدار و مەترسیدار بوو، کە دۆسییەی سەدان سەرکردە و حاکم و دەسەڵاتدار و پیاوانی سیاسی لە نێو دا تۆمارکرابوو،

سەرکردەی کام وڵاتی گەورەیە، کام سەرۆک حیزبی دەسەڵاتی بە هێزە، کام سیاسەتمەداری بەناوبانگی عەرەبی و جیهانی هەیە، کە لەگەڵ قەزافی دانیشتنی کردوە، سرپەن و عەلەنەن، هەموو بە پێشکەوتووترین ئامێری تۆمارکردنی دەنگ و ڕەنگی شاراوە، لە نێو چین و هەودا و ئەستونگەکانی ئەو ڕەشماڵە، تۆمارکراون و بە ئەرشیفکراون. سەدان دۆسییەی خیانەتکاریی گەورەی تێدایە: مەلیک لەسەر مەلیک، حاکم لەسەر حاکم، سەرۆک حیزب لەسەر سەرۆک حیزب، تەنانەت گرووپە چەکدارەکانی ئەو جیهانە فراوانە، لەو پەڕی عیلمانییەکانەوە بیگرە، تا ئەو پەڕی ئیسلامییەکان. ئەسڵەن، قەزافی بەو چەکانە کوژرا کە خۆی دابووی بەو گرووپە چەکدارانە. دۆسییەی ئابڕووبەر، لە ژێر ئەو ڕەشماڵەی قەزافیدا تۆمارکراوە و دەسیسە و تەگبیر و پیلانی پیس پیس لە ژێریدا تاوتوێکراوە و بڕیاری لەسەر دراوە. ــدوای کوژرانی قەزافی هێندێک لەو تۆمارەدەنگیانە ئاشکرا بوون کە لە ژێر ئەو دەوارانەدا بە نهێنیی تۆمار کرابوون، وەک گفتوگۆی نێوان قەزافی و ئەمیری قەتەر: حەمەد بن خەلیفە و حەمەد بن جاسم. (https://www.youtube.com/watch?v=j٧٣qzzb١cEY)

ڕەشماڵەکەی قەزافی بە قەد دەزگای هەواڵگەری (CIA) و (KGB) نهێنی تێدا کۆکراوەتەوە و بە ئەرشیف کراوە.

درەنگ تێگەیشتم، بۆ ئەو ڕەشماڵەی گۆڕەپانی قوتابخانەکەم، بەلای ئەو لیبییانەوە، هێندە پیرۆز و بە قیمەتە.

ڕەشماڵ، بۆ خێڵەکییەکانی لیبیا، وەک نامووس و شکۆ و ئابڕوو بوو. ڕێزی زۆریان لێدەگرت.

# (٥٢)

# پاسەوانە ژنەکانی قەزافی

کە لە یەکەم سەفەرمدا، لە ئەزمیر لە چاوەڕوانی گەیشتنی کەشتییەکەی لیبیا بووین، کە چەند ڕۆژێک لە وادەی خۆی دواکەوتبوو، ڕۆژانە هۆتێلچییەکە دەپرسی:" چ بوو، کەشتییەکەی ئەو پیاوە شێتە هەر نەگەیشت؟"

نەک هەر ئەو هۆتێلچییە، زۆری دیکەش ـ لە پادشا بۆ گەدا، قەزافییان بە شێتوویت ناودەبرد. لە چاوی ئەواندا، زۆر ڕەفتار و گوفتاری ئەو زاتە شێتانە بوو. پاسەوانە ژنەکانی، بۆ نموونە، بەقەد کەسێتیی خۆی تیروتوانجیان تێدەگیرا یان گاڵتەجاڕییان پێدەکرا.

جارێک د. کەمال غەمبار، گوتی:"لە سەردەمی هەرزەیی ڕۆشنبیریمدا، گاڵتەم بە زۆر بیروبۆچوون و تیۆر و هزری کەسانی ناودار دەکرد، بەڵام کە بەنێو فەرهەنگی زانست و ئەدەبدا بناوم لێدا و گەشتر شتەکانم بینی، هەستم کرد، ڕاستییەکان پێچەوانەی بۆچوونەکانمە."

جا، ڕەنگبێ، کە ئێمەش لە حەقیقەتی ئەو ژنە پاسەوانانە تێبگەین، هەمان قسەی د. کەمال غەمبار دووبارە بکەینەوە.

سەرچاوەی زۆربەی ئەفسانەکان لە مێژوودا، وڵاتی یۆنان و گریکی دێرینە. لە چەندان ئەفسانەیاندا، ژنە شەڕکەرە چەکدارە قارەمانەکانیان، بە ژنانی ئەمازۆنی، ناویان هاتووە. ئەو ژنانە، مەملەکەتی خۆیان هەبووە و لەشکرەکانیان هەر ژنی شەڕکەر بوون و پیاویان تێدا نەبووە. هەرچی خەسڵەت و ئاوڵناوی ئازایەتی و بوێریی هەیە، لە پەسنی ئەو ژنانەدا بەکارهاتووە، تەنانەت دەڵێن، ئەو ژنانە، تا لە تیرهاوێژیدا، نیشانە شکێنی دەستڕاست بن، مەمکێکی خۆیان دەبڕیەوە، جا ڕاستە بێ یان چەپە. گۆیا زاراوەی (ئەمازۆنی)یش، بە زمانی یۆنانی کۆن، واتای، ژنە مەمکبڕاوەکان دەدات. ئەفسانەکان، باسی ئاهەنگ و گۆبەندی ئەو ژنانە دەکەن، کە چۆن خۆشیی خۆیان دەردەبڕن کە کچیان دەبێ. چۆن ئەو کچانە فێرە تیرەندازی و زۆرانبازی و ئەسپسواری دەکەن. ئەوان هەر چەند ڕۆژێکی

دیاری کراویان هەبووە، بۆ جووت بوون لەگەڵ پیاوان، بۆ نانەوەی وەچە. لە ئەدەبیاتی سەدەی حەوتەم و هەشتەمی پێش زایینی، ناوی ئەو ژنە ئەمازۆنییانە هاتووە.

کاتێک فرانسیسکۆ دی ئۆریانای، سەربازی ئیسپانی، لە ساڵی (١٥٤١)، بۆ یەکەمجار گەیشتە سەر ڕووباری ئەمازۆن، دیتیی ئەو خێڵانەی لەو ناوەدا دەژین، هەموو پاسەوان و شەڕکەرەکانیان ژنن. بۆیە بڕیاریدا کە ئەو ڕووبارە ناولێنێ(ڕووباری ئەمازۆن)، وەک ئاماژەیەک بۆ ژنە شەڕکەرەکانی نێو ئەفسانەکانی گریکی دێرین.

ژنە ئەمازۆنییەکان، هەر لە نێو پەڕەی کتێبەکانی ئەفسانەدا مانەوە، تاوەکو سەرەتای سەدەی هەژدەم، کە شوێنەوارناسان و زانایانی ئەنترۆپۆلۆژیا، بۆ یەکەمجار ئاشکرایان کرد، کە ئەو ژنە ئەمازۆنیانە، لە مێژوودا بوونیان هەبووە و زادەی ئەفسانە و خەیاڵ نین. گۆڕی، نزیکەی (٣٠٠) ژنی شەڕکەریان دۆزیەوە، کە چەک و شتومەکە تایبەتییەکانیان لەگەڵدا نێژراوە و ئاسەواری زام و برینی شەڕکردن و شکان و قنجان، لە ئێسکوپروسکیاندا دیارە.

لە ناوچەی تامزاغا ـ کە دەکاتە وڵاتی لیبیای دێرین، تونس و جەزائیریش دەگرێتەوە ـــ لە قوڵایی بیاباندا، نەقش و نیگاری ئەو ژنە ئەمازۆنیانە لەسەر تاتەبەرد و دیواری ئەشکەوتەکان دۆزراوەتەوە. (بۆ زانیاری، لە بیابانیشدا، گردۆڵکە و تاشەبەردی گەورە گەورە هەیە، کە پێکهاتەکانیان تایبەتن بە بیابانەکان.). زانایان، ناوەڕاستی ئاسیا و ناوچەکانی لیبیا بە زێدی ئەسپ دەزانن. جا گۆیا ئەو ژنانە، کە بە ڕەچەڵەک لە نەتەوەی ئەمازیغن، یەکەم کەس بوون، ئەسپییان ماڵیکردوە و بوون بە ئەسپسوار و لە شەڕەکانیاندا بەکاریان هیناون. جا گۆیا، یەکێک لە ژنە هەر ئازا و جەوهەردارەکانی ئەو ئەمازیغییانە، کە ڕابەری ئاینییشیان بوو، ناوی ئەمازۆ بووە. لەو ناوەوە، ئەو ژنانە ناوی ئەمازۆنییەکانیان بەسەردا براوەتەوە. ئێستا لە مۆزەخانەی نیشتیمانیدا لە واشتۆن، پەیکەرێکی ژنە ئەمازۆنی شەڕکەر هەیە، بەناوی (ڤینۆسی ئەمازۆنی). سەرچاوە مێژووییەکان دەڵێن، ئەو هۆزە، دوو شاژنی هەبووە، یەکێان وەک سەرکردەی لەشکر، ئەویدیکەش وەک حاکمی و بەڕێوەبەری مەملەکەت. لە بن وێنەی دوو ژنی شەڕکەر کە لەسەر بەرد نەخشێنراون، نووسراوە:( ژنەشەڕکەرەکان: ئەمازۆنیا و ئەخیلیا). لەسەدی دووەمی پێش زایینی، ئەو مەملەکەتە کەوتووەتە ژێر دەسەڵاتی ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی، دیارە هەر ئەوانیش، باس و

خواسی ئەو ژنە ئەمازۆنییانەیان گەیاندۆتە ئەوروپا و دواتر بۆ ناوەڕاستی ئاسیا تا ئێران و توران هاتووە.

ئێستا، با بگەڕێنەوە، سەر پاسەوانە ژنەکانی قەزافی.

بێگومان قەزافی بە ئاگابوو وە خوێنەرێکی باشی مێژووی وڵاتەکەی و ئەفریقیا بوو، ئەو ئەفریقیایەی کە ئەو بە زێدی خۆی دەزانێ و مەیل و ئینتمای بۆ ئەوێ پتر بوو لەوەی هەیبوو بۆ ئوممەی عەرەبی.

وەک پێشتریش ئاماژەمان پێدا، کە قەزافی جەڵەوی حوکمڕانی گرتە دەست، دانیشتوانی لیبیا، یەک ملیون و (١٩٥)هەزاری پیاو و یەک ملیۆن و (٥٧) هەزاری ژن بوون. ئەو دەیزانی بەو ژمارە کەمەی پیاوەکان، ئەو هەموو خەونەی هەیەتی بۆی جێبەجێ ناکرێ، بۆیە ژیرانە، کەوتە کارکردن بۆ ئەوەی ژنان بهێنێتە مەیدانی خەباتکردن و کارکردن. ئەو باش دەیزانی کە کەلتووری خێڵەکیی بیابانیی، ڕێگر و کۆسپی گەورەیە، بەڵام کاتێک خەڵکەکە بینییان، ئەو ژن و کچانی هۆزەکەی خۆی پێش هەموو کەسێک، هێناوەتە ڕیزی پیاوان، خەڵکەکە وردە وردە لە هزر و هەنگاوەکانی ئەو زاتە تێگەیی و هیچ دژایەتییان نەکرد. کە من لە لیبیا بوون، زۆرینەی مامۆستای قوتابخانە بنەڕەتییەکان ژن بوون.

لەساڵی (١٩٨١)، واتا دوای (١٢) ساڵ لە کودەتا، قەزافی یەکەم بنکەی مەشق و ڕاهێنانی سەربازی، یان بڵێین چەکداری بۆ ژنان کردەوە و ناوی لێنیا (الراهبات الثوريات : ڕاهیبە شۆڕشگێڕەکان)، دواتر هەر لەو ژنە مەشقپێکراوانە، دەستەیەکی هەڵبژارد، کە پێیان دەگوترا، ژنە ئەمازۆنییەکان، یان پاسەوانە ژنەکانی قەزافی.

موتەرجیمی یاوەریی قەزافی، کە (٤٠) ساڵ لەگەڵی بووە، دەڵێ، (٢٦) جار هەوڵی تیرۆرکردنی قەزافی دراوە و هەموویان پووچەڵکراوەنەتەوە. بەڵام لە ڕاستیدا، هەر (٣) لەو هەوڵانە باس دەکرێن. لە ساڵی (١٩٧١)، ئەنوەر ساداتی سەرککۆماری میسر، کە دژایەتیی ئەو پیاوەی دەکرد، پیلانێکی بۆ کوشتنی دارشت، کە سەری نەگرت. لە ساڵی (١٩٧٧)، یەکێک لە پاسەوانەکانی خۆی، پیلانی دانابوو، کە لە کاتی نوێژی جەژندا، قەزافی بکوژی. ئەمەش زۆر ئەو زاتەی پەرێشان و ڕاڕاکرد، چونکە ئەو کەسە نەک هەر پاسەوانی خۆی بوو، بەڵکوو لە بەرەبابی خۆ و هۆزەکەی بوو! لە ساڵی (١٩٨٤)، سەددام حوسێن، (١٦) لیبیی لە ئیسلامییە سەلەفییەکان، مەشق و ڕاهێنان پێکرد بۆ کوشتنی قەزافی، بەڵام هەر کە

گەڕانەوە لیبیا هەموویان گیران و کوژران.((لە نیو ٢٢ سەرکردەی وڵاتی عەرەبی، هەر قەزافی بەدەنگ هات، کە سەددام لە سێدارەدرا و کچەکەی بووە پارێزەری سەددام!)) لە ساڵی (١٩٩٨)یش، دیسان ئیسلامییە چەکدارەکان تەقەیان لە قەزافی کرد، یەکێک لە ژنە پاسەوانەکان خۆی کردە قەڵغانی قەزافی، کوژرا و (٧) یش لە دەستەخۆشکەکانی بریندار بوون.

هەرگیز، نە قەزافی بۆ خۆی، نە پاسەوانە ژنەکان، نە خەڵکی عەوامی لیبیا، قسەیان لە نهێنیی ئەو هەڵبژاردنەی نەکردوە. ئەوەی دەگوترێ، هەموو بۆچوون و لێکدانەوەیە. تەنها ئەوە نەبێ، کە یەکێک لە پاسەوانە ژنەکان بە ناوی عائیشە عەبدولسەلام محەممەد، گوتویەتی "قەزافی، ژنی پێ باشتر بووە لە پیاو، لە مەسەلەی پاسەوانیدا."

ئەو دەڤەرەی من لێیبووم، لە دەرەوی سرت، لە نیوان نزیکەی هەر کیلۆمەترێک شەش حەوت ماڵ هەبوون، ئەوان بەو چەند ماڵانە دەڵێن (شەعبییە)، جا یەکێک لەو شەعبییانە، کە کوڕە مامی قەزافی بوون، چەند ژنێکیان، کە لە دواناوەندی (شهداء البدر) مامۆستا بوون، زۆرجاران پۆشاکی سەربازیی ژنە ئەمازۆنییەکانیان دەپۆشی، بە تایبەتی لە بۆنە نیشتیمانییەکاندا، بەڵام بۆ قوتابخانە چەکیان هەڵنەدەگرت. نەمزانیوە، کە ئەوانە لە پاسەوانەکانی قەزافی بن ــ پرسیاریشم کردووە. لە قوتابخانەکانیشدا، چەندان مامۆستای ژن هەبوون کە لە ڕاهیبە شۆڕشگێرەکان بوون، نەک پاسەوانەکانی ئەو.

هەموو پاسەوانە ژنەکان، بە ڕەچەڵەک، ئەمازیغی خوێن بوون، واتا، قەزافی باوەڕی بە ئازایەتی و بوێریی ئەو ژنانە هەبووە وەک لە ئەفسانەکانیش باس کراون. لە هەڵبژاردنیاندا، ئەو خۆی دەستنیشانی دەکردن. مەرج و خەسڵەتەکانی ئەو پاسەوانانە، کە خۆی دیاری کردبوون، ئەمانە بوون:

پاکیزەیی: کچۆڵەکان دەبێ تەمەنیان لە نیوان (٢٠ ـ ٣٥) ساڵ بێ و ڕازیبن بەوەی کە هەتا پاسەوانی ئەو بن، شوو نەکەن و پاکیزەیی خۆیان بپارێزن. ئەوەش بۆ ڕاگرتنی دڵی شێخی خێڵ و ڕێزگرتن لە کەلتووری خێڵەکیی عەرەبی بووە، کە کچەکان هەر پاکیزە دەبن.

سوێندخواردن: بەڵێن بدا کە گیانفیدا و پێشمەرگەی قەزافی دەبێ و ئامادەیە لە پێناویدا خۆی بکاتە قوربانی.

قیافه و بەژن و باڵا: جوانیی مەرج نەبووە، بەڵام نابێ کورتە باڵا بێت و دەبێ ئازایەتی لە جەوهەریدا دیاربێ و گورج و گۆڵ و لەشساغ و جست و چالاک و زرینگ و چەلەنگ بێ.

مەشق و ڕاهێنان: بەرگەیی مەشق و ڕاهێنانە قورسەکان بگرێ، کە لە کۆلێژی پۆلیسی تەرابلس خوولیان بۆ دەکرایەوە و بڕوانەمایان پێدەدرا. مەشق و ڕاهێنانی بەکارهێنانی هەموو جۆرە چەکێک، جگە لە وەرزشی جۆدۆ و کاریتی. ئەوان لە پاسەوانیدا، دەمانچەیەک و قەمەیەکیان هەڵدەگرت.

پۆشتەوپەرداغی: دەبووایا بایەخ بە جلکوبەرگی خۆیان بدەن و لەخۆشیان بخەفتن، سووکە میکیاژ و پێڵاوی نیو پاژنەبەرز و ئێکسسواراتی ئاسایی ڕێ پێدراو بوو.

ئەوان نزیکەی (٤٠٠) ژن دەبوون. ژمارەی یاوەرەکانی قەزافی لە نێوان (١٥) تا (٤٠) ژن دەبوون. وەک دەستووری سەربازیی، گەورە ئەفسەری پاسەوانەکان، نەک قەزافی، دەستنیشانی ئەو ژنانەی دەکرد، کە لەگەڵ قەزافی دەردەچوون.

قەزافی ناوی زۆربەی ئەو ژنانەی نەدەزانی، هەموویانی بە (عائیشە ـ بە ناوی تاقە کچەکەی خۆی، کە ناوی دایکیشی بوو) بانگدەکردن.

لە هێندێ ڕووداودا، ئەو پاسەوانە ژنانە، بوونە بنێشتەخۆشەی میدیاکارانی جیهانی: لە کۆبوونەوەی لوتکەی بیستەمینی ڕێکخراوی یەکێتیی ئەفریقی لە ئەدیس ئەبابە، لە ساڵی (١٩٨٤)، کە ئاسایشی ئەسیوپیا ڕێی بە پاسەوانەکانی قەزافی نەدا بە چەکەوە بچنە هۆڵی کۆبوونەوە، لێیان بووە ناخۆشی. کە قەزافی لە نێو ئۆتۆمبیلەکەیەوە، ئەوە دەبینی، دەڵێ:" ئێوە، هەمیشە ئازا و بوێرن، چیدەبێ با ببێ، بشکوژرێن، فریشتەی بەهەشتن!". لە کۆبوونەوەی لوتکەی عەرەبی لە شەرم شێخ، لە میسر، ساڵی (٢٠٠٣)، پیاوانی ئاسایشی هۆتێلەکەی قەزافی، دەستەوەیاخە لەگەڵ ئەو پاسەوانە ژنانە لێکگیردەبن، کاتێک دەیانەوێ ڕێگرییان لێبکەن لە چوونە ژوورەیان بە چەکەوە. خۆ لە کۆبوونەوەی سەرۆکەکانی ئەفریقیا و ئەمەریکای لاتینی لە نەیجیریا، لەبەردەم دەرگای هۆڵی کۆبوونەوە، بووە شەڕێک، تا سەرۆکی نەیجیریا بۆخۆی نەهات، گرژییەکە خاونەبۆوە. لیبییەکان، چونکە لەو سارا و بیابانە سەختەدا ژیاون، زۆر دڕن، بۆیە ژنەکانیشیان تا بڵێی ئازا و بە جەوهەرن.

جا کە لە ساڵی (٢٠٠٨)، قەزافی سەردانی ئیتاڵیای کرد ــ دوای نزیکەی (٤٠) ساڵ لە قسەبڕینەوە، سیلڤیۆ بێرلسکۆنی، سەرۆک وەزیرانی ئەو وڵاتە، لە پێشوازیکردنیدا، هێندە مشەوەشی پێوە دیار بوو، پڕ دەداتە دەستی قەزافی و ماچی دەکا، لەوەش خەوەشتر، دەستی یەکێک لە پاسەوانە ژنەکانی قەزافی دەکوشێ، میدیاکاران نووسیبوویان، ئەو ژنە بە نیگایەک، تەماشای بێرلسکۆنی دەکات، دڵی دادەخورپێنێ! ــ ئەمانە درەچوونە لە ڕێوڕەسمی پرۆتۆکۆلیی پێشوازی کردن.

ئەو پاسەوانانە، وەک نیزامی سەربازیی، هەر یەکە پلەی خۆی هەبووە و مووچەی باشیان پێدراوە، بۆ بازاڕکردن و کڕینی شتومەکی خۆیان، دەیانتوانی سەفەر بکەن بۆ ئیتاڵیا.

بە حوکمی ئەوەی (٨) ساڵی ڕەبەق، لەگەڵ ماڵی یەکێک لە پاسەوانەکانی قەزافی هەر دیوارمان نێوان بوو، کە ئەو ئەفسەرەش لە ڕووداوێکی هاتووچۆدا گیانی سپارد، کوڕە گەورەکەی چووە شوێنی، وە وەک شایەتحاڵێک کە چەندان جار کەژاوەی قەزافیم بینیوە، ئەو دیڕانە تۆمار دەکەم:

پاسەوانە حەقیقیەکانی قەزافی، ئەو گەنجە گیانفیدا و خوێنگەرامانە بوون کە لە هۆزەکەی خۆی بوون و جێگەی متمانەی هەمووان بوون و لە یەکێتیی سۆڤیەتدا مەشق و ڕاهێنانیان پێکرا بوو. لە هەموو کەژاوەکانی قەزافیدا، چ لە لیبیا و چ لە دەرەوە، دەیان ئۆتۆمبیلی زرێپۆش و چەک لەسەر، یاوەری دەبوون و پاسەوانیان دەکرد. ئەو پاسەوانە ژنانە، تەنها لەو بۆنە و کۆڕ و کۆبوونەوانەدا بەدیار دەکەوتن، کە میدیاکاران بۆنەکانیان دەگواستەوە، لە لیبیا و لە دەرەوەی لیبیا. هەرگیز قەزافی پاسەوانی ژنی لەگەڵ نەبووە، کە هاتۆتەوە زێدی خۆی، یان لە بۆنەیەکی کۆمەڵایەتیدا بەشداری کردبێ دوور لە زوومی کامێرا. لە دوو دەیەی یەکەمی حکومڕانیدا، دەزگای هەواڵگریی و سیخوڕی یەکێتی سۆڤیەت، پاسەوانی پشت پەردەی قەزافی بوون ـ ئەمە لە بەڵگەنامەکانی یەکێتیی سۆڤیەتدا تۆمار کراوە.

زۆربەی دەروونناسان، کۆکن لەسەر ئەوەی کە قەزافی، وەک زۆر سەرکردەی دیکە، نێرجسیەتی هەبووە، حەزی کردووە، سەرنجی خەڵک بۆ لای خۆی ڕاکێشێ. دیارە ئەویش چەند ئامرازێکی بۆ ئەو مەبەستە داهێناوە، هەروەک چۆن ئەوانی دیکە، بە

دارعەسا و شەپقە و چرووت و پایپ و  ئاماژەی دەست و پۆشاک و ئۆتۆمبیل و نوکتە و تەنز و خانمەکانیان ....تاد.، هەوڵیان داوە خۆیان نیشان بدەن.

دوو تێبینی:

دوای ڕووداوەکانی (١٧)ی شوباتی (٢٠١١) و کوژرانی قەزافی، کەس نازانێ ئەو (٤٠٠) پاسەوانە ژنە چیان لێ بەسەر هات؟ بۆ کوێ چوون؟ لە کوێنە؟ تەنها دوو ژن، بۆ ماوەی چەند دەقیقەیەک لە دوو کەناڵی تیڤیدا قسەیان کردوە دواتر، ئەوانیش لەبەرچاوان نەمان. هێندێ بۆچوون هەیە، کە کەلتووری خێڵەکیی عەرەبەکانی لیبیا، ڕێنادە، ژن بکوژن تەنانەت ئەگەر لە بەرەی نەیارانیش بن.

تێبینی دووەم: لە ڕووداوەکانی بەهاری عەرەبی، لە تونس، میسر، سوودان، یەمەن، سوریا، ژنان شان بە شانی پیاوەکان، بەشداریان کرد لە ڕاپەڕینەکاندا و بوونە قوربانی و زۆریش زامدار بوون و گیران. بەڵام بە درێژایی (٧) مانگی ڕاپەڕینی خوێناوی لە لیبیا، یەک تاقە ژن بەشداری نەکرد و لە ماڵ نەهاتەدەر، بە ژنە ئیسلامییەکانیشەوە!

ڕۆژنامەوانیکی فەڕەنسی دەنووسێ:"چونکە ژن، لەسەردەمی قەزافیدا کۆیلە بوون، بەشداری ڕاپەڕینان نەکرد."

منیش دەڵێم:' لە کاتی ڕاپەڕین، کۆیلەکان یەکەم کەسن سینگی خۆیان دەدەنە بەر گولـلە، چونکە غەردیان لێکراوە و دەیانەوێ تۆڵەی خۆیان بکەنەوە. کەواتە وانییە. ئەو ژنە لیبییانە، بە درێژایی مێژووی لیبیا، ئەو ئازادی و کەسێتییە متمانپێکراوەیان، نەدراوەتێ، کە قەزافی بۆی فەراهام کردبوون . لە (١٩٩٤) بۆ (٢٠٠٥) بە قەراری قەتعی نەمبیست، تاقە ژنێک لەو وڵاتە کوژرابێ! بەبێ ڕەزامەندی ژنی یەکەمیش، کەس نەیتوانیوە ژنی دووەم بێنێ، ئەسڵەن، لە لیبیا، ژنی دووەم زۆر زۆر کەم بوو. ژنی سێیەم و چوارەمیشم نەبیستووە. لەوێ، تەڵاقدانیش هێندە کەم بوو وەک نەبێ وایە!

## (٥٣)

# پۆشاکی قەزافی

لە کتێبی (پۆشاکی کۆییانە ١٩٠٠ ــ ٢٠١٦)، زۆر بەوردی لێکۆڵینەوەی ئەکادیمییانەم لەسەر زۆربەی لایەنە دیار و شاراوەکانی پۆشاک کردووە، لە دوو بڕگەی تایبەتدا بە (کەلتوور و پۆشاک وە پۆشاک و کەسێتی)، ناڕاستەوخۆ، ئاماژەی بۆ پۆشاکی کەسێکی وەک قەزافی تێدایە. لەو بڕگانەدا هاتووە:"پۆشاک وزەیەکی شاراوەی تێدایە کە کاریگەری لەسەر پۆشاکپۆش و کەسانی غەوارە و غەریبش هەیە. کەلتووری نەتەوەکان دەستنیشانکەری جۆری پۆشاکن. لاسایی کردنەوەی پۆشاک، میراتێکی بەجێماوی بابوباپیرانە و پیرۆزیی و شکۆدارییەکەی ڕێزیان لێدەگیرێ. پۆشاک وەک چۆن گوزارشت لە ناسنامەی نەتەوە دەکات، بەهەمان شێوەش ناسنامەی پۆشاکپۆش بەدیار دەخات. لە پۆشاکدا هزر و ڕۆشنبیرەیی و بۆچوونەکانی کەسەکە دەخوێندرێتەوە. کە باس لە ناسنامەی پۆشاک دەکەین، دەبێ ئەوە لەبەرچاو بگرین کە پۆشاک خاوەن هێز و ئیرادەیەکی مەزن و کاریگەرە و زۆرجار دەسەڵاتی خۆی بەسەر جومگەی دەسەڵاتدارەکانی دیکەی کۆمەڵگادا دەسەپێنێ. پۆشاکە سادەکەی مهاتما غاندی(١٨٦٩ ــ ١٩٤٨)، ئاڵای یاخی بوون بوو دژ بە کۆلۆنیالیزمی داگیرکەری ئینگلیزی. ڕەنکۆچۆغەڵی کوردی، تا ساڵی (١٩٥٨) سیمبوڵی خەبات و کوردایەتی بوو. پۆشاکی گیڤارا (١٩٢٨ ــ ١٩٦٧) بوو بە ڕەمزی خەباتی چەپەکانی جیهان. ڕەنگی پۆشاک، شێوازی بڕین و دیزاین و دوورینی، کەرەستەی خاوی پۆشاکەکە، بۆنەکەی تێیدا دەپۆشرێ، هەموو ڕەمز و واتای خۆیان هەیە. لەچکەکەی ژنیا ئامینی، بووە ڕەمزی ڕاپەڕینی خەڵکی ئێران لە ئەیلوولی (٢٠٢٢) دا.

خوێندەوەی دەروونناسە بۆ پۆشاک لە دوو جەمسەرەوە کاری خۆی دەکات، لە قەلب و قالبی خودی کەسەکە وە لە هەڵسەنگاندن و تێگەیشتنی چاوی بەرانبەرەکەی."

بە گوتەی هاوەڵ و هاوپۆلەکانی قەزافی، ئەو زاتە هەر لە هەرزەییەوە، خوو و حەز و ئارەزووێکی تایبەتی بۆ پۆشاک هەبووە، بە گوتەی وان، ئەو هەمیشە لەگەڵ تێکڕای

هاوپۆلەکانی جیاواز بووە لە پۆشاک پۆشینی، لە قۆناغی ئامادەیدا بە (کورە پانتۆڵ ڕەشەکە)، ناسرابوو.

تا دە پانزدە ساڵ دوای کودەتاکەی، قەزافی پتر هەر پۆشاکی سەربازی دەپۆشی و جلکوبەرگی ئاسایی بوو، دواتر وردە وردە، پۆشاک بووە، ئامرێزێکی کاریگەری ئەو بۆ خۆنیشاندان و خۆنمایشکردنی سەرنجڕاکێشەرانە، تا وای لێهات پۆشاک و پاسەوانە ژنەکانی، بوون بە بەشێک لە کەسێتیی ئەو زاتە.

دەربارەی پۆشاکی قەزافی، دەکرێ بڵێین: ئەو هەرگیز بە گۆترە ئەو پۆشاکانەی هەڵنەبژاردووە. دیزاین و ڕەنگ و شێوازی درووینەکان لەسەر خواستی خۆی بووە. پۆشاکەکانی ڕاستەوخۆ پەیوەست بوون بەو بۆنەی کە تێیدا ئامادەبووە. هەر پۆشاکەی، لە جێگەی خۆیدا هەڵگری پەیامێک بووە مەرامێکی لە پشت بووە. نابێ ئەوەش فەرامۆش بکەین کە زۆربەی دیزاینی پۆشاکەکانی دەچنەوە سەر کەلتووری نەتەوەیی لیبیا و کۆمەڵگاکانی ئەفریقیا.

وەک چۆن، پاسەوانە ژنانەکان، تەنها لەو بۆنانە بەدیار دەکەوتن و یاوەری قەزافی بوون، کە کامێرای میدیاکاران بۆنەکانیان تۆماردەکرد و دەگواستەوە، بەهەمان شێوە، ئەو پۆشەکە سەرنجڕاکێشەرەکانی هەر لەو بۆنانەدا دەپۆشی. ئەو هەر بە پۆشاکی میللی خۆیانەوە، لەگەڵ خەڵکی عەوامی لیبیا دادەنیشت و هیچ جیاوازییەکی نەبوو لەگەڵ شێخی هۆزەکاندا.

لە کۆڕ و کۆبوونەوەکانیدا، بە تایبەتی لەگەڵ سەرکردە و مەلیک و حاکمەکاندا، هەمیشە بە پۆشاکێکی جیاوازەوە دەرکەوتووە، شێواز و دیزاین و ڕەنگ و پۆشینەکەی لەگەڵ ئێکسیسوارەکان، هەڵگری مانای خۆیان بوون:

لە بۆنە سەربازیی و نەتەوەییەکانی ناوخۆدا، پۆشاکی سەربازی لەبەر دەکرد، بە چاوێلکە و کڵاو و دارعەسای دەستییەوە بە دیار دەکەوت. نەخشە و ئاڵای ئەفریقیای لەسەر سینگی خۆی دەدا، کە دەچووە کۆبوونەوەکانی یەکێتیی ئەفریقیا، تا وەک مەلیکی مەلیکان دەرکەوێ.

کە پێشوازی لە باراک ئۆبامای سەرۆکی ئەمریکا کرد، پۆشاکەکەی ئەفریقیانە بوو لە ڕەنگی سەربازییدا، وەک بڵێی، کەسێتیی سەربازیی خۆی نیشان بدا. لە کۆبوونەوەی دا

لەگەڵ سەرکردە و مەلیکەکانی عەرەب، وێنەی هەموو سەرکردە قارەمانەکانی لەسەر کراسەکەی نمایش دەکرد، وەک ئەوەی پێیان بڵێی، ئێوە، وەک جەمال عەبدولناصر، سەرکردەی قارەمان نین. کە سەردانی ئیتاڵیای کرد، وێنەی شەهید عومەر موختاری لەسەر دڵی خۆی دانابوو، کە ئیتاڵییەکان لە ساڵی (١٩٣١) دا لە سێدارەیان دا، وەک پەیامێک، کە منیش نەوەی ئەو شەهیدەم و وا جارێکی دیٚ بە زیندووی دمانبیننەوە.

ئەو هێندێجار، دژی خانەخوێ، بە پۆشاکەکەی پەیامی خۆی دەگەیێنێ. لەگەڵ سەرکردە و مەلیکەکانی ئەفریقیا دادەنیشێ، بەڵام وێنەی هەموو ئەو جەنگاوەرە شەهیدکراونەی ئەفریقیای لەسەر پۆشاکەکەیدا نمایشکردووە، کە بەدەستی ئەو سەرکردە و مەلیکانە شەهیدکراون، بۆ نیشاندانی پاڵپشتیی خۆی بۆ جەماوەری یاخی بووەی ئەو وڵاتانە.

بەڵام لە سەردانی بۆ فرسای لە فەرنسا، پۆشاکی دروستکراوی لە فەرو و کەوڵی گای پۆشی بوو، تا لەگەڵ کەلتووری وان بگونجێ.

قەزافی جگەرەکێش نەبوو، بەڵام لە هێندێ بۆنەدا، لاسای گیڤاراى دەکردەوە، تا وەک شۆڕشگێڕ خۆی نمایش بکات. بەڵام لە هۆڵی نەتەوە یەکگرتووەکاندا لە ساڵی (٢٠٠٩) وە لە دانیشتنی لەگەڵ ڤلادمێر پووتنی سەرۆکی ڕووسیا، لە ساڵی (٢٠٠٨)، هەمان پۆشاکێکی کەسکی میللیی لیبی پۆشی بوو.

سەرەڕای ئەوەی کە کاڵا و قوماش و کەرەستەکانی ئەو پۆشاکانە نرخیان گران بوو و ذیزاینەر و بەرگدرووەکان، کە زۆربەی غەیرە لیبی بوون، هەقدەستی خەیاڵیان وەردەگرت، قەت لە هەڵسەنگاندنی ساڵانەی نێودەوڵەتی بۆ پۆشتەترین و ڕێکوپێکترین پۆشاکی سەرکردەکانی جیهان، نەک پلەی باشی وەدەست نەدەهێنا، هەمیشە لە ڕیزبەندی (١٠) پۆشاکە ناڕێک و نابەدڵەکان، ناوی دەردەچوو، وەک ئەوەی ساڵی (٢٠٠٠).

قەزافی کوژرا، بەڵام دەکرا، ئەو میراتانەی ئەو، بۆ نەوەکانی داهاتووە، ببنە مایەی داهات و دەستکەوتیی ماددی باش. بە نمایشکردنیان لە مۆزەخانەکان و پاراستنیان لە کەلتوورخانەی نیشتیمانی خۆیاندا تا گەشتیار و گەریدە و میوانانی بیانی و ناوەخۆ سەردانی بکەن.

## (٥٤)

## (٣) قاتیلەکەی لیبیا: ئۆتۆمبیل ــ ماددەی هۆشبەر ــ دەریا

بە ڕێژەیەکی زۆر بەرز خەڵکی لیبیا خاوەن ئۆتۆمبیلن، لەبەر ئەوەی بەگشتیی، باری بژێووی و گوزەرانیان باشە، وڵاتەکە زۆر بەرفراوانە و ئاوەدانی و خانووەکانیان پەرش و بڵاون و سیستمی گواستنە و هاتووچۆی دەوڵەت ژێرخانێکی تۆکمە و پێشکەوتووی نییە و کەلتووری خێڵەکیی پتر مەیلی لەگۆشەگیریی و سەربەستیی خۆی هەیە. ڕێژەی ئۆتۆمبیلی مودیل نوێ و باشیشیان بەرزە. لە (کتێبی سەوز)دا قەزافی دەنووسی:"ئۆتۆمبیل ئامرازێکی پێویستیی خێزانە کە دەبێ هەموو خێزانێک هەیبێ."

گەرچی داتا و ئامارێکی متمانەپێکراوی فەرمیم بۆ ڕێژەی ڕووداوەکانی هاتووچۆ، لەو وڵاتەدا لەبەر دەست دانییە، بەڵام، دەتوانم، دەربارەی ساڵانی نێوان (١٩٩٤ بۆ ٢٠٠٥)، بە تەخمینکراوی بڵێم، ڕێژەی ڕووداوەکان هێندە بەرزە، لە هەر (٥) خێزان، سێیان قوربانیان داوە و هەیە پتر لە یەک قوربانی!

لە دیوەخانێک دانیشتوویت، یەکێک دێ و خەبەری ڕوودانی پێکدادانی دوو ئۆتۆمبیلی پێیە، دەڵێ:

ــ مەسعود خەلیفەی فرجانی لە گەڵ سالم جابری شەیبانی لە فلان شوێن پێکیان داداوە.

ــ سەلامەتن ئینشائەڵلا؟

ــ هەر ئاسن بەر ئاسن کەوتووە، لە خودا بەزیاد بێ.

زۆر گرینگە لە ڕووداودا، بزانرێ کەسەکان سەر بەکام خێڵن، ئەگەر ئۆتۆمبیلەکان بسووتێن و ببنە سیکراپ، ئەوان دەڵێن، هیچ نییە ئاسن بەر ئاسن کەوتووە، ئەگەر قوربانیشی لێبکەوێتەوە، یەکەم پرسیارێیان لە ناوی نەخۆشخانە و بەخاک سپاردن و شوێنی پرسەکە دەبێ. بوون بە قوربانی شتێکی ئاساییە و بایەخی پێنادەن و بە قەزا و قەدەری لە قەڵەم دەدەن.

بۆچی ئاستی ڕووداوەکان، وا بەرز و ترسناکە؟ هۆکارەکان زۆرن:

له پێش هەموویان، یاسای هاتووچۆ، تەنها لەسەر کاغەز بوونی هەیە، داب و نەریتی خێڵەکی یاسای کارپێکراوی حەقیقیی ئەو وڵاتەیە. بەڕێوەبەرایەتیی هاتووچۆ، هیچی لەدەست نییە و ڕادەستی سولحی خێڵەکیت دەکات. بە تیژڕەوویەکی زۆر خێرا لە داواوە، لە ئۆتۆمبیلی منیان داوە و خودا لە مردن ڕزگاری کردووم و هیچ بێ یاسایی و خەتایەکم نەبووە، ئەوجا پۆلیسی هاتووچۆ پێم دەڵێ، بڕۆن بۆ خۆتان پێک بێن، دەنا گەر داوا تۆمار بکەی، تا (٦) مانگی دیکە کەس لێی ناپێچێتەوە، ئەو جگە لەوەی هەموو ئەو هۆزە دەبنە ناحەزت!

سولحی نێوان دوو کەس، کە پێکدادانیان کردووە، لە چوارچێوەی هۆزدا بەڕێوەدەچێ، واتا ئەگەر، هۆزی فرجان، کەتنکەرەکەی هۆزی شەیبانی ببەخشت کە قوربانیشی لێ کەتووەتەوە، ئەوا سبەینێ، هۆزی فرجانیش کە کەتنێک بە ئۆتۆمبیل دەکات دەبێ هۆزی شەیبانی ببەخشێ، جا هەر کەسێک بێ لەو هۆزە. ئەوە بووەتە هاندەر، کە شۆفێر پێشوەخت دەزانێ، هەر شتێک بکات، خێڵ لێیخۆش دەبێت و هیچ سزایەکی یاسایی نایگرێتەوە.

ڕێگای نێوان شارەکانیان زۆر دوور و درێژە، تەرابلس بۆ بەنغازی، بۆ نموونە (١٠٠٠) کیلۆمەترە، زۆربەی ڕێگاکان جووت ڕێگا نین. جا چونکە یاسای هاتووچۆش شلۆقە، ئەوا شۆڤێرەکان بەو ئۆتۆمبیلە مۆدێل نوێیانە زۆر تیژڕەون. تەنانەت گەنجەکانیان، لەو ڕێگا دووروودرێژانەیان، کە زۆربەیان هێڵێکی ڕاست و ڕێکن، بێ پێچ و لۆفە و هەوراز و نشێو، لە جیاتی ئەوەی قاچیان لەسەر ڕکێفی بەنزین بێ، خشتە کەرپووچێکی دەخەنە سەر و قاچیانی لێ درێژدەکەن و گوێ لە گۆرانی دەگرن... !

لەوەش گرنگتر، مۆڵەتی شۆفێری، لە ڕێی دۆستایەتی و ناسیاوی و واستە و دیاری، بەهاسانی وەدەست دێ و لایەنە زانستی و تەکنیکی و کارامەیی پەیڕەوناکرێ. لە ڕووداوێکدا، بە شۆفێرەکەمان گوت، خەتا لە تۆیە چونکە بە چرای دەستە چەپ، ئاماژت نەدا کە بۆ لای چەپ بادەدەیتەوە، گوتی: جا خۆ شەو نییە، چرای بۆ چییە!

وەک گوتمان، چونکە خانووەکانیان لەو دەشت و دەر و سارایە، لێک دوورن و پەرش و بڵاون، ئەگەر شۆفێر بۆی نەکرێ شۆفێری بکات ئەوا ژن و منداڵ بە ئاسایی بەبێ ڕاهێنان

و مۆڵەت، شۆفێری دەکەن، ناچاران، چونکە بەبێ ئۆتۆمبیل کاری ڕۆژانەیان بۆ مەیسەر نابێ، ئەمەش هۆکارە بۆ ڕوودانی هاتووچۆ.

نۆژەنکردنە و چاککردنی ڕێگا و بانە تێکچووەکانیان، زۆر بە خاوخلیچکی بەڕێوەدەچێ، جاربووە، بە هۆی چاڵێکەوە شەش حەوت کەس بوونتە قوربانی لە شەش حەوت ڕووداودا لە هەمان جێگادا.

دوو هۆکاردیکەش هەن، کە ساڵانە، قوربانی زۆریان لێدەکەوێتەوە: لەو ڕێگایانەی بە نێو سارا و بیابانەکاندا دەڕۆن، لە کاتی پەڕینەوەی قەتاری وشتران، چونکە ئۆتۆمبیلەکان زۆر تیژڕەون، پێکداداان ڕوودەدەن و هەمیشە قوربانییان لێدەکەوێتەوە، بە تایبەتی بە شەو کە وشترەکان لەسەر ڕێگاگان یخ دەبن و پاڵدەکەون. هۆکاری دووەم، ڕەشەبای گیبلییە، کە وادەکات تۆزوخۆڵ مەودای بینین بکاتە کەمتر لە دوو مەتر و جادەکان بە زیخ و لم تەواو دادەپۆشی و ڕووداوی زۆری بەدوا دادێ.

قەزافی، گرێبەستێکی گەورەی لەگەڵ کۆمپانیاکانی ڕووسیا واژوکردبوو، بۆ بەستەوەی شارە گەورەکانی لیبیا بە هێڵی شەمەندوفەڕ، بەڵام بەسەردا کوژرا.

ڕەنگ بێ ئاماریی قوربانیانی ئاڵوودەبوون بە ماددەی هۆشبەر، کەمتر نەبێ لە قوربانییەکانی ڕووداوی هاتووچۆ. سنووری لیبیا، بە درێژای مێژوو هەر واڵا بووە، هیچ دەسەڵاتێک نەیتوانیوە نزیکەی(٧٠٠٠) کیلۆمەتر سنووری دەریا و بیابان و سارا کۆنترۆڵ بکات. لە لایەکی دیکە وڵاتە بەرهەمهێنەرەکانی ماددەهۆشبەرەکان، وەک مەغریب و باشووری لیبیا، دەرودراوسێن و نزیکن. ئەوا جگە لەوەی نە خەڵکەکە هۆشیاریی ڕۆشنبیرییان هەیە و نە دەوڵەتیش یاسای توندوتۆڵ و ڕێگریی بۆ ئەو ئافاتە مەترسیدارە دەرکردووە. لە زۆربەی وتارەکانیدا قەزافی، لەو بارەیەوە هەر یەک، قەوان دووبارە دەکاتەوە:"یاساکان جێبەجێ بکەن، بیانگرن، سزایان بدەن، چیبکەین؟ ئەو ئافاتە ئافاتێکی جیهانییە، نەک هەر لیبیا، وڵاتە زل هێزەکانیش پێوەی دەناڵێنن." من بۆ خۆم چەندان جار گوێم لەو وتەیە بووە!

ماددەهۆشبەرەکان بە هەموو جۆرەکانییەوە، لە نێو خوێندکارانی ئامادەیی و پەیمانگا و زانکۆکان ـ بە کوڕ و بە کچەکانیشەوە، بەکار دەهات و مامەڵەی پێوەدەکرا. من بەڕێوەبەری ئامادەییم بینەوە، کوڕەکەی دەبردە لای پزیشکی پسپۆڕی ئەو نەخۆشییانە. بەداخەوە،

مەڵبەند و نەخۆشخانەکانیش، بۆ چارەسەری ئاڵوودەبووەکان، لە ئاست ئەو پەتایە پیسە نەبوون و خزمەتگوزارییە تەندرووستییەکانیان زۆر هەژارانە بوون.

خەڵکی لیبیا، چونکە بەدووو و دەشتەکین، پتر ڕوو لە دەشت و دەرو سارا دەکەن، بەڵام ئەوانەی لە کەنار دەریای سپی ناوەندن، بە تایبەتی هاوینان و وەرزی گەشت و سەیران، بۆ مەلە کردن خۆیان بەو دەریایە دادەدەن. مامۆستا تەحسینی هاوڕێم دەیگوت:"ماشەڵا، نە لیبییەکان حەزیان لە دەریایە، نە دەریاش حەزی لە چارەی وانە!" ساڵ نییە، ژمارەیەکی بەرچاو لەو مەلەوانانە لەو ئاوەدا نەخنکین. بەداخەوە، دەوڵەت، شوێنی گونجاوی بۆ مەلەکردن دەستنیشان نەکردە و لەو جێگایانەی مەلەی تێدا دەکرێ، پۆلیسی فریاگوزاری و بەلەم و کەرەستەی فریادڕەسی زۆر بەدەگمەن دەبینرێ، بۆیە قوربانییەکە جار هەیە، کەسی فریادڕەسیش لەگەڵ دەخنکێ.

خۆم شایەدحاڵی ئەم ڕووداوە بووم، لە گەشتێکی بەهاری قوتابخانەیەکدا، لە کەنار شاری سرت، خوێندکارێک خنکا بۆ ڕزگارکردنی دوو سێ کەسیشی لەگەڵ خنکا، یەکێکیان باوکی خوێندکارەکە بوو.

# (٥٥)

## میدیا و ڕۆژنامەوانی

ئەوەی من بینینم ئەو دووانە حاڵیان پەریشان بوو، کێشەکە هەر ئەو نەبوو، کە تێکرای دامۆدەزگاکانی میدیا و ڕۆژنامەوانی لە پێناو خزمەتکردنی بیر و فەلسەفە و گوتاری تاکڕەویی قەزافی دابوون، بەڵکوو جۆری ئامێر و کەرەستە و بەرنامە و ناوەڕۆکەکانیشیان کرچ وکاڵ و لاواز و کەم بایەخبوون.

بۆ نموونە، تاکە کەناڵێکی تیڤی هەبوو، بە ناوی ڕەنگ و دەنگی لیبیا، بە پێچەوانەی هەرچی کەناڵی تیڤیی جیهانی هەیە، لۆگۆیەکەی لە گۆشەی دەستە ڕاستی خوارەوەی سکرینەکە، یەک لەسەر هەشتی رووبەرەکەی داپۆشی بوو، کە بریتی بوو، لە نیوە خۆرێک لەسەر نووسرا بوو جەماهیرییەی لیبیا. ستۆدیۆییەکانی تاریک و تنوک بوون، زۆربەی پێشکێشکارەکان، لە پۆشاکی میللییدا کەمخولق و بێ مەیل بەدیار دەکەوتن. هەموو سەرە سەعاتێک پێش دەنگوباس، پێنج دەقیقە دەقی چەند بڕگەیەک لە کتێبی سەوز دەخوێندرایەوە، دەنگوباسەکانیش هەر (٣) بابەت بوون، قەزافی و کۆڕ و کۆبونە و سەردان و وتارەکانی، هەواڵەکانی فەلەستین، ئەوجا هەرچی دەنگوباس لەو جیهانە هەیە دژ بە ئیمپیریالیزم و ئەمریکا. دیزاینی و دیکۆری ستۆدۆیەکەش هەر نەخشەیەکی کەسکی جیهان بوو، هەڵواسرابوو. دوای خوێندنەوەی هەواڵ، دیسان دەگەڕانەوە سەر شتیەڵکاری و ڕاڤەکردنی دەقێکی کتێبی سەوز. وتار و شیتەلکاریی هەواڵەکانیان زۆر سادە و ڕووکەش بوو. لە مانگی ڕەمەزانان، بەرنامەی میللییان پەخش دەکرد، دەنا هەر سروود و گۆرانی میللی و چەند بەرنامەیەکی ساکار بوون، ڕۆژانە چەند بارە دەکرانەوە. شەوان هەواڵەکانیان بە زمانی ئینگلیزی و فەرەنسیش پەخش دەکرد. لە گرتەکانیاندا، هەر یەک گرتە بۆ هەموو دەنگوباسێک بوو، بۆ نموونە، سێ ساڵ بۆ شەڕی ناوخۆی یەکێتیی نیشتیمانی و پارتی لە باشووردا، گرتەی ئەو دوو سێ دۆشکەیان نیشاندەدا، کە لەسەر هەیبەسوڵتانیەوە، بە دیوی چنارۆکی، ئەو پێدەشتەی بیستانەیان دەڕشاند... .

لیبییەکان، بۆ خۆیان گلەیی زۆریان لە میدیا هەبوو، تەنانەت وەک نوکتەیەک دەیان گوت، هاوولاتییەکی لیبی، لە فەرنسا سەرپێچییەک دەکات و پۆلیس سزایی ئەوەی بۆ دەبڕێتەوە کە دەبێ سێ شەو و سێ ڕۆژان لە ژووریکدا بەدیار کەناڵی تیڤی لیبییەوە دانیشێ، وەک تەعزیبێک!

بە گوتەی کتێبفرۆشێک، ڕۆژانە لە (٪۹۰)ی ڕۆژنامەکان، دەگەڕێندرێنەوە بۆ دەزگاکانیان، ئەو لە (٪۱۰) یەش، لاوەکان بۆ هەواڵی وەرزشی دەیکڕن. ڕۆژنامە سەرەکییەکانیان ئەو سێیانە بوون: (الجماهيرية، الزحف الاخضر، الشمس). لە لاپەڕەی یەکەمیان تا دوا لاپەڕە، هەموو تەرخان کرابوون، بۆ خزمەتکردنی هزری شۆڕشگێڕیی قەزافی. بە ئەمانەتەوە، دەڵێم، ئەوەندەی من لە لیبیا بووم، جارێک، نەمدی مامۆستایەک، قوتابییەک، لاوێک، فەرمانبەرێک، کەس کەس ڕۆژنامەیەکی بە دەستەوە بێ و لە هیچ شوێنێک نەمدی ڕۆژنامە داندرابێ، تەنانەت لە لای سەرتاشەکانیش. ڕۆژنامەی تایبەت بە چین و توێژێکی دیاریکراوی وەک خوێندکار، کرێکار، مامۆستا، منداڵم... قەت نەکەوتە بەرچاو.

لە تەرابلس، کتێبخانە و ڕۆژنامەفرۆش هەبوون، بەڵام لە سرت، نەبوون، تەنانەت کتێبخانەی گشتیشم نەبینی. لە کاتێکدا، ئەو قوتابخانەی کە قەزافی لە ئامادەیی دەرسی تێدا خوێندبوو، کرابوو بە مۆزەخانە، بەڵام هەمیشە دەرگای قوفڵی پێوە بوو، کە دەبووایە بیکەن بە کتێبخانە بۆ شارەکە.

کاتێک کوڕەکانی، هاتنە سەر گۆڕەوپانی سیاسی و بازرگانی، وەک گەنج، ویستیان گۆڕانکاریی لە میدیای لیبیادا بکەن، ئەوان سەفەری وڵاتانیان کردبوو و میدیای وڵاتە پێشکەوتووەکانیان بینی بوو. ئەوە بوو لە ساڵی (۲۰۰٦) سەیف ئەل ئیسلام، کە سەرپەرشتیی دەزگای خێرخوازیی قەزافی دەکرد، ویستی چاکسازییەک بکات، دوو ڕۆژنامەی دەرکرد بە ناوەکانی (ئۆیا وە قۆرینا) و چەند کەناڵێکی تیڤی ئاسمانی و چەند ماڵپەڕێکی ئیلکترۆنی کردەوە. ڕۆژنامەکان وازیان لە بەکارهێنانی زمان دەسەلات و ڕژێم هێنا، بەرنامەکانیان فرە بابەت بوون، جۆری چاپ و کاغەز و دیزاینەکانیان سەردەمییانە بوون و نرخەکەشیان هەرزان بوو. خەڵکەکە، بە دڵخۆشییەوە پێشوازیان لێکرد و بۆ یەکەمینجار کۆتی میدیای ڕژێم شکێندرا و جۆرە ئازادییەک فەراهەم کرا. بە تایبەتی کە

ئەو پڕۆژەیەی ناویان لێنابوو (دەزگای سبەینێ بۆ ڕاگەیاندن)، کە ڕەخنە و توانج و پێشنیار و چاکسازییان کردبوە دروشمی خۆیان و دژی بیرۆکراتی و حیزبایەتی و گەندەڵی ئیداریی بوون. بەڵام کاتێک قەزافی، هەستی کرد، ئەوانە ڕکابەری میدیا تاکرەوەکەی ئەون، وردە وردە دێ، پەراوێز بخرێنت، بڕیاریدا، کە هەموو میدیای لیبیا خۆماڵی بکرێت و نابێ کەرتی تایبەت خاوەن میدیایی خۆی بێت. بەوە ئەو چرایەش خامۆش کرا و ڕەوتی چاکسازیی گورزێکی کووشندەی بە قەپرغە کەوت.

## (٥٦)

## زمان

کۆنترین زمان لە لیبیا و بەشێکی زۆری باکوور و باشووری باکووری ئەفریقیا، ئەمازیغیی بووە. ئەویش کە تێکەڵەیەکە لە زمانەکانی ئەکەدی و بابیلی و ئارامی و میسری دێرین، ئەمازیغییەکان نزیکەی پێش (١٢) هەزار ساڵ لەو مەفتەنەدا ژیاون. تەواریقەکان، هۆزێکی گەورەن، دەچنەوە سەر ئەمازیغییەکان، لە وڵاتانی مالی و تشاد و مۆریتانیا و سوودان بڵاوبوونەتەوە. تەواریقەکان حەزناکەن بەو زاراوە ناویان بێنن، دەڵێن ئێمە ئەمازیغین، ناحەزان دەیانەوە لێکمان بکەن تا لاواز و پەرتەوازە بین. زمانی ئەمازیغی خاوەن ئەلفوبێی خۆیەتی پێیدەڵێن ئەلفوبێی (تیفیناغ). لەگەڵ دەستپێکی کۆچی عەرەبەکان لە نیوەدورگەی عەرەب و دۆڵی دوو ڕووبار و ناوچەی شام، هێندێ هۆزی عەرەب ڕوویان کردە ناوچەکانی لیبیا، دوای هاتنی ئایینی ئیسلام، وردە وردە ئەو زمانە نوێیە، چونکە زمانی دەسەڵات بوو، جێگەی بە زمانی ئەمازیغی لەق کرد. هەموو ئەو دەسەڵات و ڕژێم و ئیمپراتوریەتانەی حکومڕانی ئەو ناوچانەیان کرد، بەربەرەکانی ئەمازیغییەکانیان دەکرد، تا وای لێهات بوون بە کەمینە.

تا ساڵی (١٩٣١)، لە (٥٢٪) حەشیمەتی لیبیا بە زمانی ئەمازیغی قسەیان دەکرد. قەزافی، ئەوانی وەک نەتەوەیەکی جیا نەدەناساندن و بە دروستکراوی ئیمپریالزمی دەزانین، نەک هەر خوێندن بە زمانی ئەمازیغی قەدەغە بوو، نەدەبوو منداڵەکانیشیان بە وشەی ئەمازیغی ناوبنێن و پێشیان دەگوتن (طەواریق). لە دیوەخانێک دانیشتبووین، پیرەمێردێک پرسی: "ئەو کوردانە کێنە؟ بۆ من ناوم نەبیستوون؟" بەڕێوەبەرەکەم گوتی: "مامە، ئەوانە، وەک (طەواریق)ەکانی لای خۆمانن، لە عێراق و ئێران و تورکیا و سوریا دەژین."

بێگومان زمانی عەرەبی زمانی فەرمی لیبیایە، ئەم زمانەش لە چەندان زار و بنزار پێکهاتووە. لە فەرهەنگی زماندا، عەرەبیی لیبیا پێدەگوترێ شێوەزاری لیبی، چونکە قامتێک خەسڵەتی خۆی هەیە کە جیای دەکاتەوە لە شێوەزارەکانی عەرەبیی عێراقی و میسری و جەزائیری و کەنداو... . شێوەزاری عەرەبیی لیبی تێکەڵەیەکە لە عەرەبی فەسیح و

زمانەکانی ئەمازیغی و ئیتاڵی و تورکی... تاد. جا لە نێو سنووری لیبیاشدا، زارەکان جیاوازن، وەک زاری بەنغازیی، زاری تەرابلسی، زاری موسراتی، زاری سرتاوی... . زۆربەی زارەکان بەناوی هۆز و خێڵەکانەوەیە.

ئیمڕۆ، هێندی لە گەنجەکانیان، زمانی ئینگلیزیش دەزانن، پیرەکانیشیان زمانی ئیتاڵیان هەر لەبیرماوە.

بەگشتی، لە دیدی من و بە بۆچونی هێندێ لە زمانناسانی عەرەب، پاکترین و ڕەوانترین و خۆشترین عەرەبی فەسیح، لە جیهانی عەرەبیدا، ئیمڕۆ لە دەڤەری بەنغازی قسەی پێدەکرێ.

لە خەسڵەتە دیارەکانی شێوەزاری عەرەبی لیبی، ئەمانەن: وشە بە (مثنى : جووت) بەکار ناهێنن، یان تاکە یان کۆ، واتا ناڵێن (معلمان) دەڵێن (معلم یان معلمون). پیتی (ن) لەسەرەتای وشە لە جیاتی پیتی (ا) بەکاردێنن، دەڵێن (نرید) لە جیاتی وشەی (ارید). زۆر کەم ئەم دەنگانانەیان لێ دەبیستی (ظ / ض / ث/ ذ ) دەیانەکەنە دەنگی (د / س).

لە ئاخاوتیاندا، دەیان وشەی ئەمازیغی و ئیتاڵی و تورکی و ئارامی و هیندی و فارسیت دێتە بەرگوێ، ئەوا جگە لەو وشە عەرەبیانەی ئەوان سەروگێلاکیان شکاندوون و بوون بە شێوەزاری عەرەبی لیبی، وەکو:

اسماعین (اسماعیل)، جبرین (جبرائیل)، کشیک (کەوچک)، فرکیتا (چەنگاڵ)، کوجینا (ناندێن)، مرشا (شۆستە)، باهی (باشە)، بیاض (خەڵووز)، دهب (زێڕ)، تعلب (ڕێوی)، خشم (لووت)، دحی (هێلکە)، حوش (ماڵ)، شنی (چییە؟)، دار (ژوور)، لۆطه (ژێر)، علاش (بۆچی؟)، باش (تاوەکو)، دلاع (شووتی)، فیسع فیسع (خێرا خێرا)، کیفنک (چۆنی؟)، کمشه (کۆمەڵێک)، گراع (قاچ)، مرش (مریشک)، گاعد (هەیە)، اشبح(سەیرکە)، امداس (پێلاو)، هدرزه (گفتوگۆ)، شن الجو (چۆنی؟)، گعمز (دانیشە)، مور (بڕۆ)، هلبه (زۆر)، رۆشن (پەنجەرە)، موس (چەقۆ)، هابی (دەوڵەمەند)، لیم (پورتقاڵ)، نو (گەرم)، اهمد (وامەکە)، انراگی (چاوەروان دەکەم)، مهناش (لیرە نییە)، اشکون (کێ؟)، عساس (پاسەوان)، ماباش (نامەوێ)، بلعوط (درۆزن)، مکلوب (شێت و وێت)، سمح (جوان)، شین (ناشیرین)، بشویش (هێواش هێواش)، روب (ماست)،

فکرۆنه (کیسەڵ)، صونیه (دەفر)، راگد (خەوتوو)، خنب (دزی). لامبا (چرا)، گزاز (مینا)، کەربه (ئۆتۆمبیل)، حوت (ماسی)، بیرو (قەڵەم جاف)، سفنس (نانی زرۆبی)...تاد.
کیژۆڵە و ژن و منداڵەکانیان زۆرجار لە جیاتی ئەوەی بڵێن (نا ــ نەخێر)، لای ڕاستی لێویان خواردەکەنەوە و هەناسەیەک هەڵدەمژن، دەنگێک لە شێوەی مرچە درووست دەکەن و نەختێ شانیان هەڵدەتەکێنن.
لە پرۆگرامی خوێندن و لە ڕاگەیاندن و میدیاکانیاندا، زۆربەی هەر زۆری وشەی بیانیان، وەک (ڕادیو، تەلەڤزیۆن، سینما، تەلەفۆن، فاکس، مۆبایل... تاد) کردووەتە عەرەبی.

لە نووسینیشدا، تاکە وڵاتی عەرەبییە، کە لە پۆلی یەکی بنەڕەتییەوە، ڕێنووسیان بە (حەرەکاتە) واتە هەموو پیتێک، (شەددە، کەسرە، بۆر، فەتحەی)ی دەبێ لەسەر دابندرێ. واتا بەمشێوەیە: (أَ كِ تْ بُ). زۆربەی خوێندەوارەکانی لیبیا خۆشنووسن. چونکە مامۆستای پۆلی یەکی بنەڕەتی دەبێ (خۆشنووس - خەتات) بێ، دەنا نابێتە مامۆستای پۆل.

## (٥٧)

## کۆستی ڕەندی جوانەمەرگ، دۆزەخێک لە غەریبیدا

خوێندکاران و منداڵان، وەکو گەنج و ئەوانیدی، خوا خوایان بوو زوو ئەزموونەکانی کۆتایی ساڵ تەواو بێت و بگەنە ڕۆژی (٢٠)ی ئایاری (٢٠٠٠)، دەستپێکی یارییەکانی فوتبۆڵی جامی جیهانی. هەر چەند ڕۆژێک بوو ڕەندی ئەزموونەکانی پۆلی پێنجەمی بنەڕەتی و ڕەسەن هی پۆلی نۆیەمی بنەڕەتی تەواوکردبوو، ڕۆژانە ئەوان دەچوونە لای ئەحمەدی تاقانە کوڕی مامۆستا تەحسین، کە ئەویش هەر لە پۆلی نۆیەمی بنەڕەتی بوو، بۆ سەیرکردنی یارییەکان لە تیڤیدا.ماڵەکەیان، سێ کیلۆمەترێک، بەرەوە سرت، لە پێش ماڵی ئێمە بوو.

ئەگەرچی ڕۆژانە، بە ئۆتۆمبیل، خۆم ئەوانم هاتووچۆ پێدەکرد، نازانم چۆن بوو، ڕۆژی (٣١) ئایار کارێکی بازاڕم هاتە پێش و چوومە سرت. کاتێک لە دەوری نیوەڕۆ بەرەو ماڵ بوومەوە، لە نزیک ماڵی مامۆستا تەحسین ویستم ڕاوەستم و بزانم منداڵەکان چوونەتەوە یان نا، بەڵام چونکە دڵنیا بووم کە ئەوان بۆ نیوەڕۆ دەگەڕێنەوە ماڵی خۆمان و دەمزانی مامۆستا تەحسین زۆر تەکلیفی نانخواردنم لێدەکا، بۆیە، نە ڕاوەستام و نەهۆڕنێکم لێدا. لە ماڵەوە، دایکیان چاوەڕوانی گەڕانەوەیان بوو، جا چونکێ ڕەندی زۆر حەزی دەکرد بە پایسکلەکەی هاتووچۆ بکات، منیش بەدوایاندا نەچووم و گوتمان ئێستانا ئێستا دەگەڕێنەوە.

ئەو ڕۆژە دایکیان بەشە جەرگوناوی سوورکراوەی بۆ (ام محمود)ی هاوژینی مامۆستا کشکۆ، ئامادەکردبوو، چاوەڕوانی ئەوەبوو، وەک هەموو نیوەڕۆیەک، ڕەندی بگەڕێتە و بۆیان بیات.

کاتێک، ئەوان هەر نەگەڕانەوە، وامان لێکداوە کە مامۆستا تەحسین بە زۆر ئەوانی بۆ نانخواردن گیراوەتەوە، بۆیە نەگەڕانەوەی ئەوانمان بە ئاسایی زانی.

دەوری، سەعات یەک و نیو، محەممەدی دراوسێمان، کە هاوڕێی ڕەسەن بوو، بە پەلە لە دەرگای داو، پێراگەیاندین، کە ڕەندی لە نەخۆشخانەی ئیبن سینای سرتە و نەختۆکەک

زامدار بووه، ئۆتۆمبیلێک لە پایسکلەکەی داوە! هەرچەندی کردمان هیچی زانیارییەکی دیکەی نەداینێ!

من و دایکی ڕەندی وەک شێتان، خۆمان گەیاندە نەخۆشخانە... چیمان دێ؟ هەرچی، مامۆستا و دۆست و ناسیاو و خەڵکی ئاواییەکەیە، لەوێ خڕبوونەتەوە، مامۆستا عەبدولناصر و مامۆستا منداوی برام و مامۆستا تەحسین و برادەرانی دی، بە پەڕۆشەوە لە بەردەرگای ژووری پشکنینی ورد ڕاوەستاون، چاوەڕوانی هەواڵێکی خۆش دەکەن!

هەرچۆنێک بوو، خۆمان گەیاندە ڕەندی...

لەسەر قەرەوێلەیەک، ئەو بێزمان و بێهۆش درێژکرابوو، هیچ شوێنێکی زامدار نەبوو، بەڵام دیار بوو قاچی ڕاستەی شکا بوو. کاتێک لە پزیشکەکانمان پرسی، گوتیان، مێشکی لە جێگەی خۆی لەقاوە و چەند دەمارێکی ئازاری زۆریان پێگەیشتووە... هەرچەندی کردمان، هیچ زانیاریی دیکەیان نەداینێ.

کاتێک، خوشکم لە تەرابلس پەیوەندی کرد و داوامان کرد کە ڕەندی ببەینە دەرەوە، بۆ ئەڵمانیا یان هەر وڵاتێکی دیکە، پزیشکەکان، قبوڵیان نەبوو دەستی لێبدرێ.

چەند ئامێرێکی هەناسەدان و فشاریخوێن و ئەو شتانە بە دەم و لووتی ڕەندییەوە بوون و پەرستارێکیش بە سەریەوە بوو. دەمزانی سەعات دوای سەعات، باری تەندرووستی خراپتر دەبێ.

بەرەبەیانی (٢)ی تەمموز، ڕەندی ڕۆحی پاکی سپارد. چونکە تایەنی کچم، ئەزموونی وەزاریی پۆلی شەشەمی زانستی هەبوو، نەمانزانی بڕیاری چی بدەین، ئەوبوو، بە باشیان نزانی لە گۆڕستانی سرت بە خاکی بسپێرین و دواتر، بیگوازینەوە کوردستان.

بە هیچ وشەیەک، ناتوانم گوزارشت لە دژوواری و ناخۆشی و غەمگینیی ئەو ڕۆژگارە بکەم، هەر چوارمان، وەکو شێتانمان لێهاتبوو، جا چونکە ڕەسەن لەگەڵ ڕەندی بوو لە ساوەتەخی ڕووداوەکە و لەسەر کۆشی و باوەشی خۆی گەیاندرابووە نەخۆشخانە، باری دەروونی ئەو زۆر خراپ تێکچوو بوو!

لەبەر گریان و لە خۆدان و لەهۆشخۆچوون، نازانم چۆن گەیێندرایە مزگەوتی نزیک گۆڕستانەکە و چۆن بەخاکیان سپارد. خەڵکێکی یەکجار زۆر لەگەڵ جەنازەکە هاتبوونە

گۆڕستان. دەتوانم بڵێم ئەوەی فەڵەستینی و عێراقی لە سرت بوو، بە کورد و عەرەبەوە، هاتبوون.

بۆ ماوەی سێ ڕۆژان، لە تەنیشت ماڵەکەمان، دوو خێوەتی گەورەیان هەڵدا، یەک بۆ پرسەی پیاوان و یەک بۆ پرسەی ژنان. خەڵکێکی زۆر شەو و ڕۆژ بۆ سەرەخۆشی دەهاتن و لە دەورمان بوون.

شۆفیرەکەی ئەو ڕووداوەی لە دەست قەومابوو، مێردمنداڵێکی بنەماڵەی قەزافی بوون، کەس و کاری زوو هاتنە نەخۆشخانە و لە ناشتن و پرسەکە لەگەڵمان دانیشتن. بەڵام ئەو مێرمنداڵەی ڕووداوەکەی کردبوو، چونکە مۆڵەتی لێخورینی نەبوو، برایەکی گەورەتری، لە جیاتی ئەو چوو بوو خۆی ڕادەستی پۆلیس کردبوو.

محەممەدی دراوسێمان، کە تەمەنی (١٤)ساڵان دەبوو، وەکو ڕەسەنی کورڕم، ڕووداوەکەی بینین بوو، بەڵام خانەوادەی مێرمنداڵەکە، هەڕەشەیان لێکردبوو، کە دەبێ بڵێ، گیراوەکە، شۆفێرەکە بووە!

گەرچی ئێمە لەبەر خەمی ئەو کارەساتە جەرگبڕە، ژیانمان لێ بووە دۆزەخێکی حەقیقی و دونیامان لەبەر چاو تاریک بوو، کێشەیەکی خێڵەکی ڕوویدا. چونکە من مامۆستای قوتابخانەیەک بووم، لە نێو هۆزی فرجان، بەڕێوەبەرەکەشم هەر لەو هۆزە بوو، ئەوان خۆیان لە ڕووداوەکە کردە ساحێب و داوایان لێکردم کە هیچ تەنازول و شەرت و شروتێک لەگەڵ خانەوادەی شۆفێرەکە، بەبێ ڕەزامەندی وان قبوڵ نەکەم. لە لیبیا، شێخی خێڵ، دەبێتە ناوبژیوان لە کاتی ڕووداوی هاتووچۆدا، ئێستا خێڵی فرجان دەیانەوێ، ڕێککەوتنێک لەگەڵ خێڵی قەزافی بکەن، کە من کوڕێ وانم، لێیانخۆش دەبم، بەو مەرجەی سبەینێ ئەگەر شۆفێرێکی فرجان، هەمان شتی لێبقەمێ لەگەل قەزافییەک، دەبێ ئەوانیش فرجانەکە ببەخشن.

من سەرەتا پێداگریم کرد، کە دەبێ بریار بریاری یاسا و دادگا بێ، ئەوان ئەوەیان پێ باش نەبوو، چونکە ڕەنگبێ ئەو دادگا و دادگایکردنە ماوەیەکی زۆری بووێ، لە لایەکی دیکەش، گوتیان، تۆ عێراقی هەر عێراقییەک، ڕووداوێکی وا بکات، ئێمەش بەهەمان یاسا و دەستوور مامەڵەی لەگەڵدا دەکەین.

دوای سەردان و دانیشتنێکی زۆر، هەموولایەک وایان بە باشیان زانی کە لەو شۆفیرەکە خۆش بم و ئازادی بکەم.
هەرواشم کرد.
لە ڕۆژگارێکی یەکجار سەخت و ناخۆش و تاڵ، تایەن دەچووە ئەزموونەکانی سەری ساڵ و ئێمەش، ڕەشپۆش و دڵبەخەم و چاو بە فرمێسک.
لیبیا، بۆ ئێمە بووە دۆزەخێکی حەقیقی، پڕ پشکۆ و ئاگر و عەزاب و ئەشکەنجە. ئەگەر ئەو خزم و دۆستانەمان لە دەور نەبوونایە و دڵنەواییان نەکردبیان، دوور نەبوو بە شێت، هەموومان شێت بین. سەیرانگا و سەفەر و خۆشیمان بووە سەر قەبران و زیارتکردنی گلکۆی ئەو جوانەمەرگە نازدارە.
لە کۆتا یاریی فوتبۆڵی جامی جیهانی(١ / ٦ / ٢٠٠٠)، دۆڕاوە هەر گەورەکە من و خانەوادەکەم بووین، دۆڕانێک، کە قەت قەت نموونەی نییە و نەبووە!
دوایی، چەند مانگێک، لیبییەکان لێیان کردینە هەرا کە چۆن دەبێ، جەنازە لە گۆڕ دەربهێندرێت و بگوازرێتەوە وڵاتێکی دی. زۆر داوایان لێکردین کە ئەو پارەی لەوە خەرجی دەکەین بۆی بکەینە خێر و سەدەقە. ئەوبوو، گۆڕی ڕەندی هەر لە جێگەی خۆی لە گۆڕستانی (هەمالی) مایەوە.

## (٥٨)

# ئەدەب و هونەر

ئەگەرچی دروانسیەکانی ڕۆژهەڵات و ڕۆژاوای لیبیا، میسر و تونس، خاوەن گەنجینەیەکی ئەدەبی و هونەری دەوڵەمەندن و جێپەنجەیان لە پاشخان و کەلتووریی ئەدەبیی عەرەبی دیارە، لیبیا لەم ڕووەوە هەژاری پێوە دیارە. جا پێش ئەوەی لیبیا ببێتە جەماهیرییە، هەر وابووە. بە درێژای (٤٢) ساڵ، قەزافی ئەدەب و هونەری کردە ئامرازیی خزمەتکاری بیروباوەڕ و فەلسەفەکانی خۆی، جا چونکە بە خەرواران پارەی لە پێش شاعیر و ئەدیب و هونەرمەندە ستایشکار و چاوەشەکان هەڵدەڕشت، کەس هێندە عەوداڵ و پەرۆشیی ئەدەبیی ڕەسەن و زیندوو نەبوو. جگە لەمانە، بنەمای لیبیا، خێڵ و هۆزە، ئەدیب و هونەرمەندەکانیشیان، ئەوەندەی لە فکر و خەیاڵی ئەواندا بوون، نیو ئەوەندە لە فکر و خەیاڵی خاک و نەتەوەدا نەبوون.

قەزافی، چەند شاعیرێکی خۆی هەبوو، کە شیعری میللییان بۆ دەگوت، کتومت وەک سەردەمی خەلیفە و ئەمیرەکان، بۆخۆی لە بنەبانی دیوەخان دادەنیشت و ئەوانیش شیعریان بەسەردا هەڵدەگوت و ئەویش خەڵاتی باشی دەکردن. ساڵانە چەند بۆنەیەک هەبوو، دەبووایا، چالاکیی سوارچاکی و کۆڕی شیعر خوێندەویان تێدا بگێڕدرێ. خەڵاتی شاعیرەکان، جگە لە پارە و پوول، ئۆتۆمبیل و مەدالیا و خانوو بوو.

قەزافی، کە فیستیڤاڵ و کۆڕی ئەدەبیی گەورە و قەڵەباڵغی سازدەکرد، شاعیر و هونەرمەندانی غەیری لیبیشی، هەر بۆ مەدح و ستایشی خۆی داوەت و خەڵات دەکرد.

پێم سەیرە، هەرچەندە نەیارانی قەزافی، ئەویان بە دیکتاتۆر و زاڵم و زەندیق ناودەهێنا، کەچی لە دەرەوەی لیبیاش، ئەو شاعیر و ئەدیب و هونەرمەندە هەڵنەکەوتووە، ببنە دەنگ و سەدایەکی جیاواز و کاریگەر. دەبینین، نەیارانی سەددام حوسێن، چەندان شاکاریی ئەدەبیی زیندوویان بۆ بەجێهێشتووین و کتێبخانەی عەرەبیان بە ئەدەبی بەرەنگاریی و یاخیبوون و هەڵگەڕانەوە، دەوڵەمەند کردووە، تا ئەو ڕادەییەی ڕژێمی بەعس

دەوڵەتنامەی(جنسیەی) لە دوو لە شاعیر و ئەدیبانی عیراقی یاخی بوو ساندەوە (جەواهیری و عەبدول وەهاب بەیاتی).

ئەوەی جێگەی سەرنج بوو، خوێندکارەکانیشیان لە ڕیزبوون و بۆنەکاندا، بە دەگمەن شیعریان دەخوێندەوە، ئەگەر هەشبا، هەر گوتن بوو بەسەر قەزافی.

حاڵی شانۆ و هونەری شێوەکاری و سینەما، لە حاڵی شیعر و ئەدەبەکە باشتر نەبووە. هەمووشتێک لە پێناو جەماهیرییە، درووشمی زەقی ئەو ڕژێمە بووە، سەرەتا، لە پایتەخت هێندێ مەڵبەندی شانۆ و مۆزیک و هونەر هەبوون، بەڵام ئەوانیش وردە وردە پووکانەوە. بۆیە لەو بوارانەشدا، هیچ ناوێکی دیار و زیندوومان نایەتە بەرچاو.

ئەو چەند شاعیرەی، لە پێگەیەکی ناوچەییدا، شوهرەتێکیان هەیە، لە دەرەوەی لیبیا بوون: حسن السنوسی، پەنابەر بوو لە میسر و هەر بە دوو قەسیدە ناوی دەرکردووە (نیشتیمانی فەخریی) و (ڕاپەڕین). عوض ئەل مالکی، بە بولبولی بیابان ناسراوە، کۆڕ و کۆبوونەوەی شیعریی، لە لیبیا و میسر دەگێرا.

لە بواری نووسینیشدا، خەلیفە ئەل تلیسی، بە شێخی ئەدیبانی لیبیا ناسراوە. (٤٥) بەرهەمی چاپکراوی هەیە، کە پتر دەربارەی خێڵ و هۆز و کەلتوور و کەلەپووریی لیبییەکانە و وەرگێڕانیشی لە زمانی ئیتاڵیەوە بۆ عەرەبی هەیە. تەیسیر بن موسا، شارەزا بوو لە مێژوو و کەلتوور و ئەدەبی لیبیا و لە ڕۆژنامەوانیدا کارامە و بە توانا بوو. بەرهەمەکانی ئەو دوو نووسەر، هەمیشە وەک ژێدەر و سەرچاوە سەیردەکرێن. محەممەد فەرید سیالە، باوکی ڕۆمانی لیبییە و سێ لە بەرهەمە چاپکراوەکانی، بە باشترین ڕۆمانی لیبی دادەندرێن: (ئەوا ژیانیش گۆڕا)، (ژیان ململانێیە)، (ددانپێدانانی مرۆڤێک).

ئیبراهیم ئەل کونی، ناودارترین ڕۆماننووسی لیبیە، ئەستێرەیەکی درەوشاوەی ئاسمانی ئەدەبی عەرەبی و جیهانییە. نزیکەی (٧٠) بەرهەمی چاپکراوی هەمەڕەنگی هەیە، چەند بەرهەمێکی بۆ نزیکەی (٤٠) زمان وەرگێردراون. بە ئەدیبی بیابان ناوی دەرکردوە. ئەو زۆربەی تەمەنی لە ئاوارەیی و غەریبیدا بەسەر برد.

لە ژنە نووسەرەکانیش، ناوی وەفا ئەل بوعسی، ڕۆماننووس، وە شەریفە ئەل قیادی، پەخشاننوس و ڕۆمانووس لەسەر زارانن، ئەوانیش هەر لە هەندەران ژیانیان بەسەر بردووە.

بەمشێوەیە دەبینین، زۆربەی قەڵەمە بە توانا و دیارەکان لە هەندران، گەشەیان کردوە.
دوای ڕاپەڕینی بەهاری عەرەبی، شاعیر و ئەدیبەکانی لە دەوری کۆشک و سەرای قەزافی بوون، ڕاونران و گیران و پەرتەوازەی وڵاتان بوون و بەرهەمەکانیان بە بەرهەمی زەندیق و هەڵگەڕاوە لە قەڵەم دران.

## (٥٩)
# کەلەپوور و شوێنەوار و گەشتوگوزار

مێژووی شارسانیەتیی لیبیا و ناوچەکەی، بۆ نزیکەی (١٢)هەزار ساڵ دەگەڕێتەوە. بەدرێژایی ئەو ڕۆژگارە دوورودرێژەدا، چەندان خێڵ و هۆز و تیرە و قەوم و نەتەوە لەو ناوەدا ژیاون و پێیدا گوزەریان کردوە، ئەوانە میراتی کەلتوور و کەلەپووری خۆیان، کەم تا زۆر، لەسەر دانیشتووانەکانیدا بەجێهێشتووە. بۆیە لیبیا یەکێکە لە وڵاتە هەرە دەوڵەمەندەکان لەو بوارەدا.

گەشتیار یان میوان، لە یەکەم سەردانیاندا ئەو میراتە مەزنە بە چاوی خۆی دەبینێ. پیاسەیەک بەناو گوزەری قەیسەرییەکان و بازاڕە دێرینەکانی تەرابلس، ئەو ڕاستییەت بۆ دەسەلمێنێ. دەکرێ بڵێین، ئەو بازاڕانە بۆ خۆیان مۆزەخانە و کەلتوورخانەیەکی ئاسایی کەلەپووری لیبین.

لە شیعری میللی و فۆلکلۆر و پەندی پێشنیان و مەتەڵ و گەمە میللییەکاندا، وەک کوردەوارییی خۆمان دەوڵەمەندن و هەر دەڤەرەی بەرهەمی تایبەتمەندیی خۆیان هەیە. دەتوانم بڵێم، هەرچی دەکەوێتە بەر چاوت، ئاسەوار و ڕوخسار و نیشانە و هێمای ئەمازیغییەکانیان پێوە دیارە.

پۆشاکی ژن و پیاو و منداڵیان، تەواو جیاوازن لەگەڵ پۆشاکی وڵاتانی دەرودراوسێ. هەریەکەی چەندان پارچەیان هەیە و شێوازی پۆشین و نمایشکی خۆیان هەیە بە گوێرەی بۆنەکانیان. قەزافی زۆر لەو دیزاینە میللییانەی، بۆ پۆشاکی خۆی دەسازاندن و دەستکاریی دەکردن.

زێرینگەرەکانیان، تا بڵێی دەستڕەنگینن، پارچە زێڕەکانیان کە هەر عەیار (٢٤)ن، زۆر قورس و قەبە و گەورەن. تایبەتن بەشارستانیەتی خۆیان. نەخش و ڕەسم و شێوازیان جیاوازە لەگەڵ ئەوانەی لای خۆمان. ئەوساڵانەی من لە لیبیا بووم، زاوا دەبووایە، یەک دوو کیلۆ زێڕ بۆ بووک بکات. قەزافی سەردەمانێک پێشینەی باشی هاوسەرگیریی دەبەخشییەوە.

میل و خال و کووتان، یەکجار مێژوویەکی کۆنی هەیە، جاران کەسانی وەک و شێخ و مەلای لای خۆمان بەو ئیشە هەڵدەستان. دەست و قاچی ژنە لیبییان بە تاتۆ و خاڵ و میل دەڕازێندرێتەوە. تەنها پیاوە خاوەن مەقام و دیارەکان، مافی تاتۆکردنیان هەیە. دوو دیاردەی سەرنجڕاکێش: چۆن لەلای خۆمان ئاهەنگی خەنەبەندان دەکرێ و خەڵک کۆدەبێتە و بە خۆشی و گۆبەند، ئەو نەریتە بەڕێوەدەچێ؛ لە لیبیا، بۆ تاتۆکردن، بۆنە و ئاهەنگگێڕانی کەلتووری خۆیان هەیە ولەگەڵ چڕینی گۆرانی و چەپڵەڕێزان ئەو شتە دەکەن. ژنەکانیان کە پیردەبن، ئەو خاڵ و میل و تاتۆیەیان پێ گوناح و حەرامە، جا دەبێ بۆ هەر تاتۆیەکی سەر لەشی، خێر و سەددەقەیەک بکات، پتر ئەو سەددەقەش دەبێ زێڕ بێ.

لە چنینەوە و تەون و جۆلاییدا، وەکو خۆمان، چونکە خووری و لووا و موویان زۆرە، هەموو شتێک بۆ خۆیان دەچننەوە و دروست دەکەن، لە پۆشاک و عەبا و ڕەشماڵ و لباد و بەڕە و فەرش و دوگرد و جاجم و گوریس و پەت و هەودا... تاد. دەڵێن ژنە ئەمازیغییەکان، هەزاران ساڵ پێش ئێستا، لە دارخۆرما فێرە چنینەوە بوون، کە دیقەتی قەدی ئەو دارەیان کردووە. ئێستا بەرهەمی کارگەکان، بازاڕی ئەو بەرهەمە کەلتووریانەی تەواو لاواز و خامۆش کردووە.

چا و قۆریە و قاوەخانە و ئیستکان و دەستەباشی، بەشێکی بایەخداری کەلتووری لیبیە، هەرچەند چا لە ناوەڕاستی سەدەی نوزدەم گەیشتۆتە ئەو وڵاتە، بەڵام ئەوان تقووس و ڕێوڕەسم و نەریتی تایبەت بەخۆیان داهێناوە، کە لە هیچ شارستانیەکی دیکەدا نییە، چا و تەدارەگی چاخواردنەوە کتێبیان لەسەر نووسراوە.

هەرچەندە ئەمازیغییەکان، لە نەتەوە یەکگرتووەکان، چێشتی کوسکوسیان بە فەرمی وەک کەلتووری خۆیان ناساند، ئەو چێشتە خواردنی سەرەکی هەموو خەڵکی لیبیایە، تەنانەت لە چێشتخانەکانیش. لیبییەکان، وەک خۆمان دۆڵمە و گیپە و نیسک و خورما و ڕوون و هەرشتەیان هەیە. بەڵام خۆراکی زۆرینەی خەڵک مەکەڕۆنییە کە ئیتاڵییەکان لەگەڵ خۆیان هێناویانە. لیبییەکان بە بەسبوسە بەناوبانگن کە لەگەڵ چا دەخورێ. فەتیرە، پەنیر و هەنگوینە بە چای دەخورێ. هەریسە، دەخرێتە سەر خواردن، لە جیاتی بەهاراتی تیژ... تاد.

لە سەر ڕێگای نێوان زۆربەی شارەکانی لیبیا، نمایشی کەلوپەل و دەفر و گۆزە و جەڕکە و شەربە و لەگەنی گڵی دەبینی. ئەوان لە باب وباپیرانیانەوە ئەو پیشە میللییەیان بۆ بەجێ ماوە. ئەوەی جێگەی سەرنجە لەو کارە دەستیانە، نیگار و نەخش و ڕەسمەکانی سەر ئەو کەلوپەلانەیە، کە بە بۆیەیی خۆیان و زۆر بە دەسترەنگینی دەیکەن. جگە لەوانە دەیان جۆرە حەسیر و باوەشێن و زەنبیل و سەبەتە و پێتەرازوو و پووشینە لە گەڵای دارخورما درووست دەکەن. کەم ماڵە لیبی هەیە، بەو کەرەستانە نەڕازاندرابێتەوە و ڕۆژانە بەکاریان نەهێنن. شانازیان پێوەدەکەن.

سالانە ئەوان پێشبڕکێی سوارچاکییان هەیە، ئەسپەکانیان یەکجار جوان دەڕازێننەوە، زین و قەڕاسە و گوڵوانکە و متومووروەکانیان گرانبەهان. لەو پێشبەڕکێیانەدا، وەک شەهید عومەر موختار، دەبێ تیراندازیش بکەن.

گۆرانی میللیی لیبی، جوان هۆنراونەتەوە و ئاواز و مۆزیکی خۆشیان تێدایە و پڕن لە وێنەی ئەدەبی و هونەری جوان جوان. لەگەڵ ئەو گۆرانییانە، ئامێری مۆزیکی میللی بەکاردەهێنن و بە شێوازی خۆیان ژن و پیاو چەپڵەلێدەدەن.

چونکە لیبیا بەو کەلتوور و کەلەپوورە زۆر دەوڵەمەندە، لەو بڕوایەدام، ئەگەر ئەو بەرهەمانە، سەردەمییانە بە بازاڕ بکرێن و زیندووبکرێنە و ڕەواجیان پێبدەن، داهاتی باش وەدەست دێنن، بەتایبەتی ئەگەر کەرتی گەشتوگوزار پەرەی پێبدرێت و پێشبخرێت.

کە منداڵ بووین، لە قوتابخانە هەر ئەوەندە زانیارییەمان پێدرابوو دەربارەی لیبیا، کە لەناوەندی گەورەترین سارای سەر زەوی هەڵکەوتووە و وشتریان زۆرە. بەڵام کە دەچێتە ئەوێ و دەبینی جیهانیکی دیکەیە.

یەکەمین گەشتیی قوتابخانەمان بۆ شوێنەوارەکانی شاری لبدە بوو، ئاسەوارەکانی ئەو شارە دێرینە، پێیدەگوتی کە چ شارستانییەتیکی پێشکەوتوو لەو دەڤەرەدا هەبووە. ئەو پاشماوە و کەلاوانەی بە پێوەماون، هیچ جیاوازییەکیان نییە لەکەڵ پاشماوەی شوێنەوارەکانی ڕۆما، چونکە زۆربەی کۆشک و خان و سەراکان، دەستکردی هەمان ئیمپراتوریەت بوون، جیاوازییەکەی ئەوەیە، ئیتاڵییەکانی بایەخ بە شوێنەوارەکانی خۆیان دەدەن و نۆژەنیان دەکەنەوە و دەیان پارێزن. ئەوەی کە جێگەی سەرنج بوو بۆ من، لە ناو جەرگەی ئەو شوێنەوارانەوە هێڵی ئاسنیین ڕاکیشراوە بۆ کەناری دەریای ناوەند، ئەمەش

بۆ ئەوە بوو، ئیتاڵییەکان، کە لە لیبیا بوون، هەرچی دار و مەڕمەڕ و دینگە و شتی بەکەلک وبە قیمەت هەبووە، وەک تالان بۆ وڵاتی خۆیان بردوە و لەوێ شوێنەوارەکانی خۆیان پێ نۆژەن کردووەتەوە یان لە مۆزەخانەکانیان داناوە. دەمپرسی، بۆچی حکوومەتی لیبیا داوای وەرگرتەوەی ئەو شتانەی خۆی ناکات؟

پێگە شوێنەوارییەکانی لیبیا زۆرن، تەنانەت لە قوڵایی بیابانیشدا، پاشماوەیان ماوە. لە شوێنە هەرە بەناوبانگەکانیان ئەمانەن:

لبدەی گەورە؛ کە فینیقییەکان لە هەزارەی یەکەم پێش زایین، لەسەر دەریا بونیاتیان ناوە و دواتر سیبتیمۆس سیفیرۆس، ئیمپراتۆری گەورەی ڕۆمانی چەندان قەڵات و گەرماو و پەرستگا و شانۆ و شەقام و جادەی بۆ دروستکرد، (١٢٠) کم لە ڕۆژهەڵاتی تەرابلسە، ناوی لە لستی شوێنەوارە جیهانییەکاندا لە یۆنیسکۆ تۆمار کراوە.

شاخی ئەکاکوس؛ لە سەر سنووری نیوان لیبیا و تونس و جەزائیرە، لە دەڤەری غات، بە سەدان ئەشکەوتی تیدایە، کە مێژووەکانیان یەکجار دێرینە. ئەمەش لە گەڵ شوێنەوارە جیهانییەکان لە یۆنیسکۆ ناوی تۆمار کراوە.

شارۆچکەی غدامسی کۆن؛ یەکێکە لە شارە ئاوەدانە هەر کۆنەکانی لیبیا، بە گەوهەری بیابان ناسراوە، پێش (١٠٠٠) ساڵ ئاوەدانی تێدا بووە. ئەوەش بە یەکێک لە شوێنەوارە جیهانییەکان لە یۆنسکۆ تۆمارکراوە.

چیای نفووسە؛ لە ڕۆژاوای لیبیایە، وەک کۆگا بۆ هەڵگرتنی گەنم و جۆ بەکارهاتووە، بەندەرێکی جوانیشە.

قەیرەوانی؛ شارێکی دێرین بوو، هەر پاشماوەکانی ماوە. ئەو شارە (٦٣٠) پێش زایین بە دەستی یونانییەکان درووست کراوە دواتر ڕۆمانییەکان داگیریان کردوە. پێگە و مەقامی چەند خوداوەندێکی دێرینی هەر لێماوە.

صبراتە؛ (٧٠) کم لە ڕۆژهەڵاتی تەرابلسە، پاشماوەی گەورەترین شانۆی ڕۆمانی لێیە، لە سەدەی دووەمی زاییندا بونیاتنراوە، مەنزڵگەی چەندان خوداوەند بوو، تا بۆخۆت سەردانی نەکەی نازانی چ دەستکردێکی مرۆڤە، ئەوەش هەر لە یۆنیسکۆ ناوی تۆمار کراوە.

تەرابلسی کۆن؛ بۆ خۆی هەمووی شوێنەوارە، گەشتیاران سەردانی دەکەن، ئیستاش هێندێ گەڕەک و خانووبەرەی ئاوەدانە. مۆزەخانەی جەماهیرییەش هەر لە ناوقەڵاتی تەرابلسە کە بینایەکەی لەسەدەی حەفتەمی زایینی دروستکراوە، بوتە سەرای ناوەندی شارەکە.ــ لە سەرەتای ڕاپەرینی (٢٠١١)، لەسەر سواندەی ئەو سەرایە قەزافی وتارێکی ئاگرینی بۆ جەماوەری لیبیا خوێندەوە.

جگە لەمانە، چەندان شوێنەواری دیکەش هەنە، وەک شارۆچکەی سووسە، کە پاشماوەی قەڵا و گەرماو و قەسر و سەرا و شانۆی ڕۆمانی دێرینی لێماوە. وە شارۆچکەی شەحات، کە لە سەدەی شەشەمی پێش زایین ڕۆمانییەکان بونیاتیان ناوە، چەندان پەرستگا و قەڵات و گەرماو و گۆڕستانی لێیە.

وەک سرووشت و دیمەن و هەوارگە، جگە لە مێرگەکانی خومس، کە بە بووستانی دارخورما بە ناوبانگن، لە ڕۆژهەڵات، چیای (الاخضر) وەکو شاخ و داخەکانی لای خۆمانە، ساڵانە خەڵک لە هاوینان بۆ گەشتوگوزار ڕووی تێدەکەن، شوێنێکی خۆش و دڵگیرە.

ئەوەی، کە ڕەنگ بێ بۆ خوێنەری کورد، جێگەی سەرسوڕمان بێ، جوانترین دیمەنی سرووشتی لە لیبیا، بیابان و ساراکانە. بەداخەوە کەرتی گەشتوگوزار لەو وڵاتە بایەخی پێنەداربوو، چونکە فەلسەفەی قەزافی بوو، دەبێ خۆیان بە دوور بگرن لە بێگانە، تەنانەت گەشتیار و گەڕیدە و میوانی غەیرە لیبیش. دەنا جگە لە تیشکی خۆر، شەوانی سارا کە هەواکەی فێنکە، یەکجار سەرنجڕاکێشە. چونکە چرا و ڕۆناکی شار لێ نزیک نییە، بە ملیاران ئەستێرە دەبینی. هێندکیان هێندە نزمن وادەزانی گڵۆپی سەر شەقامن. ئەستێرەکان پڕ پڕن و زۆر درەوشاوەن و هەر یەکەی بە جۆری خۆی دەنوێنێ. هەر بۆیە قەزافی، ناوە ناوە دەچووە هەوارگەکانی خۆی و لەو سارایە چەند شەوێکی بەسەر دەبرد. بە قسەی پاسەوانەکانی، جار بوو لەوێ، چۆتە خەڵوەتگە و نەیهێشتووە بە شەو و ڕۆژ کەس لێی نزیک بێتەوە.

ئەوەی کە ئەو پاشماوە شوێنەوارییە مەزنانەی لیبیای وێران کردوە، ئەوەبووە، بۆخۆیان لەسەردەمە دێرینەکاندا، ئەو شوێنانەیان تاڵان کردوە و دواتر ڕوخاندوە و بەرد و کەرپووچ و مەرمەڕەکانیان بۆ دروستی کردنی خانووی خۆیان بردوە. ئیتاڵیەکانیش،

ستوون و گۆڵەگە و تاتە بەردە گەورە گەورەکانیان گواستۆتەوە ڕۆما. دواتریش ڕژێمی قەزافی، چونکە داهاتی باشی لە نەوەت دەست دەکەوت، عەوجە بە کەرتی گەشتوگوزار نەبوو، ئەوانەی وەلاوە نا و قەزافی کەیفی بە بێگانە نەدەهات و پێخۆش نەبوو پێ بنێنە سەر خاکی وڵاتەکەی.

## (٦٠)

# پرسە و گۆڕستان

خەسڵەتێکی لیبییەکان ئەوەیە کە هەموویان قەدەرییــن. مردن بەلایانەوە، چارەنووسێکی دیاریکراوی خوداوەندییە و دەبێ بە سینگفراوانییەوە قبوڵی بکەین. هەرکە خەبەری مەرگی کەسێکیان بۆ دێ، گەنج بێ یان پیر، ژن بێ یان پیاو، یەکسەر دەڵێن:"الله غالب، انا لله وانا اليه راجعون." لە ماوی سەعاتێکدا دوو ڕەشماڵی پرسە، یەک بۆ پیاوان و یەک بۆ ژنان هەڵدەدەن. ڕەشماڵەکان، هەمووی یەک جۆرە نەخش و ڕەنگیان هەیە، سێگۆشەی بچوکی بچوکی ڕەنگاوڕەنگن، پتر لە میسر دروستدەکرین، بە کرێیان دەگرن، لوولە ئاسن تێکهەڵدەکێشن و دەیکەن بە کەپرۆکە و ڕەشماڵەکەی بەسەردادەدەن. قەبارەکەی هەمەجۆرە و دەتوانرێ فراوانتر بکرێ، جێگەی (٤٠٠) بۆ (٥٠٠) کەس دەبێتەوە و لەسەر حەسیر بە سێ لادا دۆشەک ڕیز دەکرین و سەرینیشیان دەخەنە پشت. لە دەرەوەی ڕەشماڵەکە گەنجەکان قاوەچاغەی چای و قاوە دادەنێن. چاگێڕان، جار هەیە قاوەگێرانیش، شتێکی ئاساییە. دەبێ ئیستکانی چایەکانیان کەفی لەسەر بێ. ئەوان بەو کەفە دەڵێن (ڕەغوە).

هەموو مردوویەک لە لیبیا، دەبێ بچێتە نەخۆشخانە، لەوێ سەرشۆرکی مردوو شووشتن هەیە، کە شۆردرا و کفنکرا و بۆن و گوڵای پێدا بژێندرا، دەچن وەری دەگرنەوە و بەرەو گۆڕستان بە کەژاوەی ئۆتۆمبیلی زۆر بەڕێ دەکەون.

لە شاری سرت هەر یەک گۆڕستانی گەورە هەیە، بەناوی مەرقەدی پیاوچاکێکە بە ناوی (هەمالی)، لەبەرانبەر دەروازەی گۆڕستانەکە کە شوورەی هەیە، مزگەوتێک هەیە، لەوێ خەڵکەکە نوێژی بە کۆمەڵ لەسەر جەنازە دەکەن.

لە گۆڕستانەکە بلۆک و چەمەنتۆ و لم و بیرە ئاو هەیە لەگەڵ هەموو کەرەستەکانی گۆڕهەڵکەندن. گۆڕەکانیان هەر چاڵێکە، مەترێک قوول دەبێ. چواردەوری بە بلۆک دەکەنە دیوار و جەنازەکەی شۆڕدەکەنەوە ناوی و بە بلۆک سەری دادەپۆشن، ئەوجا هەمووی بە چەمەنتۆ دادەپۆشن و خۆڵ و لمەکەی دەخەنەوە سەری و دوو بلۆکیش وەک

کێل، لە سەرین و پێینگانی گۆڕەکە دادەنێن. ئەو چەمەنتۆیە بۆ ئەوەیە سەگ تخونی مردووەکە نەکەوێت و دەری نەهێنێ، چونکە ئەو لمە بە هاسانی هەڵدەدرێتەوە.

دوای تەلقینداني مردوو، خاوەن تازییەکە، دەچن بەڕیز لە ژێر ئەو تارمە دوورو درێژەدا ڕادەوەستن کە بۆ ئەو بۆنەیە درووست کراوە. ئەوانەی لەگەڵ جەنازەکە هاتوون، دەچن سەرەخۆشیان لێدەکەن، دەبێ یەک یەک دەستیان بگووشیت و هەیە ماچیشیان دەکا.

گۆڕستانی هەماڵی، کە لەشەقامی سەرەکیی شارەکە نزیکە و دەکەوێتە دەروازەی تەرابلس، لە شێوەی لاکێشەیە، زۆر گەورەیە. کراوە بە دوو بەش، بەشی ڕاستە و بەشی چەپە. کە من لەوێ بووم، بەشی چەپە، کە نیوەی گۆڕستانەکەیە بە درێژی، پڕ ببۆوە، بە گۆڕ. بەشەکەی دیکە، وردە وردە گۆڕی نوێی تێدا لێدەدرا. لە لیبیا کەس گۆڕستانی خانەوادەی خۆی نییە. هەر کەسێک بمرێ، لە تەنیشت دوایین مردووی دەنێژرێت. واتە مردووەی بنەماڵەیەک پەرتوبلاو دەبنەوە. بەم شێوەیە، دەوڵەمەند بی یان هەژار، خەڵکی ئەو وڵاتەبی یان بێگانە، هەموو بەڕیز، بێ فەرق و جوودایی لە تەنیشت یەک دەنێژرێن. کاتێک، ئەو بەشەی گۆڕستانەکەش پڕ بۆوە و جێگەی هیچ گۆڕێک نەما، دەچن شۆفڵ لە بەشی یەک دەدەن و دەیکەنەوە زەوێ و دەست دەکەن بەناشتنی مردووی نوێ. ئەوان دەیان گوت، هەر (٧٠) ساڵەی جارێک، بەشێکی گۆڕستانەکە شۆفڵی لێدەدرێ.

لە گۆڕسانەکان کێل و گلکۆی وەک لای خۆمان نابینی، تەنها دوو بلۆکەکەیە، نابێ گۆڕ هەڵبنهیت، پێیان حەرامە، دەبێ هەر بە خۆڵ و لم دایپۆشی.

کە ڕەندی جوامەرگ بوو، دوای مانگێک، من کێلەکانم کردە مەڕمەڕ و گۆڕەکەم هەڵهێنا، خەڵکێکی زۆر سەرکۆنەیان کردم، بەڵام من سووربووم لەسەر ئەوەی کە کردم. ئەو گۆڕە تاکە گۆڕ بوو کە کێلەکانی مەڕمەر بێ. یەک گلکۆ لەو گۆرستانە هەبوو، بەرزییەکەی مەترێک دەبوو، بە کەرپووچ دروستکرابوو، تاتەبەرێک وەک کێل لە سەریندا چەقیندرا بوو، دوو سێ دێرە شیعری لەسەر بوو. ئەو شیعرانە هی قەزافی بوون، گۆڕەکە هی جەنگاوەرێک بوو، لە شەری (قرضابیة) کوژرابوو. واتای دوو دێرە شیعرەکە ئەوەبوو(فلانی کوڕی فلان... لە شەڕگەکەدا، هاوڕێیەکانت هەڵاتن و تۆیان بە تەنیا جێهێشت، بۆ ئەوەی زۆرتر بژین، لێ تۆ قاچت چەقاند و جەنگایت تا شەهید بوویت. ئێستا تەمەنی تۆ زۆر زۆر درێژترە لە تەمەنی هاوڕێ ترسنۆکەکانت.)

لە دوای ساڵی (٢٠١١) کە داعش شاری سرتی گرت، لیژنەیەکیان هەبوو، بۆ تێکدان و خاپورکردنی گۆڕ و گۆڕستانەکانی سەرانی ڕژێمی پێشوو، لەو گۆڕستانە، کێلی سەرێنی ڕەندی جوانەمەرگییشیان شکاندووە، گەرچی لەسەریشی نووسرا بوو، (الفاتیحە).
دوای بە خاکسپاردن و مەراسیمی گۆڕستان، خاوەن تازییەکان دەچنەوە نێو ڕەشماڵەکان و خەڵک دەستە دەستە بۆ سەرەخۆشیکردن دەچێنە کنیان. خاوەن مردوو، لە نێو دەرکی ڕەشماڵەکە ڕادەوەستن، دەبێ دەستی هەمووان بگوشێت و کە چوویتە ژوورەوەش، لە دەستە ڕاستەوە دەست بکەی بە تەوقەکردن لەگەڵ هەموو ئەوانە لەوێ دانیشتوون، ئەوجا دەچی دادەنیشی و فاتیحە دادەدەیت. لەوێ قورئان خوێندن نییە.
بەم شێوەیە، ڕێوڕەسمی پرسەکە بەڕێوەدەچێ بۆ ماوەی نزیکەی مانگێک، ئەو ڕەشماڵانە هەر دەمێنن و خەڵک بە شەو و بە ڕۆژ سەردانیان دەکەن.
بە درێژای ئەو ماوەیەش، ئامادەکردنی سفرە و نانخواردن لە ئەستۆی خاوەن تازیەیە.
یەکەمجار بوو، چوومە پرسەی گەنجێکی جوانەمەرگ کە دەمناسی، کاتێک چاوم پڕ بوو لە فرمێسک، دیتم خاوەن تازییەکە دڵی من دەدەنەوە و بەلایانەوە چارەنووسێکی ئاساییە و گریانی ناوێ.
لە نەریتی وان، ژن بە هیچ جۆرێک ناچنە سەر قەبران و ئەسڵەن نازانن مردووەکانیان لە کوێ نێژراون. تەنانەت بۆ جوانەمەرگەکانیشان زۆر کەم دەگرین. وەک ئێمە قژ ناڕننەوە و سینگ ناکووتن و نایکەنە زریکەلێدان و گریان و فیغان. بۆ ماوەیەکی کەم ڕەشی دەپۆشن، دوای (٤) مانگ، بێوەژن دەتوانی شوو بکاتەوە.
ئەگەر لەسەر قەبران، ژن ببینی، ئەوا خەڵکی لیبیا نین، وەکو مەمانان چوونەتە سەر گۆڕی ئازیزانیان.
لە ماوەی ئەو مانگەی کە پرسەیە، فەرمانبەر و کاربەدەستانی دەوڵەت دەتوانن دەوام نەکەن.
ئەوەندەی من لە لیبیا بووم، ڕووی نەدا لەگەڵ کەژاوەی مردوویێک بچمە سەر قەبران، (کوژرا) بێ.

## (٦١)

# خوێندن و پەروەردە

ئەگەرچی قەزافی لە کەرتی پەروەردە و خوێندندا شۆڕشێکی حەقیقی لە لیبیا بەرپاکرد، بەڵام ئاکامەکانی لە مەودای نزیک و دووردا، زۆر کەمبایەخ و کاریگەربوون لەسەر گەشەکردن و بەرەوپێشچوونی وڵات.

ئەوەی ئەو کردی لەو بوارەدا شۆڕش بوو چونکە، وڵاتێکی نەخوێندەوار و بێسەوادی فێرە خوێندەواری کرد. بە هەزاران قوتابخانە لە شار و لادێ و ئاوەدانییە دوورە دەستەکان بونیات نران. دوای هاوردەکردنی مامۆستا لە وڵاتانی دراوسێ، بە تایبەتی میسر و جەزائیر و سوودان و دامەزراندنی مامۆستا فەڵەستینییەکانی ئاوارەی بووی لیبیا، مامۆستا دەرچووەکانی خۆی دامەزراند. خوێندن لە هەموو ئاستەکان بێ بەرامبەر بوو، هەموو پێویستییەکانی خوێندن بۆ قوتابی بێ بەرامبەر دابین کرابوو، پرۆگرامی خوێندنی بنەڕەتی و ئامادەیی لە پرۆگرامەکانی خوێندنی ئینگلیزی لە بەریتانیا وەرگیرابوو. جگە لە خوێندکاری لیبی، مۆریتانییەکان و فەڵەستینیەکان و ئەوانەی غەیرە لیبیش بوون، دەیانتوانی بی بەرامبەر لەوێ بخوێنن و زانکۆش تەواوبکەن.

ڕێگرەکانی سەرنەکەوتنی ئەو شۆڕشە، واتا ئاکام و دەستەکەوتووەکانی کەم و بێ بایەخ و بەرهەمهێنەربێ، زۆر بوون: لە هەموو ئاستەکانی خوێندندا. بەرنامە و مەبەست و ئامانجیان هەر دەرچوونی قوتابییەکان بوو لە پۆلێک بۆ پۆلێکی هەورازتر، بەبێ لەبەرچاوگرتنی ئاست و توانست و بەهرەی ئەو خوێندکارە. ڕۆژانی ئەزموونەکانی وەزاری، هەرچەندە، پۆلیس و ئاسایش بە ئۆتۆمبیلی سەربەچەکەوە، دەوری قوتابخانەکانیان دەگرت، مامۆستاکان، بە بەرچاوی هەموانەوە، کێبڕکێیان بوو لە یارمەتیدانی قوتابی و ڕێخۆشکردن بۆ گزیکردن. جا کە ئەو خوێندکارانە دەگەیشتنە قۆناغی پەیمانگە و زانکۆکان، لەبەر ئاست نزمیان، نەیان دەتوانی بە توانای هزر و ئەقڵ و مەعریفەی خۆیان دەرچن، لەوێش هەمان تاس و حەمام بوو و شانۆگەریی گزیکردن و یارمەتیدان دووبارە دەبۆوە. بۆیە کە ئەو خوێندکارانە خوێندنیان تەواو دەکرد، ئاستەکانیان

زۆر نزم بوو. زۆربەی دەرچووە کورەکان، دەیانەویست لە جێگە و فەرمانگەیەک دامەزرێن، ئیشکردنی تێدا نەبێ، یان حەزیان دەکرد ببنە (بن دیوار) ــ کە ڕێژەکەیان بەرز بوو. ئەگەر داشمەزرابانایە، دەبووایە بەڕێوەبەر و سەرپەرشتیار و سەرۆک بن، تا هیچ ئەرکێکی پراکتیزەکردنیان نەبێ و لە پێشت مێز فرمان دەربکەن. لە کۆلێژەکانی زانکۆکان، ڕاگر و یاریدەدەرەکەی مامۆستای لیبی بوون، بەڵام کادیرەکانی، کە ئەرکە قورسەکەیان لەسەر شان بوو، غەیرە لیبی بوون. ئەو خوێندکارانەی دەنێردرانە دەرەوە بۆ وەدەستهێنانی بڕوانامەی باڵا، یان ئەوەتا نەدەگەڕانەوە، یان مەبەستیان لە چوونە دەرەوەکە، هەر وەرگرتنی پارەکە بوو. زۆریان دەچوونە ماڵتا و قوبرس و یۆنان و سوودان و میسر بۆ خوێندن، لەوێ لەگەڵ زانکۆکان ڕێکدەکەوتن، کە بڕوانامەی ساختەیان بدەنێ، بەبێ ئەوەی دەوام بکەن، جا خوێندکارەکە، ئەو پارەی دەوڵەت بۆ تەرخان کردبوو، بۆ خۆی گلدەداوە، خەرجی خۆی و کرێی خانوو و پلیتی سەفەر و کرێی خوێندنی دەخستە تەنکەی باخەڵی. پاش تەواوکردنی خوێندنە ساختەکارییەکەی، با هێندەی داهات کۆدەکردەوە کە بتوانێ بازرگانییەکی باشی پێوە بکات و ژیانی خۆی زامن بکات، بە بڕوانامە ساختەکەش دادەمەزرا ــ بێگومان هەموویان وا نەبوون.

سەرقاڵکردنی ئەو منداڵ و هەرزەکار و خوێندکارانەی زانکۆکان، بۆماوەی (٤٢) ساڵ، بە بەرنامەی سوواوی بێ سوودی و بێزارکەری سیاسی و فیکری، تایبەت بە هزر و فەلسەفەکانی خودی قەزافی، هێندەی دێ ڕۆحی گەشکردن و پێشکەوتنی ئەو خوێندکار و کادیرانەی مردارکردەوە. هەموو ڕۆژێک، هەموو حەفتەیەک، هەموو مانگێک، بۆ ماوەی (٤٢) ساڵ، یەک قەوان و یەک سروود و یەک گوتار هەزار بار دەکرانەوە. (بۆچی لە کۆڕ و سیمینارێکی وەکو من، تەنانەت خەڵکی دەرەوەی قوتابخانەش دەهاتن ئامادە دەبوون، چونکە تامەزرۆی گۆڕانکاری و بابەتی نوێ و تازە بوون). دەوڵەت ئەوانەی هەموو دەزانی. بۆیە بە دەگمەن، ئەندازیارێک، یان سەرپەرشتیارێک یان پیشەوەرێکی سەرکەوتوو و شارەزا و بە توانایان تێدا هەڵدەکەوت. دەبووایە هەمیشە پشت بە کادیری غەیری لیبیی ببەستن.

بە درێژایی (٤٢) ساڵی حکومڕانی، قەزافی هەر خوێندکاری بێ توانا و نەشیاوی ناردە پەیمانگە و زانکۆکان، لەوێشڕا، هەر دەرچووی نەزۆک و دەستوپێ سپیی و بێ ئەزموون

و مەعریفەی، بە هەزاران هەزار، دەخستە سەر خەرمانی دەرچووانی کەڵەکەبووی بێکەلک و فەڕیساڵانی پێشوو.

خەرجی و مەسرەفێکی زۆر و بەسەربردنی کاتێکی زۆری تەمەن لەسەر ڕەحڵەی ڕەق و تەق، بەبێ دەستکەوتیی ماددی و مەعنەوی بۆ خودی هاوولاتی و نیشتیمانەکەیان.

ئەوەندە ساڵەی لەوێ بووم، بەڕێوەبەرەکەم، قەت منی نەدەکردە چاودێری ئەزموونەکانی وەزاری، لە لایەک من دەبوومە ڕێگر لە گزیکردن و لە لایەکیش ئەو نەدەیەویست من تووشی بگرە و بەردە بم لە گەڵ قوتابییە سەرسەخت و لاسارەکانیان ــ ڕەنگبێ حەزیشی نەکردبێ من ئەو ڕووە ناشیرینەی سیسمی پەروەردەی ئەوان ببینم، کە خۆشی گلەیی و ڕەخنەی لێ هەبوو.

## (٦٢)

## نەخۆشخانە و بنکە تەندرووستییەکان

نەخۆشخانەکانی لیبیا، بە گشتی ئەلهەقی سەردەمییانە و پێشکەوتوو بوون لە نەخشە و دیزاین و بونیات و ساختومانندا. کەرەستە و ئامێر و کەلوپەلی جۆری باش و گرانبەهایان تێدا بوو، دەرمانەکانیان، لە باشترین مارکەکانی ئەورووپا بوون، کە بۆ هەموو کەسێک بێ بەرامبەر بوون. خزمەتگوزارییەکان هەموو بێ بەرامبەر بوون، هێندێ نەخۆشخانە، پاشنیوەڕۆیان، بە پسوولە بوو، ئەویش نرخەکەی هەر دەیکردە (٤٠ سنتێک).

بەڵام؛ ڕۆح و داینەمۆی ئەو نەخۆشخانە پڕ ئامێر و کەرەستە باشانە، کادیری پزیشکییە، کە دەتوانم بڵێم هەر (٢٠٪)یان بۆ دابین کرابوو. جارێ، هەرچی پزیشکی لیبییە، بۆ سۆدرەی سەران بوونیان نەبوو، چونکە توانا و ئەزموون و کارامەییان کەم بوو، لە بەشی سەرۆکایەتی و سەرپەرشتیاریی نەخۆشخانە و دامودەزگا تەندرووستییەکان دادەمەزران. دکتۆری لیبی ئیشی نەدەکرد. پەرستارە لیبییەکان، هەر بۆ کات بەسەر بردن یان ڕاپەڕاندنی ئیش و کاری نووسین و ئامار دەوامیان دەکرد و کەم ئەزموون بوون، هۆشیاریی خزمەکردنیان زۆر لە ئاستێکی نزمدا بوو، ئەوەش هەم لەبەر ئەوەی دەترسان لە ئیش کردن، هەم لەبەر ئەوەی قەزافی بە درێژایی ئەو ساڵانە، ئەوەی لەبن گوێدا دەخوێندن، کە ئەوان (سەییدن). کەواتە ئاغا چۆن خزمەتی پاڵە و ڕەنجبەر دەکا؟

لەم خالانەش گرینگتر، خودی هاووڵاتی لیبی، هیچ متمانەیەکی بە دکتۆر و کادیری خۆیان نەبوو، نەدەچوونە لایان. کە سەردانی نەخۆشخانەیەکیان دەکرد، دەیان پرسی کام دکتۆری غەیرە لیبیی دەوام دەکات: عێراقی، میسری، سوودانی... تاقولۆقەی ئەورووپای ڕۆژهەڵاتیش. کچە پەرستارەکانیش زۆربەیان ئەوانەی خوارووی ڕۆژهەڵاتی ئاسیا و ئەمەریکای لاتینی و ئۆکرانی بوون. نەخۆشی لیبی، تەنانەت بۆ هەڵامات و ژانەسەرێک، یەکسەر دەچووە تونس بە پلەی یەکەم، وە بۆ میسر بە پلەی دووەم، بە گوێرەی دوور و نزیکیان لە سنووری ڕۆژاوا و ڕۆژهەڵات. ئەوانەی هەبووش بوون، دەچوونە نەخۆشخانەکانی ئەورووپا، بە تایبەتی ئیتالیا و ئەڵمانیا.

## (٦٢)

# نەخۆشخانە و بنکە تەندرووستییەکان

نەخۆشخانەکانی لیبیا، بە گشتی ئەلهەقی سەردەمییانە و پێشکەوتوو بوون لە نەخشە و دیزاین و بونیات و ساختوماندا. کەرەستە و ئامێر و کەلوپەلی جۆری باش و گرانبەهایان تێدا بوو، دەرمانەکانیان، لە باشترین مارکەکانی ئەورووپا بوون، کە بۆ هەموو کەسێک بێ بەرامبەر بوون. خزمەتگوزارییەکان هەموو بێ بەرامبەر بوون، هێندێ نەخۆشخانە، پاشنیوەڕۆیان، بە پسوولە بوو، ئەویش نرخەکەی هەر دەیکردە (٤٠ سنتێک).

بەڵام؛ ڕۆح و داینەمۆی ئەو نەخۆشخانە پڕ ئامێر و کەرەستە باشانە، کادیری پزیشکییە، کە دەتوانم بڵێم هەر (٢٠٪)یان بۆ دابین کرابوو. جارێ، هەرچی پزیشکی لیبییە، بۆ سۆدرەی سەران بوونیان نەبوو، چونکە توانا و ئەزموون و کارامەییان کەم بوو، لە بەشی سەرۆکایەتی و سەرپەرشتیاریی نەخۆشخانە و دامودەزگا تەندرووستییەکان دادەمەزران. دکتۆری لیبی ئیشی نەدەکرد. پەرستارە لیبییەکان، هەر بۆ کات بەسەر بردن یان ڕاپەڕاندنی ئیش و کاری نووسین و ئامار دەوامیان دەکرد و کەم ئەزموون بوون، هۆشیاریی خزمەکردنیان زۆر لە ئاستێکی نزمدا بوو، ئەوەش هەم لەبەر ئەوەی دەترسان لە ئیش کردن، هەم لەبەر ئەوەی قەزافی بە درێژایی ئەو ساڵانە، ئەوەی لەبن گوێدا دەخوێندن، کە ئەوان (سەییدن). کەواتە ئاغا چۆن خزمەتی پاڵە و ڕەنجبەر دەکا؟

لەم خاڵانەش گرینگتر، خودی هاووڵاتی لیبی، هیچ متمانەیەکی بە دکتۆر و کادیری خۆیان نەبوو، نەدەچوونە لایان. کە سەردانی نەخۆشخانەیەکیان دەکرد، دەیان پرسی کام دکتۆری غەیرە لیبیی دەوام دەکات: عێراقی، میسری، سوودانی... تاقولۆقەی ئەورووپای ڕۆژهەڵاتیش. کچە پەرستارەکانیش زۆربەیان ئەوانەی خوارووی ڕۆژهەڵاتی ئاسیا و ئەمەریکای لاتینی و ئۆکرانی بوون. نەخۆشی لیبی، تەنانەت بۆ هەڵامات و ژانەسەرێک، یەکسەر دەچووە تونس بە پلەی یەکەم، وە بۆ میسر بە پلەی دووەم، بە گوێرەی دوور و نزیکیان لە سنووری ڕۆژاوا و ڕۆژهەڵات. ئەوانەی هەبووش بوون، دەچوونە نەخۆشخانەکانی ئەوروپا، بە تایبەتی ئیتاڵیا و ئەڵمانیا.

داهاتی بەشێکی زۆری کەرتی تەندرووستی لە تونس و میسر، ساڵانە، لەسەر نەخۆشە لیبییەکان بوو، کە هەمیشە کاروانەکانیان بەڕێوە بوون.

پزیشکە میسرییەکان، کە زۆرینە بوون، وەک کۆیلە و نۆکەر، لەبەر دەستی نەخۆش و پەرستارە لیبییەکان کارییان دەکرد. ئاستیی پسپۆڕییان باش نەبوو، بەڵام لە پزیشکە لیبییەکان باشتر بوون. کە پزیشکی عێراقی، دوای ساڵی (١٩٩٢) ڕوویان لە لیبیا کرد، ناو و ناوبانگی باشیان دەرکرد، پزیشکە میسرییەکان بەربەرەکانی و دژایەتییان دەکردن، چونکە لەوان باشتر و سەرکەوتووتر بوون.

لە لیبیا، هەر غەیرە لیبییەک، گرێبەستی هەبێ، مافی ئەوەی نییە دوای دەوامی خۆی کاربکات، وەک کردنەوەی نۆڕینگە یان دەرسگوتنەوە بە خوێندکاران لەماڵاندا.

## (٦٣)

# درووشمەکانی قەزافی

تەمەنم هەر شەش حەوت ساڵان دەبوو، ژنێکی دراوسێمان هاتە لای نەنکم، پێیگوت:

ــ یا ئامینە، ئەتوو لۆ هێندە تووکمان لێدەکەی! لۆ دوعامان لۆ ناکەی سەرکەوین و خودا کارێک بکا تەخت و تاراجی ئەو مەلیکانە تێک و پێکدا؟ دەزانی ئەمە سەرکەوین، هەر مارەی(ماڵەی) ڕۆژێ تەنەکە نەفتێکی دەدەینێ، نەفتی کەرکووکێ لۆخۆمان دەبێ!

نەنکیشم، بە هێمنی، گۆتی:

ــ جا فەرقی، ئەمن هەر یەک تەنەکەی نەفتیم لە مارێ (لە ماڵێ) هەیە. ڕۆژێ ئەو هەموو تەنەکە نەفتە لە چێکەم، مەگەر لە ق.... ی تۆی بکەم؟

جاران، هەر دوڵەمەند و هەبووەکان، دوو سێ تەنەکە نەفتیان بۆ ئاگر کردنەوەی زستانێ دادەنا، دەنا فەقیر هەر بە شووشە نەفتی دەکرێ خۆ وەک ئێستا سۆبە و تەباغی نەفتێ نەبوو.

نەنکم هەوادارێکی سەرشێتی مەلیکەکان بوو، تا ڕادەی کڕنۆش بردن. شەو و ڕۆژ لەسەر بەرماڵ دوعای بۆ دەکردن.

ئیمڕۆ، وا (٧١) ساڵم، لەو وەختیەوە، نەبووە ڕۆژی گوێبیستی درووشمێکی نوێ نەبم و خەڵکیش دەهۆڵ و زۆرنای بۆ لێنەدا و پێی هەڵنەپەڕێ!

(٢٢) ساڵە، لە ئەورووپا دەژیم، قەت یەکجار، لە هیچ شوێنێک، جگە لە ڕێکلامی بازرگانی، درووشمێکی سیاسیم نەکەوتە بەرچاو. لە هیچ شوێنێک نە نووسراوە:"النظافة من الایمان"، هەموو شوێنێکیش دەڵێی پەڕی گوڵە هێندە پاک و خاوێنە و کارەکان بە پووخت و ڕەختی بەڕێوەدەچن.

هەر بستە دیوارێک هەبووبێ، هەر شوێنێک بەرچاو و دڵگیر هەڵکەوتبێ، هەر شەقام و جادەیەک، جێگەی سەرنج و تەماشاکردن بووبێ، لەو لیبیا گەورە و فراوانەدا، ئەوا بە تابلۆی گەورە گەورە و قەبارە جیاواز ڕازێندراوەتەوە و درووشمەکانی جەماهرییەیان لەسەر تۆمارکراوە. لە وێنە و ڕەسمی سەرکردە هەر مەپرسە!

تابلۆکان، پارەی باشیان لێ خەرجکراوە، بە ڕەنگ و بۆیە و دیزاینی جوان جوان نەخشێنراون، بە چرا و ڕۆناکی ڕۆشەن کراونەتەوە. ناوە ناوە نۆژەنیان دەکەنەوە و یان

دەیانگۆڕن. دروشم هەیە پتر لە (٣٠) ساڵە هەڵواسراوە و نەگۆڕاوە و هەمیشە نۆژەن دەکرێتەوە. بۆ خەڵکی ئەو وڵاتە بوون بە بەشێک لە دار و بەرد و خۆڵ و قیری شەقامەکان، یەک زەڕرە جێگەی سەرنجراکێشان نین، ڕەنگ بێ ئەسەڵەن هەست بە بوونیشیان نەکەن، چونکە ژینگەی چاویان، پڕ بووە، یان تێر بووە، لەو ڕەنگ و وشە و دیمەنانە.

هەرچی درووشمی لیبیا هەیە، زادەی زمان و هزری قەزافییە. یەک تاکە دروشم نییە، لەداهێنانی کەسێکی دیکە بێت، جا پلە و مەقامی ئەو کەسە هەرچەند باڵا و بەرزیش بێ. مەرجیش نییە، قەزافی داوای لە هەوادارەکانی کردبێ، بچن، ئەو گوتانەی ئەو لەسەر ئەو دار و دیوارە بنەخشێنن، بەڵام ڕێگریشی لێ نەکردوون و بە پێویست و جوانیشی زانیوون.

بێگومان، ئەو هەموو دروشمانەی قەزافی یان جەماهیرییە، زادەی شەو و ڕۆژێک نەبوون، لەگەڵ ڕۆژگاری دوور و درێژ و بەسەرهات و ڕووداوە زۆرەکان، دروشمەکانیش ترووکاون و نەوەی نوێیان خستووەتەوە.

لە ڕاستیدا، خۆش نییە، مرۆڤ (٧٠) ساڵی تەمەنی، لە شار و وڵاتەکەی خۆیدا، هەر هەمان دیکۆر و ئارایشت و دیمەن و ڕوخسار ببینێ. لە وڵاتانی ڕۆژئاوادا، وەرزیانە نەبێ ساڵانە دیکۆر و نمایشی دوکان و پێشەنگا و مۆڵ و بازارەکانیان دەگۆڕن، تەنانەت ناو ماڵەکانیشیان بە چەند ساڵێک جارێک نۆژەن دەکەنەوە بە کەلوپەل و شتی تازەباوو.

لەو دروشمانە کە لە جەماهیرییە، لە زۆر شوێندا دەهاتنە بەرچام و لەبیرم ماون، بە کوردییەکە، ئەمانە بوون:

بەرگریکردن لە وەتەن، بەرپرسیارەتیی منە.

ئیمپریالیزم و زایۆنیزم و کۆنەپەرستی، دوژمنانی منن.

مەعریفە، مافی سرووشتی هەموو کەسێکە.

جەماهیرییە، دەسەڵاتی گەلە.

هەربەردەوامە شۆڕشەکەمان.

زرتلیدان بۆ ئەمریکا و بەریتانیا.

خانوو هی کەسی نیشتەجێیە.

نوێنەرایەتیکردن، فێڵبازییە.

ئیمپریالیزم هەر دەبەزێ.

گەل، جێگرەوەی نییە.

منداڵ، تەربییەتی دایکییەتی.

حیزبایەتیی، دیموکراسی لەباردەچووێنێ.

شەڕاکەتیی نەک هەقدەستییەتیی.

ئەفریقیا بۆ ئەفریقییەکان.

هاوپەیمانیەتیی ئەفریقیا تەنها لەگەڵ خۆیەتی.

سەربەستی، یەکێتی، سۆشیالیزم.

حیزبایەتی خیانەتە.

وەرزش بۆ وەرزشکردنە، نەک تەماشاکردن.

مافی مرۆڤ، گەورەترین درۆی سەردەمە.

براوەکان، بە هێزەکانن.

فەڵەستین چاوی جوو تێرناکات، جوو هەموو نیشتیمانی عەرەبی دەوێ.

قورئان شەریعەتی منە.

گەل لەسەرووی دەسەڵاتە.

کتێبی سەوز، بەرنامەمە.

هەربژی فاتیح.

قەزافی سەرۆک نییە، سەرکردەی شۆڕشە.

بێ پەروا هەر تەحەددایان بکە، ئەی تاکە هەڵۆ.

خودا و موعەممەر و لیبیا و بەس.

جەماهیرییە نەتەوەییە، لیبیا شۆڕشی میللییە.

.............تاد.

ئەمەش، بانگی ئاڵای سەوز بوو:

"ڕەنگەکانی: شین و زەرد و سوور و ڕەش، لە ناخی مرۆڤدا ڕۆحی هیوا ناژێننەوە، بەڵکوو ئەوان هێمای کاولکاری و ماڵوێرانی و بێئومێدین، بەڵام ڕەنگی سەوز، ڕەنگی هیوایە، ڕەنگی ژیانە، تەنانەت بەهەشتیش بە ڕەنگی سەوز ئاماژەی پێدەکرێ. ئا ئەوە ئاڵا سەوزەکەمانە، بەیداخی سەروەری و شکۆدارییە وا لەسەر سەرمان دەشەکێتەوە، لەسەر

خاکی جەماهیرییە، خاکی سەروەری و قارەمانیەتی و گیانفیدایی کە بە خوێنی شەهیدان ئاودراوە، بۆ ئەوەی ئەو ئاڵایە هەر شەکاوە بمێنێتە. دەبا بەیەکەوە سڵاوی (اللە اکبر)ی بۆ بسێنینەوە."

سروودی نیشتیمانی لیبیاش ئەمە بوو:

[نشيد الله أكبر فوق كيد المعتدى]

الله أكبر الله أكبر

الله أكبر فوق كيد المعتدى

والله للمظلوم خير مؤيد

الله أكبر فوق كيد المعتدى

والله للمظلوم خير مؤيد

أنا باليقين وبالسلاح سأفتدى

بلدى ونور الحق يسطع فى يدى

قولوا معى قولوا معى

الله الله الله أكبر

الله فوق المعتدى

الله أكبر الله أكبر

يا هذه الدنيا أطلى واسمعى

جيش الأعادى جاء يبغى مصرعى

يا هذه الدنيا أطِّلى واسمعى

جيش الأعادى جاء يبغى مصرعى

بالحق سوف أهده وبمدفعى

فإذا فنيت فسوف أفنيه معى

قولوا معى قولوا معى

الله الله الله اكبر

الله فوق المعتدى

الله أكبر الله أكبر

قولوا معى الويل للمستعمر
والله فوق الغادر المتكبر
قولوا معى الويل للمستعمر
والله فوق الغادر المتكبر
الله أكبر يا بلادى كبرى
وخذى بناصية المغير ودمرى
قولوا معى قولوا معى
الله الله الله أكبر
الله فوق المعتدى
الله أكبر الله أكبر
الله أكبر الله أكبر

## (٦٤)

# شەوانی گوندی

هەموو ئەو عەیامەی من لە لیبیا بووم، دەوامی پۆلەکانی شەش و هەورازتری قوتابخانەکەم هەمیشە بەیانیان بوو. دەوری سەعات (١٢) و نیو لە قوتابخانە دەردەچووین، تا ڕەسەن و تایەن پۆلی نۆیەمی بنەڕەتیان تەواو کرد، یەکسەر بەرە و ماڵ دەبووینەوە. هەفتەی سێ جار چوار جار، پاشنیوەڕۆیەکەی دەچووینە سرت بۆ بازاڕیکردن. زۆربەی جاران کشکۆم لەگەڵ خۆم دەبرد، لەسەر ڕێگاش مامۆستا تەحسینم هەڵدەگرت. بە دەگمەن ئەو دوکان و شوێنانەی بازاڕمان تێدا دەکرد دەمانگۆڕی، لە دوکانی سالم خەلیفەی کە خوێندکاری خۆمان بوو، زۆربەی شتە پێویستەکانی ماڵی هەبوو، لە شیرنەمەنی و وشکە و شەکر و چا و کەلوپەلی پێویستی ڕۆژانەی ماڵ. بۆ خۆت دەچوویتە ناو دوکانەکەوە ئەوەی دەتەویست هەڵتدەگرت. ئەو کوڕە، یەکجار ڕەفتارجوان و ڕەوەشت بەرز بوو، تابڵێی ڕێزی لێ دەگرتین، باوک و خانەوادەکەشی، کە ناوە ناوە زەحفەتیان دەکردین، هەروا بوون. ئەوجا دەچووینە گۆڕەپانی سەوزە و میوەفرۆشان، کە زۆربەیان میسری بوون و ئەوەی هەیان بوو لەسەر ئەرز یان لەسەر کەچە مێز و تەختۆکە نمایشیان دەکرد. ئەوەندەی لە ئۆتۆمبیلەکە جێگا هەبووایە ئەوا شتمان دەکڕی ــ پێشتر باسی بازاڕی سەوزەفرۆش و میوەفرۆشم کردووە. ئەوجا بامان دەداوە بۆ لای قەساب و نانەوەخانەکان کە ئەوانیش پتر غەیرە لیبی بوون، دوو سێ جۆرە نانیان هەبوو، پتر نانە سوورییەکەمان دەکڕی یان سەموونی بابۆڵە، نیو دۆلار (٣٥) نانی پێدهات. جاروبار سەردانی ئەو سێ چوار دوکانە ماسیفرۆشانەشمان لە دەم دەریا دەکرد.

قەت نە دەچووینە چایخانە و کافتریا، یەکسەر دەگەڕاینەوە. قەت بەبیرم نایە لە چێشتخانە نانم خواردبێ.

کە دەگەڕاینەوە، هەر کەسەی شتومەکی خۆی لە ئۆتۆمبیل دادەگرت و دەچوینەوە ماڵی. ئەگەر بازاڕیمان نەکرد بایە، جاروبار یەکمان دەگرتەوە و لەگەڵ یەک و دوو گەنجی لیبی

برادەر دەچووینە ئەو مەزرا و باغچانانەی لەو ناوە هەبوون. خۆ ئەگەر پرسە یان بۆنەیەکی کۆمەڵایەتی هەبووایە ئەوا بێگۆمان بە ئەرکی خۆمان هەڵدەستاین.

ناوە ناوەش منداڵەکان سەردانی دەستە خوشک و برادەرەکانیان دەکرد، بە ئۆتۆمبیل دەمبردن. بەردەوامیش خانەوادەکان، ئێمە وماڵی مامۆستا تەحسین و فەلەستینییەکان، بە ڕۆژ یان بە شەو سەردانی یەکتریان دەکرد.

جاروباریش، بڵێی مانگێ جارێک سەیرانۆکەکی ئەو دەشت و دەر و مەزرایانمان دەکرد، خبز بالجمر و ماکەڕۆنی و چای و ئەو شتانەمان ساز دەکرد.

بۆ بەسەر بردنی شەوانە. بێگومان لە گوندی هیچ شوێنێک نییە کاتی لێ بەسەر بەری. هەر بۆنە و بۆنەش سەردانی ماڵە لیبییەکانمان دەکرد. بەڵام ئەو حەوت هەشت ماڵە فەلەستینەی لە ئاواییەکە بوون، بەرنامەیەکی شەوانەی تایبەتیان هەبوو، دەتوانم بڵێم زۆربەی شەوەکان، ئەگەر کەش و هەواکەی گیبلی و خۆڵبارین و ڕەشەبا و تەڕوتووشی نەبووایە، بەیەکەوە کۆ دەبوونە و دادەنیشتن.

چۆن؟

شەوانی هاوین، دوای نوێژی خەوتنان، کشکۆ لە دەرگای دەدا و منیش لەگەڵی دەچوومە و ماڵ بە ماڵ پیاوە فەلەستینییەکانمان لە ماڵ دەردەهێنا، دەمانزانی شەو قۆنگرمان لە کوێیە، با بڵێین، لە ماڵی شێخی گەورەی فەلەستینییەکان، شێخ بەیوگە. کە دەچووینە ماڵی وان، پێش وەخت لە پێش دەرگای حەوشە بە لای دیوارەوە و کە گۆڕەپانێکی واڵای فراوان بوو، حەسیر و بەڕە ڕاخرا بوون، شێخ بەیوگ پێشوازی لێدەکردین و دادەنیشتین. شەوان لە نێوان پێنج بۆ هەشت نۆ کەس کۆ دەبووینەوە، تەنها من عێراقی بووم، قەت لیبییەکان لەگەڵمان دانەدەنیشتن.

شەوان، لە ئاوایی، دەبێ بە تاریکی دانیشی، ڕەنگ بێ هەر چرای ستوونەکانی سەر شەقام و کۆڵانەکان هەبن. ماڵەکانیش هەر چرای ناو ژوورەکان دادەگیرسێنن، چونکە مار و دووپشک، کە زۆرن لەو سارا و دەشت و دەرە، شەوان بەرەو ڕۆناکی دێن. شوێنەکە پێشی وارا بوو، ئەو دەشت و دەرەی بەرامبەر بوو و ئەستێرە بە ئاسمان دەبریسکانەوە.

دوای بیست دەقیقەیەک لە دانیشتن، سینە چا دهات و زۆربەی جار کێک و پیسکیت و تۆ و گوڵەبەڕۆژەی لەگەڵ بوو، دوای ماوەیەکی دیکە سینە میوە دەهات، کە زۆربەی جار شووتی و کاڵەک بوو.

قسە و باسی شەوانە، گێرانەوەی ڕووداو و بەسەرهاتی ڕۆژگار بوو. فەڵەستینەییەکانیش خۆمان ئاسا، گەرچی دەمێکە لە زێدی خۆیان دابڕاون، هەمیشە باسوخواس و دەنگوباسی فەڵەستینیان لەسەر زار بوو، ئەوانیش لەو هەندرانە بەسەر گرووپ و حیزب و دەستە و تاقمەکان دابەش بوو بوون.  ئەگەر باسی لیبیا بکرابایە هەر باسی خوێند و قوتابخانە و بازاڕ و پرسە و خۆش و ناخۆشییەکان دەکرا. کەس حەقی بەسەر دەنگوباسی سیاسیی ناوەخۆی ئەوانەوە نەبوو. واباشتر بوو.

دیارترین و خۆشترین، یادەوەریی ئەو دانیشتنانەی شەوان، شەترەنجەکەی نێوان کشکۆ و ئەیمەن بوو ــ لە بڕگەیەکی دیکەدا باسی دەکەم.

دوای دانیشتن لە نێوان (٩٠) دەقیقە بۆ دوو سەعات، هەڵدەستاین و بەرەو ماڵ دەبووینەوە، جا یەکێکمان دەیگوت، خودا یار بێ، سبەی شەو لە ماڵی ئێمەن.

ئەو دانیشتنانە زستانانیش بەردەوام بوو، بەڵام کەمتر، چونکە منداڵەکان خوێندنیان هەبوو و ئێمەش سەرقاڵی دەرس و دەروری خۆمان دەبووین.

ئەوەندە ساڵەی من لەگەل ئەو خێزانە فەڵەستینیانە بووم، قەت عێدزی و ناخۆشیان لە نێواندا نەبوو، تەنانەت منداڵ و ژنەکانیش زۆر جەرگسۆزی دیکدی بوون.

لە ساڵی (١٩٩٨) دوو خێزانی عەرەبی عێراقی هاتنە ئاواییەکە، ئەوان لە قوتابخایەکی ئەو نزیکانە مامۆستا بوون. هەردووکیان شیعە ئایینزا بوون، یەکێکیان، قەت لەگەڵمان تێکەڵ نەدەبوو، چونکە فەڵەستینیەکان سەددامیان خۆشدەویست و شیعەکانیش بە خوێنی سەری ئەو تینوو بوون. ئەوەکەی دیکە دیار بوو بەعسی بوو، لە یەکدوو دانیشتن، لە غیابی من، زۆر زەممی کوردی کردبوو و زۆریش پەلاری بە من دادا بوو، بەڵام ئەوان لەدەمیان دابۆوە، کە ئەوان من وەک مامۆستایەکی نموونەی دەبین و هیچ لەو شتانەیان لێ نەدیووم کە ئەو منی پێ لەکەدار کردبوو. تەنانەی کوڕەکەی ئەو مامۆستایە بە منداڵە لیبییەکانی گوتبوو، کە ڕەسەن و ڕەندی کوڕم لەگەمان پێک نەکەن، چونکە گۆیا ئێمە جاسووسی

ئیسرائیل و جووین. ئەو دوو خێزانە هەر چەند مانگێک لەو قوتابخانە و ئاواییە مانەوە، زوو دوورخرانەوە، چونکە شوێنەکە، لە ڕووی ئاسایشییەوە بۆ لیبییەکان بایەخدار بوو.

کاتێک ڕەسەن و تایەنی کچم، چوونە قوتابخانەی ئامادەیی لە شاری سرت، گەرچی بە پاسی قوتابییان هاتووچۆیان دەکرد، بەڵام ناوە ناوە هەر خۆم هاتووچۆم پێدەکردن، بە تایبەتی کە تایەن چووە کۆلێژی پزیشکی لە زانکۆی تەحددی لە سرت.

## (٦٥)

# ڕیشۆڵەکەی کشکۆ

ماڵەکەی کشکۆ هەر دوو سەت هەنگاوێک لە کۆلانەی دەستە چەپی ماڵەکەمان دوور بوو. خانووەکەی کە هەر یەک هۆدە و حەمامێکی بچووک و حەوشەیەک بوو، بیوەژنە لیبییەک، بە کرێیەکی زۆر کەم، وەک هاوکاری، دابووی بەو. (ام محمود)ی هاوسەری، لەبەر پیریی و نەخۆشی و دەردەسەریی ژیان و ئاوارەیی و غەریبی، تەواو پشتی چەمابۆوە، هەمیشە لە نێو دەرگای ژوورەکە، ڕوو لە حەوشە و ئاسمان لەسەر تەژگە بەڕێک دادەنیشت، ئەوا ئەگەر تەندروستیی زۆر باش بووایە، دەنا هەمیشە لە نێو جێگا هەر قیت دادەنیشت، بالیفێکی دەخستە پشت خۆی و قاچەکانی بە بەتانییەک دادەپۆشی. پرچ و کەزییە سپییەکانی دەتگوت، ئاوی تاڤگەن بەو شاخانەوە دێنەخوارێ. چاوەکانی هیچ دیار نەبوون، چونکە چاوێلکە بن شووشە نەفتەکانی سەریان، وایان دەشێواندن نەتدەزانی چۆنن و چ ڕەنگن و تەماشای کام لا دەکەن. تاڵە مووی سمێل و چەناگەی لە هی کشکۆ درێژتر نەبوو بن، کورتتر نەبوون. ئەوەندە ساڵەی من هامووشۆی ئەو ماڵەم دەکرد، دەمدیت ئەو ژنە هەر کراسێکی عەرد ڕەشی گوڵ گوڵی سپی وردوردی لەبەر بوو، ئەوجا نازانم، چەند دەستە کراسێکی لەو قوماشە هەبووە یان نا. بە دووسێ مانگان جارێک، جیهادی کچی دەهاتەلای، جا چونکە ئەو کچەشی شەش حەوت منداڵی سەلک و بنکی هەبوو و مێردەکەی لە سرت ئیشی دەکرد، هەر ئەوەندە پێڕادەگەیشت.

(ام محمود)، پیرێژنێکی دڵ پاک بوو، بەڵام لە تاو قەهر و جەور و زوڵمی ڕۆژگار و لە دووری شەش حەوت کوڕی بەجێماوی لە میسر و فەڵەستین، هەمیشە پرتە و بۆڵەی بوو. بە سەر زۆر زیندوو بوو، ژنە فەڵەستینییەکان لە زمانی دەترسان، چونکە چی لە دڵ بووایە، ڕوو بە ڕوو پێیدەگوتن. کشکۆ، نازانم بڵێم چی، نۆکەر و خزمەتکاری ئەو ژنە بوو، یان بڵێم کویلە و دیلی بەردەستی بوو. هەرچی بیکردبا، بۆ هەر شوێنێک چووبا، دەبووایە بە ڕەزامەندی ئەو بێ، ئەگەرچی، کە کشکۆ لە دەرگەی ماڵ دەردەچوو، خۆشی نەیدەزانی ڕوو لە کوێ دەکات و بە تەمای چییە.

دەتوانم بڵێم لە وەتەی بووین بە دراوسێ، ڕۆژانە من و کشکۆ یەکترمان هەر دەبینی، ئەگەر ئەو بهاتبا لای من، لە بەردەرگا، یەکدوو جار بە دەنگێکی بەرز دەیگوت: یا ئەڵڵا، یا ئەڵڵا! جا ئەگەر زوو بەپیریەوە نە چووبامایە، ئەوا سەری دەینا نێو دەرگاکە و دەیگوت؛"مامۆستا، فازیل، لە ماڵی؟"

هیچ خانوویەک، لەو ئاواییەکەمان و لە هەموو گوندەکان، دەرگای حەوشەیان پێوە نەبوو، ئۆتۆمبیل دەهاتە حەوشە. ڕەنگ بێ باوەڕ نەکەن، گەر بڵێم، دەرگای ماڵەکان کێلون و قوفڵی پێوە نەبوو. کەس دەخڵی ماڵی کەسی نەدەکرد. جا ئەگەر کشکۆ بهاتبا ژوورەوە، لەبەر هیوانەکە، لە سەر سەکۆی بەر هەیوانەکە دادەنیشت، نەیدەهێشت دۆشەگ و بەڕەی بۆ بینین.

زۆربەی چوونە بازاڕی کشکۆ لەگەڵ من بوو، ئەو ئۆتۆمبیلی نەبوو، پێشتر هەیبوو، بەڵام دیتی کە هیچ ئەرکی لەسەر نییە و پێویستی پێینیە، فرۆشتبووی. بەیەکەوە دەچووینە گۆڕەپانی سەوزەفرۆش و میوەفرۆشان و هەر جێگەیەک پێیویست بووایە. مامەڵەی کشکۆ، کشکۆیانە بوو ــ ئێمە ئەو زاراوەمان داهێنا بوو، با بڵێین ئەو دەیەویست یەک دەسک سڵق بکرێ ــ لە لیبیا شت هەرزان بوو، ئەگەر یەک دەسکە سڵقت، یان یەک شووتی، یان یەک کاڵەکت بویستبا، پێش ئەوەی مامەڵەی بکەی، کابرای سەوزە و میوەفرۆش، دەیگوت:" مەحتەلمان مەکە، دەسکە سڵقەکەت، یان شووتییەکەت یان کاڵەلەکەی هەڵگرە و برۆ عافیتت بێ." واتا بەخوار دەیان دایتێ! تەنانەت، لە نانەواخانە تا (٤) نان بە خوڕایی بوو، چونکە (حەفتا) نان بە یەک دۆلار بوو.

جا عزەت نەفسی کشکۆ ڕێی نەدەدا، داوای یەک دەسکە سڵق لە سەوزەفرۆشەکە بکات و ئەوەیش بڵێ، هەڵیگرە و برۆ! کشکۆ مامەڵەی یەک شکارە (گوونیە) سڵقی دەکرد، پێم دەگوت، منیش دوو دەسکم دەوێ، با (٣) دەسکان بکڕین بۆ هەردووکمان، قبوڵی نەبوو، دەچوو، دە دوانزدە دەسکە سڵقی دەکڕێ. ئەوجا، بۆ هەموو شتەکانی دیکەش، چەندان سندووقە تەماتە و شکارە پەتاتە و زەنبیلە قەڕنابیت و کیسە پیواز، هەتا ئۆتۆمبیلی پڕ دەکرد. ئەوجا دەبووایە سەرێک لە ماڵی جیهادی کچی بدەین و دواتر، ماڵ بە ماڵ لە دەرگای ماڵە فەڵەستینییەکان بدەین، ئەو ڕزقەی بەسەر دابەش دەکردن و خەنی دەکردن.

لەوە دەرچوو بوو، کشکۆ لە کێشە و ئازار و موعاناتی نەتەوەی کورد بە ئاگای بێ، ناوی شاعیر و هونەرمەند و گۆرانیبێژە کوردەکانیشی دەزانی، زۆر جار دوای ئەوەی سواری ئۆتۆمبیلەکە دەبوو، بۆ خۆی دەستی لە نێو کاسێتەکاندا دەگێڕا و دەیگوت:

ـــ مامۆستا، کامیان، شوانەی، عەرەب عوسمانییە؟

لەگەڵ گۆرانییەکان، من ناوەڕۆکی شیعرەکانم بۆ تەرجەمە دەکرد. زۆر کەیفی بە شیعری فۆلکلۆری کوردی دەهات. زۆر سەرسام بوو بە شیعرەکانی مامۆستا هێمن و پەشێو... .

ئەو دەمەوعەسرانەی کشکۆ لە ماڵ دەبوو، من دەچوومە لای، لە دیوی ژوورە و لە بن دەرگاکە، کۆسپێک هەبوو، تەژگە بەڕەیەکی ڕادەخست و دادەنیشتین. کشکۆ ئاشقی حەقیقی شەترەنج بوو، من لەو باوەڕە دابووم، ئەگەر شەترەنجی لێ قەدەغە کرابا زگی دەدا. یان گەر نەساغ بوویا یان لەبەر هەر هۆیەک، بۆی نەکرابا شەترنج بکات ڕەنگبێ شێت بووبا.

ئەگەرچی هەموو کەرەستەکانی کشکۆ، کۆنە مشارێک و یەک دوو مەورەتی سوواو و چەقۆیەکی دەستکردی خۆی و گازێکی پینەدۆزان بوو، هەمیشە، خرە خرِ و تەقە تەقی دەهات. شەترنجەکەی لە ڕۆحی خۆی پتر خۆشدەویست. ئاخر ناهەقی نەبوو، بە سێ چوار ساڵ، ماندبوون و شەونخوونی بۆی درووستکرابوو، سەری بە دەیان قەسابخانە داگرتووە، تا ئەو قۆچەی ئەو دەیەوێ بۆ دروستکردنی داشەکانی شەترنجەکە وەدەستی بێنێ. جا هەر داشێکیشی بە نەقش و نیگار دەڕازاندەوە، ئەو هونەرمەند نەبوو، بەڵام هەوڵی دەدا، سەری ئەسپێک، یان شێوەی وەزیرێک داتاشێ لەسەر قۆچەکە!

تەختەی شەترنجەکەش، هەر دەستکردی خۆی بوو، و چوارچێوەیەکی وەک پروازی بۆ دروست کردبوو.

لەو ساڵانەی لە زانکۆ بووم، فێرە شەترەنج ببووم، تەنانەت کە لە ساڵی (١٩٩٧) لە ڕومادی گەڕامەوە، کۆیە، بە هاوکاریی مامۆستا دڵشاد نەجیب چەلەبێ ـــ ڕۆحی شاد، کە مامۆستای نیگار بوو و پاشنیوەڕۆیان لە (مرکز الشباب) لە کۆیە خوولی بۆ منداڵان دەکردەوە، خوولی شەترنجیشمان کردە و قوتابخانەکان کێبڕکییان لەگەڵ یەکتری دەکرد.

شەترنج، بووە هەوێنی دۆستایەتیی نێوان من و کشکۆ و پەیوەندییەکەی نێوانمانی گەرمتر کردبوو. هەر کە دادەنیشتم، شەترنجەکەی لە نێو کیسەکەیدا دەردەهێنا و بە دەم

قسه کردنەوە، داشەکانی منیشی لەسەر ڕیز دەکرد. بەبێ ئەوەی کەس باسی گەمەکردنی کردبێ.

که ئەو دەکەوتە خەیالاتی جیهانی شەترنج، فڕی بەسەر دونیاوە نە دەما، دەبووایە (ام محمود) چەندجار هاوارکات: کشکۆ، چایەکەتان وا قوڵپان دەدا!

لەسەر تەباغێکی یەکچاوەی گچکە، جاران بەو تەباغەیان دەگوت (چوولە)، کشکۆ زوو قۆریەچایەکەی دەخستە سەر ئاگرەکە، قۆریەکە، کە چینکۆیەکی شین بوو، لە کتڵی یان قۆری شوانەکانی ئەو کێوانە دەچوو. ئەوجا کشکۆ دەچوو قۆرییەچایەکەی دەهێنا و دوو پەرداغی گەورەی لێ پڕ دەکرد. پەرداغەکان بنیان بچووک و دەمیان پەل بوو، کوزکوزی قەدیمی بوون، دەستەباشیەکەشی، هیچ جێگەیەکی نەمابوو نە قنجابێ. بە هەردووکیشمان یەک کەوچک بوو. (ام محمود) هەرچی نەخۆشییە هەیبوو، نەک هەر چا، زۆربەی خواردن و خواردنەوەکانی بە پارێزی بوو.

لە سێ چوار دەستە شەترنج من یەک دەستم لە کشکۆ دەبردەوە، جا هەتا تۆڵەی خۆی نەکردبایەوە، نە دەبووایە دەست بکێشیتەوە و بڕۆی. زەحمەتە ئەو شەوانەی ئەو بە دوراوی چووبێتە نێو جێگا، خەوی لێ کەوتبێ.

غەنیمی گەورەی کشکۆ، لە شەترنج ئەیمەن بوو. ئەو فەڵەستینییە دەرچووی کۆلێژی کشتوکاڵ بوو لە میسر، سەرپەرشتی باغ و چیمەنی هوتێل وەفای دەکرد لە سرت، کە تایبەت بوو بە میوانەکانی قەزافی. کورتەبنە و نەختێ خرپن بوو، قژ و پرچی خۆڵەمێشی بوون و هەمیشە جگەرەی بەسەر لێویەوە بوو، ماڵی ئەو، لەگەڵ هاوسەر و دووسێ منداڵیەکەی، هەر (٣٠٠) هەنگاوێک بەلای دەستە ڕاستی ماڵی ئێمە بوو. ئەو هەمیشە لە گفتوگۆکردندا، دەستەواژەی (لە منی وەرگرە)ی زۆر بەکار دەهێنا.

ئەیمەن، پتر لە کشکۆ خولیای یاری شەترنج بوو، دەیزانی کشکۆ چەند شێتی ئەو یارییەیە، بۆیە هەمیشە نازێکی لەسەر دەکرد. کە دادەنیشتین و کشکۆ شەترنجەکەی دەردەهێنا و داشەکانی ڕیز دەکرد و بە ئاماژە بە ئەیمەنی دەگوت، "دەی، دەستت ببزوێنە، ئەوا من داشێکم، جولاند." ئەیمەنیش، خۆی قورس دەکرد و، دەیگوت. "کشکۆ، وازمان لێ بێنە، با بۆخۆمان دوو قسان بکەین." ئەوجا بەبێ ئەوەی تەماشای تەختەی شەترنجەکە بکا، دەکەوتە گفتوگۆ.

یاریی نێوان ئەو دووانە، بەردەوام بوو، هەر چوار وەرزی ساڵ، بە شەو و بە ڕۆژ، هەر کاتێک دەستیان بەتاڵ بوویە. قەت کشکۆ نەدەچووە ماڵیان بۆ یاریکردن، هاوسەرەکەی ئەیمەن، سەرودڵی بەو هاوار هاواری نێوانیان دەگیرا و پرتاوی دەهێنا. بۆیە ئەیمەن یان دەهاتە ماڵی کشکۆ، یان کە شەوان هەموومان بەیەکەوە دادەنیشتین، ئەوان، بۆ خۆیان خەریکی یاریکردنەی خۆیان دەبوون.

ئەیمەن یاریزانێکی نمرە یەک بوو. ساڵانە لە پێشبڕکێی شەترنج لەسەر ئاستی سرت، خۆی براوەی یەکەم بوو، بەڵام جار و بار، کشکۆ لێی دەبردەوە.

یاریی نێوان ئەو دووە، تقووس و دەستوور و شێوازێکی تایبەتی وەرگرتبوو. هەمیشە دەبووایا کشکۆ، لە ئەیمەن بپاڕێتەوە تا دەست بە یاری بکات لەگەڵی، چونکە زۆربەیجاران ئەیمەن سەرکەوتوو بوو، کشکۆ بە حەسرەتەوە بوو لێی بباتەوە، جا کاتێک ئەیمەن دەیزانی لەسەر دۆڕانە و دەستەکەی خراپە، دەیەویست، بە ئەنقسەت یارییەکە تێکبدا. زوو کشکۆ هانای بۆ دانیشتووانی مەجلیس دەهێنا و دەیگوت:

"کوڕینە، ئێوە شاهید بن، ئێستانا ئێستا من دەستەکە دەبەمەوەی، تکایە ئاگادار بن، ئەگەر ئەیمەن یاریەکەی تێکدا، ئەوا چونکە دۆڕاوە و لەسەری حسێبە!"

ئەیمەن بەوە پەست دەبوو، هێندێک دەکشایەوە دواوە و نارەزایی نیشان دەدا و دەیگوت، کشکۆ منداڵانە ڕەفتار دەکات. جا بەهەزار تکا و ڕجا ئەیمەنمان ڕازی دەکرد، لە بەر خاتری ئێمە، دەست بە یارییەکە بکاتەوە. بەڵام ئەیمەن قبوڵی نەبوو بدۆڕێ. جا یان فێلی دەکرد، تا کشکۆ بیکاتە هاوار هاوار و یارییەکە تێکچی، یان ڕقی خۆی بە منداڵان دادەڕشت و بەسەریاندا هاواری دەکرد، یان بە بیانۆی ئەوەی دەستی بۆ پیاڵە چایەک، یان کوزە شووتییەک بردوە، تەختەی شەترنجەکەی دەجولاند و یاریەکەی تێکدەدا، جاری وا هەبوو کشکۆ تەختەکەی لە باوەشی دەگرت، دەیزانی ئەیمەن لێی تێکدەدا.

ئەگەر ئەیمەن بدۆڕابووایە، زۆر خەفەتی دەخوارد، خۆی لە بیردەکرد و قسەی ناخۆشی بە کشکۆ دەگوت، ئەگەرچی کشکۆ بە باوکی ئەو دەشیا. بەڵام کشکۆ گوێ نەدەدایە بردنەوەکە لە لای ئەو لە جامی جیهانی فوتبۆڵ گرنگتر بوو. جار هەبوو، ئەیمەن بدۆڕابووایە، سێ چوار ڕۆژان قسەی لەگەڵ کشکۆ نەدەکرد، دەبووایە ئەمن ئاشتیان

بکەمەوە، دەمهێنانە ماڵی خۆمان تا یاری بکەن بەو مەرجەی من ببمە حەکەم بەسەریانەوە. کشکۆ عیدزبوون و خۆلالوتکردنی نەبوو. تابڵێ هێمن و بە تەحەموول بوو.

دەمەو عەسرێک چوومە لای کشکۆ، بینیم، وەکو جاران لەسەر کۆسپەکە بە دیار ام محمودیەوە دانیشتووە و خەریکە بە دەرزی و داو، چوار دەوری ئەو کیسە دەدورویتەوە کە داشەکانی شەترنجەکەی تێدا هەڵدەگرێ. کیسەکە، هێندی بەرگە سەرینێک دەبوو، ڕەنگی چووبۆوە، بەڵام قوماشەکەی سفت و توندوتۆڵ بوو. ئەو هێندە بە دەیقەت و بە وەستایانە دوورمانەکەی دەکرد، کە دەرزییەکەی تێڕادەکرد، واتدەزانی لە سینگی خۆی ڕادەکا، هێندە ئەو کیسەی لە لا خۆشەویست بوو. شەش حەوت جار کە دەچوومە لای کشکۆ دەمدیت هەر خەریکی دوورمانی ئەو کیسەیە.

ڕۆژێک پێم گوت:

ــ کشکۆ، وابزانم، ئەو کیسەیە، دەکەیتە ڕیشۆڵەکەی شێرزاد حەسەن!

پرسی:

ــ دە بۆم باس بکە، شێرزاد حەسەن کێیە و ڕیشۆڵەی چی؟

بە وردی باسی هاوڕێیەتی و دۆستایەتیی نێو شێرزاد حەسەن و خۆمم بۆ کرد، کە لە زانکۆی بەغداوە بەیەکەوە بووین. دواتر باسی نووسین و چیرۆکەکانی ئەوم بۆ کرد و پێناسەیەکی جوانم بۆ کرد، ئەوجا هاتمە سەر چیرۆکی (ڕیشۆڵە)کەی شێرزاد حەسەن، کە لە کاتی خۆی لە هەشتاکانی سەدەی ڕابردوو بڵاوی کردەوە. بۆم گێڕایەوە، کە چ گۆبەند و ناخۆشی و پشێویەکی بەدوا داهات، کاتێک کوڕێکی دراوسێیەکەی شێرزاد، هەڕەشە و گوڕەشەی ئەوەداکات، کە گۆیا، ڕواچیی ڕیشۆڵەکانی نێو ئەو چیرۆکە، بە ڕاستی باوکی ئەو کوڕەیە. هەرچەند شێرزاد دەیەوێ ئاوێک بەو ئاگرە داکات، ماڵی ڕاوچی ڕیشۆڵەکان، پتر گەرم دادێن و دەیکەنە ناخۆشی، بۆیە شێرزاد پێیان دەڵێ، وازنەهێنن، کورتە چیرۆکی (ڕیشۆڵە) دەکەمە چیرۆکێکی درێژ، نۆڤلیت. ئەوبوو، لیان بووە شەڕ و ناخۆشی و شێرزادیش وادەکەی خۆی هێنا جێ.

جا کشکۆ گوتی:

ــ دەباشە، بریاربێ، منیش ئەو کیسە بکەمە ڕیشۆڵەکەی شێرزاد حەسەن، بەڵام دەبێ تۆش یارمەتیم بدەی.

رۆژێک کە چوومە لای، بینیم هەر چوار دەوری کیسەکەی هونەرمەندانە بە داوی ڕەنگاوڕەنگ جوان جوان درویتەوە، دەتگوت، یاخە و سەر سینگی عەبای عەرەبییە، بە داوی زێڕین نەخشیندراون. جا لێ پرسیم: ئێستا چی لێ بکەم؟ منیش گوتم، لەسەر ڕوویێکی کیسەکە، نیگاری ئاڵای فەڵەستین بە دوورمان بنەخشینە!

کشکۆ ئافەرینێکی بەسەردا باراندم و گوتی، بە ناوی خودا، ئەوا بریارم دا.

خودا بۆ کشکۆی دا. کەوتە گەڕان و پشکنین و سۆراغکردنی ئەو داوانەی کە ڕەنگیان لەگەڵ ڕەنگی ئاڵایەکەی فەڵەستین دەگونجێ، ئەو دەزوو و داوانەی کۆدەکردەوە کە خۆڕاگر و باش و جوان بوون.

نەک هەر لە ماڵ، لە قوتابخانەش، کە دەستی بەتاڵ دەبوو، هەر خەریکی ئەو دەرزی و دوورمانە بوو، مامۆستا و قوتابییەکان هێندە پرسیاریان لێکردبووە:"مامۆستا کشکۆ، ئەو چی دەکەی؟". هەموو ئەو دەڤەرە بە چیرۆکی ڕیشۆڵەی شێرزاد حەسەن ئاشنا بوون، چونکە ئەو لە وەڵامی پرسیارەکە دەیگوت:" وا خەریکی ڕیشۆڵەکەی شێرزاد حەسەنم."

دوو سێ مانگی پێچوو، تا ئاڵای فەڵەستین هاتە سەر پشتی کیسەی شەترنجەکە. جا کە کشکۆ پرسیاری ئەوەی لێ کردم، چ لە دیوەکەی دیکەی کیسەکە بکەین، پێشنیارم کرد، کە وێنەی (مسجد الاقصی) لەسەر بکێشێ و بیکاتە نەخش و دوورمان، وەک ڕەمزێکی فەڵەستینی و ئیسلامی.

دەتوانم بڵێم دوای دوو سێ مانگ نەخش و نیگارەکانی سەر کیسەکەی کشکۆ تەواو بوو، بەڕاستی هەرکەسێک سەیری دەکرد، وەک تابلۆ یان کارێکی هونەری پێی سەرسام دەبوو. ئەوەبوو، لە وەرزی چالاکییەکانی ڕۆشنبیریی جەماوەری لە قوتابخانەکاندا، کە نمایشی هونەری و وێنە و تابلۆ کرایەوە، کە خۆم هەموو ساڵێک بە چەند کارێکی هونەری ژوورێکی سەربەخۆم بۆ نمایشی کارەکانم تەرخان دەکرد، کیسەی شەترنجەکەی کشکۆشمان لە شوێنێکی بەرچاو هەڵواسی، هەر میوانێک دەیپرسی ئەوەچییە: کشکۆ دەیگوت:

ـــ ئەو ڕیشۆڵەکەی شێرزاد حەسەنیە!

وەک پێشتر ئاماژەم پێدا، کشکۆ ئێستا بەدەست زەهایمەرەوە گرفتارە و لە کن جیهادی کچیەتی لە زلێتن (٢٠٢٣)، بەڵام کیسەکەی شەترنجی هەر لە تەنشت خۆی دادەنێ،

کوڕەکانی لە فەڵەستین و میسر، لە پێجی فێیسبووکی خۆیاندا، وێنەی ئەو ئاڵایەی سەر کیسەکەی باوکیان نمایش کردبوو. بەڵام باوەڕ ناکەم ئەوان ئاگاداری چیرۆکی (ڕیشۆڵە)کەی شێرزاد حەسەن بن لە میسر و فەڵەستین.

## (٦٦)

# داهات و بازاڕ و ئابووری لیبیا

لەبیرمە،ساڵی (٢٠٠٥) بوو، شوفێرێکی لیبی کە لە پێش من بوو، گوژمە دینارێکی لەناو مستیدابوو لە بەنزیخانەیەکی سرت، بە توڕەیی لەگەڵ کابرای بەنزینفرۆش گارە گاری بوو و جنێوی دەدا، دەیگوت،"ئێرەش کاول بوو، بە قوڕێ گیرا، بووەتە فەلوجە!" ـــ ئەو کات شەڕ و پێکدادان لە فەلوجە مانشێتی هەموو دەنگوباسەکانی جیهان بوو. مەسەلەکە ئەوە بوو نرخی یەک لیتر بەنزین ببووە نزیکەی (١٤ سنت). من کە تازە چوومە لیبیە بە (٤ - ٥) دیناری لیبی، تانکی ئۆتۆمبیلی گچکەت سەرڕێژ دەکرد، وا بزانم لتری بە (٤سنت) بوو.

گەرچی لیبییەکان ناخۆشی و زەحمەت و دەردەسەریی زۆریان چێشت ساڵانی گەمارۆ قورسەکەی بەسەریاندا سەپێندرابوو، بەڵام گرانیان نەدیتبوو، ئەوان فێرنەببوون بەنزین بەو نرخە گرانە بکڕن.

چەندان جار گوتمان، لیبیا وڵاتی خێڵ و هۆزە، بۆیە هیچ نهێنی و سرڕێک لەو وڵاتەدا نییە، هەموو شتەکان لە مەربوعەکان باس دەکران و خەڵکەکە دەیانزانی داهاتی وڵاتەکەیان چەندە و خەرجییەکانیشیان چەندە.

کە تازە کودەتایان کردبوو، لیبیا هیچی نەبوو، یەکدوو ساڵان بە فرۆشتنی ئاسن و فافۆنی کۆنە و سیکرابی ئۆتۆمبیل و چەک و تۆپخانە بە جێماوەکانی ئیتاڵیا دەژیان. کە لە حەفتاکان نەوت دۆزرایەوە، وردە وردە ئاهێکیان هاتەوە بەرێ.

جا چونکێ لەسەرتادا، قەزافی پرۆژەیەکی ئاوەدانکردنەوەی گەورەی لە سەرتاسەری لیبیا ئەنجامدا، کە بە قسەی بە پرسێکی ڕووسی، کە ئەوەی لەو وڵاتەدا لەو ماوە کورتەدا کراوە، بەوان نەدەکرا! خەڵکی لیبیا هەمیشە چاویان لە دەستکەوتی مەزنتر و پێشکەوتنی باشتر بوو. قبوڵیان نەبوو بۆ دواوە بگەڕێنەوە. هەمیشە دەیانگوت، "بۆ ئێمە چاو لە دوبەی بکەین، دەبێ ئەوان چاو لە ئێمە بکەن، چونکە ئێمە دەوڵەمەندتر و هەبووترین!"

قەت لەو لیبیایە، هیچ شتێک بە قەت سەروەت و سامان و پارەوپوولی ئەو وڵاتە جێگەی مشتومڕ و قسە و بگرەوبەردە نەبووە، ناهەقیشیان نەبوو، ئەوان دەیان زانی ڕۆژانە چەندی دەفرۆشن و داهاتیان چەندە. جارێک قەزافی گوتی:"من نەوتم بۆ چییە؟ قابیلە من نەوت دەخۆمەوە؟ ژنە لیبی بیست و چوار سەعات بنێشتیان لە زاریە، ئێ لەسەر منە بچم بنێشتیان بۆ بکڕم. کەواتە دەبێ بچم ئەو نەوتە، گەر بە ئیستعماریش بێ، بفرۆشم تا پارەی بنێشتیان بۆ بێنمەوە!" جا ئەو خەڵکە دەیان پرسی،"قابیلە، پارەی ئەو هەموو نەوتە هەر بۆ بنێشتی زاری ژنانە؟"

ڕۆژێک بەرپرسێکی گەورە، کە برادەرم بوو، ناوە ناوە دەردە دڵی خۆی لەلا دەکردم، دەیگوت،"هیچ سەرمان لەو موعەمەرەی خۆمان دەرناچێ، ئاخر ئێمە چیشمان بە شۆڕشگێڕانی ئایرلەندی و مۆریتانی و سوودانی و ئەمەریکای لاتینییە، بچین کۆمەکیان بکەین و چەک و چۆڵیان بۆ بکڕین و پارەیان بەسەردا ببەشینەوە؟ دەبینی بار و دۆخی ئێمە چۆنە، پاسەوان و کرێکار هەیە لەو کۆمپانیایانە دوو مانگە مووچەیان وەرنەگرتەوە. تۆ دەزانی لەو سارا و بیابانە، جێگە نەماوە، (حاویەیی) پڕ دۆلاری تێدا نەشاربێتەوە. ئێ بۆدەچی، (حاوییە)دۆلاران لەو سارایە دەرزینیت و بەسەر گەلەکەی خۆت دابەشی ناکەی؟ بۆ کەی هەڵدەکری؟ " ئەوە یەکەمین جار نەبوو، من گوێم لە (حاوییە دۆلاری شاردراوە) بێ لە زاری خۆیانەوە!

ساڵی (١٩٩٩)بوو، قەزافی سەردانی تشادی کرد، (عەلی) دراوسێمان، کە هەر دیوارمان نێوان بوو، وەک پاسەوان یاوەری قەزافی بوو لەو سەفەرەدا، لێم پرسی،"سەفەرەکەتان چۆن بوو؟" گوتی،"هەموو هەر خێروبەرەکەت بوو، لە هەردوو لای شەقامەکانی ئەنجامینا ئەو خەڵکە بە هەزاران هەزار بۆ پێشوازی قائید ڕاوەستا بوون، ئێمەش هەر بە سندووقان دۆلارمان بەسەردا دەکردن. هەمووی خەنی ببوون. دوو هەزار مەسیحییەک هاتن بوونە موسڵمان."

ڕاپۆرتەکان هەمیشە باسی سەخاوەتی قەزافیان دەکرد کە دەچووە ئەو وڵاتانەی ئەفریقیا، جگە لە پارە بەشینەوە، پرۆژەی زۆریشی بۆ دەکردنەوە، لە خانووبەر و ڕێگاوبان و ئیستگەی کارەبا و خەستەخانە و قوتابخانە...

له (٩٤٪)ی داهاتی لیبیا له نەوتەوە بوو. ئەو له ئەفریقیا، له بەرهەمهێنانی نەوت یەکەم و له گاز دووەم بوو. دوای هەڵگرتنی ئابلوقەی ئابووری، له ساڵانی (٢٠٠٣ ــ ٢٠٠٤) ڕۆژانه نزیکەی دوو ملیۆن بۆشکه نەوتی دەفرۆشت. له ژێر زەویش، نزیکەی (٤٢) ملیار بۆشکەی هەبوو، ئەوا جگه له گازی سرووشتی.

له کارگه و فابریقەشدا، کارگەی ئاسن و پۆڵا و چەمەنتۆ و سۆدا و پەین و پیشەسازیی پەترۆکیمیاوی گەورە گەورەی هەبوو. له کشتوکاڵیش بەرهەمێکی جوانی له جۆ و گەنم و زەیتوون و خورما و سەوزە و میوە هەبوو. له ساڵی (٢٠٠٩) داهاتی ڕۆژانەی (١٦٠) ملیۆن دۆلار بوو. هەموو ساڵێک گەنجینەکەی هەر پڕ بوو قەت لەکەمی نەدەدا.ــ گەر واشیان گوتبایە، باوەڕیان پێنەدەکردن.

هاوردەکانی لیبیا بریتی بوون له خۆراک و ئامێر و کەرەستەی کارەبا و جلکوبەرگ و ئۆتۆمبیل و ئامێری کشتوکاڵی کەرەستەی بیناسازی و کەلوپەلی ناوماڵ.... هاوردەکانیشی به پلەی یەکەم له ئیتاڵیا بوو، ئیسپانیا، ئەڵمانیا و ئەوجا تورکیا. لیبیا بۆ خۆی دەیان کارگه و بانک و دامودەزگای وەبەرهێنانی له ئیتاڵیا و ئەڵمانیا و ئەفریقیادا هەبوو.

بازاڕی لیبیا، بازاڕی بەکاربەربوو، جا چونکه باری گوزەرانی و بژێوییان باش بوو کەرەسته و شتومەکی باشیان دەکڕی، بەدەگمەن کەرەستەی چینی و میسری و سورییان هاوردە دەکرد. هەموو کەرەستەکانیان ئەوانەی دەرەجەی یەکی ئەورووپایی بوون و مارکه بوون. ـــله بڕگەیەکی دیکه باسی ئەوانەم کردووە.

لەگەڵ کوژرانی قەزافی، باسوخواسی سامان و پارەوپۆلی (ئەو سەرکردە و خانەوادەکەی) زۆر به گەرمی بووە مانشێت و بنێشته خۆشەی سەر زاران. هەر لەگەڵ یەکەم چەخماخەی ڕاپەڕینی چەکداری، باراک ئۆبامای سەرۆکی ئەمەریکا، یاسای سڕ کردنی هەموو سەروەت و سامانی لیبیای.له بانکەکانی ئەمریکا دەرکرد، که به ملیارەها دۆلار مەزەنده دەکرا. دەگوترا پاره و پولی لیبیا له دەرەوە نزیکەی (١٥٠) ملیار دۆلار و (١٤٤) تەن ئاڵتونه، له بانکەکانی نەمسا و بەریتانیا و کەندا و فرەنسا و ئەڵمانیا و ئیتاڵیا و سویسرا و ئەمریکا و دەوڵەتی باشووری ئەفریقیا هەڵگیراون. به قسەی ئەحمەد قەزافی ئەل دەم، ئامۆزای موعەمەر، لیبیا خاوەن نزیکەی (٦٠٠) ملیار دۆلار بوو به نەختینه و ئاڵتون.

با واز لەو دەهوڵ و زوڕنایە بهێنین، کە نەیارانی قەزافی، دوای کوژرانی خەڵکیان پێ هەڵدەپەڕاند، کە قەزافی دز و چەتە و بەتاڵانبەری سامانی لیبیا بووە بۆ بەرژەوەندیی خۆی و خانەوادەکەی. قسە لەسەر ئەو بەڵگانە بکەین کە لەبەردەستن:

لەگەڵ هەڵگیرسانی ڕاپەڕینی چەکداری لە لیبیا، قەزافی (١٦٠) ملیۆن دۆلاری لە بانکێکی ئەڵمانیا ڕاکێشاوە و لە گەنجینەی بانکی بەنغازی داناوە. نازانرێ کە ئەو بڕە پارەیە چی لێ بەسەر هاتووە!

لە ئەڵمانیا، دوایی (٢٠١١)، دوو کەس دەگرن چونکە بڕێک دۆلاریان پێبووە، ژمارەکانیان هی ساڵانی زوو بووە، لە لێپێچینەوەدا، دەردەکەوێ کە ئەو دۆلارانەیان لە تورکیا کڕیوە، هەر (١٠٠) دۆلار بە (٧٥) دۆلار. گۆیا ئەوە دۆلاری لیبی بووە ـــ ئەو دۆلارانە لە بازاڕی کوردستانی باشووریش ناوی دەهات. پێدەچێ، ئەوە تاڵانی پارەکانی لیبی بوو بێ لە بانکەکانی لیبیا لە گەرمەی ڕاپەڕینەکەدا، خۆتان دەزانن، تورکیاش، بازاڕێکی گەورەی قاچاخچییەتیە!

تاکو ئێستا هیچ بەڵگەیەکی فەرمی نەخراوەتە بەردەست، کە قەزافی و هاوسەرکانی و منداڵەکانی حیسابی بانکیان بە ناوی خۆیان هەبوو بێ، دەگوترا لە بانکەکانیماڵتا و قوبرس هەیانە، بەڵام ساغ نەکراوەتەوە.

سەرچاوەکان دەڵێن، وڵاتانی ئەوروپا و ئەمریکا دەستیان بەسەر پارەوپوڵ و سامانی لیبیا داگرتووە. تاوەکو ئێستا ئامادەنین یەک دۆلار، وەک کۆمەکی مرۆیش بدەوەنەوە هاووڵاتییانی لیبی.

لەگەڵ کوژرانی قەزافی و ڕووخانی جەماهیرییە، هێندێ لەو لیبییانەی لایەنگر و هەواداری ڕاپەڕینەکە بوون لە لەندەن، هەڵیان کوتایە سەر قەسرێکی قەزافی لەو شارە، کە بای (١٢) ملیۆن دۆلارێک دەبێ. ئەوانەی تێیدا بوون چۆڵیان کرد و ڕاپەڕیووەکان دەستیان بەسەر داگرت و چون تێیدا دانیشتن. بەڵام کاتێک دیتیان ئەو قەسرە مەسرەفی کارەبا و ئاو و زبڵ و خاشاک و ئینتەرنێت و خزمەتکردنی باخ و چیمەنی و باجی زۆرە و بەوان دابین نابێ و حکوومەتی بەریتانیا بە یاسا پارەی خۆی دەوێ، چۆڵیان کرد. ئێستا (٢٠٢٢)، ئەو قەسرە بووتە گووفگ و زبڵخانە و بەڕەڵایە و دەرگای کلۆم درایە و کەس بەلایەوە ناچێ.

بەڵام بەڵگە لەبەردەست دایە، کە منداڵەکانی قەزافی، لە ڕێی بانکەکانی لیبیاوە، پارەیان ڕاکێشاوە، بەناوی جێبەجێکردنی چەند پرۆژەیەک ــ پێشتر لێرە، ئاماژەمان بە ڕۆڵی منداڵەکانی قەزافی داوە. ئەوان لە خۆشترین ژیان دابووین و بێ دڵی خۆیان نەکردوە. قەزافی، وەک هەموو سەرکردەیەک، لە قەسرەکەیدا، لە باب ئەل عەزیزیە، شاهانە ژیاوە و ناوماڵ و شتومەکەکانیان شاهانە بوون.

کەواتە هەر ڕۆژێک، ئەو پارەوپۆل و ئاڵتۆنە دەستبەسەر داگیراوانە، بگەڕێندرێنەوە بۆ لیبیا و دەستێکی پاک و ئەمین کاریان پێ بکات، دەتوانن لیبیا تەواو نۆژەن بکەنە و بژێننەوە. ئەوەشمان لەبیر نەچی، لیبیا بە دەیان کارگە و فابریقەی لە وڵاتانی جیهانی هەیە بە ناوی خۆی.

بۆ مێژوو، خانوو و ناوماڵ و ئۆتۆمبیلی ئەو خزم و کەس وکارەکانی قەزافی کە لەو ئاواییە بوون، من ئەو چەند ساڵەم لێ بردەسەر، بەگشتی، هیچ فەرق و جیاوازییەکی وایان نەبوو لەگەڵ هی خەڵکی عەوامی گوندەکە.

## (٦٧)
# کۆڵیتەکەی کشـکۆ

حەز و خوولیای من بۆ باڵندە و تەیروتوار ــ وەک لە پێشەکی کتێبی (کەو لە کوردەواریدا) باسم کردوە، بۆ نۆستالیژیای سەردەمی منداڵیم دەگەڕێتەوە. ماڵەکەمان لە خوار مزگەوتی خانەقایەیی گەڕەکی قەڵاتی، کە هەر سێ هۆدە بوو، جگە لە (١٨) منداڵ و دوو دایک و باوکم، دوو سێ جووت قەفەز کەو و سوێسکە و شەش حەوت مریشکی کوردی و کەڵەشێری شامی و دەیان جووجەڵە، لە ژێر بنمیچیدا دەحەوانەوە. پاییزانیش بەرانێکمان دادەبەستا بۆ قاورمەی زستان. پێش ئەوەی بکەومە سەر پێ، دایکم دەیگوت: باوکت سەگێکیشی هەبوو لە گۆڕەپانی کۆڵانەکەدا، گەوەڕی بۆ دروست کردبوو.

سەربوردە و حیکایەتەکانی شێت و شەیدایی باوکم بۆ ئەو پەلەوەرانە، یەک و دوو نییە: بۆ ئیشێک دەچێتە قەڵادزێ، لە کۆڵان چاوی بە مریشکێکی کوردیی جوان دەکەوێ، چەند کەسێکی ئەو شارە لەگەڵ خۆی دەباتە ماڵی خاوەن مریشک و داوای مریشکەکەیان لێدەکات، کابراش دەڵێ، قەسەم بەخودا، وامزانی بۆ داخوازیی کچەکەم هاتوون. لە هوتێل شەهلاش لە بەغدا، گوێ لە قاسپەی کەوێکی دەنگ خۆش دەبێ، کە سەربازێکی کورد، لە کوردستانەوە، وەک دیاری بۆ ئەفسەرێکی عەرەبی هێنابوو، باوکم دەچێتە مەیدانی تەیروتواران، کەوێک پەیدا دەکات و دەچێ، بە دزییەوە، لە گەڵ کەوی نێو قەفەزەکەی دەیگۆڕێتەوە. چەند ساڵێک لە کۆیە، کەوی بەغدایی ناوی لەسەر زاری کەوبازەکان بوو، لای وان هەر کەوێک ناو و نازناوێکی خۆی هەیە.

کە ماڵمان، لە نزیک باخچەکەی (صغەیر) بوو لە غەربیات، توولە سەگێکمان هەبوو، ناوی بۆڕە بوو، کە ماڵیشمان گواستەوە، ئەویشمان لەگەڵ خۆمان برد، بەڵام دواتر، برا فەلەستینییەکان ڕازی نەبوون، سەردانمان بکەن، دەیانگوت، ماڵێک سەگی تێدا بێ، نوێژی تێدا درووست نییە.

هیچ ماڵێک نەبوو لە ئاواییەکەماندا، ڕێک بەرانبەر خانووەکەی، پارەچە زەوییەکی خۆی نەبێ، بۆ هەوێز و کۆڵێتی مریشک و قاز و مراوی. من کۆڵێتێکی قشتم بۆ مریشک و

مراوییەکانم درووست کردبوو، لەگەڵ چەند هێلانەیەک بۆ کۆتران. دەتوانم بڵێم، کەم هێلکەی بازاڕمان دەکڕێ. بۆ خۆخافڵاندن و خۆلەبیرکردن دەروون هێورکردنەوە ئەو مریشک و مراوییانە بۆ من هاوڕێی باش بوون.
ماڵەکەی کشکۆ، کە لە بێوەژنێکی بەکرێی گرتبوو، هەر یەک هۆدە و هەیوانێک بوو، قوونە خانوو بوو، بۆیە پارچە زەویی خۆی نەبوو بۆ ئاژەڵداری و پەلەوەر بەخێوکردن.
لەگەڵ ماڵی کشکۆ لە دەستە چەپەوە، هەر کۆڵانەیەکمان بەین بوو، جا لەبەردەم ماڵەکەماندا، کە گۆڕەپانێکی کراوە بوو، ئەو دیوی باخچە و کێڵگە و بووستان بوو، ڕێک لە لای دەستە ڕاست، بەرانبەرمان دارخورمایەکی بەرز و گەورە هەبوو.
بەڵام چ دارخورمایەک؟!
هەمووتان دارخورماتان دیوە، درەختێکی قەد گرنج گرنجی بەرز و بڵند، لە تۆقەڵەیدا، چەتر ئاسا، گەڵا نوک تیژ تیژەکانی لە شێوەی نیوە کەوانە بۆ خوارەوە سەرشۆڕ دەکەنەوە. ئەگەر دارەکەش بەردار بێ، ئەوا هێشوو هێشوو قەسپی دەنگ زەردی ئاڵتوونی بە دەووری قەدەکەیدا، لە سەرەوە، شۆڕ دەبنەوە.
دارخورما تەبیعەتێکی هەیە، هەموو ساڵێک چەند چڵێکی نوی لە تۆقەڵەدا دەردەکات و ئەوانیش گەڵا نووک تیژەکانیان لێ دەردێ، دەبێ جوتیار ساڵانە، لقەکانی ژێرە و بە داسووکە یان مشار ببڕێتەوە، جا شوێنی هەر چڵێکی بڕاوە دەبێتە گرنجێکی نوێ و باڵاکەی وردە وردە هەڵدەکشێ. دارخورما لەو موصراتەیە هەبوو، پتر لە بیست مەتر بڵند بوو. بەڵام ئەگەر کەس خۆی لە دارخورما نەگەێنێ و وەک بڵێی بەرەڵا بکرێت، ئەوا لەسەر زەوییە و ئەو گەڵا نووک تیژانە، بە بازنەیی، بە دەوریدا پەرش و بڵاو دەبنەوە، دەکەونە سەر خۆڵە پۆتەکە. جا ساڵ بە ساڵ خەڵفی نوێ دەردەکات و ئەوانیش لە سەرەوە، بە چوار دەوریدا سەرشۆر دەکەنەوە. ئەو جۆرە دارخورمایە، بنکەکەی، باوەڕ بکەن، هەر شتێکی لە دار گوێز بچووکترە. کەم کەسیش دەیتوانێ تخوونی کەوێ، هەمووی هەر دڕکە نووک تیژە درێژەکانە.
ئەو دارخورمایە، کە لە نێوان شوورەی خانووەکەی ئێمە و ماڵی عەلی بوو، بێ خاوەن بوو، وەک بڵێی خواکردە بۆ خۆی لەوێ شینبوو، جا بەدرێژایی تەمەنیشی کەس دەخڵی

نەکردووە و وردە وردە لە جێگەی خۆی گەورە بووە و بووەتە ئەو منارە نێو قەد ئەستوورە دڕکاویی و پەرش و بڵاوە.

کشکۆ، لەسەر عێشق و ڕەزای دەرە و درواسییەکان، ئەو دارخورمایە بۆ خۆی کردبووە کۆڵێتی مریشکان.

لێ چ کۆلیتێک؟!

جارێ، بۆ تەلبەندکردن و دروستکردنی تەیمان بەدەووری ئەو دارخورمایەی کە قوونی لە عاردی و سەری لە عاسمانان بوو، کشکۆ هەر تۆڕە تەلی تەیمان و بەرچیغ و ئەستوونگ و تەختە و ئاسنێکی دەست کەوتبێ، ئەوا بە دوای خۆیدا ڕادەکێشی و بە وەستایی خۆی لەوێدا دەچەقێنێ و دەیچەسپێنێ. لە هەر شوێنێکی ئەو ئاواییە کەچە دەرگایەک یان پەنجەرەیەکی شکاو و پکا هەبوو بێ، ئەوا ئەو گەیشتووەتە سەریان و بە شانان بۆ ئەوێ هەڵی گرتوون.

ئەگەر دارخورمایەکە نەبووایە، سەیرکەری ئەو دیمەنە، ڕەنگ بێ وابزانێ ئەو شوێنە تەلبەندکراو و دڕکەزیباوییە، بەندیخانە یان کەمپێکی سەربازییە.

بە وەستایەتیی خۆی دەرگایەکی بچووکی لە گۆشەیەکی ئەو کۆڵێتە گەورەیەدا دروستکردبوو، لە جیاتی قوفڵ و کلیل، لە سێ چوار جێگە بە ئەلقەی تەل لێکی گیردەکردن.

هەر وەختەکی کشکۆ لەو تەلبەند و دەرگایە نزیک بووبایەوە، ئەوا لە دیوی، بەتەلیۆنێک مریشک و قاز و مراوی بەرەو پیریەوە دەهاتن. بۆیە هەرکە خۆی دەکردە نێو تەلبەندەکە، گورج دەرگاکەی ئەلقەڕێز دەکردەوە.

ئەرزەکەی ئەو کۆڵێتە، هێندە ڕیقنە و پەڕ و پەرەمووچ و پاشماوەی ئەو پەلەوەرانەی لەسەر کەوتووبوو، تەپووتۆزی مردبوو. هەر کەسێک، یەکەمجاری بێ سەر بەو جێگەیە دابگرێ، سەرەتا ماوەیەک دۆشدادەمێنێ و دیمەنە ناوازەکان سەرسامی دەکەن.

کشکۆ بۆ خۆی نەدیدەزانی چەند مریشک و کەڵەشێر و قاز و مراوی و جوجەڵەی هەیە. هەر ئەوەندەی دەزانی، مانگ دوای مانگ لە زیاد بوون دابوون.

ئەو کۆڵێتە، فەزایەکی کراوە بوو، لە دووری سێ چوار مەتر، بە دەوری ئەو دارخورمایە هەمووی گەوەڕ و کۆڵێتی گەورە و کچە بوو، هەموو کۆڵێتەکان کۆنە سندووق و تایەیی

ئۆتۆمبیل و کەچە دۆلاب و ئیغدانی فڕێدراو بوون. قەت نەبوو دووانیان پێکبچێ، هەبوو چوار پێنجێک کەوتوبوونە سەر یەکتری.

شەش حەوت تەشت و لەگەنگی گەورە گەورەی پەل، نەک قوول، لەو سەر ئەرزە بە نارێکی ڕێزکرابوون، ئاوەکەی ناویان شێلو و ڕەنگ خۆڵەمیشی بوو، ڕۆژانە بۆ خۆی پڕی دەکردنەوە، هەرچەندە جۆگەڵە ئاوەڕۆیەکی بچووک بە ناویدا تێدەپەڕی، کە بۆ قاز و مراوییەکان ببووە گۆلاو.

دیمەنە سەرسوڕهێنەرەکەی ئەو کۆڵێتە، لە تابلۆکانی دارخورمایەکەدابوو: لەبن لق و گەڵای دارەکە دوو سێ مریشک، جێگەی خۆیان خۆش کردبوو، هەموویان چەندان هێلکەیان تێدابوو. نەختۆکەک واوەتر، قازێک لەسەر هێلکان کڕ کەوتبوو، لە لایەکی دیکەش مراوی لەسەر هێلکان بوو. لەبەرزی دوو سێ گەز، نهۆمێکی دیکەی مریشکان بوو، گەڵاو و لق وپۆپەکانیان وا ڕێکخست بوو، دەتگوت، جۆلا بۆی چنیوون، سێ چوار جێ پڕ هێلکە بوون و تاک و تەراش مریشکیان لەسەر کڕ بوو. ئەوجا بڕۆ بۆ نهۆمی سێیەم و چوارەم و پێنجەم... مریشکەکان، چونکە لە سندووق و کوولانکەکان جێگەیان وەدەست نەدەکەوت، سەر ئەو دارخورمایەیان، جێ جێ، نهۆم نهۆم کردبووە، کۆڵێتی خۆیان. ئەتۆ خەریکی تەماشاکردنێ مراوییەکی کڕکەوتوو بووی، هێندەت دەزانێ لە نهۆمی چوارەمی دارخورمایەکەوە، مریشکێک یان دووان، بە باڵەفرە دادەبەزینە سەر ئەرزی. جا بۆ بەسەر کەوتنەوە، هەبوو دەچووە سەر سندووقێک یان تایەیەکی هەڵپەساردراو و لەوێ وە بەرەو دارخورمایەکە هەڵدەفڕی و دەچۆوە جێگەی خۆی. هەشبوو، لقەکانیان وەک پێپلیکانە لێکردبوو، ساڵدانە ساڵدانە، بەدەم گارەگارە و بەرەو سەرەوە دەچوون. من هەر لەو کۆڵێتە بینیم، مریشک بەرەو بەرزایی هەڵفڕێ و بچێتە سەرەوەی دارخورما و هەڵنیشێ. ئەو پەلەوەرانە سرووشتیی گەورە ببوون، نەگەچرابوون و هێ زۆر جوانیان تێدا بوو، ئەوان بە مریشکی کوردی دەڵێن ( دەجاج بەلەدی).

هەرچی تەمەنێکت دەویست لە مریشک و قاز و مراوی هەبوو. هەبوو تازە یەک دوو جووجەڵەی هەڵێنابوو، هەبوو تەمەنیان یەک حەفتە بوو، سێ حەفتە و دوو مانگی و باڕۆکە و قەیرە و تا پیرە مریشک و قاز و مراوی.

ئەلەف و نان هەرزان بوون، فەردە نانێک بە دینارێک بوو. کشکۆ هێندێکی بەبەر مریشکەکان وەردەکرد و هێندکێشی بۆ قاز و مراوییەکان لە تەشتە ئاوەکان دەکرد. دەرودراوسێش، ڕۆژانە هەر پاشماویەکی خواردنیان هەبووایە، لەو دیو تەیمانەکەوە، بۆ ناو کۆلێتەکەیان هەڵدەدا.

هەموو جارێ کشکۆ، پێتەراوزووێکی دەخستە بن هەنگڵی و پڕ دەکرد لە هەر سێ جۆرە هێلکە، هێندێک جێگاکەیان هێندە عاسی بوو، قرانگی بۆ دروستکردبوون، تا ڕایان کێشێتە لای خۆی. خۆ هێلکەکانی سەر لق و پۆپی دارخورمایەکە، پیاو نەبوو بتوانێ دەستیان بۆ ببات، هەموو زەمەند و گەڵای نووکتیژ بوو. یان ئەوەتا لەبەر ئەو خۆرەتاوە پیس دەبوون، یان مریشک لەسەریان کڕدەبوون و دەبوون بە جووجەڵە.

کشکۆ هەر چەند هێلکەیەکی بۆ خۆیان دەگێڕایەوە، دەنا ئەوەکەی دیکەی بەسەر ماڵە فەڵەستینییەکان و ئەو دراوسێیانە دابەشییەوە کە پاشماوەی خواردنیان بۆ پەلەوەرەکانی دەبرد. ئەو قەت یەک هێلکە و یەک مریشکی نەفرۆشتووە. بەڵام زاعێی دەکردن. زۆربەی جاران کە سەری لە جیهادی کچی دەدا، لە سرت، بێ هێلکە و مریشکی نەدەکردن. کەس دەخڵی ئەو شتانەی نەدەکرد، خەڵکەکەش چاویان تێر بوو، ــ پێشتر گوتمان، زۆربەی دەرگا و بانی ماڵەکانی ئاوایی بێ قوفڵ و بێ کێلون بوون.

کشکۆ هەمیشە حەزی دەکرد، کە چووە شوێنێک، ئەگەر دەسکە تورێکیش بێ، شتێکی هەر پێ بێ. جا لە سرت، ماڵە فەڵەستینی هەبوو، تەلەفۆنیان هەبوو، کە کشکۆ دەچوو، لەوێ تەلەفۆن بۆ منداڵەکانی بکات لە میسر و لە غەزە، مریشک و قاز و مراوی و توورەگە هێلکەی لەگەڵ خۆی بۆ دەبردن، بە دیاری.

هەموو جارێ، کە بارۆکەیەکی جوان و سەرنجڕاکێشم دەدیت، دەمگوت:" ئای وەستا حەمەد، ئێستا لێرە بوویتایە، تەماحیت تێدەکرد و دەخستە بن باڵی خۆت و دەتبردەوە کۆیە!" ئەوجا کشکۆ دەیگوت: "بڵێ، بڵێ، کامیانت پێ جوانە تا بۆت بگرم، لە گەڵ خۆت بیبەوە بە دیاری، بڵێ بابە، ئەوە دیاریی کشکۆیە..!"

پێش ئەوەی ئەو دەڤەرە بۆ یەکجاری بەجێبهێڵم و سەرهەڵگرم، ناوە ناوە کشکۆ دەیگوت:

ــ بەخوا، ئەمنیش ئیشی نابەجێ دەکەم! خۆم و ام محموود، دوو کەسین، بە قەد منداڵێک ناخۆین، من ئەو ڕەوە مریشک و کەڵەشێر و قاز و مراوییەم بۆ چییە. لە خۆرا، ئیش بۆ خۆم پەیدا دەکەم، دەڵێـم بچم، دەرگایان لێ بکەمەو و بەرەڵایان بکەم، کێ دەیان با، با بیان با...!

لەڕاستیدا، یەک دوو دراوسێی لیبی، تەماحیان لەو کۆڵێت و دارخورمایە کردبوو، بەڵام دەیانزانی، وەکو کشکۆیان پێ ناکرێ، ئەوان خزمەتی مەڕ و بزن و بەرخی خۆیانیان پێ نەدەکرا، ئەوجا ئەو ڕەوە پەلەوەرە.

دوای ئوغرکردنم، نازانم، چارەنووسی ئەو کۆڵێتە گەیشتە کوێ.... وەک ناشزانم، بۆچی قەت نەچووم، دوو سێ وێنەی فۆتۆگرافی ئەو دیمەنانە بچرکێنم، خۆ کامێراشم هەبوو! بەڵام بە چاوی (GPS)ی گوگڵ دەزانم، دارخورمایەکە لە شوێنی خۆی، وەکو خۆی هەرماوە(٢٠٢٢).

## (٦٨)

# بەرەو کوردستانێکی بریندار

هەق وانییە ئەوانەی بە جزی پشکۆ و بە گڵپەی زمانە ئاگر نەسووتابن، باسی ئێش و ئازاری سووتان بکەن. غەریبی بۆ خۆی پشکۆیە و کاڵکردنەوە تەمەن لە غەریبیدا سووتانە. تەنها ئەوانەش هەست بە ژان و عەزابی ئەو سووتانە دەکەن، کە شەویان لە کووچە و کۆلانی ولاتی غەریبیدا کردبێتەوە و ڕۆژیان لە بەردەرگای مزگەوت و کلێسا و کەنیشتەکانی ئاوارەییدا لێک گرێدابێ. نە گیرافانی گەرم و نە کۆشک و سرای شاهانە و نە باغ و چیمەن و دیمەنی بەهەشت ئاسا، دەبنە ژوورۆکەکی بێ چرای کەلاوەیەکی زێد و مەفتەنی خۆت.

لە غەریبایەتیدا، هەر کەسێک دەبینی، لە چاوی تۆدا نامۆیە و تۆیش لە دیدی ئەودا غەریب. هەر شوێنێک ڕووی تێدەکەی، غەریبییە و سەرەدەرزییەک بەتۆوە پەیوەست نییە. لە خۆشترین سات و لەگەڵ ئازیزترین هاوڕێیانی غەریبیدا، لە ناخڕا واهەست دەکەی، خۆشییەکە دەستکردە و ئازیزەکەت هەر تا ئەو سەری ڕێیەکەیە. هیچ شتێک شک نابەی هی تۆ بێ، نە ئاسمان، نە مانگ، نە ئەستێرەکان. شەماڵ و سرووەی غەریبی بۆن و بەرامەیەکی جیاوازیان هەیە، بەفر و بارانی ڕەنگێکی دیکەیان هەیە، تەیر و توار و گیاندار و ئاژەڵەکانی، هەر دەڵێی لە جنسی بوونەوەری دیکەن، ڕۆژ نییە، بێ ئاگایانە، چەندان جار لەبەر خۆتەوە نەڵێی:"لە لای ئێمە... ئەوەی خۆمان ... جاران ئێمەش... ئێستاش دایکم ... مەمانان... بە بیرم دێ... لە پێش چاومە... خۆزگە ئێستا... .".

لە غەریبایەتیدا، تۆ هەرچییەک بێ، هەر ناسنامە و پەساپۆڕت و بەڵگەیەکت لە بەرکی دابێ، هەر غەریبی. منداڵێکی چوارساڵی، دەتوانێ ڕێت پێبگرێ و لێپێچینەوەت لەگەڵدا بکا. پیرەمێردێکی سەر کورسیی چەرخەدار، مافی هەیە ڕاتگرێ و پێت بڵێ تۆ کێیت؟ یان ئاڵوودەیەکی زمان تێکئالاوی سەرمەست، دەتوانێ پێت بڵێ،" تۆ چی دەکەی لێرە، بۆ ناچیتەوە کاول بووەکەی خۆت!" جووتە پێڵاوە نوێیەکەت دەبینن، دەپرسن، "ئێوەش

لەوتان هەیە؟" بابۆلەیەک بەدەستەوە دەگریێ، پێت دەڵێن، "شتی وا خۆشت خواردووە!" دەچیتە سەیران، دەڵێن، "سەیرانی وا خۆشتان کردووە"!

لە هەموو ئان و ساتێکدا، بۆی هەیە، لە ئاسماندا، یەکێکت بۆ نازڵی بێ و هەر بە هەوەس، تەشقەڵەت پێبکات. ئەبو بەکر، کە هاوڕێی گیانی بە گیانیم بوو، عەسرێک گوتی، وەرە بچینە لای ئەو دوو مامۆستا میسرییە، تازە هاتوون بۆ قوتابخانەی (شهداء البدر). ئەوان لە خانوویەک دابوون، تایبەت بوو وان تەرخان کرابوو. ڕێک بەرانبەر ماڵی ئەبو بەکر. کە چووینە لایان و دانیشتین و چا و قاوەیان بۆ کردین. پاشنیوەڕۆیەکەی گەرم بوو لەسەر دۆشەکێک لەسەر ئەرزەکە دانیشتبووین، مامۆستایەکیان مێشکوژێکی بە دەستە و بوو، ناوە ناوە ڕایدەوەشاند و مێشێکی دەکوشت. پاش ماوەیەکە، ئەبو بەکر، پرسیاری لێ کردن، کە ئایا ئەوان، بە جوانی بەندەکانی گرێبەستیان خوێندۆتەوە؟ ئەوجا پێیگوتن:

ــ ئێوە بە چ حەقێک، هاتوون گیاندار و ڕوحلەبەری لیبی دەکوژن؟

ئەوانیش، گوتیان، "لە مەبەستت تێناگەین و هیچ شتی نایاسایمان کردوە؟".

بە خۆتۆرەکردنێکی، کۆمیدییانە و بەڕاستی، هەستا سەرپێ و پەنجەی ڕاوەشاند و گوتی:

ــ ئەوەندەی هاتووین، ئەوا لەبەر چاوی ئێمە پتر لە دە دوانزدە مێشی لیبیتان کوشت. ئێمە ئەو ڕەفتارەی ئێوەمان قبوڵ نییە و من ڕاپۆرتتان لێدەدەم.

ئەوجا ئەو دەیزانێ، یەکێک لە مامۆستاکان لە دووپشک دەترسێ. لە ناو قەپێلکە شقارتەیەک دووپشکێکی دەرهێنا و مامۆستا بە ڕاکردن خۆی کرد بە ژووردا و ڕۆحی لەبەردا نەما بوو.

لە غەریبایەتیدا، هەمیشە هەست دەکەی کە تۆ وەک ئەوە وایە لە مەنزلگایەک دابەزیبیت، نە جێگە هیێ تۆیە و نە خاک و وڵاتەکە. لە زێدی خۆتدا، تا دەمریت، کەس داوای پسوولەی نیشتەجێبوون و مانەوەت لێ ناکات. لێ، لەوێ کە یەک سەعات بەسەر کاتی دیارکراوی مانەوەکەت تێپەڕی، هەرچەند گرێبەستیشت هەبێ، مانەوەکەت نایاسایە و سزای بە دوا دادێ.

ڕۆژێک، باوکی خوێندکارێک هاتبووە قوتابخانەی بۆ لێپێچینەوە لەو مامۆستا فەڵەستینییەی کوڕەکەی ئەوەی لە پۆل سزادا بوو. کابرا زۆر توڕەبوو و بە کەس هێور

نەدەکرایەوە، بەڕێوەبەرەکەمان پێیگوت، "خاڵە، پێیناوێ خۆت وا سەغڵەت کەی، ئەوانە بە پسوولە کاغەزێک هاتوون و بە پسوولە کاغەزێکیش کوێت بوێ هەڵیان دەدەین"!

لە گەڵ تۆمە بووکێ، خەسوو گوێت لێ بێ!

من وام هەست دەکرد، قسەکانی ڕاستەوخۆ ئارستەی من دەکات، هەرچەند کێشەکە لەگەڵ من نەبوو، قەت قەتیش، هیچ لیبییەک پێی نەگوتوم لەسەر چاوت برۆیە. بەڵام من و فەڵەستینییەکە، غەریبەکە بووین لەوێ.

لە هەموو شاری سرت، من تاکە شۆفێر بووم کە پشتێنی سەلامەتیم لە کاتی شۆفێری دەبەست، ڕۆژێک، لە ناوەندی شار، پۆلیسی هاتووچۆ ڕایگرتم و سەرپێچی تیژڕەویی بۆ نووسیم، لە کاتێکدا، من بە مام سەبرۆکە ناسرا بووم و ڕێک لە گەڵ کاروانی ئۆتۆمبیلەکانی شەقامەکەدا دەڕۆیشتم. پێشم گوت، کە چۆن دەتوانم خێراتر بم لە کاتێکدا ئەو قەتارە ئۆتۆمبیلەم لە پێشە. کەلکی نەبوو، پسوولەی پێنژاردنی هەر بۆ نووسیم، هاوڕێیەکم لەگەڵ بوو، گوتی،"ئەوە پسوولەی، بەستنی ئەو پشتێنە نەفرەتییەیە، چەندجارم پێمگوتوی، مەیبەستە، ئاخر ئەوان، وادەزانن کە فەلسەفەیان لەسەر لێدەدەێ".

قسە قسە دێنێ. لە هەر پێنجماڵی دراوسێ لە لیبیا، سێیان تامپۆن و ڕووداوی هاتووچۆیان لەدەست قەوماوە و قوربانییان داوە. جا ڕۆژێک دراوسێیەکمان، لە ڕووداوێکدا زامدار ببوو، لە جامی پێشەوی ئۆتۆمبیلەکە، دەرپەڕیبووە دەرەوە، سەروگێلاکی هەموو لەفاف بوو، کە چووینە سەردانی لە نەخۆشخانە، دۆستێکی لێ پرسی:" کە ئەوت لێ بەسەرهات چیت کرد؟" ئەویش گوتی:" یەکسەر هاوارم کرد، ئافەرین، مامۆستا فاضل"!

دیاربوو، مەبەستی ئەو بوو، کە ئەگەر، ئەویش وەک ئەو مامۆستایە، پشتێندی سەلامەتی ببەستبایە، وای لێبەسەر نەدەهات.

***

هەمیشە لەگەڵ خۆم، دەمگوت، هەموو خەتای گای بنەیە، بەڵام دەشمزانی، ئەمە هەر پەندێکی رووتە و دڵنەوایی خۆمانی پێدەدەینەوە. بەهەموو پێوەرێک، دەبووایە، خەڵکانی ئەو وڵاتانەی ئێمەیان وەک ئاوارە و پەناهەندە لەباوەش گرتووە، بێنە کوردستانەکەی ئێمە و لە خێر و بێر و نیعمەتیدا سوودمەند بن، نەک پێچەوانەکەی. جا کێشەکە هەر ئەوەنەبوو، ئێمە، رۆڵەی ئەو خاک و مەفتەنە لەو خێروبێر و جوانی و نیعمەتە مەحرووومکرابووین، بەڵکوو لەوەش خراپتر، گەلەگ خراپتر، دەشیان کووشتی و بە کووشتیشیان دەدای و خەڵکیشیان پێدەکووشتی. تا نەگەڕامەوە، نەمزانی چ گۆڕستانێکی گەورە و فراوانیان بۆ رۆڵەکانی ئەو وڵاتە بونیاتناوە، لە پێناو گەیشتن بە دەروازۆکەیەکی تەسکی سەر سنووری تورکیا یان ئێران!

بە گوێرەی گرێبەستی نێوانمان، ئێمەی مامۆستای غەیرە لیبی، حەقی خۆمان بوو هەموو هاوینێک سەفەر بکەین و تێچووی سەفەریش لەسەر دەوڵەت بێ، بەڵام دوای چوار ساڵ، ئەوجا یەکجار پلیتی سەفەریان بەمن رەوا بینی. ئێمە لە دوای نیوەی ساڵەوە خۆمان بۆ ئەو سەفەرە ئامادە دەکرد. تا مانگی تەمووز هات. چونکە گەمارۆی ئابووری و فڕینی فڕۆکە هەر سەپێنرابوو، دیسان کەشتیی تولەیتەڵە بۆوە هاوسەفەرمان تا ئەزمیر.

لە بەندەری تەرابلسە و بەڕێکەوتین بۆ بەندەری ئەسکەندەریە، لە میسر و ئەوجا بەرەو باکووری خۆرهەڵات بامان داوە و هەتینە ئەزمیر، لەویش یەکسەر، بەبێ خۆ دواخستن، بە پاس بەڕێکەتین بۆ سلۆپی و دوای (٢٤) دەمژمێر لەو رێیە دوو و درێژە بەرە ئیبراهیم خەلیل و هەولێر بەرێ کەوتین. باش بوو ئەمجارە، لە دەروازەی ئیبراهیم خەلیل، باجستێنە کوردەکان نە بەندیان کردین، نە باجیان لێسەندین.

***

لەم سەفەرەمدا، هەرلەگەڵ هەڵمژینی یەکەم هەناسەی زێدەکەم، هەست و ئیحساسم، دیمەن و بۆن و بەرامەی گۆڕاویان لەبەرچاوما وێنا دەکرد، پێشتر نەمدی بوون و پێیان ئاشنا نەبووم. هەرچی دەمدیت و داهاتە پێش چاوم، لە زەین و زهنمدا بوونیان هەبووە، لێ ئێستا هەر هەموویان بە رەنگ و روخسارێکی دیکە خۆیان دەنوێنن.

وەک چۆن پڵنگێک، تازە لە شەڕێکی دژووار و خوێناوی و ترسناک، دەرباز بووبێت و لە چەنگ رەوە گیاندارێکی دڕندەتر لە خۆی، لە مردنی حەتمی، رزگاری بووبێ، پڵنگێک

سەرو گێلاکی خوێناوی، دەست و شان و پشتی و ڕانی دارووشاو و زامدار و شەقشەقبوو، هێشتا قەتماغەی سەر برینەکانی دەڵەمەن و بە زەحمەت ڕێ دەکات و تەواو وەهۆشخۆ نەهاتۆتەوە و بەرچاوی ڕەشکەوپێشکە دەکا. کوردستانم وا دەهاتە بەرچاو!

دەمزانی ئەوە پیرە قەڵاتەکەی هەولێرییە، بەڵام بە گومانەوەش سەیرم دەکرد. دڵنیا بووم ئەوە گەلییەکەی دێگەڵەیە، لێ، جیاواز دەهاتە بەرچاوم. هیچ شکم نەبوو لە باڵای بەرزی هەیبەسوڵتان و کۆسار و باواجی، بەدەست خۆم نەبوو، لە دیدمدا، ڕوخسار و هەیئەتێکی دیکەیان هەبوو. هەموو شتەکان گۆڕا بوون و نەش گۆڕابوون: دارەکەی کەندەکۆخ، سەروچاوەکەی حەمامۆک، سوولەکەی خاڵە باس، گومبەزەکەی مزگەوتی گەورە، تاقەکانی قەیسرەی کۆن و نوێ، بتاقەکەی ئەحمەدی سەری مەیدانێ، بۆن و بەرامی مەیدانی سەرێ و مەیدانی خوارێ، تەنانەت بانگ و سەڵای موئەزینی مزگەوتەکانیش!

تەماشای ڕوخساری هەرکەسێک و دیمەنی هەر گۆشەیەکم دەکرد، دێڕە نازدارەکانی قەسیدە (بەهاریەکەی حاجی)م بە بیر دەهاتەوە، کە لە بۆتەی فەلسەفەیەکی قوول و جواندا، پەیوەندیی نێوان سرووشت و مرۆڤەکان ڕاڤەدەکات و دەفەرمووێ، ئەو شاخ و داخ و سرووشت و بوونە، هەر ئەوەی جارانن، نە گۆڕاون، بەڵام چونکی بوون و حزووری مرۆڤەکان گۆڕاون، لە دیدماندا، سرووشتیش گۆڕاوە و وەک جاران نەماون:

**بەهاری وا هەموو ساڵێکی دێتەوە ئەمما**
**ئـــەوانی دەچنە دیـــاری مەمالیکی عوقبا**
**یەکێکی نایەتەوە، چوونیان هەر ئەوچوونە**
**لە شێخ و عالیم و جاهیل، لە پادشا و گەدا**
**مەکانە، شەوقی بە عیلاتە، پەشمە کۆنەهەوار**
**حەیاتــە زەوقی بــە ئەحبـابە، بایە ئاب و هەوا**

هەتا سەر بە کۆنەهەوار و ماڵی دۆست و ئەحبابان دانەگری، نازانی لەو چوار ساڵە ڕەزاقورس و ناشیرینەدا، چەندان لەو شێخ و عالیم و پادشا و گەدایانە، چوونیان هەر ئەو چوونە بووە و نەگەڕاونەتەوە و ناشگەڕێنەوە. دەزانم مردن برا گەورەیە و میوانی ناوختە،

بەڵام کووشتنی ئازیزێکت بە گولـلەی گەرمی دەستی برای خۆت، خەم و کەسەرێکە، نە لە دڵ دەردەچێ و نە برینی سارێژ دەبێ. تا ئەو ڕۆژەی نە چوومە سەرقەبران و لەسەر گلکۆی چەند ئازیزێک فاتیحام نەخوێند، نەمدەزانی، لەو شەڕە پیسە نەفرەتییە، ئەو هەموو هەموو گەنجە جوانە بوونەتە قوربانی. لە سەر هەر دە دوانزدە کێلێک، شەش حەوتێکیان ساڵەکانیان (نەوەتەکان)بوو؛(١٩٩١، ١٩٩٤، ١٩٩٥، ١٩٩٦، ١٩٩٧، ١٩٩٨).
هەر خۆم دەزانم، عەیشێ عەباسێ، کە دروانسێی گەڕەکیمان بوو، بە چ کولەمەرگییەک، ئەو (٣) کوڕە جوانەی پێگەیاند، هیچ کارێکی شەریفانە نەما، ئەو بێوەژنە، بۆ قووتی حەلاڵی نیوزاری ئەو منداڵانە نەیکات، جا هەر سێ کوڕیشی، خوێندکار و شاگردی خۆم بووم، بەڵام شەڕەکانی شاخ و شار، ئەو سێ ڕۆڵە نەوجەوانەیان ڕادەستی گڵ کرد و ئەو دایکە جەرگسووتاوە قوربانیدەرەی، ڕادەستی فرمێسک و حەسرەت و هەنیسکان کرد. بەڵام فرمێسک و حەسرەت و هەنیسک، دادای چی دەدەن! چەندان لەو عەیشێ عەباسانە، بێکەسانە لەو کووچە و کۆڵان و کەلاوانەی ئەو شار و دێیانە کەوتوون و کەسیش پێنازانێ!
لەم سەفەرەمدا، هەر گۆڕستانەکان نەبوون، گەورەتر و بەرینتر ببوون، ئەوانەی زیندووش بوون، هەر بە نیوە ڕۆح دەهاتنە بەرچاو و شار و دێ و بازاڕ و مەیدانەکانیشم وەک گۆڕستانێکی خامۆش دەهاتە پێش چاو. چونکێ دەمێک بوو، لە زێدەکەم دابڕا بووم، هەستم دەکرد، هەبوو کە دەیدیتم و بەلامدا تێدەپەڕی، خیسەیەکی لە خۆی دەکرد. ئاخر، کۆمەڵی کوردەواری، خێڵەکییە و هەموو یەکتر دەناسن. کەس نییە نەزانێ، بکوژەکەی باوکی یان برایەکەی کێی بووە، جا کاتێک، غەریبێک بەلای بکوژێک تێدەپەڕی، ئەو یەکسەر دەستی بۆ بەر پشتێنەکەی دەبا، نەکۆ تۆڵەسێنێک بێت و لەنکاوڕا سیلەی لێبگرێ و خەڵتانی خوێنی بکات.
یەک دوو حەفتەی یەکەم، هەر بەوە ڕاگەیشتم سەردانی ئەو دۆست و ناسیاوانە بکەم کە لە شار و شارەدێیەکان ببوونە سووتووی ئەو شەڕەی بە هیچ فەرهەنگێک پێناسە ناکرێ. لەوە ناخۆشتر، دەچیتە ماڵی ئەو تازیەدارانە، چ دەڵێی! چۆن دڵنەوایان دەکەیت و دڵیان دەدەیتەوە! کووشتنی ئازیزێک، بە دەستی ئەو هاوخوێنەی خۆی کە چەندان ساڵ بەیەکەوە لەسەر یەک ڕەحلە دانیشتوون و چەندا شەویان لەو شاخ و داخەدا، بە برسییەتی و ترسە و بەسەر بردووە. جا بڵێم، کوڕەکەتان شەهیدی خاک و نیشتمان و نەتەوەیە و

سەرمان پێیان بەرزە! کە هەرگیز، من قوربانییانی شەڕی ناخۆ بە شەهید لە قەڵەم نادەم، ئەوانەی لەشەڕی یەکتر کوژیدا کوژراون، هەرچەند دەزانم لە دڵپاکیی خۆیان، بوون بە قوربانیی بازرگانانی جەنگ.

کاروانی دوورودرێژی قوربانیانی شەڕی ئەو چوار پێنج ساڵە، هەر مەنزڵگا و کاروانسەرای لە گۆڕستانەکان نەبوو، تووشی دەیان قوربانی دەبیت، لە سەر ئەو شەقام و جادە و لە نێو ئەو کۆلانانە، چاوێک، دەستێک، قاچێکیان لەدەست داوە، هەیە گۆپاڵ و هەیە دارشەقەی بوونەتە هاوڕێی هەمیشەیی. کەسم نەدی لەسەر کورسیی چەرخەدار، ئەوان، لە ماڵەوە، لەسەر جێگە، وەک شەپرەلێدراو، دەتلێنەوە ــ خۆ وڵاتانی ئەورووپا و وڵاتە پێشکەوتووەکان نین، بە کورسیی پاتریدار بیان گەڕێنن و چارەسەریان بکەن!

زۆرتان، زیقەتی و گرانی و نەبوونیی ساڵەکانی دوای ڕاپەڕینتان لە بیرە، چەرمەسەری و کولـلەمەرگی و مەرگەساتەکان باسناکرێن... کە بە دەیان ژن و منداڵ، دەکەوتنە بەر چەقۆی دەڕاسەی گەنم و جۆ، لەو بیتوێنە هەلا هەلا دەبوون یان گیانیان لەدەست دەدا.

ئێستا، گەمارۆی ئابووریی بەعس و گەمارۆی ئابووریی یوئێن، بەسەر ئەو خەڵکە پەریشان و زەبوونەدا، بوون بە چوار قات، گەمارۆی ئابووریی زوونی زەرد و گەمارۆی ئابووریی زوونی کەسکیشیان هاتووەتە سەر. کەسانی ئەوتۆ، بە دواتدا دەگەڕێن و لە دەرگای ماڵ دەدەن، تا دوێنێ، شاهانە دەژیان و خۆیان بە کەس نەدەگۆڕییەوە، ناهەقیشیان نەبوو، هەبوو هەر خۆی و خۆی توانیبووی ڕۆحی خۆی قوتار بکات. تاوانەکانی ئەو ڕۆژانەی شەڕی براکوژی هێندە ناشیرین و قێزەوەنن، پیاو بە گێڕانەوەی هێڵنجی دێتێ و تف لە خۆی و نەتەوەکەی دەکات! جا بەدەستە خۆشت نییە، لە هەر مەجلیس و دیوەخانێک دادەنیشی، باس دەبێتە باسی ئەو ڕۆژگارە ڕەزاقورسە ــ هەرچەندە قارەمان هەیە، وەک داستان و ئەفسانە، سەرکەوتن و کوشتارەکان دەگێڕێتەوە و پتر لە ناپلیۆن فەخر بەو ڕۆژەوە دەکات.

لە دڵی خۆمدا دەمگوت، بەڵکوو ئەو نەگبەتییە گەورەیە و ئەو نەهامەتییە سەختە، بۆ خەڵکی ببێتە دەرس و عیبرەت و جارێکی دیکە بیر لەو شتە پیسە نەکەنەوە. بەڵام، زوو هەستم کرد، من پتر شاعیرانە، بەدەم خەیاڵەوە، بیر دەکەمەوە. هاوڕێیەک دەستی گرتم و بردمی بۆ بارەگای حیزبێک، برادەرێکمان لەوێ بوو، وەک بەرپرسێکی ڕۆناکبیر و

ڕۆشنبیر و سیاسی، زوو زوو لە تەلەڤزۆنی حیزبدا، شیتەڵکاری و ڕاڤەکردن و پەیامی سیاسی هەبوو. بینیم لە ژوور سەری خۆیدا، لە چوارچێوەیەکی زێڕیندا، ئەو ئایەتەی هەڵواسیوە ـ هەرچەند ئەوەندەی من عیلمم هەبووبێ، ئەو زاتە قەت ڕووی لە قیبلە نەکردووە!

بسم لله الرحمن الرحيم

(ا لذِينَ آمَنُوا وَهَاجَرُوا وَجَاهَدُوا فِي سَبِيلِ اللَّهِ وَالَّذِينَ آوَوْا وَنَصَرُوا أُولَئِكَ هُمُ الْمُؤْمِنُونَ حَقًّا لَهُمْ مَغْفِرَةٌ وَرِزْقٌ كَرِيمٌ * وَالَّذِينَ آمَنُوا مِنْ بَعْدُ وَهَاجَرُوا وَجَاهَدُوا مَعَكُمْ فَأُولَئِكَ مِنْكُمْ وَأُولُو الْأَرْحَامِ بَعْضُهُمْ أَوْلَى بِبَعْضٍ فِي كِتَابِ اللَّهِ إِنَّ اللَّهَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ ﴾.

من دەمزانی و تێگەیشتبووم کە لە فەلسەفەی ئەو برادەرە (موجاهید و ئەنصار و موهاجیر) کێنە. ئەوەی کە زۆر نیگەرانی کردم، وتەیەکی ئەو برادەرە بوو کە گوتی:"من هەمیشە لە ژێر فەرمانی سەرکردەی خۆمم، ئێستا، هەر ئێستا، ئەو ئەمر بکات، هەتا ـــــ ڕاناوەستم "!

نیگەرانییەکەم، هەر لە نێو ئەو بارەگایە نەبوو، لە دژە زوونەکەی دیکەشدا، لە مەجلیسێکدا، قارەمانێک ـ کە خوێندکاری خۆشم بوو، بۆ نیشاندانی وەلاء و دووبارکردنەوەی بەیعەت بۆ سەرکردەکەی، گوتی:" کوڕینە، خۆتان دەزانن، من لە زۆربەی بەرەکاندا بەشدار بووم، جاران من هەر چوار مەخزەنم دەبەست، بەڵام شەرت بێ، ئەوجارە شەش مەخزەن ببەستم"!

ئەنصار و موهاجیر و موجاهیدەکانی شەڕی ئەو چەند ساڵە بە تەواوەتی دیمۆگرافیای شار و شاردەدێیەکانیان گۆڕی بوو. لە بازاڕ و سەری مەیدانێ و گۆڕەپان و سەرجادەکانی کۆیە، گوێت لە زۆربەی زاراوەکانی کوردی دەبوو، دەستووری پۆشاک و جلکوبەرگی خانەقینی و کەلاری و کەرکوکی و جاف و مەخموری و موسڵاوی و ئاکرێی و ئامێدی و زاخۆیت دەدیت، تەنانەی دوکانداریشیان تێدا بوو، بۆ نموونە، بە زاری کرمانجی دەدوان. ماڵ و حاڵی ئەنصارەکانی پارتی لە کۆیە، لەلایەن موهاجیرانی یەکێتی داگیرکراوە. لە زوونی زەردیش، موهاجیرانی پارتی، بەسەر ماڵ و خانوو و موڵکی ئەنصارەکانی

یەکێتییەکانیان داداوە و تێدانیشتەجی بوون. لەو ڕێ و بانانە، لەبەرطووطە طووطی ئۆتۆمبیلە دەستبەسەرداگیراو و غەنیمەکان، مێشکی سەرت دەچوو. هەبوو هی دۆست و برادەرانم بوو، ئێستا سووکانیان لەدەستی کەسانی نەناسیاوی ئاوارەدا دابوۆ ــ تەنانەت ئۆتۆمبیلی برایەکی خۆم.

ئەگەر ڕۆژێک لەگەڵ هاوڕێیەک یان خزمێک، بۆ دوور کەوتنەوە لە ژاوەژاو و قسەوباسی کووشتن و بڕینی ئەو چەند ساڵە چووبایتە پیاسەیەک یان سەیران و گەڕانێک، هەر هێندەت دەزانی، یەکێکیان دەیگوت؛"خاڵە / مامە / مامۆستا، تەماشای ئەو دەرگایە بکە، یان بڕوانە، ئەو گابەردەت لێدیارە... ئەوا، ڕۆژەکەی فلانی کوڕی فلان لێرە بوو لە گەڵ منداڵەکەی دەچوونە فلان شوێن، بە هەڵکەوت، مەفرەزەیەکی فلان حیزبی، لێرەوە دێ و ئەو زاتە دەبینی، یەکسەر دەیگرن و ئەها ئەو سەر کۆڵانەت لێدیارە... یان ئەو دارتووە گەورە دەبینی، بردیانە ئەوێ و خڕ... بە یەک صەلیبە، لە هیچ و خۆڕایی ساردیان کردەوە، ئەو دەمێک بوو وازیشی لە حیزبایەتی هێنابوو، دەستی لە وەزیفەش هەڵگرتبوو، بۆ خۆی کاسبی خۆی دەکرد..." جا پیاسە و سەیران و گەشتەکەم لێ دەبووە صندان و قوزەڵقورت!

چەند خەفەتم دەخوارد، کە دەمبینی پێشبینیەکانم، درووست دەرچوون؛ لە سەرەتای (١٩٩٤)، کە دەبووایە، لە جیاتی قەڵادزێ، چەخماخەی شەڕەکە لە پەیمانگەی ناوەندی مامۆستایانی هەولێر ڕوویدا، لە کۆبوونەوەیەکی گەورەی مامۆستایان لەو پەیمانگەیە، قسەم کرد و داوام لێکردن، کە "تازوو، وەک چینی ڕۆشنبیر، شتێ بکەین و ڕێ لە هەڵگیرسانی ئەو شەڕە چاوەڕوانکراوە بگرین، دەنا ئەو تۆپانەی کە ئەو شەو گواسترانەوە بۆ سەر قەڵاتی، بە ماڵی ئێوە دەکەوێت و ئێوە و ئازیزانتان دەکەنە قوربانی." ــ هەواڵی ئەویان پێدابووم، کە شەوەکەی چەندان تۆپیان بردبووە سەر قەڵاتی. جا خەفەتەکەم ئەوبوو، یەکێک لە مامۆستا جوامێرە گەنجەکانی لەو کۆبوونەوە دانیشتبوو، بووە قوربانی، لە بەستۆرە، تۆپێک بە ماڵی دەکەوێ و دەبێتە قوربانی، وای کە بە دڵ بۆی پەرێشان بووم!

تازە، ئاوێک بە ئاگری شەڕەکە داکرا بوو، بەڵام پاشماوە و ئاسەواریەکانی هێ ئەونەبوون، وا زوو بسڕێنەوە و بکوژێنەوە ــ کە تاکو ئێستاش (٢٠٢٢) هێندێکیان هەرماون. ڕەنگ بێ ئێستاش هێندی لە مامۆستا هاوپیشەکانم، گەوایی ئەوەم بۆ بدەن، کە لە وەختی شەڕی عێراق ـ ئێران، دەمگوت:"ئەوەندەی ئەو (صور من المعركة)، ئەمن

نیگەران و پەست دەکات ــ کە بۆ ماوەی هەشت ساڵان، دوای دەنگوباسی شەو، تیڤییەکان نمایشیان دەکرد، نیو ئەوەندە هەواڵەکان نیگەران و پەستم ناکەن، چونکە دەزانم، ئەو منداڵانەی ئێستا تەماشای ئەو مرۆڤە سووتا و هەلاهەلا و بێ سەر و بێ دەست و بێ قاچانە دەکەن، ڕۆژێ دێ، خەڵکی ئەو وڵاتە ئەوها کەل و پارچە دەکەن و سەردەبڕن!" ـــ پێشبینییەکەشم ڕاست دەرچوو، داعش بە نموونە. جا من دەمزانی ئاسەواری ئەو شەڕەی خۆشمان، دوای چەندین ساڵ بەدیاردەکەوێ، وەک کورد دەڵێ، جارێ برینەکە گەرمە، با سارد بێتەوە! کە لە برادەرێکم پرسیم کە ناونیشانی برایەکی خۆیم بداتێ، کە زۆر دۆستم بوو، غەریبیم دەکرد و حەزم دەکرد سەردانی بکەم، کاتێک گوتی، "بەڕاستی منیش نازانم ماڵیان لە کوێیە!" تێگەیشتم، کە ئەو ڕق و بوغز و حیقدەی حیزب لە دڵی لایەنگرانی خۆی چاندووە، چەندە قووڵ ڕەگیان داکوتاوە، برای لە برا کردوە، کەواتە، ئەو برایە هیچ سیلەی ڕەحم و خێزانی و کۆمەڵایەتی و کەلتووری لەگەڵ برای خۆشی نەماوە، نەک لە گەڵ خزم و دۆست و دەرودراوسێ.

ئەمە سەرەتای داڕوخانێکی مەترسیداری کۆمەڵی کوردەوارییە، کە پێشتر کەس پێ ئاشنا نەبووە. ــ ئێستاش (٢٠٢٢)، خۆتان بە چاوی خۆتان دەبینن، چون هەنە پیرە دایک و باوکی خۆیان فڕێ دەدەنە سەر جادان، گرتەی ئەو دایکەشتان بینی، ئەو بێشکەی بە دەستی خۆی سووتاند، کە (٧) منداڵی پێ گەورە کردبوو. ئەمانە هەمووی بەرهەمن؛ چی بچێنی ئەو دەدرویتەوە، پەندی کوردی هەموو زێڕ و گەوهەرە،؛ خوێن و بوغز و حیقدمان چاند، خوێن و بوغز و حیقد دەدورینەوە .

لەم سەفەرمەدا، دەمبینی کەسانێک کە هەرچی و پەرچی و لۆتی و جاش و خوێڕی بوون، ئێستا دیوەخان و پاسەوان و یاوەریان هەیە و ئاغا و کوێخا هەر ئەوانن. دەیانگوت، حیزب، کەسێکی دەویست کە ڕەحم بە نەیارەکەی نەکات، دڕەندانە بکوژێ، ببڕێ، بسووتێنی، فەرهود بکا، تاڵان بکا، گرنگ، دوژمن بتۆقێنی و سەریان پێ شۆڕکا و لە زوونی ئەواندا دەریان پەڕێنی. شتێک نەمابوو ناوی نیشتیمان بێ، هەموو ئێنتیما و بەیعەت و خۆشەویستیی بۆ سەرکردەی حیزب و ئاڵای حیزب بوو. "هەمووشتێک لە پێناو حیزب"، زۆر لە درووشمەکەی بەعس دەچوو کە دەیگوت "هەمووشتێک لە پێناو قادسییە".

که بەلای ئەو هۆڵ و یانە و مەڵبەندە ئەدەبی و هونەرییانەی شارەکان تێدەپەڕیم، جەرگم کزەی لێوە دەهات، کە دەرگاکانیان قوفڵ درابوو. پڕ بە دڵ هەستم بە حەنین و سۆزێکی نامۆ دەکرد، بۆ کۆڕ و سیمینار و پێشەنگە و نمایشی ئەدەبی و هونەری. کە ئەوانیش تەنانەت ناوەکان و سەندیکا و ڕێکخراوەکانیشیان، بەسەر حیزبە ڕکابەرەکان دابەش ببوون. تاکە کاری هونەری، کە بۆمن نوێ و جێگەی سەرنج بوو، ئەو کۆمەڵە شاخە زل زلانەی سەر ڕێی نێوان کۆیە و هەولێر بوون، لە نزیک گوندی تەکەور و پیرەر، وەک پێشەنگەی سرووشتی دەهاتنە پێش چاوت. دەستەیەک لە هونەرمەندانی شێوەکاری بێئومێد و نامراد، وەک هاوار و پەیامێک، لە بەرکی بەتاڵی خۆیان، ئەو شاخانەیان بە بۆیەی ڕەنگاوڕەنگ، کردبووە چەندان کاری هونەری؛ کوتر و گوڵ و خۆر و مانگ و ئاسمان و ڕەنگەکان گوزارشتیان لە ئاشتی و ئاسایش و برایەتی و جوانی و خۆشەویستی دەکرد، لە وڵاتێکدا کە زمان و دەنگی تەفەنگ بەسەر هەموو دەنگەکاندا زاڵ بوون.

لەسەروبەندی گەڕانەوەمان بەرەوە لیبیا، دیسان، چەند دۆستێکی دڵسۆز، داوایان لێکردم وەک سەرپەرشتیاریی زمانی ئینگلیزی، چ لە زوونی زەرد، چ لە زوونی کەسک، بگەڕێمەوە سەر وەزیفە، بەڵام، چونکێ تایەن و ڕەسەن، لە قۆناغێکی ناسکی خوێندن دابوون و زەحمەتبوو بتوانن، بە هاسانی لە قوتابخانەکانی خۆمان بەردەام بن، وامان بە باش زانی، هەرکاتێک ئەوان خوێندنی ئامادەییان تەواو کرد، ئەوا بیرێکی لی بکەینەوە. نەبوونی خانوو و بێ جێییش پەڵپێکی دیکە بوو.

پێش، دەستپێکی خوێندنی ساڵی نوێ، لە کۆتایی مانگی ئاب، دیسان لە ڕێی ئەزمیر بە کەشتیی غەرناطەی لیبی، گەڕاینەوە، لە ڕێگا کەشتییەکەمان، سەرێکی بە بەندەری بەیرووتیش داگرت.

بەم شێوەیە، یەکەم سەردانمان بۆ کوردستان، سەردانی گۆڕستانەکان و پرسەخانەکان بوو، کە دەکرا، بەدەم چاخواردنەوەیەکی کوردەواری لە ژێر دەوارێکی ئەو ڕەوەندانە، ئاشتیانە و بەخۆشی ڕێی لێبگیرێ و ئەو هەموو هەموو خەڵکە بێتاوانە، نەبنە قوربانی.

هاوڕێیەکم گوتی:"ئەو شەڕە، شەڕێکی دواخرابوو، دەبووایە بیکەن، چونکە لە ساڵی (١٩٦٤) ەوە خۆیانی بۆ ئامادە دەکەن، جا کاتێک، کە بینیان لەیەکەم هەڵبژاردنی پەرلەمان، ئەو هەموو جەماوەرە پشتیوانیی ئەوانن، دەرفەتەکەیان بە هەلێکی زێڕین زانی، بۆ یەکلایی

کردنەوەی کۆنە حیسابی نێوانیان. هەرچەندە خەڵکەکە دەنگی بۆ ئاشتی و خۆشگوزەرانی و ژیانی نوێ دا، نەک بۆ خوێن و ماڵوێرانی و دەربەدەری".

# (٦٩)

# هیندێک لە داب و نەریتی لیبییەکان

گۆڕان و گۆڕانکاریی خەسڵەتی ژیان و شارسانییەتین، بەڵام من لە ساڵانی نێوان (١٩٩٤ ــ ٢٠٠٥) ئەم (شتانەم) لە خەڵکی لیبیا دەدی، جا کەم یان زۆر:

- ژن و منداڵیان لە کاتی ئاخەوتندا، زۆرجار لە جیاتی ئەوەی بڵێن (نەخێر)، هەردوو شانیان هەڵدەتەکێن و لە زاریانەوە دەنگێک درووست دەکەن لە چەقەوانە لێدان دەچێ. دەنگەکە یەک جار لە زاریان دەردەچێ.
- ئەگەر کوڕ بۆ کچان، یان کچ بۆ کوڕان زمانی دەربێنێ، ئەوا مانای داواکردنی کارێکی بەدڕەوەشتییە.
- ئەگەر بە نوێژی بەیانی ڕانەگەن، هەر کاتێک لەخەو هەڵسان، نوێژەکە دەکەن.
- کە مەلا بانگی دا و بووە کاتی نوێژ، لە هەر جێگەیەک بن، پێلاوەکانیان دادەکەنن و ڕوو لە قیبلە دەکەن و هەر لەسەر لمی ئەرزەکە، نوێژ دادەبەستن، سەر شۆستەبێ، دەم ڕێگابێ، مەیدان و گۆڕەپان بێ، حەوشە و کۆڵان بێ.
- کە بووە کاتی بانگی نیوەڕۆ یان عەسر، لەناو بازاڕی دوکاندارەکان، یان ڕێبوارێک، دەچێتە سەر کۆسپەیەک و ڕوو لە قیبلە دەکا و دەست دەخاتە بناگوێ و دەست دەکا بە بانگدان. جار هەیە پێنج شەش کەس لە بازاڕ بانگدەدەن، نێوانیان هەر چەند گورسێک دەبێ.
- جگەرکێشیان، لە چاو خۆمان زۆرکەمە. هەشبن، پتر گەنجەکانن. قەنە و سبیلە و دارجگەر و پایپ بەکار ناهێنن. کەم تەزبیح بەدەستەوە دەگرن.
- مەیخانە و بار و مەیفرۆش نییە، مەشروبخۆریان کەمە. خێزانی میسری و سوودانی هەنە ئارەقی قاچاغ لەماڵەوە درووست دەکەن و بە دزییەوە دەیفرۆشن.
- لە گەراج، ناوی موسافیرەکان تۆماردەکەن و کۆپییەکی ناوەکان دەدەنە شۆفێری تەکسییەکە و پەساپۆرت و ناسنامەکان، لە لای شۆفێرەکە دەبێ، تا دەگەنە شوێنی مەبەست.

- ئەگەر بازگەی پۆلیس هەبێ لە نێوان شارەکان، ئەوا تەنها بۆ قسە و پرسیار ڕوو لە شۆفێرەکە دەکەن.
- لەناو ئۆتۆمبیلەکانیان، شۆفێرە پیاوەکان، دوو شتیان پێیە: مەترەقێک بۆ شەڕکردن، لە ژێر کورسیی شۆفێرە و چونکە کووچکە بەرد لەوێ زەحمەت دەست دەکەوێ، بەردی تەرازوو، کیلۆ و دوو کیلۆی، یان ئارمێچەی داینەمۆ و پانکە و ئەو شتانە، لە نێوو سندووقی دایە، بۆ شکاندنی جامی ئۆتۆمبیل، ئەگەر تووشی شەڕ بوون.
- منداڵی ساواش، بە نەفەر حیسابە، لە کاتی سەفەرکردن.
- لەوێش، خواردن و خواردنەوەی شۆفێرانی پاس و ئۆتۆمبیلی نەفەرگواستنەوە، لە چێشتخانە و کافتریاکانی نێوان شارەکان، لەسەر چێشتخانەکەیە.
- هەموو کەسێک بە ناوی خۆی بانگ دەکەن، کاک و کاکە و مامۆستا و خاڵە و مامە و لالۆ نییە. منداڵێکی پۆلی یەکی بنەڕەتی، بەڕێوەبەرەکەی خۆی، هەر بە ناوی خۆی بانگ دەکا.
- ژن و پیاوی بەساڵاچوو، ڕێز و قەردێکی یەکجار زۆریان هەیە و هەموو ئەمر و فەرمانێکیان دەبێ جێبەجێ بکرێ.
- ژن دەسەڵاتی تەواویی خێزانی هەیە. لە هەموو فەرمانگەیەک، جگە لە هۆتێل و کافتریا ئیش دەکەن. جحێڵەکانیان لە (٨٠٪) شۆفێری دەزانن. ئاساییە لە کێڵگە بە تراکتۆر زەوێ بکێڵن. "پەروەردەی قەزافی و ئاپۆ بۆ ژن، وێکدەچوون."
- شووبرا، دەتوانێ سزای ژنی برای خۆی بدا، گەر ژنە کار و ڕەفتارێکی نابەجێ کرد.
- کە منداڵییان تەمەنی بووە دوو سێ ساڵان، وەک برینشکە، جزی دووپشکیان بۆ سۆردەکەنە و دەرخواردیان دەدەن، تا بەرگریی لەشیان بەهێزبێ دژی دووپشک پێوەدان، کە لەوێ زۆر زۆرە.
- سوورە دووپشک و ڕەشە دووپشکیان هەیە، قەبارەکەیان بستێک دەبێ.
- لە بازاڕی شارە گەورەکان، دووپشک لە نێو شووشەدا نمایش دەکرێن بۆ فرۆشتن، گەشتیارە بیانییەکان وەک دیاری دەیان کڕن.

- جار هەیە کە ڕەشەبا لە بیابانەکانەوە دێ، دووپشکی لەگەڵە و دووپشک دەبارێ.
- ئەگەر دوو کەس لە دوو هۆز و ئێلی لەگەڵ یەک بەشەڕبێن، ئەوا هەر کەسێکی ئەو دوو هۆز و ئێلە لەوێ بن، دەبێ بچن پشتیوانیی لە شەڕکەری خۆیان بکەن، بیناسن یان نەیناسن، هەق بەو بێ یان بەو نەبێ.
- هەرگیز ژن و منداڵیان ناچنە سەر قەبران و زۆرکەم ژن هەیە، گۆڕی ئازیزانی خۆی پێبزانێ.
- کە کەسێکیان لێ دەمرێ، ژنەکان نایکەنە شین و شەپۆڕ و سینگ کووتان و قژڕنینەوە. پیاوەکانیش، زۆر ئارام و هێمنن.
- پرسەکانیان، کە هەمیشە لەژێر ڕەشماڵە، جار هەیە مانگێک دەخایەنێ و پرسەدارەکان بۆ ئەو ماوەیە مۆڵەت وەردەگرن.
- لە گورستان نابێ گۆڕ هەڵبێنی. کەس خاوەن گۆڕستانی خۆی نییە. گۆڕەکانیان، لە تەنیشت یەکدییە بە ڕیز، دوایین گۆڕ، هی دوایین مردووە.
- ئەوانەی حاڵیان باشە، هەموو مانگی ڕەمەزان لە مەککە و مەدینە بەسەر دەبەن، بە تایبەتی ئەوانەی تەمەنیکیان هەیە.
- نووسینی سەر کێلیان نییە.
- مردوو لە نەخۆشخانە دەشوورێت و کفن دەکرێ. جەنازەکە، کە جوان گوڵاو پژێن دەکەن، یەکسەر دەیبەنە مزگەوتی گۆڕستان. لە تەنیشت گۆڕستانەکە مزکەوتێک هەیە بۆ نوێژکردن لەسەر جەنازە.
- لە گۆڕستان سەکۆیەکی سەر بە چەتر هەیە، بۆ پێشوازیکردن لەوانەی سەرەخۆشی لە تازیەدار دەکەن. مەڕاسیمەکە کە سەرەخۆشی و دەستگوشینە، بە ڕاوەستان بەڕێوەدەچێ، دانیشتن نییە. هەمیشە خەڵکێکی زۆر ئامادە دەبن و جەنازە بە خاک دەسپێرن.
- بێوەژن هەر (٣) مانگ ڕەشپۆش دەبێ.
- زەوی گۆڕ و تێچووی مردوو ناشتن بێبەرانبەرە. کە جەنازەیەکیان بە خاک سپارد، لە تەنیشتی گۆڕێکی دی لێدەدەن، تا حازربەدەست بێ بۆمردووی ئاینده.

○ ئەگەر گەف و هەڕەشە لە یەکێک بکەن، دەڵێن؛ نەمرم سێ شەوان بۆت دەچمە بەندیخانە. وەک خێڵ شیکاتەکردنیان لە لای پۆلیس پێ عەیبە. گەر بشگیرێن، هەر دوو سێ شەوە، سەرۆک خێڵ و شێخەکان، کێشەکان یەک لای دەکەنەوە.

○ کە پیرەمیرەدکانیان دەچینە ماڵێک، یان فەرمانگە و دامودەزگا و جێگەیەکی میری، بە گۆچانەکەیان، دوو سێ جاران لە دەرگا دەدەن.

○ کچەکانیان (خوێندکار و مامۆستا و فەرمانبەر) زۆرکەم لەچک دەبەستن، بەڵام زۆربەی ژنەکان لەچکەیان بەسەرەوەیە.

○ ئەوان، بە ژن و پیاو و منداڵ، زۆر حەز لە گوڵاو و عەتر دەکەن. هەمیشە بۆنی خۆش و گرانبەها لە خۆیان دەدەن. منداڵەکان، پێش ناردنە قوتابخانە عەتر بژێن دەکەن. پێش هەر دابەزینێک لە ئۆتۆمبیل، چەند (پفێک) عەتری خۆش خۆش لە خۆیان دەدەن. هیچ کەسم نەدی بە قەد خەڵکی لیبیا ئاشقی بۆنی خۆش بێ.

○ باوەڕیان بە سیحر هەیە و خۆیان هێندێ ڕەفتاری سیحراوی، وەک نەریت، دەکەن. شێخ و ساحیریان نییە، بەڵام کەلتوورەکەیان دەوڵەمەندە بە تەلەسمەکانی سیحر.

○ کچەکانیان لینگ و لەتەریان قەت ڕووت و قووت نییە. هەمیشە لەژێر تەنوورە و کراس، پانتۆڵ دەپۆشن. شۆڕەژنەکان و بەساڵاچووەکانیش کراسی ئاوداماں.

○ کچ و ژنەکانیان پێچە و عەبا ناگرنەوە، بەڵام ژنە بەتەمەنەکان جارۆگەیەکی کەلتووری خۆیان بەخۆ دادەدەن، عەردەکەی سپییە و ڕەنگی دیکەشی هەیە، خەت خەتە بە سیمی زێڕین و ڕەنگاوڕەنگ. ئەو کاڵایە لە لایان جوان و پیرۆزە و پێیدەڵێن (الفراشیه).

○ پۆشاکی کەلتووریی ژنانی لیبیا جیاوازی هەیە بە گوێرەی ناوچەکانیان، ڕۆژهەڵات، ڕۆژاوا، باشوور.

○ لە بۆنە کۆمەڵایەتییەکانی تایبەت بەژنان، بۆخۆیان پۆشاکی نیمچە ڕووت دەپۆشن، بە تایبەتی کچەکانیان، بەڵام، خۆیان نیشانی پیاوان نادەن و هەر لە ماڵەوە خۆیان نمایش دەکەن.

o ژنەکانیان، شەوان لەماڵەوە سەما بۆ مێردەکانیان دەکەن ـــ بەڵام هەموویان نا.

o کەس کەس مافی ئەوەی نییە بچێتە ژووری نووستنی ژن و مێرد، تەنانەت منداڵەکانی خۆشیان.

o چەندەها سەمای فۆلکلۆریی خۆیان هەیە، کە زۆربەیان گۆرانی میللی و چەپلەڕێزانی لەگەڵە، بەڵام هیچ جۆرە شایی و هەڵپەڕکییەکی وەکو ئەوانەی خۆمانیان نییە. دەستگرتنی بە کۆمەڵی تێدابێ.

o ژنەکانیان هەمیشە بە چرپە و دەنگی نەرم دەدوێن، بەڵام پیاوەکانیان وانین، دەنگیان بەرزە.

o گەرچی گیانداری کێوییان هەیە و تەیروتواری زۆریان هەیە وەکو کەو و سوێسکە و باڵندە کۆچەرییەکان، بەڵام قەت نەمدیووە، جگە لە ڕاوی ماسی، هیچ ڕاوێکی دیکەیان هەبێ.

o لە گردۆڵکەکانی لیبیا کەو هەیە، وەک دەڤەری سرت، بەڵام کەوبازیی لەوێ نەریت و خوو و حەز نییە و کەس کەو لە ماڵەوە بەخێو ناکات.

o زۆرکەم گوێدرێژ و هێسترم لەو وڵاتە بینیوە.

o گەرچی نزیکەی(١٨٠٠) کم، کەناری دەریایەن هەیە، حەز لە مەلە و دەریا ناکەن، پتر مەیل و خۆشەویستییان بۆ ناوەوەی نیشتیمانە.

o سفرە و خوانیان، لە ماڵەوە، (٣) بەشە: بۆ پیاوان، بۆ ژنان، بۆ منداڵان. هەموویان لەسەر یەک سفرە نان ناخۆن. زۆربەی لەسەر ئەرز دادەنیشن.

o وەک لای خۆمان، جگە لە خواردن و چێشتە کەلتوورییەکانی خۆیان، دۆڵمە و سەروپێیان هەیە. ماکەڕۆنی و کوسکوسی خواردنی سەرەکییانە، نەک برنج.

o نیوەی ئیستکانەکانیان، چایە و نیوەکەی دیکە کەفە، ئەوان بەو کەفە دەڵێن (ڕەغوە).

o ئاساییە، دوو کەس لە تەنیشت یەک دانیشتبن، یەک ئیستیکانە چا، بە هەردووکیان بخۆنەوە، هەر یەکەی فڕێک.

o ژنەکانیان زۆر کابان و دەستڕەنگینن لە دروستکردنی جۆرەها کێک و زەلابیە و کولێچە و بەسبووسەی ماڵ.

○ ژن و کچەکانیان زۆر حەز لە خەنە دەکەن. هەمیشە دەست و قاچیان بەخەنەیە. دوکانی خەنەفرۆش و کەرەستەکانی سەربەخۆن و بازارِیان گەرمە. ژنەکان حەزیش لە بنێشت دەکەن.

○ بخوور زۆر بەکاردەهێنن، بە تایبەتی لەماڵەوە و شەوانی هەینی و لە بۆنەکاندا. چەندان جۆری بوخووری بۆن خۆشی گرانبەهایان هەیە. هەیە لە شێوەی بەردی خوێی سرووشتییە، بە ئاگری دادەکەن.

○ زێرەکانیان پارچەی گەورە و قورسە، نەخشیان زۆر لەسەر نییە. هەر بازنێکیان کە لە شێوەی لوولەییە، رەنگ بێ (١٠) سم پان بێ. هەر دەستەی یەک بازنێ تێدەکرێ.

○ لە لای بێگانە بە خراپە باسی یەکتری ناکەن و سرِیان قایمە.

○ بۆ جەژنی قوربان، دەبێ هەموو ماڵێک قوربانی بکات. ئەوەی هەژارە و توانای نییە، دەوڵەت مەرێکی، بۆ قوربانی پێدەبەخشێ، زووتر ناونووسیان دەکەن.

○ گۆشتی قوربانی تەنها بەسەر ئەو کەسانەدا دابەش دەکەن و دەبەخشنەوە کە غەریبەن. بۆ هەر ماڵێک (دوو سێ) کیلۆ، نەک بەشە پشیلەی لای خۆمان.

○ گۆشتی قوربانی، لەسەر رِستە وشک دەکەنەوە، بۆ زستان. پێیدەڵێن (گدید). لە کن وان خۆش و موتفەرِکە.

○ هەموو نێرینەیەک، لەسەرووی حەوت ساڵانەوە، دەچنە نوێژی هەینی، تەنانەت ئەو کەسانەی کە نوێژکەریش نین. جگەلەوەی کە کۆبوونەوەکە خوداپەرستی و عیبادەتە، نەریتێکی کۆمەڵایەتیشە، لەوێ هەموو حەفتەیەک یەکتری دەبینن.

○ فەرش و مافور و بەرِە و رِایەخی نێو مزگەوتیان، وەک ئەوانەی لای خۆمان رِێک و بە نرخ نین و کەلوپەلەکانی ئاسایین.

○ گەرچی شێوەزاری عەرەبی لیبیی رەوەوان و پاک و بێگەردە لە چاو هێندێ شێوەزاری دیکە، بەگشتی، وتاربێژەکانی رۆژانی هەینی لە وتاردادانیان، هەڵەی زمانەوانی و رِێزمانیان هەیە. جگەلەوەی کرۆکی وتار و بابەتەکانیان سادە و

ڕووکشەن و دووبارەکردنەوەیان تێدایە. پێناچێ باش خۆیان بە ئامادەکردنی وتارەکانەوە ماندوو بکەن. سەرقەڵەمی وتارەکانیان لە دائیرەی ئەوقافەوە بۆ دەچوو.

○ ئەوان بە سەیران دەڵێن (زەردە)، زۆرکەم سەیرانی خێزانیان هەیە، بەڵام گەنج و پیاوەکانیان بۆ خۆیان دەچنە ئەو دەشتە و دەرە، نانی پشکۆ و دەکەن و گۆشت دەبرژێنن. خواردنەوەی بادە و شەڕابیان نییە یان زۆر کەمە و بە دزییە.

○ کە سەفەری دەرەوەی وڵات دەکەن بۆ پشوودان و هەواگۆڕی، کوڕ و کچەکانیان، نوێترین مۆدێل پۆشاک و جلکوبەرگ دەپۆشن و ئەلمۆدە دەردەچن و لچک فڕێدەدەن. (زۆربەیان).

○ تەلاقدانیان زۆر کەمە. هەر وەک دووژنیش زۆر کەمە. ژنی سێیەم و ژنی چوارەمم نەبیستووە. بەبێ ڕەزامەندی ژنی یەکەم، پیاو ناتوانی ژنی دووەم بێنێ.

○ کوڕی ڕەبەن و کچی قەیرەیان زۆرە، لەبەر زۆر هۆ، وەک قورسیی مارەیی و زێڕی زۆر و خانووێ نوێ و ناوماڵی تازە. زاوا دەبێ پارچە زێڕ بۆ خەسووشی بکات.

○ زۆربەی مامۆستاکانی خوێندنی بنەڕەتی، لەو وڵاتە ژنن.

○ پەرستار و دکتۆری ژن، لیبییەکان، بەشە ئێشکچییەتیی لە نەخۆشخانەکان ناگرن. نابێ ئەوان شەو لە دەرەوەی ماڵ بن.

○ کەم ژن دەدەن بە بێگانە، بەڵام بۆخۆیان ژن لە میسرییەکان و تونسییەکان دەهێنن. زۆر کەمیش لە مەغریبی و جەزائیرییەکان. ژنهێنان بە حەزلێککردن ئاساییە و نابێتە کێشە و گرفت و ناخۆشی.

○ چونکی ڕۆنی چێشتی ئەوان، ڕۆنی زەیتونی بەرهەمی خۆیانە، ئاستی دیاردەی (کۆلسترۆل) لە ناو لیبییەکان یەکجار نزمە یان هەر نییە.

○ کەم خێزان هەیە باخ و کێلگەی خۆی لە دەرەوەی شار و گوند نەبێ. ئەوان بەو باخ و گێلگانە دەڵێن(حەوازە).

○ کە ساڵی یەک و دوو جار باران دەبارێ، منداڵەکانیان، دەچن لە بەر بارانەکە ڕادەوەستن و دەیکەن بە وازی و گەمەکردن تا باش باش دەبنە جلۆکە. لە قوتابخانەش کە بووە باران، لە پۆلەکان دەردێن و دچنە بەر بارانەکە. چونکە کەم باران دەبینن لە لایان خۆش و جوانە.

o ئاوی باران و سێلاو و پلووسکەکان لە حەوزی تایبەتدا کۆ دەکەنەوە، بەو حەوزە دەڵێن (فاسکییە). لەو وڵاتە نرخی ئاو لە شیر و بەنزین گرانترە.

o لە ژوورسەری زۆربەی بیرەئاوەکانی جووتیارەکان، لەسەر دیواربەندێکی بەرزی کۆنکریتی، ئەم ئایەتە بە خۆشنووسی هەڵکەندراوە: بسم الله الرحمن الرحيم (وَجَعَلْنَا مِنَ الْمَاءِ كُلَّ شَيْءٍ حَيٍّ).

o ژن کووشتن نییە و قەت نەمدیوە و نەشمبیستووە. (دوای ڕاپەڕینیش نەمانبیستووە یەک ژن لەو (٤٠٠) ژنە پاسەوانەی قەزافی کوژرابێ، پرسیاریشم کردووە، گوتیان، ژیانی ئاسایی دەژین).

o کووشتن، ژن یان پیاو، نییە یان زۆر کەمە. ئەوەندەی لەوێ بووم، مامۆستایەکی عێراقی لە تەرابلس و مامۆستایەکی فەلەستینی لە سرت کوژران. پێش منیش سوودانییەک، لە دەڤەری سرت کوژرابوو.

o ڕووداوی هاتوچۆ و قوربانییەکانی لە ئاستێکی بەرزی ترسناک دانە.

o کە لە پرسەدا، دەیانەوێ بڕۆن، بەبێ فاتیحا خوێندن لە جێی خۆیان هەڵدەستن و خواحافیزی دەکەن و دەڕۆن.

o کە یەکێک زەحفەت دەکەی، ئاساییە ئەو کەسە برادەری خۆی لەگەڵ خۆیێ بێنی.

o لە لیبیا کەبابخانە نییە.

o وشتر لەو بیابانە بەرەڵایە، بە دووسێ مانگ جارێک خاوەنی یان وشترەوان دەچێ بەسەریان دەکاتەوە. بەڵام مەڕو بزن شوانیان هەیە.

o بزنەکانیان کە پێیان دەڵێن بزنی (بۆر) یان بزنی سوودانی، زۆر گەورە و بەرزن، کێشیان دەگاتە (١٨٠) کیلۆ، نێوان نێوچەوان و لووتیان، وەک دەفر یان نیمچە کەوانە، بەرزبۆتەوە یان هەڵتۆقیوە.

o تەنها لە تەرابلس، یەک دوکانی فرۆشتنی تەیروتوار و ماسی جوانیی و سەگم بینی.

o کانیاو و گۆمی گەڕاویان زۆرە، چونکە نەوتیان زۆرە، لە چەندان شوێن، گەرماوی گەڕاوی گەشتوگوزاریان هەیە.

- له کڕین و فرۆشتن ئەوان مامەڵە ناکەن، یان بە دەگمەن مامەڵە دەکەن. کەلتووری ئەوان وایە. بە مامەڵەکردنی ئێمە قەڵس دەبن.
- شت بە قەرز نافرۆشنە یەکدی، چونکە قەرزکۆرن، بەڵام بە قەرز شت دەدەنە غەیرەی متمانە پێکراو.
- دانیشتن لە چایخانە و کافتریا زۆر کەمە و دۆمینە و تاوڵی و یاری کاغەز نییە، بەڵام نێرگلە هەیە. لە ماڵەوە یاری کاغەزێن دەکەن.
- موبەریدەیان نییە، چونکە ئاوەکەیان خوێیاوە و زوو دەیرزێنێ. کە سپلیت داهات، لە زۆر شوێن دەبینرا.
- ئۆتۆمبیل زوو خایسی دەبێ و ژەنگ دەگرێ. ئەوە گەورەترین کێشەی ئۆتۆمبیلە، چونکە هەواکەی شێدارە و ئاوەکەی خوێیاوە.
- لە دوایین ڕۆژی ئەزموونەکان، قوتابییەکانیان، دەست دەکەن بە دڕاندنی کتێبەکانیان و دەروپشتی قوتابخانەکان سپی دەچێتەوە لە کاغەز. "من کتێبی خۆم زووتر لێ وەردەگرتنەوە."
- گزیکردن لە ئەزموونەکان نەک باوە، دیاردەیەکی ترسناکە.
- لە دواناوەندی و ئامادەییەکاندا، ژوورێکی تایبەت هەیە بۆ پۆلیس، چونکە خوێندکاری لاسار فەلاقە دەکرێ، بە شوولاق و قەمچی پۆلیس. ئەوان بە پۆلیس دەڵێن (شورتەی سەربازیی).
- کە قوتابخانە دەچێ بۆ گەشت و سەیرانی ئەو دەشت و دەرە، دەبێ ئۆتۆمبیلێکی پۆلیسان لەگەڵ بێ، وەک پاسەوان، تا دەگەڕێنەوە قوتابخانە. خواردن و خواردنە و گواستنەوە لەسەر قوتابخانەیە.
- سلاوکردن بەبێ دەستگوشین (تۆقەکردن) نابێ، تەنانەت لەگەڵ ژنانیش.
- ئەگەر دوو کەس سارديشيان لە نێوان دا هەبێ و قسەیان نەبێ، لە دیوەخان و دانیشتنان، سلاو لە یەکدی دەکەن و تەوقەدەکەن، بەڵام لە تەنیشت یەکدی دانانیشن.
- ڕەمەزانان دەوام لە مەڵبەندەکانی خوێندن و فەرمانگەکان شەپرەی لێدەدا. شەوی ڕەمەزان، تا نوێژی بەیانی ناخەون. دوای فتارکردنەوە دوو سێ ژەم نان دەخۆن.

- دەتوانم بڵێم، هەموویان جگە لە منداڵ و نەخۆش، بە ڕۆژوو دەبن.
- مەسرەفی مانگی ڕەمەزانی هەر خێزانێک، نزیکەی مەسرەفی سێ یان چوار مانگی ئاساییە. ئەوانەی دەست کورتن، زووتر پاشەکەوتی بۆ دەکەن.
- لە دەرەوەی شار، هەر کەسێک، گەر غەریبەش بێ، لە سەر ڕێگا ڕاوەستابێ، بەبێ ئەوەی دەست بەرزکاتەوە وەک ئاماژە، ئۆتۆمبیل بۆی ڕادەوستێ و دەیگەیێنێ گەر شۆفێرەکە، ژن و خێزانی لەگەڵ نەبێ.
- تاکی لیبی حەز ناکات ڕەخنەی لێبگری، ئەگەر شتێکیشت هەبێ وەک پێشنیار و ئامۆژگاری، دەبێ ژیرانە گوزارشتی لێبکەی، بەبێ ئەوەی بهێڵی هەستیان بریندار بێ. ئەوان خۆیان بە (سەید) دەزانن.
- لە فەرمانگە و دائیرە و دامودەزگای حکوومی و مەڵبەندەکانی خوێندن، لە هیچ ماڵ و دیوەخانێک، وێنەی موعەممەر قەزافی نابینرێ یان کەمە، بەڵام لە شەقام و مەیدان و گۆڕەپانەکان، تابلۆ و وێنەی بە چەندان شێوە و قەبارە دەبینرێ، بە تایبەتی لە شارە گەورەکان.
- هیچ فەرمانگە و دامودەزگایەکی حکوومەت، تابلۆی بەسەرەوە نییە، بۆ نموونە فەرمانگەی شارەوانی، یان پۆلیسخانە یان پۆستەخانە، جگە لە نەخۆشخانەکان.
- کەس نابینی چەکی پێبێ، تەنانەت پۆلیس و سەربازەکانیش، جگە لە پاسەوانەکان و کەژاوەکانی قەزافی.
- یەک (دۆلار) نزیکەی (٧٠) نانی پێدەهات. ئاوی پرۆژە بەخواربوو، بۆ پارەی وزەی کارەباش، شێک هەبوو ڕەمزی بوو، زۆربەیان ئەویشیان نەدەدا. بە دوو مانگ (٣) دینارێک (١ دۆلار) بوو.
- هەموو دەرمانەکانیان کە بە خۆڕایی بوو، باشترین مارکەی جیهانی بوو.
- لەناو پاسی موسافیران لە نێوان شارەکاندا، ئاساییە کە لەسەر تەباغی گاز چا لێ دەنێن و بە درێژایی ڕێگا چا فڕ دەکەن، بەتایبەتی شۆفێر و سەکنەکەی.
- هەر نەخۆش بکەون دەچنە تونس و میسر.

- زۆربەی منداڵ و مامۆستاکانی گوندی لە ورەزی گەرمادا کە دەگەڕێنەوە ماڵەوە، پێڵاوەکانیان دادەکەن و دەیانخەنە سەر شانیان یان بەدەستەوەیان دەگرن.
- بە گشتی هەر لەسەر ئەرز دادەنیشن و حەز لە کورسی و قەنەفە ناکەن.
- زۆرکەم لە نانخواردن، کەوچک بەکاردەهێنن، پێیان حەرامە.
- لە (٢٠٪)ی خەڵکی لیبیا قورئانیان ئەزبەرە (حیفزە).
- گوتەیەکیان هەیە دەڵێن:"میسری، نە ڕیزیان دەگرین، نە خۆشمان دەوێن؛ سوودانی، ڕێزیان دەگرین، بەڵام خۆشمان ناوێن. توونسی، نە خۆشمان دەوێن، نە خۆشیان دەوێین." پرسیم ئەدی عێراقی؟ گوتیان، (جارێ باش شارەزایان نەبووین) خۆشمان دەوێن، ڕێزیان دەگرین.
- ئەوان بەو کەسانەی کە شیعە ئایینزان، دەڵێن (یەهودی). بۆ خۆیان هەموویان سوونە ئایینزان مالیکیی مەزهەبن.
- گەرچی کورد لە لیبیا، وەک هۆز هەیە، بەڵام، کە باسی کوردی خۆمان دەکەن، پتر بە ناوی مەلا مستەفای بارزان و ناوی ئاپۆ ئاشنان. گەرچی دەیانزانی سەددام دیکتاتۆرە، سۆزیان بۆی هەبوو، بەڵام دژی حیزبی بەعس بوون.
- لیبیا تاکە وڵاتی عەرەبییە، کە یەک هاووڵاتیان نییە هەڵگری بیرباوەڕی مارکس بێ یان شیوعی بێ یان بەعسی بێ. لە (١٩٤٨)ەوە ئیخوان لەو وڵاتە هەیە.

## (٧٠)

# چۆن باسی قەزافی دەکەن؟

لە مێژووی هاوچەرخدا، بە دەگمەن ناوی سەرکردە یان مەلیک یان پاشایەک دەبیستین و دەخوێنینەوە، بە قەد ناوی قەزافی لەسەرزاران بێ و لە مانشێتی میدیاکانی ناوچەکە و جیهاندا دووبارە بووبێتەوە. لە گەڕان و سۆراغکردندا، بەدوای سەرچاوەکان، دەبینین هیچ وشە و ئاوەڵناوێک نەماوەتەوە کە پەسنی ئەو زاتەی پێ نەکرابێ، بە جوانی و بە ناشیرینی؛ بە چاکی و بە خراپی؛ بە مەدح و سەنا و ڕیسواکردن و سوکایەتی پێکردن. هەر کەسە و هەر قەڵەمەی لە سونگەی دید و بۆچوون و فەلسەفە و بەرژەوەندیی خۆیەوە پەسن و زەممی ئەو سەرکردەیەی کردووە.
هەر لە دەستپێکی ئەو نووسینەمدا گوتم:"من چیم دیوە و چیم بیستووە، بۆ مێژوو ئەوە تۆمار دەکەم، با خوێنەر بۆخۆی ببێتە قازی و حەکەم و بڕیاردەر، زۆرکەس لێم دەپرسێن: قەزافی قارەمان بوو، یان دیکتاتۆر؟" ئەوە بەو واتایە نا، کە ڕۆبۆتانە دەنووسم و بێئاگایانە بۆچوونەکان تۆمار دەکەم. چونکە لە دیدی مندا، قەزافی قارەمانێکی دیکتاتۆر، یان دیکتاتۆرێکی قارەمان بوو. زۆربەی هەرە زۆری خەڵکی لیبیا لێی ڕازی بوون و ڕێزیان دەگرت، ئەگەر نەشڵێم هەموویان خۆشیان دەویست. ئەدی کەواتە بۆ بەو ڕۆژەڕەشە گەیشت؟ ــ لە بڕگەیەکی دیکەدا، ئەو مانشێتی بابەتێکە،، بە لێکدانەوەی خۆم، وەڵامی پرسیارەکە دەدەمەوە.

لەسەر زاری گەورەپیاوان و دەسەڵاتداران و بلیمەت و ڕۆشنبیر و خەڵکی عەوامدا دەگوترێ و گوتراوە، قەزافی: بلیمەتە، شێتە؛ بیرمەندە، گێلەپیاوە؛ سیاسەتزانە، کەلفامە لە سیاسەت؛ قارەمانە، زاڵم و جەبەرووتە؛ خزمەتکاری نیشتمان و نەتەوەکەیەتی، خائین و ئامرازی دەستی بێگانەیە؛ شۆڕشگێڕە، ئاژاوەچییە؛ خەباتکەرە، تێکدەرە؛ گیانفیدایە، خۆپەرستە؛ بەخشندەیە، قرچۆک و ڕەزیلە؛ ئازا و ڕەشیدە، ترسنۆک و بێدۆنە؛ خاکی و سادەیە، ڕۆحگەورە و لووتبەرزە؛ هاووڵاتییەکی

ئاساییە، ئاغایەکی بێڕەحمە؛ هیچ بەرپرسیارەیەتییەکی نییە، هەموو شتێکە؛ مەلیکی مەلیکانە، شوان و گاوانی ڕەعییەیە؛ خوداپەرستە، بێدینە؛ باوەڕدارە، مولحیدە؛ بانگخوازی ئیسلامە، زەندیق و هەڵگەڕاوەیە؛ فەیلەسۆفە، جاهیلە؛ بیرتیژ و دانایە، کورتبین و نابینایە؛ قسەزان و قسەهەقە، زۆربڵێ و زمانپیسە؛ خاوەن قسەی خۆیەتی، تەنافبازە؛ پشتیوانیی مەزلومانە، دوژمنی مرۆڤە؛ ئاشتیخوازە، شەڕانگێزە؛ ئەدیب و نووسەرە، بێسەواد و کوێرەوارە؛ چەپ و مارکسییە، ئیمپریالیست و پۆپۆلیستە؛ گوفتارشیرینە، جنێوفرۆشە... تاد.

ئەگەر لە دید و بۆچوونی خەڵکی لیبیاوە دەستپێبکەین، بۆ مێژوو دەڵێم:"هاووڵاتی لیبی، زۆر بە دەگمەن لە لای غەیرە، بیرباوەڕ و بۆچوونی خۆیان دەردەبڕن و بەهیچ شێوەیەک ئامادەنین، لەبەرچاوی خەڵک، یەکتری بشکێننەوە، تەنانەت لە مەجلیس و دیوەخاناندا، ئەو کەسانەی ساردیشیان لە نێوان هەیە، سلاو و تۆقە لەگەڵ یەکدی دەکەن و نایانەوێ، ناحەزانیان بەخۆیان شادکەن. بۆیە هەڵسەنگاندنی بۆچوونی خەڵکی لیبیی بەرامبەر قەزافی هاسان نییە. دەبێ نێوان دێڕان بخوێنیتەوە و ناڕاستەوخۆ، لە گوفتار و ڕەفیایان شتان هەڵێنجی.

بەدەر لە وتار و گوتاری میدیاکان و دەزگا حکومییەکانی وەک مەڵبەندەکانی خوێندن، کە بێگومان بەسەر سەرکردەی خۆیاندا هەڵدەڵێن و مەدح و ستایشی دەکەن. نەمدیوە لیبییەکان لە ناوخۆیاندا، مەدحی یان زەممی قەزافی بکەن. کە باس و ڕووداو و پێشهاتێکیش بووبێتە قسەی مەجلیسان، وەک شتێکی ئاسایی باسیان لێوەکردوە، جا چ بە نیشاندانی ڕەزامەندی بووبێ، یان نیشاندانی نارەزایی. لە دیوەخان و مەجلیسان ئاسایی بوو گوێت لێبێ بڵێن:"قەزافی نەدەبووایە، ئەوە شتە ئەنجام بدا، یان ئەو قسەیە بکات... ." ئەوان ڕوو بە ڕوو قسەی دڵی خۆیان بەو زاتە دەگوت.

کەواتە دەتوانم، بڵێم، زۆربەی لیبییەکان لە قەزافی ڕازی بوون، ناڕازییەکان پتر خەڵکی بەنغازی و شاری خومس بوون ــ لە دێرزەمانەوە، ئەو دوو دەڤەرە، دانوویان لەگەڵ قەزافی نەکوڵاوە و وەک دوو دەڤەری ڕکابەر تەماشا دەکران.

چونکی، بزووتنەوەی ئیخوان، لەساڵی (١٩٤٨)ەوە، ڕەگی لە لیبیا داکووتاوە، هەمیشە لایەنگر و هەوادارانیان، نەک کەیفیان بە قەزافی نەهاتووە بەڵکوو پتر لە جارێک هەوڵی تیرۆرکردنیشیان داوە. کەواتە پێشوەخت دەزانین، تێڕوانینی ئەو گرووپە چۆنە. ڕەنگ بێ ئەگەر جەمال عەبدولناصر، یان حوسنی موبارەک، یان مەلیک عەبدولعەزیز، یان سەددام، یان مەلیک حوسێنیش، سەرکردەی لیبیا بووایە، ئەو گرووپە هەمان ڕەفتار و بۆچوونیان دەبوو!

لە دیدی هێندێ لە ڕۆشنبیرانیان، قەزافی سەرکردەیەکی سەرکەوتوو و لێهاتوو نەبوو، لەبەر دوو هۆ: لەلایەک ئەو ڕۆشنبیرانە حەزیان دەکرد، کە وڵاتەکەی وانیش وەک ئیمارات و ئەوانەی کەنداو، لە ئاستێکی بەرزی پێشکەوتن و ئاوەدانی و گەشەکردن دابێ، نەک ببێتە بەخشەر و بەفیڕۆدەری سامانی وڵات بۆ غەیرە لیبییەکان. لە لایەکی دیکەشدا، ڕەخنەی ئەوەیان هەبوو کە هۆزەکەی خۆی، دەستی بەسەر جومگە سەرکییەکانی ئەو وڵاتە داگرتووە، لە ئابووری و دارایی و کۆمپیانیا و دەسەڵاتدا... . ئەوا جگە لەوەی کە ئازادی حیزبیی خنکێنرابوو لەوێ. بۆیە هەبوو، قەزافی، بە سەددامی لیبیا ناوزەند دەکرد.

دکتۆر غازی ئەل قەصیبی (١٩٤٠ ـ ٢٠١٠)، وەزیری دەوڵەت و کاری سعوودی، لە بیرەوەرییەکانیدا دەنووسێ؛" قەزافی بەرگریکەرێکی سەرسەختی تموحەکانی خۆیەتی، دەیەوێ ببێتە زەعمی جیهانی سێیەم، لەوەش پتر دەیەوێ ببێتە مامۆستا و ئیمامی ڕۆحی ئەو جیهانە. هەر کاتێ نێوانی لیبیا و سعودییە دەهات خراپ تێکبچێ، زوو نێردراوی خۆی بەنیازی ئاشتەوایی دەنارد، کە چاکیش دەبووینەوە، زوو تێکیدەداوە. کاتێک کە مەلیک فەیسەڵ کۆچی دوایی کرد، بە تەنها ئیستگەی ڕادیۆی

لیبیا قورئانی نەخوێند، بووە هەرا، دواتر قەزافی گوتی، "ئەو هەرایە چییە؟ بازرگانێکی پترۆڵفرۆش مردووە و بڕایەوە." کە لەساڵی (١٩٧٩) قەزافی و هاژینەکەی هاتنە ریاز، هاوسەرەکەی بەبێ پاسەوان و یاوەر دەچێتە بازاڕی، لەوێ پۆلیسی ئاداب، لێپێچینەوە لەو ژنەدەکەن کە عەبای نەگرتۆتەوە، دەبێتە هەرا، ژنە بە توڕەیی دەگەڕێتەوە ماڵەوە و قەزافی فرمان دەدا، هەر ئێستا فرۆکە ئامادە بکەن و بۆ گەڕانەوە و دەڵێ ئەوەی کراوە، سووکایەتی کردنە بە من و بە لیبیا. دوای هەزار تکا و ڕجا قەزافی ئیقناع نەبوو، داوای کرد کە سەرۆکی موفتی سعوودی بێت و گفتوگۆی لەگەڵ بکا. قەزافی داوای لە شێخ کرد، کە ئایەتێکی لە قورئانی پیرۆزی بۆ بێنێ، بڵێ، دەبێ ژن، عەبا و پێچە بگرێتەوە! ئەو ڕۆژەی قەزافی لە پەنجەری فرۆکەکەی خواحافیزی لێکردین، لە دڵی خۆمدا زگم پێی سووتا و گوتم، ئەو پیاوە دەتوانی ببێتە سەرکردەیەکی مەزن، بەڵام...!"

خەلیفە حەفتەر (١٩٤٣ ـــ ) دەڵێ: "لە کۆلێژی سەربازی، قەزافی هەمیشە کەمدوو بوو، گۆشەگیر بوو، نوێژەکانی لە کاتی خۆیدا دەکرد و قورئانی زۆر دەخوێند ـــ ١٩٦٤"

محەممەد حەسەنیین هەیکەل (١٩٢٣ ـــ ٢٠١٦)، دەنووسێ: "کە شۆڕشی فاتیحی بەرپاکرد لە ساڵی (١٩٦٩)، من یەکەم کەس بووم، وەک نێردراوی جەمال عەبدولناصر، لە بەنغازی، چاوم بە قەزافی کەوت و کۆبوونەوەیەکی پێنج سەعاتمان لەگەڵ خۆی و ئەفسەرە یاوەرەکانی کرد. ئەو گەنجە دەشتەکییەم وەک جوانۆیەکی ڕەسەن هاتە بەرچاو کە تاکو ئێستا پاکیزەیی بیابان و ئەو سارا پان و بەرینانەی لێ دانەتەکاوە، گەنجێکی تایەن و پاک و جست وچالاک، ئەگەر کرا بخارێندرێ بۆ گرتنەئەستۆی بەرپرسیارەتیی نیشتیمانی، ئەوا(ئەو جوانۆیە) دەبێتە هەسپێکی بەهێز و بەتوانای کەموێنە. بەڵام ئەگەر مەشقی پێنەکرێت و فێر نەکرێت، ئەوا هەر بە بەڕەڵایی دەمێنێتە و دوورنییە، بۆ خۆی و بۆ کەسانی دەوروپشتی موزەڕەتیشی هەبێ.

له (٢٩)ی مارتی (٢٠١٠)، له شاری سرت، سیلفیۆ برلسكۆنی، سەرۆك وەزیرانی ئیتاڵیا، كه بۆ كۆبوونەوه دەچێته ژێر دەوارەكە، له بەرانبەر زوومی كامیراكانی میدیای جیهانی، بەدەر له عورف و پرۆتۆكۆلیی دەوڵەتی، پردەداته دەستی قەزافی و ماچی دەكات، كه لێدەپرسن بۆچی ئەو رەفتاره نامۆیەیی نواند، دەڵێ:"كەسێتیی قەزافی هێنده بەهێزه كەوا له پیاو دەكات عورف و عادەتی لەبیر بچێتەوه. من هەمیشه دۆستی گەلی لیبیا بووم، ویستم بەو كاره عوزر له گەلی لیبی بخوازمەوه، بەرامبەر ئەو تاوانانەی ئیتاڵیا دەرهەق بەوان ئەنجامی داوه. دەبێ ئەو تاوانانەی دژ به گەلان ئەنجام دراون، خوردتر و رِشتر رسوا بكرێن."

تۆفیق ئەل منستیری، كه ئەفسەرێكی یاوەری قەزافی بووه له یەكەم رۆژی كودەتای (١٩٦٩)ەو دەڵێ:"رژێمێكی به زەبر و زەنگ بوو، قەزافی دەیەویست له دەرەوه ئارایشتی بكات و جوانی نیشان بدا. ئەو بۆ یەك رۆژیش له نێو قۆزاغەی خێڵەكی دەرنەچووه. خەڵكی لیبیاش ئەویان وەك "سەرۆك خێڵ" قبوڵ بووه نەك وەك "سەرۆك دەوڵەت". ئەو دژی هەر شتێك بوو كه بۆن و بەرامەی شارستانییەتی لێ بێ. قەزافی ژێر و زۆرزان نەبوو، له هزردا، كەسێكی خاكی و هەرزەیی بوو. ئەو هەموو ساڵه توانی فەرمان رەوایی بكات، چونكه هۆزێكی بەهێز و جەرگسۆزی، له پشت بوو."

ئەنوەر سادات (١٩١٨ ــ ١٩٨١) ناوی له قەزافی نابوو:"پیاوه شێتەكەی لیبیا."

دەزگای هەواڵگریی ئەمەریكا (CIA)، هانا دەباته بەر ناودارترین دەروونناسانی جیهان، ئەوانیش كۆك دەبن لەسەر ئەو راپۆرته كه دەڵێ:" ئەو زاته كەسێكی جیووه ئاسایه، زوو بیرورِای خۆی دەگۆرِی و رەفتار و هەڵسوكەوتی نامۆیه و كەسێكی دەشتەكی دەستەمۆنەكراوه."

دەروونناسێكی فەرنسی، له رۆژنامەیەك نووسی بووی :" ئەگەر قەزافی خۆی لەو رەفتار و هەڵسوكەوت و پۆشاك و روخساره نامۆ و سەیر و سەمەرانه، رزگار بكردبایه، دەیتوانی بێته ریزی بیرمەند و فەیلەسوفه ناودارەكانی مێژوو."

بروسكەیەكی ساڵی (٢٠٠٩)ی جین كریتز، باڵیۆزی ویلایەته یەكگرتووەكانی ئەمریكا لەترابلس، بەم شێوەیه باس لەكەسایەتیی قەزافی دەكات:"كەسێكی

جیوەیی و نامۆیە لەهەڵسوکەوتدا، حەزی لەسەمای فلامینکۆی ئیسپانی و پێشبڕکێی ئەسپسوارییە و بەشێوەیەکی یەکسان دۆست و دوژمن بێزاردەکات، خۆویستە و لەبەرزایی دەترسێت و حەزی لەفڕین نییە بەسەر ئاودا."

ڕۆناڵد ڕیگن(١٩١١ ــ ٢٠٠٤)، سەرۆکی ئەمەریکا، لە بیرەوەرییەکانیدا، قەزافی بە "موهەریجە شێتۆکە، ناو دەبات و دەڵێ:"هەمیشە وام دەزانی قەزافی بۆ کووشتنم پلان دادەڕێژێ، کە لە مۆسکۆ وتارم دەربارەی ئاشتیی جیهانی دەخوێندەوە، بۆ خۆم گوڵــلەبەندم لەبەرکردبوو، وامدەزانی ئێستانا ئێستا خوولە چەخماخەیەکم لێ پەیدا دەبێ، کە قەزافی ناردوویەتی، دێت و دەمکوژێ."

باراک ئۆباما (١٩٦١ ــ )، ڕۆژی کووشتنی قەزافی گوتی:"بە کووشتنی قەزافی چاخێکی تاریکی لیبیا کۆتایی هات." بەڵام دوای (٥) ساڵ گوتی:"گەورەترین هەڵە، کە من وەک سەرۆک کردم ئەوەبوو، دەستمان لە لیبیا وەشاند و قەزافی و خەڵکی لیبیامان کووشت، هەڵەیەک کە ناتوانم ددانی پێدا نەنێم."

هیلەری کلینتۆن (١٩٤٧ ـ ) کە قەزافی کوژرا گوتی:" هاتین و دیتمان و ئەو مرد."

دۆناڵد ترەمپ (١٩٤٦ ــ ) گوتی:" قەزافی و سەددام پیاوی خراپ بوون، ئەوان هۆکاریی سەرهەڵدانی ئیسلامییە تیرۆریستەکان بوون، دەبووایە نەیان کوژین، هەرنەبووایە، ئەوان تیرۆریستەکانیان دەکوشت."

لە ئاهەنگی یەکەم ساڵیادی کودەتای سێپتەمبەری (١٩٦٩) لە تەرابلس، جەمال عەبدولناصر، لە حزوور مەلیک حوسێن و حەبیب بورقیبە و قەزافیدا لە وتارێکیدا گوتی:"ئەی جەماوەری لیبیا، من دوای خۆم، ئێوە بە قەزافی برام دەسپێرم، ببێتە پارێزەریی نەتەوەی عەرەب و پارێزەریی یەکێتیی عەرەبی. ئەی قەزافی، تۆ لاویەتیی خۆم وەبیردەهێنیتەوە."

لە کۆنگرەی لوتکەی کۆمکاری عەرەبی لە دۆحە ساڵی (٢٠٠٩)، مەلیک عەبدوڵڵای عاهیلی سعوودی، بەم گوتەیە لە دەمی قەزافی داوە:"شاهنشینی سعوودیەی عەرەبی، نۆکەری ئیمپریالیزم نییە، کێ تۆی هێنایە سەر تەخت، کێ تۆی هێنا؟ خۆت لە شتێک هەڵمەقورتێنە کە کاری تۆ نییە، دەزانین بەریتانیا تۆی درووست کرد و ئەمەریکا تۆی پاراست. لە خودا بترسە، گوڕت لە پێشە."

شێخ یوسف قەرەزاوی، سەرۆکی یەکێتیی زانایانی جیهانی ئیسلامی گوتی:"قەزافی شێت و شووره و هیچ ئەوەیە پیاو پێی پێبکەنێ. نابێ ئەفسەر و سەربازەکانی فرمانەکانی جێبەجێ بکەن، هەر کەسێک دەستی بگاتە ئەو زاڵمە و بیکوژێ دەستی کەسک دەبێ. ئەو، وەکو هاوەڵەکانی، مێژوو ناخوێننەوە، بیشیخوێننەوە تێی ناگەن، تێشی بگەن لێ حاڵی نابن. خودا لە دونیا و لە قیامەتی تۆڵە لە قەزافی دەسێنێتەوە."

هیوگۆ چاڤێز(١٩٥٤ ــ ٢٠١٣)، سەرۆکی ڤێنزیولا دەڵێ:"ئێمە دەبێ هەمیشە یادی قەزافی وەک خەباتگێڕێکی گەورە و شۆڕشگێڕ و شەهید، بکەینەوە."

لویس فەرخان (١٩٣٣ ــ )، سەرۆکی ڕێکخراوی (ئوممەی ئیسلامی، دەڵێ:"قەزافی شەرەفمەندا کۆچی کرد، گیانی فیداکرد لە پێناو وڵاتەکەی."

ڕۆناڵد ڕیگن:"ئێمە دەزانین ئەو سەگەی ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست، ئامانجی شۆڕشی جیهانیی هەیە."

نیلسن ماندێلا گوتی:"ئێمە لە ڕوانگەی فەلسەفەی خەباتی خۆمانەوە، دەڕوانینە ئەوانی دیکە. هەرکەسێ پشتیوان و هاوکارمان بووبێ، پشتوان و هاوکاری دەبین. یاسیر ئەرەفات و زەعیم قەزافی و فیدال کاسترۆ، بەهەموو توانایانەوە هاوکاریی خەباتی ئێمەیان کرد."

## (٧١)

# بۆچی قەزافی بەو ڕۆژە ڕەشە گەیشت؟

ڕۆژ نییە، بە چەندان شێوە ئەم پرسیارەم لێ نەکرێ. من هەمیشە ئەو پرسیارە لە خۆم دەکەم کە قەزافی دەیتوانی وا بکات بەو ڕۆژە نەگات، بەڵام بۆ هیچ هەنگاوێکی هەڵنەهێنا بۆ ڕێگریکردن لەو ڕۆژە ڕەشە؟

هاووڵاتی هەر وڵاتێک، لە هەموو سەردەمێک و لە هەموو گونجێکی ئەم جیهانەدا، هەمیشە (٣) خەونی هەبووە کە بە ئاشتی و بە خوێن لە پێناویدا خەباتی کردوە: (خۆشگوزەرانی؛ ئاشتی و ئاشتەوایی؛ ئازادی). قەزافی (دەسەڵات و گەنجینە و هێز)ی هەبووە بۆ مەیسەرکردنی ئەو (٣) خەونە بە ئاسانی؛ لە دەسەڵاتداریدا، هیچ ڕکابەرێکی کەمەرشکێنی نەبوو، لە گەنجینەدا، لە قارووونی زۆرتری هەبوو، هێزیش، لە چاوەخۆی بەهێز بوو. لە دەستپێکی ڕاپەڕینەکەی (فەبرایەری ٢٠١١)، بۆ دامرکاندنەوەی جەماوەری ڕاپەڕیوو، هەستا بە بەخشینی (٢٠٠ دینار / ٨٠ دۆلار)، بەو کەسانەی کە سەردانی بانقیان دەکرد. خەڵکێکی زۆر کەم بۆ وەرگرتنی ئەو هاوکارییەوە چوون و قبوڵیان نەبوو ئەو بڕە پارە کەمە وەرگرن، چونکە دەیانزانی گەنجینە و داهاتی لیبیا بە (سەدان) ملیار دۆلاری خەوتووە لە ژێرزەمینی وڵاتانی دیکەدا!

قەزافی ئەو پارە و سامانە زۆرەی بۆ چی هەڵگرتبوو؟ بۆ کێی هەڵگرتبوو؟ هەمیشە هاوڕێ لیبییەکانم دەیانگوت:"بۆ ئێمەش وەکو (دوبەی) نەبین خۆ هەموو شتێکمان لەوان زۆرتر و باشترە؟:"

ئەوانەی بە مێژووی ڕۆژهەڵاتی ناوەند و جیهانی سێیەم ئاشنان، گەواهی دەدەن کە کودەتا بەرپاکردن و هەڵگەڕانەوە و کووشتنی سەرۆک و مەلیک و میر و پاشا، لەو وڵاتانەدا بە درێژایی مێژوو هەر هەبووە، بە تایبەتی دوای نیوەی یەکەمی سەدەی ڕابردوو. بۆیە لە هەموو ئان و ساتێکدا، دەست وەشاندن لەو سەرۆک و مەلیکانە، پێشبینی کراوە، ئەگەر نەیارانیان دەرفەتیان بۆ هەڵبکەوێ.

لەم کتێبەدا، ئاماژەمان بەودا کە لە سەرەتای کودەتا، میسر، بە دیاری کراویش، ئەنوەر ساداتی سەرۆک کۆماری ئەو وڵاتە، هەوڵی کووشتنی قەزافی دا، بەڵام سەری نەگرت، ئەو دەیگوت:"جیهان ئاسوودەتر دەبێ، بەبێ ئەو پیاوە شێتە!". ڕەووتی چەکداریی (ئیخوان)یش بە لانی کەم، دوو جاران هەوڵی کووشتنی ئەویان دا و ژمارەیەک لە پاسەوان و یاوەراکانیشی بەدەستی ئەو چەکدارانە کوژران. کە خۆم لە لیبیا بووم، دوو جار هەوڵی کووشتنی درا، هەردوو جارەکەش، جێبەجێکارانی پیلانەکان لە هۆزی قەذاذیفە و لە خزم و ناسیاوە نزیکەکانی خۆی بوون. دەگوترێ لەو ماوەی (٤٢) ساڵ لە حوکمڕانی، (٢٦) جار هەوڵی کووشتنی قەزافی دراوە!

من پێشتریش لێرەدا گوتم، کە ڕاپەڕینەکەی (فەبرایەری ٢٠١١) بەرپابوو، نەک قەزافی هەر کەسێک سەرکردەی لیبیا بووایە، هەر ئەوە چارەنووسی دەبوو.

بەڵام کووشتنی قەزافی، بابەتێکی ئاڵۆزتر و قوولتر و گەورەتر بوو. ئاڵۆزتر بوو، چونکە دوژمنەکانی زۆر بوون، لەسەر ئاستی جیهان. قوولتر بوو، چونکە (٤٢) ساڵ حکومڕانی، سەنگ و قورسایی لەنگ و ناپارسەنگی بەدوای خۆیدا هێنا لە هەموو ڕووێکەوە. گەورەتر بوو، چونکە کاریگەریی لەسەر نەخشەی (رابردوو و ئیستا و ئایندەی) وڵاتەکە و ناوچەکە و جیهانیشی هەبوو.

کە لە کتێب و ڕاپۆرت و هەواڵ و قسە و باسەکاندا، بەدوای چارەنووسی قەزافیدا کنە و پشکنین دەکەی، بۆت ڕوون دەبێتەوە کە (دەسەڵاتە زل هێزەکانی جیهان) (١٠) ساڵ دەبوو، واژوویان لەسەر وەفاتنامەی قەزافی کردبوو– جا بە هەر ڕێگە و ئامراز و دەسیسەیەکەوە بێ! قەزافیش، ئەو زانیارییەی هەبوو، بۆیە دەیەویست بە شێوەیەک سیاسەت بکات، هەم وڵاتانی (ئیستعمار و سەهیۆنی و ڕەجعی و ئیسلامی) ڕازی بکات، هەم هەمیشە وەک ڕابەر و سەرکردەی بیرکابەر و قائیدیش خۆی نیشان بدا، هەر نەبێ لە ناو هاوڵاتییەکانی خۆی و لە ناو عەرەب و لە ئەفریقیا! ئەدی لە دوایین کۆبوونەوەی کۆمکاری عەرەبی، نەیگوت، "دوای سەددام، نۆبەی یەکە یەکەتان دێ و هەمووتان لە سێدارە دەدەن، بە خۆشمەوە!" ئامادەبووانی کۆنگرەکە بە قاقا پێی پێکەنین.

لە کوردەواریی خۆماندا، کە برینێک، تووڵ دەکێشی و چارەسەر ناکرێ و بڵاودەبێتەوە و بێ لەزەت دەبێ، دەڵێن (پیسی کردووە). جا (٤٢) ساڵ حکومرانی قەزافیش، بارودۆخی

ناوچەکە و جیهانی نەک هەر پیس کردبوو ــ لە دیدی نەیارانیدا، بەڵکوو بوو بووە سەرە گڕکانێک لە بارووت و ئاگر!

با بۆتان ڕوون بکەمە، چۆن ئەو برینە پیسی کردبوو و مەترسییەکانیشی چی بوون:

یەک: لیبیا نزیکەی (١٤٠) ئێڵ و عەشیرەتە، هەمیشە پێشکەوتنی شارستانییەتی و تەکنەلۆژیا و ژیانی سەردەم، لەگەڵ ڕۆژگاردا، وادەکات، شێوە و ڕۆڵ و کەلتووری ئەو خێڵ و ئەشیرەتانە کاڵ ببنە و خاو ببنەوە و وردە وردە لە نێو کایەی ژیانی سەردەم بتوێنەوە. ئەمە لە لیبیا ڕووی نەدا. هەر ئەم ئێڵ و عەشیرەتگەرییەش بوو ڕۆڵی بەرچاوی هەبوو لە لەناوچوونی قەزافی و ڕژێمەکەی. ئەو سیستمی جەماوەرییەکی عەشائیری دانابوو، نەک جەماهیرییەکی سەردەمییانەی پێشکەوتووخوازیی سەردەمییانە. ئەو ئەشیرەتگەریی دە هێندەی سەردەمی پاشایەتی بەهێز کرد، چونکە هێزی خۆی، لە هێزی ئەشیرەتەدا دەبینیەوە، کەوا نەبوو.

دوو: هیچ کیشوەرێک بە قەد کیشوەری ئەفریقیا، فرە نەتەوە و زمان و ئایین و کەلتوور نییە. دوای ئەوەی قەزافی دڵی لە عەرەبەکانی هاوخوێنی خۆی ڕەنجا، بەرەو قوڵایی کیشوەری ئەفریقیا داکشا، وایزانی ئەفریقیا دەبێتە پشت و پەنای، لە ساڵی (١٩٩٩) لە هەموو کووچە و کۆلانێکی لیبیا نووسراو بوو (وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەفریقیا)، لە بەرانبەر (وڵایە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا). خەڵکانی ئەفریقیا هەر ئەو ساتە، قەزافیان ویست، کە دۆلاری دەبەشییەوە بە سەریاندا، کە لە بەشینەوەکە بۆوە، ئەو بووە کەسێکی غەوارە و بێگانە لە چاوی ئەواندا.

سێ: هەر لە گۆنگرەی کۆمکاری عەرەبی، بە بەرچاوی هەموو دونیا، دەستووری ئەنجوومەنی ئاسایشی نێو دەوڵەتی و نەتەوە یەکگرتووەکانی لەت و پەت کرد و بە چاوی سەرکردەکانی دادا و گوتی:"بۆ سەری خۆتان لە نێو لمدا دەشارنەوە، ئەوە گاڵتەجارییە، ئیمرۆ هێز دەخوا... ئەو کاغەزۆکانە سەلکە تورێکی قوڕاوی ناهێنن." ئەوجا چەندان نموونەی بۆ هێنانەوە بە کێشەی سەت ساڵەی فەڵەستین و ئیسرائیل دەستی پێکرد. ئەو ڕەفتارەی قەزافی، لە دیدی سیاستوانانی جیهاندا، شەهادەی وەفاتی قەزافی نووسیوە.

چوار: لە سەردانێکی دا بۆ چەند وڵاتێکی ئەفریقی، لە ناوە ڕاستی نەوەتەکانی سەدەی ڕابردوو، قەزافی بەڵێنی دام کە ئابووری هەموو کیشوەری ئەفریقیا یەکبخات و (دۆلاری

ئەفریقی) جیگەی (دۆلاری ئەمریکی) بگریتەوە. لەو رۆژەدا، ئەمریکا و ولاتانی بازنەی ئەمریکا، بریاری کۆتایی هینیان بە قەزافی دا. چونکە دەست بردن بۆ (دۆلاری ئەمەریکی) گەورەترین و مەترسیترین مەسەلە بوو بۆ ئەوان و ئابووریی جیهان و ئایندەی هەموو جیهان. مەحالٌ بوو ئەمەریکا ریگا بدا قەزافی بەو خەونە بگا. هەمیشە لە فەرهەنگی سیاسیی ئەمریکادا، دەستبردن بۆ شیواندن و سووککردنی دۆلار، هیلی سوورە.

پینج: لە دیدی سەرانی جوو لە ئیسرائیل، کیشەی نیوان فەلەستینەکان و جووەکان بیتام بوو و زۆری خایاند و بی چارەسەر ماوە. ئەوان تاوەکو (١٩٩٩) هەر لەو باوەرەدابوون کە تاکە سەرکردەیەک، دەتوانی کاریک بکات، فەلەستینییەکان و جووەکان لیک نزیک بکاتەوە قەزافییە. هەولی زۆریان لەگەلٌ دا و نوینەرانی جوو و قەزافی چەندان دانیشتن و دیداریان بە نهینیی لە ولاتانی عەرەبی ئەنجامدا. لە کۆتایدا، قەزافی گوتبووی: "شکۆی خۆم نادەمە دەست جووا!" لەو رۆژەوە جووش بریاری نووسینەوەی وەفاتنامەی قەزافی دا.

شەش: تەنها لە سالی (٢٠١٠) داهاتی لیبیا نزیکەی (٦٦) ملیار دۆلار بوو، لە کاتیکدا حەشیمەتەکەی (٦) ملیۆن و نیو بوو، بەلام لە لیستی ولاتانی گەندەلدا، ریزبەندی (١٤٦) ی پیدرا بوو لە نیو (١٧٨) ولاتدا لە جیهان. کەس نەیزانی قەزافی چی لەو داهات و سامانە زۆرە دەکرد. خەلک هەمووی لی پر بوون و راستییەکانیان دەزانی.

حەوت: کە کورەکانی قەزافی گەورە بوون، باوکی بە بیروباوەری خۆی پەروەردەی کردن و لە ماوەیەکی کەمدا، لیبیایان لە نیو خۆیاندا دابەش کرد، هەر یەکیکیان بۆخۆی ئیمپۆراتۆریک بوو بە عائیشەی کچیشیەوە. خەلکی زۆر لەوان نارازی بوون و باوکیان بە سەببکار دەزانی، هەرچەند ئەو باوکەش دەسەلاتی بەسەریاندا نەمابوو.

هەشت: بەدریژایی ئەو (٤٢) سالە، بۆ یەک رۆژیش قەزافی لەگەلٌ ئەمریکا و بەریتانیا و ولاتانی رۆژاوادا تەبا و کۆک و دۆست نەبووە، ئەگەر بە روالەتیش خۆی وانیشان دابی. چەندان کاری تیرۆریستیش دژی ئەو ولاتانە خرانە ئەستۆی قەزافی، وەک بینینمان.

نۆ: بە دواییە، قەزافی زۆر بانگەشی ئەوەی دەکرد کە ئەوروپا ببیتە ئیسلام. کە دەچووە هەر ولاتیکی ئەوروپایی، نەک داوای لە خەلکەکە دەکرد بینە سەر دینی ئیسلامی، داوایی لە

سەرکردەنانیشی دەکرد. لە ئیتاڵیا، لە سەردانێکیدا، نزیکەی (٤٠٠) ژنی کردە ئیسلام. لە یەکێتی سۆڤیەتیش هەر وایکرد.

جا لەکاتی سەرهەڵدانی ڕاپەڕینەکە، لە جیاتی ئەوەی قەزافی نەرمی بنوێنێ و دەست بکات بە گفتوگۆی هێمنانە لەگەڵ خۆپیشاندەران، بە ئاگر و ئاسن وەڵامی دانەوە. ئا لەو کاتەدا، دوو ڕووداوی زۆر گرینگ بەیەکەوە ڕوویاندا:

یەک: گرووپە ئیسلامییە چەکدارەکان، لە ماوەی حەفتەیەکدا نزیکەی (١٠) هەزار چەکداری خۆیان لە سوریا و میسر و تونس و جەزائیر و عیراق... تاد، نارده لیبیا و چوونە پاڵ چەکدارە لیبییەکان.

دوو: لیژنەی باڵای ڕاپەڕینی لیبی، داوای هاوکاریی لە هێزی ناتۆکرد بۆ پشتیوانی کردنیان. ئەو کات سارکۆزی (١٩٥٥ـ)، سەرۆک کۆماری فەرنسا بوو(٢٠٠٧ ــ ٢٠١٢). پێشتریش ناخۆشی لە گەڵ قەزافی هەبوو، بەوەی گۆیا ڕەشووەی لە قەزافی وەرگرتووە.

ئەگەر زوو هێزی ناتۆ پێڕانەگەیشتبایە، بۆی هەبوو، قەزافیش بتوانێ، هەر نەبێ، بە قەت بەشار ئەسەد لە سوریا، بەرەنگاری جەماوەر ڕاپەڕیوەکە ببێتەوە. هێزی سوپاسی قەزافی بەرە و بەنغازی دەچوو، کە هێزی ئاسمانی ناتۆ لە نزیک شاری خومس هەمووی تەفروتۆناکردن و هێزەکەی قەزافی شکا، کتومت سوپای لیبیا وەک سوپای عیراقی لێ بەسەر هات لە (ڕێگای مەرگی نێوان کوێت و بەسرا ١٩٩١). بەوەش جەماوەرەکە پتر کەوتنە جۆش و خرۆش و پەلاماردان و زانیان ڕۆژاوا دەستی لە قەزافی شووشتووە.

کەواتە، بەهاری عەرەبی، بۆ نەیارانی قەزافی، دەرفەتێکی زۆر لە بار و گونجاو و بوو، بۆ جێبەجێکردنی ئەو پیلان و نەخشەیەی کە (١٠) ساڵێک دەبوو لە سندووقە ڕەشەکاندا هەڵیان گرتبوو. خۆتێهەڵقولاندنی هێزی ناتۆ لە ڕاپەڕینەکەی لیبیا، دوور و نزیک پەیوەندیی بە خەبات و ئازادی و ڕزگارکردنی گەلی لیبیاوە نەبوو، نەخشەیەکی داڕێژراوی کۆن بوو و دەرفت و هەل هاتە پێش و دەستی خۆیان وەشاند. هێزی ناتۆ ژێرخانی لیبیای هەڵتەکاند و هەرچی کارخانە و کارگە هەبوو خاپووری کرد، تەنانەت لوولەکێشی پرۆژەی ئاوی (ڕووباری دەستکرد)یشی لەژێر زەوی، تەقاندەوە تا وەکو ئیمرۆ (٢٠٢٢) ئەو پرۆژەیان بۆ چاک نەکراوەتەوە، بێ ئاوی شپرزەی کردوون.

لە ئاکامدا، ئەوەی ڕوویدا ڕوویدا.

## (٧٢)

# مشتێ زانیاریی مزاش

ئەمەی لێرە دەخوێنیتەوە، تیکەڵەیەکە لە زانیاری و قسە و باس، کە خۆم بە حوکمی ئەوەی ئەو ساڵانەی لە لیبیا ژیاوم، قەناعەتم پێیان هەیە و حەزم دەکەم بۆ ئێوەی تۆمار بکەم. بابەتەکان فرە باس و ڕەنگ و تام و چێژن.

- بە گوێرەی بەرنامەی گەشەپێدانی نەتەوە یەکگرتووەکان (UN)، لە ساڵی (٢٠١٠) ئاستی خوێندەواری لە لیبیا گەیشتبووە (٨٨٪)، ئەمەش بەرزترین ئاست بوو لە کیشوەری ئەفریقیا. ڕێژەی تەمەنیش (٧٤) ساڵ بوو. هەم بۆ پیاو و هەم بۆ ژن. ئەمەش ئاستێکی بەرز بوو، لە چاو تەمەنی دەرودراوسێیەکانیان.
- لەوەتەی ساڵی (١٥٥١)ەوە، کە لیبیا ئەمارەتێکی سەر بە دەوڵەتی عوسمانی بوو، حوکمی قەزافی، درێژترین حکومڕانی بووە لە لیبیا و ئەفریقیا و ڕۆژهەڵاتی ناوەندا.
- سیستمی حکومڕانی (جەماهیرییەکەی قەزافی) لە زانستیی سیاسەتدا، ناچێتە ژێر ناونیشانی هیچ جۆرە سیستمێکی حکومڕانی لە مێژوودا. هەر هەموو جۆرە سیستەمەکانی لە خۆیدا کۆکردبۆوە و لە هەمان کاتیشدا هیچیان نەبوو.
- لە پێنج ساڵی یەکەمی دوای ڕووخانی ڕژێمی قەزافی، ژمارەی قوربانییەکانی خەڵکی لیبیا، لە ئاکامی شەڕەکانی ناوەخو، چوار ئەوەندەی کۆی ئەو قوربانییانە بوو کە لە (٤٢) ساڵ حکومڕانی دەستی دەسەڵاتدارانی ڕژێم لەناوچوون. یەک لەسەر سێی دانیشتووانی لیبیا بوونە دەربەدەر و ئاوارە.
- لە ساڵی (٢٠٠٩) قەزافی گوتی: "تورکیا هەمیشە چاوی تەماحی بڕیووەتە لیبیا. لەو (٥٠٠) ساڵەی دواییدا، لە نێوان هەر (٧٠) ساڵ بۆ (١٠٠) ساڵ، جارێک پەلاماری لیبیایان داوە. ئێستا وا (٧٠) ساڵەکە تێپەڕیووە، پێشبینی دەکەم، بەو زووانە تورکیا دیسان پەلامارمان بداتەوە... دەبێ وریابین و خۆمان بۆ ئەو ئەگەر ئامادەکەین".

- "(٢٠٢٠): سوپاس بۆ خودا تاکو ئێستاش، پەیوەندیم لە گەڵ زۆر لە دۆستەکانی لیبیا هەر ماوە، چ ئەوانەی لەوێن و چ ئەوانەی پەرتەوازەی ولاتان بوون، کە پتر لە ولاتی میسر و ئۆکرانیان، بێگومان دوای ڕووداوەکانی ساڵی (٢٠١١) بارودۆخەکە گۆڕاوە، ئەوان بە ڕۆژگاری سەردەمی قەزافی دەڵێن (ايام الخير و العز). ئێستا لیبیا بۆ (٣) هەرێم دابەش بووە: هەرێمی ڕۆژهەلات و بەنغازی کە میانڕەوکان بەڕێوەی دەبەن، هەرێمی تەرابلس و ڕۆژئاوا کە بەدەست توندڕەوەکانە، وە هەرێمی (هوون)، کە دەکەوێتە ناوەند و نزیک خواروو لیبیا، ــ ڕەنگبێ ئەو زانیاریە بۆ هێندێکتان نوێ بێ؛ ئەم هەرێمە لەژێر دەسەلاتی عەشیرەتی (قذاذيفة) یە، کە عەشیرەتەکەی موعەمەر قەزافییە. تاکو ئێستا لەوێ ئالا و سروود و کتێب و پرۆگرامی سەردەمی قەزافی پەیڕەودەکرێ و خۆیان ناوچەکە بەڕێوە دەبەن ــ لە هوونیش چەند دۆستێکم هەیەو ئاگاداری گوزەرانیانم ــ. گەرچی ئەو ولاتە وای بەسەرهات و ئاسایش تێکچوو، بەلام مووچەخۆرەکان، لە پایتەختەوە هەر مووچەیان بۆ دەچێت، تەنانەت کە شارەکان بەدەست داعشەوەش بوون، بەلام کێشەیان ئەوەیە جار هەیە لە بانکەکان پارە نییە، پتر لە (٥٠) ساڵ دەبێ، لە لیبیا مووچەخۆر، موچەکەی دەچێتە سەر حیسابی بانک."
- کەمنین، ئەوانەی، کە دایەگەورەی (غەزاڵ)ی دایکی موعەمەری، بە بنجوو دەزانن. بۆخۆشم گوێبیستی شتێکی وابووم. لێ، ترسی موعەمەر لە جوولەکە هێندە گەورەبوو، کە هەمیشە لەفکری ئەوەدابوو چۆن بنبڕیان بکات. لەگەڵ دامەزراندنی ئیسرائیل، ئەو (٤٠) هەزار جووەی لە لیبیا بوون، هەرەزۆریان کۆچیان کرد و لیبیایان بەجێهێشت، بەلام کە موعەمەر هاتە سەرحوکم، چوو یەک یەک ئێسکوپروسکی جووەکانی لە گۆڕستانی جوولەکەکان دەرهێنا و لە تورەگەی کردن و ناردنیەوە ئیسرائیل، بەوەش نەوەستا، قەرەبوویکی باشی بۆ ئەو جوولەکانە نارد کە زەوەیوزار و خانوویان بەجێهێشتبوو. دوایین شتیش کە کردی، ئەو جووە تاقولۆقانەی لە لیبیا مابوونەوە سواری پاپۆڕی کردن و ناردنیەوە ئیسرائیل و پارەی باشیشی دانێ و پێیگوتن، ئەو بڕە پارەشم لێوەرگرن، بۆخۆتان ڕێکخراوێک سازکەن بەناوی (کۆمەڵەی جووەکانی لیبیا).
- ئامێری گیتار لە لیبیا قەدەغە بوو، بە مەبەستی پارێزگاریکردن لە هونەری کەلتووریی میللیی خۆیان.

- ئەمەریکا و وڵاتانی هاوپەیمانی دژی گەلی لیبی و عێراقی وەستانەوە کە بە ڕاپەڕین هەستان، بەڵام کە دواتر بریاری لێدانی ئەو دوو سەرکردەیان دا، زوو پشتیان بە ئەرزی دادان. گرتن و کووشتنی سەددام و قەزافی، لەیەک دەچوون، لە نێو چاڵ و بن پرد و حەشارگە.
- ڕۆژنامەوانی میسری، حەسەنێن هەیکەڵ دەڵێ:"لەساڵی (١٩٧٠) جەمال عەبدوناصر دوای بەستنی کۆبوونەوەیەکی لوتکەی کرد، دوای ڕووداوەکانی (ئەیلولی ڕەش)، قەزافی هات و دەمانچەیەکی پێ بوو، گوتی یاسر عەرەفات و مولیک حوسێنی دەکوژم! هەرچەندی عەبدولناصر هەوڵیدا ئارامی بکاتەوە، بێ هوودە بوو. ناچار کۆبونەوەکەیان دواخست و عەبدولناصر داوای لە یاسر عەرەفات و مەلیک حوسێن کرد، لە ژوورەکە بچنە دەرەوە، پێش ئەوەی قەزافی بیان بینێ!"
- لە ساڵی (١٩٧٣)، قەزافی بەبێ ئاگادارکردنەوی حکوومەتی میسر، بە فڕۆکە بەرەو قاهیرە فڕی. چەند چرکەیەکی مابوو، دژە فڕۆکەکانی میسر فڕۆکەکە بخانە خوارەوە، ئاگادارکرانەوە، کە دەست نەوەشێنن، ئەوە قەزافییە.
- لە لیبیا و لە جیهان، قەزافی (٥٣٣) مزگەوتی و (٤٦٧) زاویەی قورئان ئەزبەرکردنی بونیاتنا و (١٢٠) ملیۆن دانە قورئانی پیرۆزی چاپ کرد و بە جیهاندا بڵاوی کردەوە.
- کاتی هێزەکانی ناتۆ دەستیان لە هێزەکانی سوپای لیبیا وەشاند لە ساڵی (٢٠١١)، گەورەترین زەروزیانیان بە ژێرخانیی ئەو وڵاتە گەیاند. لوولەکانی (ڕووباری دەستکرد ـــ نهر الاصناعی)یان بۆمبارانکرد و تاکو ئێستاش بە تەواوەتی بۆیان چاک نەکراوەتەوە. هەرچی کارگە و کارخانە هەیە وێرانیان کرد. دواتریش داعشیان نارده ئەو وڵاتە تا ئەوەی خۆیان دەستیان پێرانەگەیشتبوو، ئەوان بە تەواوەتی خاپووری کەن. بەوەش گوتەکەی قەزافی ڕاست دەرچوو کە دەیگوت:"ئیستعمار، دەیەوێ وڵاتەکەتان بکاتە وێرانە و ژیانی تێدا نەمێنێ." تێچووی ڕووباری دەستکردی لیبیا، نزیکەی (٣٥) ملیار دۆلار بوو کە بە هەشتەمین عاجباتییەکانی جیهان ناونرابوو.
- قەزافی تاکە سەرکردەی عەرەب بوو کە قەت حەج و عەمرەی نەکرد.
- لە ساڵی (٢٠١٧) خانەوادەی قەزافی لە دادگا، سکاڵایەکیان لە دژی ئەو گروپە توندڕەوانە تۆمار کرد کە لە نێو ئەو میلیشیایاندا بوون و لە مانگی ئەیلولی ساڵی (٢٠١١)دا دەستیان بەسەر

ناوچەی وادی غەرفدا گرت و لەگەڵ گروپەکانی دیکە هەڵسان بە هەڵدانەوەی گۆڕی هەر یەک لە عائیشەی کچی نیرانی دایکی قەزافی و ئەحمید عەبدولسەلام ئەبومینیاری مامی و محەممەد عەبدولسەلام ئەبومینیاری باوکی موعەمەر قەزافی و شاردنەوەی ئیسک و پرووسکیان لە شوێنێکی نادیار.

○ مێژووی لیبیا لە قەزافیەوە تا ڕاپەڕین:

ئەمانەی خوارەوە گرنگترین وێستگەکانن لە مێژووی مۆدێرنی لیبیادا لەو کاتەوەی عەقید موعەمەر قەزافی دەسەڵاتی گرتە دەست تا ئەو شۆڕشەی کە دەسەڵاتی ٤٢ ساڵی ڕووخاند.

● - ١ی ئەیلوولی ١٩٦٩: عەقید موعەمەر قەزافی سەرکردایەتیی کودەتایەکی سەربازی کرد کە دەسەڵاتی پاشایەتی لە لیبیا ڕووخاند.

● - ٢٩ی تشرینی یەکەمی ١٩٦٩: فەرمانڕەوایە نوێیەکانی لیبیا داوای کشانەوەی تەواوی هێزەکانی بەریتانیا و دوورخستنەوەی بنکەکانیان لەو وڵاتە دەکەن.

● - ١٤ی تشرینی دووەمی ١٩٦٩: دەستپێکردنی بە نیشتیمانیکردنی بانک و نەخۆشخانە بیانییەکان لە وڵاتدا.

● - ١١ی کانوونی دووەمی ١٩٦٩: جاڕنامەی دەستووری کاتی.

● - ٢٧ی کانوونی دووەمی ١٩٦٩: لیبیا و میسر و سودان پەیمانی تەرابلس واژۆ دەکەن.

● - ١٦ی حوزەیرانی ١٩٧٠: هێزەکانی ئەمریکا بنکەی ویدوسیان چۆڵ کرد.

● - ٥ی تەمموزی ١٩٧٠: دەستپێکردنی بە نیشتیمانیکردنی پیشەسازیی نەوتی لیبیا.

● - ١٤ی تشرینی دووەمی ١٩٧٠: دابەشکردنی ئیداری لیبیا گەڕێنرایەوە بە گۆڕینی دابەشکردنی عەشیرەتی تەقلیدی بە دروستکردنی پارێزگا و شارەوانی و بەڕێوەبەرایەتی.

● - کانوونی دووەمی ١٩٧٠: هەموو بانکەکان بە نیشتیمانی کران.

● - ١٤ی ژانویەی ١٩٧١: قەزافی لە شاری ئەلزاویەوە پێکهێنانی کۆنگرەی گەلی ڕاگەیاند.

● - ١٧ی نیسانی ١٩٧١: لیبیا و سوریا و میسر لەسەر یەکرێزی ڕێککەوتن و لە ١ی ژانویەی ١٩٧٢: کۆماری عەرەبی یەکگرتوویان ڕاگەیاند.

• - ١٥ی تشرینی یەکەمی ١٩٧١: بە نیشتیمانیکردنی سەرجەم کۆمپانیاکانی بیمە لە لیبیا.

• - ٢٨ی تشرینی یەکەمی ١٩٧١: دەسەڵاتی ئەنجومەنی شۆڕش لە لیبیا لیژنەیەکی پێکهێنا بۆ پێداچونەوە بە یاساکانی لیبیا لە ژێر رۆشنایی شەریعەتی ئیسلامیدا.

• - ٣٠ی ئایاری ١٩٧٢: یاسایەک دەرچوو کە حیزبایەتی قەدەغە دەکرد.

• - ٤ی ئابی ١٩٧٢: ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا تەنها لەسەر داوای لیبیا کارمەندانی باڵیۆزخانەکەی لە تەرابلس بۆ ١٥ کەس کەمکردەوە و باڵیۆزی ئەمریکاش دەستلەکارکێشانەوەی خۆی پێشکەش کرد.

• - ١٦ی نیسانی ١٩٧٣: قەزافی لە زووارەوە ئەوەی بە تیۆری خۆی ناوی دەبرد: (تیۆری سێیەم) ڕادەگەیەنێت.

• - ٦ی تشرینی یەکەمی ١٩٧٣: هەڵگیرسانی شەڕی ئۆکتۆبەری نێوان ئیسرائیل و میسر، کە کۆتایی بە پرۆژەی یەکریزی نێوان میسر و لیبیا هێنا.

• - ٢٦ی تشرینی یەکەمی ١٩٧٣: لیبیا بەهۆی پشتیوانیکردنی لە ئیسرائیل، ڕەتیکردەوە نەوت بۆ ئەمریکا دابین بکات.

• - ئایاری ١٩٧٤: دووەم کەسی ناو ڕژێم بەناوی عەبدولسەلام جەلود سەردانی یەکێتیی سۆڤیەتی پێشوو دەکات و ڕێککەوتنێکی گەورەی چەک واژوو دەکات.

• - ٢ی ئازاری ١٩٧٥: خۆپیشاندانی خوێندکاران لە شاری بنغازی دژی ڕژێمی قەزافی.

• - ١٣ی ئابی ١٩٧٥: هەوڵێکی شکستخواردوو بۆ ڕووخاندنی ڕژێمی قەزافی.

• - ٢٦ی ئابی ١٩٧٥: دامەزراندنی دادگاکانی شۆڕش.

• - ٢٥ی ئایاری ١٩٧٦: قەزافی دەستپێکردنی پێکهێنانی کۆمیتەی شۆڕشگێڕی ڕاگەیاند.

• - ١٧ی ئەیلوولی ١٩٧٦: قەزافی بەشی یەکەمی کتێبی "کتێبی سەوز"ی بڵاوکردەوە، کە ئەو شتەی لەخۆگرتبوو کە ناوی لێنابوو تیۆرییەکەی، و وەک میتۆدێک بۆ حوکمڕانی لیبیا وەریگرت.

• - ٤ی شوباتی ١٩٧٧: ئەمریکا لیبیای خستە لیستی ئەو وڵاتانەی کە بە دوژمنی خۆی دەزانێت.

• - ٢ی ئازاری ١٩٧٧: ڕژێمی قەزافی ڕایدەگەیەنێت کە بە لیبیا ناودەبرێت جەماهیرە.

• - ٣ی ئەمووزی ١٩٧٧: مشتومڕێکی نێوان قەزافی و هەندێک لە زانایان لە مزگەوتی مەولەی محەممەد لە تەرابلس سەبارەت بە ڕۆڵی سیاسی و ئابووری ئیسلام لە کۆمەڵگەی هاوچەرخدا.

• - ئازاری ١٩٧٨: ڕاگەیاندنی هەڵوەشاندنەوەی موڵک و ماڵی کەسیی لە لیبیا.

• - ٦ی ئایاری ١٩٧٨: ڕژێمی قەزافی سیاسەتی "ماڵی دانیشتووانەکەی" ڕاگەیاند.

• - ئەلفاتحی ئەیلوولی ١٩٧٩: گۆڕینی ناوی باڵیۆزخانەکانی لیبیا لە جیهاندا بۆ "نوسینگەی گەل".

• - ٢ی کانوونی دووەمی ١٩٧٩: سووتاندنی باڵیۆزخانەی ئەمریکا لە تەرابلس.

• - ٢٩ی کانوونی دووەمی ١٩٧٩: واشنتۆن لیبیای خستە لیستی ئەو وڵاتانەی کە سپۆنسەری تیرۆر دەکەن.

• - ٣ی شوباتی ١٩٨٠: قەزافی داوای تەسفیەکردنی جەسەدیی نارازییەکانی (ئەو ناویان لێنا سەگی بەڕەڵڵا) کە لە دەرەوەی وڵات دەژین.

• - ١٥ی شوباتی ١٩٨٠: داخستنی باڵیۆزخانەی ئەمریکا لە تەرابلس.

• - ١٦ی ئایاری ١٩٨٠: ٢٦ هاوڵاتیی ئەمریکی لە لیبیا دەرکران و ئەمریکا دوایین دیپلۆماتەکانی لە لیبیا کشاندەوە.

• - ٢ی ئەیلوولی ١٩٨٠: ڕاگەیاندنی یەکرێزی نێوان لیبیا و سوریا، و لیبیا سنووری بەڕووی عەرەبدا کردەوە و پاسپۆرتی عەرەبی دەرکرد.

• - ٦ی ئایاری ١٩٨١: داخستنی باڵیۆزخانەی لیبیا لە واشنتۆن.

• - ١٩ی ئابی ١٩٨١: ئەمریکا دوو فڕۆکەی لیبی بەسەر کەنداوی سرتدا خستەخوارەوە، دوای ئەوەی گرژی لە کەناراوەکانی لیبیا دروستبوو لە ئەنجامی ئەنجامدانی مانۆڕی سەربازی هێزەکانی ئەمریکا لە ناوچەیەکی دەریایی کە لیبیا بە بەشێک لە خاکەکەی دەزانێت.

• - ٧ی تشرینی یەکەمی ١٩٨١: پێکهێنانی بەرەی نیشتیمانی بۆ ڕزگاری لیبیا، کە ڕێکخراوێک بوو بۆ دژایەتیکردنی قەزافی بوو.

•- ١٠ی ئازاری ١٩٨٢: ئەمریکا قەدەغەکردنی هەناردەکردن بۆ لیبیا، جگە لە خۆراک و دەرمان، ڕێگری کرد لە دابینکردنی نەوتی لیبیا بۆ خاکەکەی.
• - ١٣ی کانوونی دووەمی ١٩٨٢: قەزافی ناوی هێزە چەکدارەکانی لیبیای گۆڕی بۆ "سوپای گەل".
• - حوزەیرانی ١٩٨٣: سوپای لیبیا بۆ جاری دووەم هێرشی کردە سەر تشاد.
• - ١٧ی نیسانی ١٩٨٤: ژنێکی پۆلیسی بەریتانی ئیڤۆن فلێچەر لەبەردەم باڵیۆزخانەی لیبیا کە پاسەوانی دەکرد لە لەندەن لە خۆپیشاندانێکی ئاشتیانەدا تەقەی لێکرا و دەسەڵاتدارانی بەریتانیا ڕایانگەیاند کە تەقە لە ناو باڵیۆزخانەکەوە کراوە، ئەمەش بووە هۆی دەرکردنی سی کارمەندی لیبی لە باڵیۆزخانە و پچڕانی پەیوەندییەکانی نێوان لیبیا و بەریتانیا.
• - ١٥ی نیسانی ١٩٨٦: هێزی ئاسمانی ئەمریکا دیسان پەلاماری تەرابلس و بنغازی دا، دوای ئەوە وڵاتانی ئەوروپا کۆت و بەندێکی زیاتریان بۆ پێدانی ڤیزا بە خەڵکی لیبیا دانا.
•- ئایاری ١٩٨٨: قەزافی دادگای شۆڕشی جەماهیری گۆڕی بۆ دادگای گەل.
• - ٢١ی کانوونی دووەمی ١٩٨٨: تەقینەوەی فڕۆکەیەکی نەفەرهەڵگر کە سەر بە کۆمپانیای "پەنامە"ی ئەمریکی بوو بەسەر شارۆچکەی لۆکەربی لە سکۆتلەندا کە ١٠٣ سەرنشینی تێدابوو. دوو لیبیی بە ناوەکانی عەبدول باسط ئەلمەگرەحی و ئەلئەمین خەلیفە فەهیمە، بە ئەنجامدانی ئەو تاوانە تۆمەتبار کران، ئەمریکاش ڕایگەیاند کە ئەو کردەوەیە هەواڵگریی لیبیا لە پشتەوەیە.
• - ٤ی ژانویەی ١٩٨٩: خستنەخوارەوەی دوو فڕۆکەی لیبی لەلایەن هێزی ئاسمانی ئەمریکا لە کەنداوی سرت.
• - ١٩ی ئەیلوولی ١٩٨٩: تەقینەوەی فڕۆکەیەکی فەرەنسی "UTI" بەسەر نیجەردا، تەقینەوەیەک کە ڕژێمی لیبیا تۆمەتبار کرا بە پلاندانانی.
• - ١٥ی تشرینی دووەمی ١٩٩١: ئەمریکا و بەریتانیا ئەلمەگرهی و فەهیمە تۆمەتبار دەکەن بە تەقاندنەوەی فڕۆکەی پان ئەنەمای ئەمریکی لەسەر لۆکەربی.

• - ٢١ی ژانویەی ١٩٩٢: ئەنجومەنی ئاسایشیی نێودەوڵەتی بڕیارنامەیەکی دەرکرد و داوای لە لیبیا کرد هاوکاریی واشنتۆن و لەندەن بکات لە لێکۆڵینەوەکان لە دۆسیەی لۆکەربی، هەروەها هاوڵاتییە تۆمەتبارەکانی ڕادەستی لیبیا بکات.

• - ٣١ ی ئازاری ١٩٩٢: ئەنجومەنی ئاسایشیی نێودەوڵەتی بڕیاری ژمارە ٧٤٨ی دەرکرد کە داوای ڕادەستکردنی دوو تۆمەتباری دۆسیەکانی لۆکەربی و نیجەر لە لیبیا کرد.

• - ی١٥ نیسانی ١٩٩٢: ئەنجوومەنی ئاسایشیی نەتەوە یەکگرتووەکان گەمارۆی ئاسمانی بەسەر لیبیادا سەپاند.

• - ١١ی تشرینی دووەمی ١٩٩٣: ئەنجومەنی ئاسایشیی نێودەوڵەتی بڕیارنامەی ٨٨٣ی دەرکرد، کە بەپێی ئەو بڕیارنامەیە سزاکانی سەر لیبیا توندتر کردەوە و پارەی لیبی لە بانکە بیانییەکاندا بەست، هەروەها گەمارۆی سەر نەوتی لیبیا توندتر کرد.

• - ئۆکتۆبەری ١٩٩٤: هێزەکانی قەزافی یاخیبوونێکی چەکدارییان لە نزیک مەسراتە پووچەڵ کردەوە.

• - ١١ی تشرینی دووەمی ١٩٩٤: درێژکردنەوەی گەمارۆی سەر لیبیا لەلایەن ئەنجومەنی ئاسایشەوە.

• - ٥ی ئابی ١٩٩٦: ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا یاسایەکی پەسەند کرد کە سزای ئەو کۆمپانیایانە دەدات (لەوانەش غەیرە ئەمریکییەکان) کە وەبەرهێنان لە لیبیا زیاتر لە ٤٠ ملیۆن دۆلار دەکەن.

• - نیسانی ١٩٩٨: لیبیا پشتڕاستی کردەوە کە دادگاییکردنی هاوڵاتیانی داواکراوی قبوڵ دەکات، بە مەرجێک ئەمە لەبەردەم دادگادا بێت لە وڵاتێکی بێلایەن.

• - ٢٤ی ئابی ١٩٩٨: ئەمریکا و بەریتانیا قبوڵکردنی دادگاییکردنی تۆمەتبارەکانی دۆسیەی لۆکەربی لەبەردەم دادگای هۆڵەندا ڕاگەیاند.

• - ٥ی نیسانی ١٩٩٩: لیبیا رادەستکردنەوەی ئەلمەگرەهی و فەهیمەی قبوڵکرد بۆ ئەوەی لە هۆڵەندا دادگایی بکرێن.

• - ١١ی حوزە یرانی ١٩٩٩: بەرپرسانی ئەمریکا بۆ یەکەمجار لە دوای ١٨ ساڵ لە گەڵ هاوتا لیبییە کانیان کۆبوونەوە بۆ تاوتوێکردنی سزا نێودە وڵەتییەکانی سەر لیبیا.

• - ٣ی ئایاری ٢٠٠٠: دەستپێکردنی دادگاییکردنی تۆمەتبار لە دۆسیەی لۆکەربی.

• - ٣١ی ژانویەی ٢٠٠١: دادگا ئەلمێگرهی تاوانبار کرد و فەهیمە لە دۆسیەی لۆکەربی بێتاوان دەرکرد.

• - ئازاری ٢٠٠٣: کۆنگرەی گشتی گەلانی لیبیا (پەرلەمان) یاسای دامەزراندنی چاکسازیی ئابووری لەو وڵاتە پەسەند کرد و دوای سێ مانگ قەزافی، شوکری غانمی وەک سەرۆک وەزیران دەستنیشان کرد بۆ سەرکردایەتیکردنی ئەو چاکسازییانە.

• - ئایاری ٢٠٠٣: لیبیا گفتوگۆی لەگەڵ ئەمریکا و بەریتانیا کرد لەسەر پرسە هەڵپەسێردراوەکان، لەوانە کەمکردنەوەی سزاکان و دۆسیەی چەکی کۆکوژ، کە ڕۆژاوا ڕژێمی قەزافییان بە پەرەپێدان تۆمەتبار کرد، هەروەها ڕژێمی لیبیا پێشنیاری قەرەبووکردنەوەی قوربانیانی لۆکەربی کرد.

• - ئابی ٢٠٠٣: ڕژێمی قەزافی و بنەماڵەی قوربانیانی لۆکەربی گەیشتنە ڕێککەوتنێک کە بەپێی ئەو بنەماڵانە ٢,٧ ملیار دۆلار قەرەبوو دەکرێنەوە.

• - ١٢ی ئەیلوولی ٢٠٠٣: دەنگدانی ئەنجومەنی ئاسایشیی نێودەوڵەتی لەسەر بڕیارنامەیەک بۆ هەڵوەشاندنەوەی ئەو سزایانەی کە بەسەر لیبیادا سەپێندرابوو.

• - ١٩ی کانوونی دووەمی ٢٠٠٣: ڕژێمی لیبیا وازهێنانی لە بەرنامەی پەرەپێدانی چەکی کۆمەڵکوژ ڕاگەیاند.

• - ٩ی ژانویەی ٢٠٠٤: ڕژێمی لیبیا قبوڵ دەکات قەرەبووی زیاتر بداتە قوربانیانی فڕۆکەی"UTI" ی فەرەنسی کە لە ساڵی ١٩٨٩ بەسەر نیجەردا بۆردومان کرا.

• -شوباتی ٢٠٠٤: بەڕێوەبەری گشتیی ئاژانسیی نێودەوڵەتیی وزەی ئەتۆمی لەو کاتەدا، محەمەد ئەلبەرادەیی، گەیشتە تەرابلس بۆ گفتوگۆکردن لەسەر هەڵوەشاندنەوەی بەرنامەی ئەتۆمی لیبیا.

• - ٢٦ی شوباتی ٢٠٠٤: حکوومەتی ئەمریکا ئەو قەدەغەیەی هەڵگرت کە بەسەر ئەو کۆمپانیایانەدا سەپێندرابوو کە لە لیبیا کاردەکەن و قەدەغەی گەشتەکانی هەڵگرت.

• - نیسانی ٢٠٠٤: قەزافی لەسەر بانگهێشتی یەکێتی ئەوروپا سەردانی بەلجیکای کرد، کە دوای ١٥ ساڵ یەکەم سەردانییەتی بۆ دەرەوەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست، دواتر تۆنی بلێر سەرۆکوەزیرانی بەریتانیا سەردانی تەرابلسی کرد.

• - ٢٣ی نیسانی ٢٠٠٤: هەڵگرتنی هەندێک سزای ئەمریکا بۆ سەر لیبیا و ڕێگەدان بە ئاڵوگۆڕیی بازرگانی.

• - ٢٣ی ئایاری ٢٠٠٤: قەزافی لە کۆبوونەوەی کۆمکاری عەرەب کشایەوە کە لە تونس بەڕێوەچوو، وەک نارەزایەتی بە کارنامەکەی بەڕێوەچوو، کە بە وەڵام نەدانەوەی بۆ خواستەکان زانی.

• -حوزەیرانی ٢٠٠٤: دەستپێکردنی گەڕانەوەی پەیوەندییە دیپلۆماسییەکانی نێوان لیبیا و ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا.

• - ١١ی تشرینی یەکەمی ٢٠٠٤: یەکێتی ئەوروپا گەمارۆی چەک لەسەر لیبیا هەڵگرت.

• - ژانویەی ٢٠٠٥: گەڕانەوەی کۆمپانیا ئەمریکییەکان بۆ وەبەرهێنان لە نەوتی لیبیا دوای بیست ساڵ.

• - کانوونی دووەمی ٢٠٠٥: دادگای باڵای لیبیا سزای لە سێدارەدانی بۆ پێنج پەرستاری بولگاری و پزیشکێکی فەڵەستینی دەرکرد بەهۆی تووشکردنی منداڵانی لیبیا بە ئایدز.

● - ئاياری ٢٠٠٦: واشنتۆن ڕایگەیاند کە پەیوەندییە دیپلۆماسییەکانی لەگەڵ لیبیا بە تەواوی گەڕاندووەتەوە.

● - تەمموزی ٢٠٠٧: دەسەڵاتی دادوەری لیبیا سزای پەرستارانی بولگاری و پزیشکە فەڵەستینیەکەی لە سێدارەنەوە بۆ هەتا هەتایی گۆڕی، دوای ماوەیەکی کەم دوای گەیشتن بە ڕێککەوتن لەگەڵ یەکێتی ئەورووپا ئازاد کران.

● - ژانویەی ٢٠٠٨: لیبیا پۆستی سەرۆکایەتیی خولانەوەی ئاسایشی گرتە دەست.

● - ٨ی ئابی ٢٠٠٨: تەرابلس و واشنتۆن ڕێکەوتننامەیەک واژوو دەکەن کە هەریەکەیان پابەند دەکات بە قەرەبووکردنەوەی قوربانیانی ئەو هێرشانەی کە بۆ سەر هاولاتیانی ئەوی دیکە دەستی پێکردووە.

● - ٨ی ئابی ٢٠٠٨: سەرۆک وەزیرانی ئیتاڵیا سەردانی لیبیای کرد و لە بنغازی داوای لێبوردنی وڵاتەکەی بۆ داگیرکردنی لیبیا ڕاگەیاند و پەیماننامەیەکی بە ئەنجامدا کە تێیدا هاتووە کە ڕۆما قەرەبووی سەردەمی کۆلۆنیالیزم بداتە لیبیا.

● - ئەیلوولی ٢٠٠٨: وەزیری دەرەوەی ئەمریکا کۆندۆلیزا ڕایس سەردانی تەرابلسی کرد، کە لە ساڵی ١٩٥٣ەوە یەکەم سەردانی لەم جۆرە لەلایەن بەرپرسێکی ئەمریکییەوە لەم ئاستەدا بێت و لەو کاتەدا ڕایگەیاند، پەیوەندییەکانی نێوان هەردوو وڵات پێی ناوەتە "قۆناغێکی نوێ".

● - تشرینی دووەمی ٢٠٠٨: بنەماڵەی قوربانیانی لۆکەربی ڕایدەگەیەنن کە قەرەبووی تەواوی خۆیان لە لیبیا وەرگرتووە.

● - ١١ی شوباتی ٢٠٠٩: قەزافی سەرۆکایەتیی یەکێتیی ئەفریقای کرد، و نیازی خۆی بۆ دامەزراندنی "ئەمریکای ئەفریقیا" ڕاگەیاند.

● - حوزەیرانی ٢٠٠٩: یەکەم سەردانی فەرمی قەزافی بۆ ئیتاڵیا ئەنجامدا.

● - ئابی ٢٠٠٩: ئەلمەگرهی لە زیندانی سکۆتلەندا ئازادکرا و گەڕایەوە بۆ لیبیا لە کاتێکدا باس لە بەدەستهێنانی گرێبەستی نەوتی وڵاتانی ڕۆژئاوا لە بەرامبەر ئازادکردنیدا کرا.

● - کانوونی یە کە می ۲۰۰۹: دە ستگیرکردنی کورەکەی قەزافی لە سویسرا بە تۆمە تی خراپ مامەڵەکردن لەگەڵ یەکێک لە خزمەتکارەکانی، ئەو دەستگیرکردنە قەیرانێکی دیپلۆماسی لەگەڵ لیبیا دروست دەکات.

● - ژانویەی ۲۰۱۰: ڕووسیا ڕەزامەندی دەربڕی لەسەر فرۆشتنی فرۆکە جەنگییەکان و تانک و سیستەمی بەرگری ئاسمانی لیبیا بە بڕی یەک ملیار و ۸۰۰ ملیۆن دۆلار.

● - ئۆکتۆبەری ۲۰۱۰: لیبیا ڕێککەوتنێکی لەگەڵ یەکێتیی ئەورووپا واژۆ کرد بۆ کەمکردنەوەی کۆچی نهێنی بۆ ئەورووپا لە ڕێگەی دەریا.

● - ١٤ ی ژانویەی ۲۰۱۱: زینی ئەلعابیدین بن عەلی سەرۆکی لەکارلادراوی تونس، دوای ئەوەی لە لایەن جەماوەری ڕاپەریوی ئەو وڵاتە ی ناچار کرا بە دەستکێشانەوەی لە پۆستەکەیدا، کە سێ هەفتەی خایاند، جا هەڵات بۆ سعودیە.

● - ۱۱ی شوباتی ۲۰۱۱: حوسنی موبارەک سەرۆکی لە کارلادراوی میسر دەستلەکارکێشانەوەی خۆی لە پۆستی سەرۆک کۆمار ڕادەگەیەنێت، دوای ئەوەی شۆڕشێکی جەماوەری داوای ڕۆیشتنی کرد و ۱۸ ڕۆژی خایاند، قەزافی ڕەخنەی لە گەلانی تونس و میسر گرت و ئەوانی بە تاوانبار کرد بۆ ڕووخانی بن عەلی و موبارەک.

● - ۱۷ی شوباتی ۲۰۱۱: لە شاری بەنغازی، چەخماخەی شۆڕشی لیبیا لیدا، خۆپیشاندان ڕوویدا، کە نزیکەی حەوت مانگ بەردەوام بوو و ڕژێمی قەزافی ڕووخاند.

● - ۲۰ی تشرینی یەکەمی ۲۰۱۱: قەزافی کوژرا.

○ ئەمانە بەرهەمە چاپکراوەکانی قەزافین:

- الكتاب الأخضر.
- آراء جديدة فى السوق والتعبئة ومبادئ الحرب.
- شروح الكتاب الأخضر المركز العالمى لدراسات وأبحاث الكتاب الأخضر.
- القرية.. القرية، الأرض.. الأرض، وانتحار رائد الفضاء.
- تحيا دولة الحقراء.
- اسراطين الكتاب الأبيض.
- السجل القومى ويتضمن أحاديثه وخطبه وحواراته ولقاءاته السياسية والصحفية صدر منه حتى الآن (٣٦ جزءاً) عن المركز العالمى لدراسات وأبحاث الكتاب الأخضر.
- ملعونة عائلة يعقوب، ومباركة أيتها القافلة.
- عشبة الخلعة والشجرة الملعونة.

## (٧٣)

# خەلە و خەرمانمان لەو سەفەرە دە ساڵیەدا

ژیان هەڵکەوتە. هەرچەندە نەخشەسازیشی بۆ بکەی، مەرج نییە پێی بە پێی نەخشە و تەگبیر و پلانەکانت بۆ بێتە دی. ڕەنگبێ، ڕووداوێکی چاوەڕواننەکراو، بتگەێنێتە بالاترین مەقام، دووریش نییە، بە ساتمەیەکی بچووک ملت بشکێنێ.

ئەم سەفەر، سەرتاپای نەخشەی ژیانی خۆم و ئاواتی هاوژین و تایەنی کچم و ڕەسەن و ڕەندی کوڕمی گۆڕێ تا هەتایە.

هەموومان کەوتینە ولاتی غەریبی، غەریبییەک کە سەرتاپای کەلتوور و ژینگە و مێژوو و زمانی لەگەڵ ئێمەدا جیاواز بوو. جوگرافیاییەکی زۆر دوور لە سرووشتی کوردستان و کوردەواری. ئازار و ئەشکەنجە و عەزابەکانمان، دەروونی و هزری و جەسدەیی زۆر زۆر بوو. ـــ هەر پێنجمان دووپشک پێوەی داین.

ئێمە لە کوردستان پایە و پۆست و شوێنێکی لەبارمان هەبوو، بۆخۆم لە پەیمانگەی ناوەندی مامۆستایانی هەولێر مامۆستا بووم و لە زانکۆی سەلاحەددینیش وانەبێژ بووم. دوکانی کلیلسازیی خۆم هەبوو و ئۆتۆمبیلم هەبوو. تەنها خانووم نەبوو. ئاواتی هاوژینم، فەرمانبەر بوو لە بەڕێوەبەرایەتیی کارەبای هەولێر و خزمەتی (١٥) ساڵی هەبوو، منداڵەکانم لە خوێندن زۆر باش بوون. خۆم و ئاوات، هەر بە خواحافیزی پەیمانگە و فەرمانگەمان بەجێهێشت بەبێ ئەوەی خۆمان خانەنشین بکەین، یان مۆڵەت وەرگرین.

بێگومان ئەو سەفەر وای کرد، هەموو ئەو شتانە و ماڵ و حاڵمان لەدەست بدەین و لە کوردستان کەوچکێکمان نەمێنێ.

ڕەندی یانزدە ساڵانم جوانەمەرگ بوو لەوێ، نەمانتوانی جەنازەکەشی بهێنینەوە کوردستان. تایەن کۆلێژی پزیشکی لەقیسچوو. ڕەسەن کۆلێژی ئەندازیاری بۆ تەواونەکرا. هیچی دەستکەوتێکی ماددیشمان پێنەبڕا، هەر نان و زگەکە بوو.

له ماوەی ئەو هەموو ساڵانە لە شیعر و ئەدەب و هونەر دابڕام، بە قەراری قەتعی نەمتوانی یەک قەسیدە بنووسم، بۆ خۆشم نەمزانی سرڕەکە لە چی دایە. دەبووایە لەو ماوەیەدا چەندان کتێبم ئامادەبێ بۆ چاپ!

ئەم سەفەر ڕێگر بوو لەوەی کە بتوانم بڕوانامەی باڵا بەدەست بهێنم و دوور کەمەوە لە خوێندن. ئەمە بۆ منداڵەکانیشم هەر وابوو.

***

لە سەرەتای مانگی تشرینی یەکەمی (٢٠٠٥)، ئێمە شاری سرتمان بەجێهێشتوو و بەیەکجارەی گەراینەوە کوردستان، بەڵام دیسان ڕوومان لە غەریبایبەتیەکی دیکە کردا!

***

کۆتایی

٢٠٢٢/١٠/٤

دوبلن

# پرۆفایلی نووسەر



- (فـازیـل حەمەد عەبدوڵا جەیدی) ناسراو بە (شـەورۆ) لە شـاری کۆیە لە سـاڵی (١٩٥١) لە دایکبووە.
- (١٩٧٥) بڕوانامەی بەکەلۆریۆسی لە زمان و ئەدەبی ئینگلیزی لە کۆلێژی ئاداب ـــ زانکۆی بەغدا وەرگرتووە.
- (١٩٧٢) یەکەم شیعری لە ڕۆژنامەی (هاوکاری) بڵاوکردووەتەوە.
- (١٩٨٢ – ١٩٩١) هەشت پێشەنگەی هونەری و فۆلکلۆری لە شارەکانی کوردستاندا کردووەتەوە.
- (٢٠٠٢) خەڵاتی شانۆگەریی (شەهید)ی لە شاری (سرت) لە (لیبیا) پێبەخشرا.
- (٢٠٠٤) خەڵاتی شاری (دوبلن)ی خزمەتگوزاری لە (کۆماری ئایرلندای باشوور) پێدرا.
- (٢٠١٠) خەڵاتی (سەید برایم)ی پێبەخشرا.
- (٢٠١١) خەڵاتی بەڕێوەبەرایەتیی پەروەردەی کۆیەی پێدرا.
- (٢٠١٣) خەڵاتی (فیستیڤاڵی شیعری نەتەوەیی کوردی) لە هەولێر پێدرا.

- (۲۰۱۵) خەلاتی باشترین لێکۆڵینەوەی ئەدەبی لە (۱۹)ەمین فیستیڤاڵی گەلاوێژ لە سلیمانی بردەوە.
- (۲۰۱٦) خەلاتی باشترین لێکۆڵینەوەی ئەدەبی لە (۲۰)ەمین فیستیڤاڵی گەلاوێژی بۆ جاری دووەم لە سلیمانی بردەوە.
  - ئەندامی یەکێتی نووسەرانی کوردە.
  - سەرنووسەری گوڤاری (کلتووری کورد)ە.
  - سەرنووسەری گوڤاری (شارەوان)ە.
  - بەڕێوەبەری هونەری گوڤاری (کەکۆن) ە.
  - ئەندامی دەستەی نووسەرانی گۆڤاری (ژیار)ە.
- لە بلاوکردنەوەی بەرهەمی ئەدەبی و پەروەردەکاری و کۆمەڵناسی و ژینگەپارێزیی گێڕانی کۆڕ و سیمیناردا کارا و چالاکە.
- چەند کارێکی هونەری لە شاری کۆیە جێبەجێ کردەوە، لە مۆزەخانەی ڕۆستەم ئاغەلەش کاری هونەری نمایشکراوە.

**بەرهەمە چاپکراوەکانی:**

- (کۆتـرێک لە ئـاگر)، شیعر، (۲۰۱۱)، چاپخانەی شەهاب ،هەولێر.
- (دەنگ لە شـیعری کەریم دەشـتی دا)، لێکۆڵینەوە، (۲۰۱۲)، دەزگای ئەکادیمیای کوردی لە هەولێر.
- (هەورازەکانی کاروانی تـەمـەنم ـــ حەسەن کاکە)، بیرەوەری، دارشتنەوە، (۲۰۱۳)، چاپخانەی شەهاب، هەولێر.
- (دوو لێکۆڵینەوەی ئەدەبی)، لێکۆڵینەوە، (۲۰۱۳)، دەزگای ئەکادیمیای کوردی لە هەولێر.
- (ڕەهەندەکانی خـەون لە شـیعری کوردیدا)، لێکۆڵینەوە، (۲۰۱٤)، دەزگای ئەکادیمیای کوردی لە هەولێر.
- (سـەدای شـیعر) بەرهەمی هاوبەشی نۆ شاعیر، (۲۰۱٤)، خانەی چاپی ئەربیل، هەولێر.

- (ماچـەکانی ئیـ◌َواره کـازیووه)، شیعر، (٢٠١٤)، چاپخانەی شەهاب، هەولێر.
- (ژنـە پیشـەوەرەکانی کۆیە ١٩٠٠ ــــ ٢٠١٥)، کلتوور، (٢٠١٥)، چاپخانەی شەهاب ــ هەولێر.
- (پۆشاکی کۆییان) کەلتوور، (٢٠١٧)، چاپخانەی تاران.
- (کەو لە کوردەواریدا) کلتوورو باڵندەناسی، (٢٠١٧)، چاپخانەی تاران.
- (جگەرە لە جیهانبینی شیعری شێرکۆبێکەسدا)،هاوبەش لە گەڵ د. هاوژین سلێوە، (٢٠١٧). ئەکادیمیای کوردی.
- (دایک لە جیهانبینی شیعری لەتیف هەڵەتدا)، هاوبەش لە گەڵ د. هاوژین سلێوە، (٢٠٢٠).
- (ئەزموونی پەروەردەیی لە پۆلە و بۆ پۆل)، پەروەردەیی، (٢٠٢٠).
- (گوتاری شەورۆ)، رەخنەی ئەدەبی، چاپخانەی چوار چرا، (٢٠٢١).
- (بولبولی ناو قەفەزیش دەخوێنێ)، شیعر، چاپخانەی چوار چرا، (٢٠٢١).
- شوێنپێیەکانم لە جەماهیرییەی لمدا، ١٩٩٤ ــ ٢٠٠٥، بیرەوەری، (٢٠٢٣).
- بەرگی کەلەپوور ـ ئینسایکلۆپیدایی کۆیە، ٥٠٠ لاپەرە، چاپنەکراوە.
- ڕێوڕەسمی جەژن لە وراتی کۆیە ١٩٠٠ ــــ ٢٠٠٠، کەلتوور، (٢٠٢٢) . چاپنەکراوە.
- شوێنپێیەکانم لە جەماهیرییەی لمدا، ١٩٩٤ ــ ٢٠٠٥، بیرەوەری، (٢٠٢٣).

# شوێنپێیەکانم
# لە جەماهیرییەی لمدا
# ٢٠٠٥-١٩٩٤

ئەم کتێبە کە بیرەوەریی خۆمە لە نێوان ساڵەکانی (١٩٩٤ - ٢٠٠٥) لە لیبیا، لە زۆر بواردا لە بازنەی بیرەوەری دەردەچی و رووماڵێکی جوانی جوگرافایی و مێژوویی و کەلتووریی و کۆمەڵایەتیی ئەو وڵاتە و دانیشتووانەکانی لە خۆگرتووە، بە خودی موعەمەر قەزافیشەوە، کە لێم دوور نەبوو.

---

# My Footprints in the Jamahiriya Sand 1995-2005





